# اللفظية (١)

سەلەف جەهمیەکانیان کردووە بە سێ بەش:

١- ئەوانەی ئەڵێن قورئان مەخلوقە.

٢- ئەوانەی ئەڵێن قورئان کەلامی الله یە، پاشان ئەوەستن نە ئەڵێن مەخلوقە و نە ئەڵێن غەیر مەخلوقە (الواقفة).

٣- ئەوانەی ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوقە (اللفظیة).

**ئیمام احمد** (٢٤١ هـ) ئەڵێ:

جەهمیەکان بوون بە سێ فرقە، ئەوانەی ووتیان قورئان مەخلوقە، وە ئەوانەی گومانیان هەبوو کە قورئان غیر مەخلوق بێت (واتا الواقفة)، وە ئەوانەی ووتیان لەفزمان بە قورئان مەخلوقە.

**ئیمام احمد** ئەڵێ:

ناڵێن ئەمانە واقفەن، پێیان ئەڵێین (شكاكة) واتا گومانیان هەیە قورئان غەیر مەخلوق بێت.

**(السنة للخلال : ١٧٦٦)**

**ئیمام احمد** ئەڵێ:

جەهمیەکان سێ جۆرن:

فرقەیەکیان ووتیان قورئان مەخلوقە

فرقەیەکیان ووتیان قورئان کەلامی اللّٰه یە، وە ئەوەستین

وە فرقەیەکیان ووتیان لەفزمان بە قورئان مەخلوقە

لەلای من هەر سێ فرقەکە هەمان ووتەیان هەیە.

**(السنة للخلال : ١٧٦٧)**

کە ئەڵێ لەلای من هەر سێکیان یەک ووتەیان هەیە، واتا هەر سێکیان مەبەستیان ئەوەیە بڵێن قورئان مەخلوقە، بەڵام فرقەی دووەم و سێیەم بە ڕێگای فێڵاوی و شاراوە ئەم کوفرە ئەکەن، بۆیە ئەبینین سەلەف کۆکن لەسەر ئەوەی کە هەر سێ فرقەکە جەهمین و کافرن چونکە زانیویانە مەبەستیانە بڵێن قورئان مەخلوقە بەڵام

لە ڕێگایەکی ناڕاستەوخۆ، هەروەک لە پۆستەکانی دواتر زیاتر ڕوونی ئەکەینەوە إن شاء اللّٰه.

## الحسن بن ثواب الحضرمي ئەڵێ:

بە ئیمام احمد-م ووت: الواقفة ؟ (واتا حوکمیان چیە)

ووتی: بەشێکن لە جەهمیەکان، بە وەقف کردن کوفرەکەیان شاردۆتەوە.

**(السنة للخلال : ١٧٧١)**

هەر بۆیەش سەلەف دەربارەی حوکمی واقفی و لەفزی تەفسیل ئەدەن ئەڵێن گەر ئەهلی کەلام بوو جەهمیە، بەڵام گەر عەوام و نەزان بوو ئەوا فێر ئەکرێت، بەڵام دەربارەی حوکمی ئەوەی ئەڵێ قورئان مەخلوقە تەفسیل نادەن و تەکفیری ئەکەن جا هەر کەسێک بێت و هەر حاڵێکی هەبێت، چونکە فرقەی یەکەم کوفرەکەی ڕوونە، بەڵام فرقەی دووەم و سێیەم کوفرەکەیان بە ناڕاستەوخۆ دەرئەبڕن بە ڕاشکاوی ناڵێن قورئان مەخلوقە، بۆیەش سەلەف ئەم تەفسیلە ئەدەن بە حوکمی ئەوان چونکە ڕەنگە کەسێک هەمان قسەی ئەوان بکات و هەمان مەبەستی ئەوانی نەبێت.

**عبدالله** ئەڵێ:

پرسیار لە باوکم کرا رحمه الله دەربارەی لەفزییە و واقفە، منیش ئەم بیست، باوکم ووتی: هەر کەسێک لەوان عیلمی کەلام ئەزانێت ئەوا جەهمیە، وە جارێکیان ووتی ئەوان لە جەهمیەکان خراپترن، وە جارێکی تر ووتی ئەوان جەهمین.

**(السنة لعبدالله : ١٦٩)**

جەهمی بوونیانی پەیوەست کرد بەوەی کە ئەهلی کەلامن یان نا، چونکە ئەهلی کەلام بۆ ئەوەی بڵێن قورئان مەخلوقە ووتیان توقف ئەکەین یان ووتیان لەفزمان مەخلوقە بە قورئان.

هەر بۆیەش ئەبینین ئیمام احمد دەربارەی واقفە ووتی پێیان ئەڵێین (شکاکة) واتا گومانیان هەیە کە قورئان مەخلوق نەبێت، هەر کەسێکیش گومانی هەبێت لەوەی کەلامی الله مەخلوق نیە ئەوا کافرە، وە لە شوێنێکی تر ووتی ئەمانە بەشێکن لە جەهمیەکان بە وەقف کردن کوفرەکەیان شاردۆتەوە، واتا ئەوانیش بڕوایان وایە قوڕئان مەخلوقە بەڵام بەم وەقف کردنە کوفرەکەیان ئەشارنەوە و دەری نابڕن

وە دەبینین ئیمام احمد دەربارەی لەفزییە ئەڵێ:

هەر کەسێک بەرەو قوڕئان بچێت بە بابەتی لەفز یان بەهەر شتێکی تر، مەبەستی ئەوە بێت کە قوڕئان مەخلوقە ئەوا جەهمیە.

**(السنة لعبدالله : ١٦٧)**

واتا عیللەتی تەکفیر کردنیان ئەوەیە بڕوایان وایە قورئان مەخلوقە، بەڵام ناڕاستەوخۆ ئەم کوفرە دەرئەبڕن بە ووشەی تەم و مژاوی.

ئەمەش مانای ئەوە نیە کە بڵێین گەر کەسێک بڕوای وابوو قورئان مەخلوق نیە ئەوا ئاساییە توقف بکات و نەڵێ غیر مخلوق، یان ئاسایی بێت بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە، نەخێر ئەمانە بیدعەی جەهمیەکانن مرۆڤی سوننی هەرگیز واز لە ووتەکانی سەلەف ناهێنێت و دەست بگرێت بە ووتەی کافر و گومڕاکان و دووبارەی بکاتەوە کە ووتەکانیان هەم مەبەستی تری لە پشتە، وە هەم خودی لەفزەکە داهێنراوە و مانای جیاواز لەخۆ ئەگرێت و ڕێگا خۆشکەرە بۆ بەهێز کردنی مەزهەبی جەهمیەکان

جا کاتێک سەلەف جیاوازی ئەکەن لەنێوان حوکمی ئەوانەی کە ئەڵێن قورئان مەخلوقە لەگەڵ ئەوانەی کە توقف ئەکەن یان لەفزین، واقفە و لەفزی بەو مەرجە تەکفیر ئەکەن کە ئەهلی کەلام بێت یان لە باسەکە تێبگات، ئەمە مانای ئەوەیە کە هەموو کەسێک کە لەم باسە قسە ئەکەن هەمان مەبەستیان نیە

هەروەک **ابو داود السجستاني** ئەڵێ:

بیستم پرسیار لە احمد کرا: ئایا بۆی هەیە کەسێک بڵێ: قورئان کەلامی الله یە و بێدەنگ بێت ؟ (واتا نەڵێ غیر مخلوق)

احمد ووتی: بۆچی بێدەنگ ئەبێت ؟ گەر لەبەر ئەوە نەبوایە خەڵک ووتیان قورئان مەخلوقە ئەوا بۆی هەبوو بێدەنگ بێت، بەڵام کاتێک خەڵکی ووتیان قورئان مەخلوقە، بۆچی بێدەنگ ئەبن و ناڵێن غیر مخلوق؟

**(السنة للخلال : ١٧٨٣)**

حنبل ئەڵێ:

بە باوکی عبداللە-م ووت: ئەوەی وەقف بکات لە قورئان، بڵێ نە ئەڵێم مەخلوقە و نە ئەڵێم غیر مەخلوقە ؟

ووتی: ووتەیەکی خراپە، شتێکی خراپە کە وەقف ئەکات، چۆن نازانێت ؟! یان حەلالە یان حەرامە، یان ئەمەیە یان ئەوەیە، الله عز وجل قورئانی پاک ڕاگرتووە لەوەی کە مەخلوق بێت، ئەمانە ئەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی کە بڵێن قورئان مەخلوقە، جا بۆ خۆیان بە باش زانی بە وەقف کردن ئەمە دەربڕن.

**(السنة للخلال : ١٧٨٦)**

### الآجري ئەڵێ:

زانایان ووتیان ئەم واقفانە وەک ئەوەن کە ئەڵێ قورئان مەخلوقە، وە خراپتریشن، چونکە گومانیان هەیە لە دینەکەیان، وە پەنا دەگرین بە الله لەو کەسەی کە گومانی هەبێت لەوەی کەلامی پەروەردگار مەخلوق نیە.

**(الشريعة : ٥٢٧/١)**

### أبو زرعة الرازي (٢٦٤ ھ) ئەڵێ:

قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە ئەو کەسەی توقف ئەکات لە قورئان بە گومانەوە (واتا گومانی هەیە غەیر مەخلوقە یان نا) وە ئەو کەسەی کە ئەڵێ مەخلوقە، هەردووکیان هەمان شتە.

**(طبقات الحنابلة : ٥٩/٢)**

ئەم ووتەیەی ابو زرعة وەک ووتەکەی ئیمام احمد-ە کە ووتی: ئەوەی بەرەو قورئان بچێت بە لەفز یان بەهەر شتێکی تر، مەبەستی ئەوە بێت قورئان مەخلوقە ئەوا جەهمیە.

ابو زرعە توقف کردنی قەید کردن بە گومان کردن لەوەی قورئان غەیر مەخلوقە یان نا، ئیمام احمدیش بابەتی لەفزی قەید کرد بەوەی مەبەستی ئەوە بێت قورئان مەخلوقە.

بەڵام دووبارەی ئەکەمەوە ئەمە مانای ئەوە نیە مادام پێت وابێ قورئان غەیر مەخلوقە ئەوا ئاساییە توقف بکەیت یان بڵێی لەفزم بە قورئان مەخلوقە، چونکە ئەم دوو فرقەیە سەریان هەڵداوە و کوفرەکەیان جێگیر بووە، تاکو ئێستاش ئەشعەریەکان دەست بەم ووتەیە ئەگرن (لەفزمان بە قورئان مەخلوقە) بۆ شاردنەوەی کوفرەکەیان، وە هەر خودی ووتەکەش مانای جیاواز لەخۆ هەڵئەگرێت ئەکرێت خەلقەکە بگەڕێتەوە بۆ قورئان بۆیە نابێت بووترێ، وە تاکو ئێستاش کەسانێک ئەڵێن قورئان مەخلوقە، وە بە هەمان شێوە گەر ئامادە نەبیت بڵێی قورئان غەیر مەخلوقە حەتمەن ئەمە شتێکی لە پشتەوەیە لە کاتێکدا ئەم هەموو سەلەفەت هەیە کە وتوویانە غەیر مەخلوقە و ئەزانی کوفری ووتنی قورئان مەخلوقە تەشەنەی سەندووە، بەڵام سەردەمانێک کە کوفری قورئان مەخلوقە بوونی نەبووە کەس لۆمەی کەسی نەکردووە کە بۆ ناڵێ قورئان غەیر مەخلوقە.

بۆیە ڕەحمەتتان لێبێت لەم اطلاقاتانەی سەلەف تێبگەن و بزانن بۆ چ بارودۆخ و سەردەمێک و کەسانێک ئەم حوکمە ڕەهایانەیان داوە، مەعلومیشە کە اطلاقاتەکانیان بە پێی قەیدەکانیان لێی تێئەگەین.

---

ماویەتی

هیوادارم کەس دەست نەکات بە ڕەددانەوە تاکو لە مەبەستم تێئەگات و بەڵگەکانم ئەبینێت.

# اللفظية (٢)



ئەبینین زۆرینەی سەلەف ئەڵێن (ئەوەی بڵێ قورئان مەخلوقە کافرە، وە ئەوەی تەکفیریشی نەکات ئەویش کافرە)

هەروا بە ڕەهایی دەری ئەبڕن کەسی دووەمیش تەکفیر ئەکەن

بەڵام ئەبینی ابو زرعة (٢٦٤ هـ) و ابو حاتم (٢٧٧ هـ) لە عەقیدەکەیاندا ئەڵێن:

ئەوەی بڵێ قورئان مەخلوقە کافرە کوفرێکی لە دین دەرخەر، ئەوەی تەکفیریشی نەکات کە تێبگات لە کوفرەکەیان ئەوا ئەویش کافرە.

پێم وابێ ئەوانەی خۆیان داوەتە پاڵ سەلەف زۆر بە هەندەوە ئەم قەیدەی دوو رازییەکە وەرئەگرن کە ووتیان (کەسەکە تێبگات) ئەڵێن کەسی دووەم راستەوخۆ تەکفیر ناکرێ بەڵکو دوای روونکردنەوە و تێگەیاندنی کافرە، ئەمە لەکاتێکدا زۆرینەی سەلەف باسی ئەم قەیدە ناکەن بە رەهایی باسی تەکفیری کەسی دووەم ئەکەن، بەڵام کەسیش ناڵێ ووتەی ئەم دوو رازییە موخالفی ئیجماعی سەلەفە، بەڵکو ووتەکەی ئەوان بە شیکەرەوەی ووتەی هەموو سەلەف ئەزانن، پێیان وایە

سەلەفیش کە وتوویانە کەسی دووەم کافرە هەمان مەبەستی دوو رازییەکەیان هەبووە کە دوای روونکردنەوە کەسی دووەم تەکفیر ئەکرێت.

کەچی کە دێتە سەر بابەتی لەفزییەکان، ووتەکە موجمەلەکانی ئیمام احمد ئەهێنن کە وتوویەتی ئەوەی بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە کافرە، هیچ حیسابیش بۆ تەفسیلەکەی ناکەن کە عبداللە-ی کوڕی ئەڵێ باوکم ووتی: ئەوەی بەرەو قورئان بچێت بە لەفز یان هەر شتێکی تر، مەبەستی ئەوە بێت قورئان مەخلوقە، ئەوا جەهمیە.

نازانم بۆ تەفسیلەکەی دوو رازییەکە (کە تەفسیلێکی حەقە) هێندە گرنگە لەلاتان و لەسەری ئەرۆن لەکاتێکدا باقی سەلەف باسی ئەم مەرجە ناکەن و بە رەهایی ئەڵێن کەسی دووەم کافرە، بەڵام حیساب بۆ ئەم تەفسیلەی ئیمام احمد ناکەن کە حوکمە موتلەقەکانی روون ئەکاتەوە، هەروەها بۆ بابەتی واقفەش هەمان شت کە لە پۆستی پێشوو باسمان کرد.

کەسێک گەر پێش سەرهەڵدانی فرقەی واقفە و پێش سەرهەڵدانی ووتنی قورئان مەخلوقە، گەر تەنها ووتبێتێ قورئان کەلامی اللە یە، نەی ووتبێ غەیر مەخلوقە لۆمە نەکراوە چونکە لای هەمووان زانراو بووە کە قوڕئان غەیر مەخلوقە کەسیش پێچەوانەی ئەمەی نەووتوە تا تەرکیز بکەنە سەر (غير مخلوق).

بگرە پاش سەرهەڵدانی فرقەی واقفەش کە کەسێک توقف بکات بەڵام بزانن بڕوای وایە قورئان غەیر مەخلوقە، وە تەکفیری ئەوانەش ئەکات کە ئەڵێن قوڕئان

مەخلوقە، کەسێک کە ئەمە حاڵی بووە تەکفیر نەکراوە لەلای ئیمام احمد تەنها هەجر کراوە چونکە وەقفەکەی شوبهە بۆ خەڵک دروست ئەکات.

**يعقوب بن بختان** ئەڵێ:

پرسیارم لە باوکی عبدالله کرد دەربارەی کەسێک کە ئەڵێ: قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە تێکەڵاوی لەگەڵ کەسێک هەیە کە ئەڵێ: قورڕئان کەلامی الله یە، وە بڕوای وایە مەخلوق نیە، وە ئەو کەسەش تەکفیر ئەکات کە پێی وایە مەخلوقە، ئایا ئەم کەسە قسەی لەگەڵ ئەکرێ ؟

ووتی: قسە لەگەڵ ئەوە ئەکات کە پێی وایە قورڕئان مەخلوق نیە، وە هەجری ئەو کەسە ئەکات کە بێدەنگ ئەبێت.

**(السنة للخلال : ١٨١٤)**

بێدەنگ ئەبێت واتا توقف ئەکات، بەڵام حاڵی باسکردووە کە چۆنە، نە گومانی هەیە لەوەی قورڕئان غەیر مەخلوقە، نە لەو کەسانەشە کە بڕوای وایە قورئان مەخلوقە بەڵام بە وەقف کردن کوفرەکەی ئەشارێتەوە، بەڵگەش بۆ ئەوەی کە ئەم هەجر کردنە مانای تەکفیر نیە ئەم ریوایەتەی خوارەوەیە

**عبدالله** ئەڵێ:

پرسیار لە باوکم کرا دەربارەی ئەو کەسەی توقف ئەکات ؟

ووتی: ئەوەی موجادەلەی لەسەر بکات و بەوە بناسرێ کە ئەهلی کەلامە، ئەوا جەهمیە، وە ئەوەی بەوە نەناسرا بێت ئەهلی کەلامە، هەجر ئەکرێت تاکو ئەگەڕێتەوە لەم وەقف کردنەی.

**(السنة للخلال : ١٨١٣)**

ڕەنگە بووترێ ئەم ووتانە دەربارەی واقفەیە چ پەیوەندی بە لەفزییە هەیە ؟

لە پۆستی پێشوو ووتمان کە سەلەف جەهمیان کردووە بە سێ بەش: مخلوقية و واقفة و لفظية، هەر سێکیان تەکفیر کردووە، بەڵام بۆ واقفی و لەفزی تەفسیلیان بە حوکمی تەکفیرەکە داوە، چونکە کەسانێک ڕەنگە بکەونە ناو هەمان شتەوە بەڵام هەمان مەبەستی ئەوانیان نەبێت، بۆیە ئیمام احمد تەکفیر کردنیان قەید ئەکات بەوەی ئەهلی کەلام بن، جدال بکەن لەسەری، بە گومانەوە توقف بکەن، مەبەستیان لە بابەتی لەفز ئەوە بێت قورئان مەخلوقە.

جا کە ئەم پێشەکیە زانرا ئیتر تێئەگەین لە ووتە و حوکمە موتلەقەکانی ئیمام احمد و باقی سەلەف.

---

ماویەتی

# اللفظية (٣)



له پۆستی یەکەم ڕوونم کردەوە دووجار لەبڕی یەک جار کە نابێ بووترێ لەفزمان بە قوڕئان مەخلوقە، وە نابێ وەقف بکەین و نەڵێین قوڕئان غەیر مەخلوقە، تەنانەت گەر بڕواشمان وابێ کە قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، هەر نابێ بڵێین لەفزمان بە قوڕئان مەخلوقە یان وەقف بکەین، چونکە ووشەی (لەفز) قورئان و فعلی عەبدیش ئەگرێتەوە، بۆیە ئیمام احمد رازی نەبوو بووترێ لەفزمان بە قوڕئان مەخلوقە یان بووترێ لەفزمان بە قورئان غەیر مەخلوقە، چونکە وەک ووتم لەفزەکە قوڕئان ئەگرێتەوە کە کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە فعلی عەبدیش ئەگرێتەوە کە مەخلوقە، بۆیە ئەم لەفزە موجمەلە داهێنراوە بەکارنایەت، ئەگینا گەر لەفز تەنها قورئانی گرتبوایە ئەوا ئیمام احمد و باقی سەلەف ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان غەیر مەخلوقە، بەڵام وایان نەووت و تەبدیعی ئەو کەسەیان کرد کەوا بڵێ چونکە ئەوکات فعلی عەبدیش ئەبوو بە غەیر مەخلوق، وە ئەگەر بێتو لەفز تەنها فعلی عەبدی گرتبوایە ئەوا ئیمام احمد و سەلەف ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، بەڵام ئەو کەسەیان بە جەهمی داناوە کەوا بڵێ چونکە مەخلوقەکە ئەگەڕێتەوە سەر قورئانیش، لەبڕی ئەم ووتە داهێنراوانەی جەهمیەکان

ئەیان ووت قورئان کەلامی الله یە بە هەموو جۆرێک و لە هەموو رووێکەوە غەیر مەخلوقە.

ئینجا واز لەوە بێنن بتانەوێ شتەکە لابەرن لەسەر ئیمام احمد و بیدەنە پاڵ من، تۆ ئەڵێی ئەوەی وابڵێ کافر نیە، نەخێر من واناڵێم بەڵکو ئیمام احمد وائەڵێ کە واقفە و لەفزی گەر ئەهلی کەلام بوون ئەوا جەهمین، شتەکە وانیشان مەدەن کە ئەمە حوکمی من بێت دام هێنا بێت، ئیمام احمد ووتی گەر مەبەستی لە مەخلوقی لەفز مەخلوقی قورئان بێت جەهمیە، ئیمام احمد ووتی گەر مەبەستی لە وەقف گومان هەبوون بێت یان مەبەستی ئەوە بێت قورئان مەخلوقە ئەوا جەهمیە.

ئینجا پاشان کە بیدعەیەک لە سەردەمێک تازە روو ئەدات، زۆر جیاوازە دوای ١٢٠٠ ساڵ کە خەڵک دێن تەواوی تەفاسیلی بیدعەکە ئەزانن و حوکمی سەلەف ئەزانن دەربارەی.

لە سەردەمی ئیمام احمد الحسين الكرابيسي بابەتی لەفزمان بە قورئان مەخلوقەی داهێنا، خەڵک لەم شتانە حاڵی نەئەبوون سەرەتا پرسیاریان لە ئیمام احمد ئەکرد، هەر لە سەردەمی ئیمام احمد محمد بن شجاع الثلجي حەنەفی مەزهەب وەقف کردنی داهێنا، کە لەم وەقفە هەر مەبەستی ئەوە بوو کە قورئان مەخلوقە بەڵام بە وەقف کوفرەکەی ئەشاردەوە.

ئینجا تۆ کە دوای ١٢٠٠ ساڵ دێیت حوکمی ئەمانەت بۆ روون کراوەتەوە لەلایەن سەلەف، سەلەف ئەڵێن ئەوەی بڵێ لەفزمان بە قورئان مەخلوقە جەهمیە، ئەوەی وەقف بکات جەهمیە، ئەزانی سەلەف خۆیان پاراستووە لەم ووتانە، هەموویان

وتوویانە قورئان غەیر مەخلوقە، کە تۆ دێیت هەمان ووتەی جەهمیەکان دووبارە ئەکەیتەوە ئەڵێی لەفزمان بە قورئان مەخلوقە یان ئەڵێی وەقف ئەکەم ناڵێم غیر مخلوق لە کاتێکدا ئەزانی هەموو سەلەف وتوویانە غیر مخلوق، حەتمەن مەبەستێکی شاراوە لە پشت ئەم کارەوەت هەیە، وەکو ئەوە نیە کە سەرەتا بیدعەکە سەری هەڵدا هەندێک ئەیان ووت ئەزانین مەخلوق نیە بەڵام ناڵێین غیر مخلوق چونکە لە قورئان و سوننەت نەهاتووە، یان کەسێک لە سەرەتای بیدعەی لەفزیەکان ووتبێتێ لەفزمان بە قورئان مەخلوقە مەبەستی لە لەفز فعلی خۆی بێت لە زمان و لێو جووڵاندن نەک مەبەستی قوڕئان بێت

ئینجا ئیمام احمد نەی ووتوە ئاساییە توقف بکەن، المروذي لێی ئەپرسێ: کەسێک توقف بکات ناڵێ غیر مخلوق، ئەڵێ: قوڕئان کەلامی الله یە ؟

ئیمام احمد ووتی: پێی ئەووترێ زانایان ئەڵێن غەیر مەخلوقە، گەر ڕازی نەبوو ئەوا جەهمیە.

**(الإبانة الكبرى لابن بطة : ٢٢٠٠/د)**

لە کۆتایی ئەم پۆستە چەند بارەی ئەکەمەوە کە ئیمام احمد مەبەستی لە جەهمی دانانی واقفە و لەفزیە ئەوە بووە کە پێیان وایە قورئان مەخلوقە بۆیە ئەم حوکمەی لەسەر داون، ئەمەش بەڵگەیەکی تر لە خوارەوە

**ابو طالب ئەڵێ:**

باوکی عبدالله پێی ووتم: جەهمیەکان بوون بە سێ فرقە دەربارەی قورئان

ووتم: بەڵێ ئەوان سێ فرقەن: جەهمی و واقفە و لەفزی، جەهمیەکان حاڵی خۆیان دەرئەخەن ئەڵێن قورئان مەخلوقە

ئیمام احمد ووتی: هەموویان جەهمین، ئەمانە (واتا واقفی و لەفزی) کوفرەکەیان ئەشارنەوە، بەڵام کاتێک تەنگاوت کردن جەهمیەت دەرئەخەن، جا هەموویان جەهمین.

**(الإبانة الكبرى : ٢١٩٧)**

سەیرکە ئەڵێ کوفرەکەیان ئەشارنەوە کە تەنگاویان ئەکەیت کوفرەکەیان دەرئەخەن و ئەڵێن قورئان مەخلوقە، واتا لە وەقف کردن و مەخلوق بوونی لەفز مەبەستیان مەخلوقیەتی قوڕئانە.

---

ماویەتی

# بەشێک

گەر هەر کەسێک بە هەڵە لەم باسانە تێئەگات وائەزانێ وتوومە ئاساییە بڵێی لەفزم بە قورئان مەخلوقە مادام قورئان بە غەیر مەخلوق ئەزانیت، یان ئاساییە توقف بکەیت مادام لە دڵی خۆت پێت وایە قورئان غەیر مەخلوقە، ئەوا هەڵە تێگەیشتنی خۆیەتی، وابزانم بە جۆرێکی هێندە ئاڵۆزیش شتەکانم نەنوسیوە تا کەس بە هەڵە تێی بگات، ئینجا پاشان مەرج نیە لە هەموو باسێک تێبگەن پۆست هەیە لێی تێناگەیت ئاساییە چونکە هێشتا بەم باسانە نەگەیشتووی، کە ئەزانی سەر لە باسەکە دەرناکەیت مەیخوێنەوە بە هەڵە تێی بگەیت و زۆر لە خۆت بکەیت ئیللا بەلایەکی دا ببەیت، بۆیە ئامۆژگاریم بۆ هەمووان ئەوەیە کە ئەگەر لەم باسە تێناگەن مەیخوێننەوە.

# اللفظية (٤)



لەم پۆستەشدا درێژە بە ڕوونکردنەوەی ئەوە ئەدەین کە سەلەف مەبەستیان لە تەکفیر کردنی لەفزییەکان ئەوانە بووە کە مەبەستیان مەخلوقی قورئان بووە، نەک مەبەستیان ئەوانە بێت کە ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوقە لە دەم جوڵاندنی و دەنگی عەبد بەڵام قورئان کەلامی الله یە و غەیر مەخلوقە لە هەموو ڕوویێکەوە.

ئەگەرچی ئەم بەڵگانە کەسانێک لە بنەڕەتەوە ڕەتی ئەکەنەوە چونکە لە مێشکیان چەسپاوە کە الحسين الكرابيسي و احمد الشراك پێیان وابووە قورئان غەیر مەخلوقە کەچی تەنها بە ووتنی (لەفزمان بە قورئان مەخلوقە) بە جەهمی دانراون، کە لە پۆستەکانی دواتر ان شاء الله ئەمەش ڕوون ئەکەینەوە.

**محمد بن عبدالله بن نمیر ئەڵێ:**

قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە هەر کەسێک بڵێ قورڕئان مەخلوقە ئەوا کافرە، وە واقفە خراپترە لەوەی کە ئەڵێ قورڕئان مەخلوقە، چونکە ئەوانەی کە ئەڵێن قورڕئان مەخلوقە کوفرەکەیان دیارە، بەڵام واقفەکان فێڵ لە خەڵکی ئەکەن.

**(السنة للخلال : ١٩٣٦)**

بڕوانە ووتی (واقفە فێڵ لە خەڵکی ئەکەن، واتا مەبەستیان مەخلوقی قورڕئانە بەڵام بە ڕاستەوخۆ دەری نابڕن)

**عبدالله ئەڵێ:**

بیستم باوکم ئەیووت: هەر کەسێک بڵێ: لەفزم بە قورڕئان مەخلوقە، مەبەستی قورڕئان بێت، ئەوا کافرە.

**(الأسماء والصفات للبيهقي : ٢/٢٠)**

پێشتریش ئەم ڕیوایەتەمان هێنا لە سوننەی عبدالله

### ابو مسعود احمد بن الفرات ئەڵێ:

هەر كەسێک بڵێ: لەفزم بە قورئان مەخلوقە بیەوێ فێڵ بكات دەربارەی قورئان بە شتێک لە شتەكان یان بە جۆرێک لە جۆرەكان كە سەر بكێشێ بۆ ئەوەی بڵێ: قورئان مەخلوقە، ئەوا جەهمیەكی پیسە.

**(الحجة في بيان المحجة : ٤٢١/١)**

احمد بن الفرات لە سەردەمی ئیمام احمد ژیاوە، ئیمام احمد مەدحی كردووە، لە حفزدا زۆر عەجیب بووە، تەنانەت ئیمام احمد ئەڵێ هیچ سەر ڕەشێک ناناسم وەک احمد بن الفرات شارەزا بێت بە فەرمووده موسنەدەكانی رسول الله صلى الله عليه وسلم، احمد بن الفرات و محمد بن يحيى الذهلي لە هەمان ساڵدا وەفاتیان كردووە (٢٥٨ هـ).

### ابو عثمان الصابوني ئەڵێ:

ئەوەی الطبري لە احمد-ی گێڕاوەتەوە كە لەفزییەكان جەهمین، ئەمە سەحیحە لە احمد-ەوە، وە احمد ئەمەی ووتوە چونكە جەهم و هاوەڵەكانی بە ئاشكرا ووتیان قورئان مەخلوقە، وە ئەوانەی ووتیان لەفزمان مەخلوقە بە قورئان بە پلەبەندی چوون بەرەو ووتنی: قورئان مەخلوقە، لە ئەهلی سوننە ترسان لەو سەردەمە بە

ئاشکرا بڵێن قورئان مەخلوقە، جا باسی لەفزیان کرد مەبەستیان ئەوە بوو قورئان بە لەفزمان مەخلوقە، بۆیە احمد ناوی بردن بە جەهمی.

**(عقيدة السلف وأصحاب الحديث : ١٧٢-١٧٣)**

## قوام السنة الأصبهاني ئەڵێ:

ووتەکەیان (لەفزم بە قورئان مەخلوقە) هەڵەیە، چونکە خاوەنی ئەم ووتەیە ئەیەوێ بە پلەبەندی بۆ ئەوە بچێ کە بڵێ: قورئان مەخلوقە، بەڵام جورئەت ناکات ئەم شتە بە ئاشکرا بڵێت، جا بە شاراوەیی ئەیڵێ.

**(الحجة في بيان المحجة : ٢/٢٠٧)**

## الطبري ئەڵێ:

گەر کەسێک بڵێ: خوێندنەوەم بۆ قورئان مەخلوقە (قراءتي القرآن مخلوق) وە پێی وایە مەبەستی لەم ووتەیە مەخلوقی قورئانە، ئەوا کافرە گومانی تێدا نیە لای ئێمە، بەڵام گەر بڵێ: مەبەستم لە خوێندنەوەم (قراءتي) فعلەکەمە کە الله پاداشتم ئەداتەوە لەسەری مەبەستم قورئان نیە کە کەلامی الله یە و غەیر مەخلوقە، ئەوا ئەم ووتەیەی وەک ووتەی ئەو کەسە وایە کە ئەڵێ: زیکر کردنی بۆ الله بە زمانی مەخلوقە، مەبەستی لەمە فعلەکەیەتی نەک پەروەردگاری کە دروستی کردووە و کردەوەکانیشی دروست کردووە.

**(التبصير في معالم الدين : ١٥٢) بتصرف**

بۆیە ووتەی تەبەریم خستە کۆتایی چونکە هەندێک لەوانەی کە قسە لە بابەتی لەفز ئەکەن تەکفیری تەبەریان کردووە جا نازانم بەهۆی ئەم ووتەیەتی یان بەهۆی شتی ترەوەیە! بەڵام خۆ جگە لە تەبەریش ئەمەی ووتوە بگرە ئیمام احمد پێش هەمووان ئەمەی ووتوە، ئینجا ووتەی تەبەری لە بابەتی لەفز هەمان ووتەی ئیمام احمد نەقل ئەکات و شوێنی ئەکەوێ، ئەڵێ احمد وتوویەتی ئەوەی بڵێ لەفزمان بە قورئان مەخلوقە جەهمیە، ئەوەی بڵێ لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە بیدعەچیە، منیش احمد بە ئیمامی خۆم ئەزانم و هەمان شت ئەڵێم

بەڵام ئەوانەی کە تەبەری تەکفیر ناکەن ڕەنگە ئەم ووتەیە تێگەیشتنیان بۆ بابەتەکە بگۆڕێ، ئینجا سەرەرای هەموو ئەمانە قسەمان لەسەر ئەوە نیە کە ئەم ووتانە ئاسایین بووترێن بەڵکو ئەبێ ئەو ووتانە بووترێن کە سەلەف وتوویانە نەک ووتەی تەم و مژاوی کە دانراوی ئەهلی کەلامە، بەڵام مەبەستەکەمان روونکردنەوەی عیللەتی تەکفیر کردنی سەلەفە بۆ لەفزیەکان

ان شاء الله لە پۆستی داهاتوو زیاتر روونکردنەوە ئەدەین لەسەر ئەم باسە.

---

ماویەتی

# اللفظية (٥)



ابن بطة العكبري لە کتێبی الإبانة الكبرى بابێکی تایبەت داناوە بۆ لەفزیەکان بە ناونیشانی: (بَابٌ ذِكْرُ اللَّفْظِيَّةِ وَالتَّحْذِيرِ مِنْ رَأْيِهِمْ وَمَقَالَاتِهِمْ) واتا: باسکردنی لەفزیەکان و ئاگادارکردنەوە لە ڕەئی و ووتەی لەفزیەکان.

بڕوانە رحمك الله ابن بطة چۆن باسیان ئەکات، ئینجا بەراوردی بکە بەو تێگەیشتنەی کە خۆت تێیگەیشتووی لەم بابەتە، بزانە بە هەمان جۆر تێگەیشتووی کە سەلەف مەبەستیان بووە

**ابن بطة** ئەڵێ:

بزانن ڕەحمەتی الله-تان لێبێ کە بەشێک لە جەهمیەکان بە فێڵی دڵیان و پیسی ڕەئیەکانیان و ناشرینی ئارەزووەکانیان بڕوایان وابوو کە قورئان مەخلوقە، جا ناوێکی تریان لە مەخلوقی قورئان نا بە بیدعەیەک کە دایان هێنا، بۆ فێڵ کردن و چەواشە کردنی خەڵکی عەوام، بۆ ئەوەی کوفرەکەیان بشارنەوە و ئیلحادەکەیان شاراوە و

نارِوون بێت بۆ ئەو کەسانەی کە عیلمیان کەمە و سروشتیان لاوازە، جا ووتیان: (ئەو قورئانەی کە الله قسەی پێکردووە و فەرموویەتی کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە ئەو قورئانەی کە ئێمە ئەیخوێنینەوە بە زمانەکانمان و ئەینوسین لە پەڕاوەکانمان ئەو قورئانە نیە کە کەلامی الله یە، بەڵکو حیکایەتە بۆ ئەو قورئانە بە لەفزی ئێمە، وە لەفزی ئێمەش بە قورئان مەخلوقە) جا کوفرەکەیان وورد و شاراوە کرد، وە فێڵیان کرد بۆ ئەوەی کوفر بخەنە ناو خەڵکیەوە بە نارِوونترین ڕێگا و ووردترین مەزهەب و شاراوەترین جۆر، بەڵام بە حەمد و منەت و چاکی تەوفیق دانی الله ئەم کوفرە شاراوە نەبوو بۆ زانایە گەورە و ڕەخنەگرە عاقڵەکان، قیناعیان لابرد لەسەر ئەو کوفرە ناشرینەی کە شاردبوویانەوە، جا کوفریان دەرکەوت بۆ زانایان و خەڵکی عەوامیش، وە ئەو کەسەی کە ئەمەی زانی و هەستی پێکرد و ناشرینیەکەی ووتەکەیانی زانی شێخی صالح و پێشەوای زانا و عاقڵ باوکی عبدالله بوو احمد بن محمد بن حنبل رحمه الله، وە ڕوونکردنەوەی کوفرەکەیان ڕوون و ئاشکرایە لە کتێبی الله عز وجل و سوننەتی پێغەمبەرەکەی محمد صلى الله عليه وسلم، قورئان و سوننەت بە درۆی خستوونەتەوە بە حەمدی الله، الله عز وجل فەرموویەتی: {وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ} [التوبة: ٦]، نەیفەرموو: (حتى يسمع حكاية كلام الله)، وە الله تعالى فەرموویەتی: {وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِتُوا} [الأعراف: ٢٠٤]، الله هەواڵیدا کە گوێگر گوێ لە قورئان ئەگرێ، نەیفەرموو: گوێ لە حیکایەتی قورئان ئەگرێ، وە الله تعالى فەرموویەتی: {وَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ حِجَابًا مَسْتُورًا} [الإسراء: ٤٥]، وە الله عز وجل فەرموویەتی: {وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ} [الأحقاف: ٢٩]، وە

الله تعالى فەرموویەتی: {قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ} [الجن: ٢]، وە نەیفەرموو: (إنا سمعنا حكاية قرآن عجيب) ئێمە حیکایەتی قورئانێکی سەیرمان بیست، وە الله تعالى فەرموویەتی: {فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ}، وە الله تعالى فەرموویەتی: {وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِي الْقُرْآنِ وَحْدَهُ} [الإسراء: ٤٦]، وە الله تعالى فەرموویەتی: {وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ} [الإسراء: ٨٢]، وە نەیفەرموو: ئێمە لە حیکایەتی قوڕئان دائەبەزێنین.

(ئینجا دوای هێنانی بەڵگە لە فەرموودەوە کە ئەمەی لەسەر زەوییە قورئانە نەک حیکایەتی قورئان بێت) پاشان ابن بطة ئەڵێ:

ئەم بەڵگانە و هاوشێوەکانیان لە قورئان و سوننەت و ووتەی هاوەڵان و تابعين و فوقەهای موسڵمانان بەڵگەیە بۆ کەسی عاقڵ لەسەر درۆی ئەم کۆمەڵەیە لە جەهمیەکان ئەوانەی کە فێڵیان کرد و وورد بوونەوە لە ووتنی: قورئان مەخلوقە.

**بڕوانە (الإبانة الكبرى : ٢٢٢٨)**

تێبگە رحمك الله بزانە کە لەفزییەکان کێن، ئەوانەن کە بروایان وایە ئەوەی لەسەر زەوییە کەلامی الله نیە و مەخلوقە، حیکایەتە یان عیبارەتە لە کەلامی الله، هەر کەسێک لە حیکایەت و عیبارەت تێبگات باش ئەزانێت ابن بطة باسی چی و کێ ئەکات، ئەوانەی ئەڵێن قورئان حیکایەتی کەلامی الله یە، کوللابیەکانن کە عبدالله بن سعيد بن كلاب (نزیکەی ٢٤٠ هـ) پێشەوایانە، بروای وایە الله تعالى قسەی نەکردووە بە

قورئان بە حەرف و بە صەوت، بەڵکو الله تعالى کەلامی نەفسی هەیە بەبێ پیت و دەنگە، کە ئەڵێ: قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، مەبەستی لە کەلامی نەفسی الله یە کە بێ دەنگ و بێ حەرفە، بەڵام ئەوەی کە جبریل هێناویەتی بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەمەیان مەخلوقە و حیکایەتە لە کەلامی نەفسی الله، مرۆڤەکان بە لەفزی خۆیان دەری ئەبڕن بەشێوەی دەنگ و پیت، بۆیە کە ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوقە مەبەستیان ئەوە نیە فعلی عەبد لە دەنگی و زمان و قورگی مەخلوقە بەڵام قورئانەکە کە ئەخوێندرێ غەیر مەخلوق بێت، بەڵکو مەبەستیان ئەوەیە ئەو قورئانەی لە ئاسمانە کەلامی نەفسی الله یە بێ دەنگ و بێ پیتە و مەخلوق نیە چونکە الله قسە ناکات بە دەنگ و بە پیت، وە ئەو قورئانەی کە لەسەر زەوییە حیکایەتی کەلامە نەفسیەکەی الله یە کە مرۆڤەکان بە لەفزی خۆیان دەری ئەبڕن و مەخلوقە، أبو الحسن الأشعري (٣٣٦ هـ) هەمان مەزهەبی کوللابی هەیە دەربارەی قورئان بەڵام لەجیاتی حیکایەت عیبارەت بەکاردێنێ، ئەڵێ قورئانی سەر زەوی عیبارەتە لە کەلامی الله، هەمان مەزهەبی کوللابی هەیە، ابن بطة-ش ناڵێ ئەمە دواتر روویدا لە سەردەمی دوای احمد، بەڵکو ئەڵێ احمد کوفرەکەی ئەوانی زانی و ئاشکرای کرد، واتا باسی ابن کلاب و جەماعەتەکەی ئەکات نەک ابو الحسن الاشعري و ئەوانەی دوای احمد، ئەمەیە مەزهەبی لەفزییەکان ئەڵێن: قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، واتای قسەکەیان ئەمەیە: الله بە دەنگ و بە پیت قسەی نەکردووە بە قورئان، بەڵکو کەلامی نەفسی هەیە کە ئەمەش تەعتیل کردنی سیفەتی کەلامە بۆ الله، جا ئەم کەلامە نەفسیە لەلایان غەیر مەخلوقە، کە ئەڵێن قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە مەبەستیان ئەمەیە، ئەی گەر الله بە پیت و بە

دەنگ قسەی نەکردووە بە قورئان کەواتە ئەم ئایەتانە چین کە هەمووی پیتن و بە دەنگ ئەخوێندرێنەوە ؟ ئەوکات ئەڵێن: لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، واتا ئەو قورئانەی لە زەوی هەیە ئێمە بە لەفزی خۆمان دەری ئەبرین بە پیت و بە دەنگ حیکایەتە بۆ کەلامە نەفسیەکەی الله، ئەگینا کەلامی الله نە پیتی تیایە نە دەنگ، بۆیە قورئانی سەر زەوی مەخلوقە و لەفزی ئینسانە، قورئانەکەی ئاسمان غەیر مەخلوقە و کەلامی نەفسی الله یە، هەروەک چۆن کەسێک لاڵە ناتوانێ قسە بکات کەسێک لێی حاڵی ئەبێت و قسەکانی ناخی ئەو ئەکات، پەنا بە الله عەقیدەی ئەوانیش دەربارەی قورئان هەمان شتە، الله قسە ناکات بە دەنگ و بە پیت، لە زمانی عەرەبیش کەلام بریتیە لە دەنگ و پیت هەر شتێک ئەم دووانەی تیا نەبوو کەلام نیە، جا کوللابی و ئەشعەری ئەم سیفەتە پەک ئەخەن لە ڕاستیدا بەڵام بە درۆ ئەڵێن ئیسباتی سیفەتی کەلام ئەکەین بۆ الله کە مەبەستیان کەلامی نەفسیە، بۆ مەعلوماتیش بوخاری ئەمانە تەکفیر ئەکات کە ئەمە عەقیدەیانە وەک ئەوەی ابن بطة باسیکرد، کە ئەمانە بوون یەکەمجار ووتیان لەفزمان مەخلوقە بە قورئان، وە مەبەستیان لەمە ئەوە بوو کە قورئانی سەر زەوی حیکایەتە لە کەلامی نەفسی الله

**ابو الحسن الاشعري** ئەڵێ:

فأما عبدالله بن كلاب فالقراءة عنده غير المقروء، والمقروء قائم بالله.

**(مقالات الإسلاميين : ٤٣١/٢)**

والمقروء قائم بالله: مەبەستی لەوەیە کە باسمان کرد، بەڵام کەسانێک کە لەم موصطەلەحانە تێناگەن ئەمە ئەچوێنن بەهەمان ووتەکەی بوخاری، ئەڵێن ئەوەتا ابن کلاب ووتی: قیرائە جیایە لە مەقروء، قیرائە مەخلوقە و مەقروء کەلامی الله یە مەخلوق نیە!

حسن بن محمد العطار الأشعري ئەڵێ:

هذه الألفاظ دالة على الصفة النفسية القديمة، فالدال حادث والمدلول قديم، وهذا المدلول هو المراد بقولهم المقروء قديم.

واتای ووتەکەی:

ئەم لەفزانە دەلالەت ئەکەن لە سیفەتی نەفسی کە قەدیمە، جا ئەوەی دەلالەتی لێئەکات مەخلوقە و ئەوەی دەلالەتی لێئەکرێ مەخلوق نیە، وە کە ئەڵێن (المقروء قديم) مەبەستیان ئەو شتەیە کە دەلالەتی لێئەکرێ.

**(حاشية العطار على شرح المحلي على جمع الجوامع : ٤٦٠/٢)**

ابن تيمية ئەڵێ:

وصار ابن كلاب يريد بالتلاوة القرآن العربي، وبالمتلو المعنى القائم بالذات، وهؤلاء إذا قالوا: التلاوة غير المتلو وهي مخلوقة: كان مرادهم أن الله لم يتكلم بالقرآن العربي، بل عندهم أن القرآن العربي مخلوق.

واتای ووتەکەی:

ابن كلاب مەبەستی لە تیلاوە قورئانی عەرەبی بوو (واتا ئەوەی سەر زەوی) وە مەبەستی لە مەتلو ئەوە بوو کە مانایەکە لە زاتی الله دا (واتا بێ دەنگ و بێ پیت) جا ئەمانە کە ووتیان: تیلاوە جیایە لە مەتلو، وە تیلاوە مەخلوقە، مەبەستیان ئەوەیە کە الله قسەی نەکردووە بە قورئانی عەرەبی، بەڵکو لەلای ئەوان قورئانی عەرەبی مەخلوقە.

**(مجموع الفتاوى : ٣٧٤/١٢)**

ابن تيمية ئەڵێ:

لما ظهر القول بأن القرآن كلام الله غير مخلوق، وأطفأ الله نار الجهمية المعطلة، صارت طائفة يقولون: إن كلام الله الذي أنزله مخلوق، ويعبرون عن ذلك باللفظ، فصاروا يقولون: ألفاظنا بالقرآن مخلوقة، أو تلاوتنا أو قراءتنا مخلوقة، وليس مقصودهم مجرد كلامهم وحركاتهم، بل يدخلون في كلامهم نفس كلام الله الذي نقرأ بأصواتنا وحركاتنا.

واتای ووتەکەی:

کاتێک ووتنی (قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە) دەرکەوت و زاڵ بوو، وە ئاگری جەهمیە پەکخەرەکانی سیفات کوژایەوە، کۆمەڵەیەک پەیدا بوون ئەیان ووت: ئەو کەلامەی کە الله دایبەزاندووە مەخلوقە، جا بە لەفز تەعبیریان لەم وتەیە ئەکرد، جا ئەیان ووت: لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، یان تیلاوەمان یان قیرائەمان مەخلوقە، وە مەبەستیان تەنها کەلامی خۆیان و دەنگی خۆیان نەبوو، بەڵکو خودی کەلامی الله کە بە دەنگەکانمان و جوڵەکانمان ئەیخوێنین ئەیانخستە ناو کەلامی خۆیان.

**(مجموع الفتاوی : ٦٥٥/٧)**

گەر ئەڵێن ووتەی ابن تیمیة و ئەمانە قبوڵ ناکەین ئەوا ووتەکەی ابن بطة بەسە بۆتان، کە ووتی لەفزیەکان بروایان وایە ئەو قورئانەی سەر زەوی حیکایەتە بۆ قورئان، واتا حیکایەتە لە کەلامی نەفسی الله، وە دووبارەی ئەکەمەوە کەسێک تۆزێک شارەزای مەزهەبی کوللابی و ئەشعەری بێت ئەزانێت کە حیکایەت و عیبارەت مانای چیە، وە ئەگەر لەبەر درێژ بوونەوە نەبوایە دەیان بەڵگەم دائەنا بۆ ئەمە کە ابن کلاب مەبەستی چیە لە حیکایەت، وە ئەگەر هەر کەسێک توانی بیسەلمێنێت ووشەی (حیکایەت) کە ابن بطة باسیکرد و دایە پاڵ لەفزیەکان، ئەو مانایەی نیە کە من باسم کرد، ئەوا وەعد بێت دەست بەجێ کەناڵەکەم ئەسڕمەوە.

---

ماویە

# بەشێک

## بۆ تێگەیشتن لەم موستەلەحانە (کەلامی نەفسی ، حیکایەت ، عیبارەت)

لەلای کوللابی و ئەشعەری قورئان کەلامی نەفسی الله یە، کەلامی نەفسی واتا چی ؟

واتا الله قسەی نەکردووە بە قورئان بە پیت و بە دەنگ، واتا ئەم پیتانەی لە قورئان هەیە کە دەنگن ئەمانە بە لەفزی ئێمە ئەبن بە پیت و بە دەنگ ئەگینا الله نە بە پیت قسە ئەکات نە بە دەنگ، بۆیە ئەڵێن ئەو قورئانەی سەر زەوی حیکایەتە یان عیبارەتە لە قورئانەکەی ئاسمان، هەر بۆیەش ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، واتا قورئان کە کەلامی نەفسی الله یە نە دەنگە نە پیتە، ئێمە بە لەفزی خۆمان بە دەنگ و بە پیت دەری ئەبڕین، لە نەتیجەدا ئەم قورئانەی سەر زەوی مەخلوقە و کەلامی الله نیە، بەڵکو حیکایەتە یان عیبارەتە لە کەلامە نەفسیەکەی الله کە نە دەنگە نە پیتە، کاتێکیش کە ئەڵێن قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە مەبەستیان کەلامی نەفسی الله یە.

بەڵام ئەمە بزانن: لای ئەهلی سوننە شتێک نیە بەناوی کەلامی نەفسی الله، بەڵکو الله بە پیت و بە دەنگ قسە ئەکات، ئەمە دانراوی کوللابیەکانە بۆ نەفیکردنی پیت و دەنگ لە کەلامی الله.

# اللفظية (٦)



بەڵگەیەک لە ووتەکانی پێشووی ابن بطة بە ڕوونی ئەیسەلمێنیت کە مەبەستی لە لەفزییەکان ئەوانەیە کە پێیان وایە ئەم قورئانەی سەر زەوی مەخلوقە و حیکایەتە لە قورئانەکەی ئاسمان کە کەلامی نەفسی اللە یە لەلای ئەوان، بۆیەش ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوقە واتا ئەم قورئانەی سەر زەوی بریتیە لە دەنگ و پیتی مرۆڤەکان کە تەعبیر ئەکەن لە کەلامە نەفسیەکەی اللە و حیکایەتی کەلامی نەفسی اللە ئەکەن.

ابن بطة لە ڕەددانەوەی بۆیان بەڵگەی بەم ئایەتە هێنایەوە ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحۡمَةٌ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ [الإسراء: ٨٢]

ئینجا ابن بطة ووتی: اللە نەیفەرموو ئێمە حیکایەتی قورئان دائەبەزێنین.

واتا لەفزییەکان ئەڵێن: ئەمەی سەر زەوی قورئانە غەیر مەخلوقەکە نیە کە کەلامی نەفسی الله یە، بەڵکو مەخلوقە و حیکایەتە بۆ قورئانە غەیر مەخلوقەکەی ئاسمان، جا ابن بطة بەم ئایەتە رەدیان ئەداتەوە ئەڵێ ئەمەی دابەزیوەتە سەر زەوی قورئانە و کەلامی الله یە (وننزل من القرآن) نەک حیکایەت بێت بۆ کەلامی نەفسی الله ئێمە بە لەفزمان دەری ببڕین و بیکەین بە پیت و بە دەنگ.

گەر بێتو لەفزییەکان ئیسباتی ئەوەیان کردبوایە کە ئەم قورئانەی سەر زەوی کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، ئەوا ابن بطة بە دابەزینی قورئان بەڵگەی نەئەهێنایەوە لە دژیان.

ابو الحسن الاشعري باسی مەزهەبی ابن کلاب ئەکات کە بڕوای وایە کەلامی الله بێ دەنگ و بێ پیتە، ئەڵێ:

قال عبدالله بن كلاب أن الله سبحانه لم يزل متكلماً وأن كلام الله سبحانه صفة له قائمة به وأنه قديم بكلامه وأن كلامه قائم به كما أن العلم قائم به والقدرة قائمة به وهو قديم بعلمه وقدرته، **وأن الكلام ليس بحروف ولا صوت.**

**(مقالات الإسلاميين : ٤٢١/٢)**

وە هەر **ابو الحسن الاشعري** ئەڵێ:

عبدالله بن كلاب بڕوای وایە ئەوەی ئێمە كە لە قورئان خوێنانی ئەبیستین كە ئەیخوێننەوە عیبارەتە لە كەلامی الله عز وجل، وە مانای فەرمایشتی الله: ﴿فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٦]، ماناكەی ئەمەیە: (حتى يفهم كلام الله) تاكو لە كەلامی الله تێئەگات.

ابو الحسن ئەڵێ: وە دەكرێ بە گوێرەی مەزهەبەكەی ئەو ماناكەی ئەمە بێت: (حتى يسمع التالين يتلونه) تاكو ئەبیستێ خوێنەران ئەیخوێننەوە.

**بڕوانە (مقالات الإسلاميين : ٤٢٢/٢)**

ئیمام احمد كە باسی لەفزییەكان ئەكرا لەلای زۆربەی جار بەم ئایەتەی سورەتی التوبة ڕەددی ئەدانەوە (حتى يسمع كلام الله) واتا ئەو قورئانەی لەسەر زەوییە كەلامی الله یە كە مرۆڤەكان ئەیخوێننەوە و ئەینوسن و حفزی ئەكەن و گوێ بیستی ئەبن، نەک حیكایەت و عیبارەت بێ لە كەلامی الله، جا بڕوانە ابو الحسن ووتی كە ابن كلاب ئەم ئایەتەی تەئویل كرد، ووتی مانای كەلامی الله ئەبیستێ نەک كەلامی الله ببیستێ، چونكە لای ئەو كەلامی الله دەنگ و پیت نیە تا بیستراو بێت، تەنانەت ابو الحسن ووتی: ئەكرێ بە گوێرەی مەزهەبەكەی ابن كلاب ماناكەی ئەمە بێت: تاكو ئەبیستێ خوێنەران ئەیخوێننەوە، واتا ئەمە كەلامی الله نیە بەڵكو لەفزی خوێنەرانە كە كەلامی نەفسی الله دەرئەبڕن، یان مانای كەلامی نەفسی الله یە كە خوێنەران دەری ئەبڕن.

**ابو نصر السجزي** ئەڵێ:

ابن كلاب و ئەوانەی هاوڕای بوون و ابو الحسن الاشعري و جگە لەوانیش ووتیان: قورئان مەخلوق نیە، وە هەر کەسێک بڵێ قورئان مەخلوقە ئەوا کافرە، بەڵام الله قسە ناکات بە عەرەبی و بە هیچ زمانێکی تر، نەزم و تەئلیف و بەدوای یەک هاتن لە کەلامی الله دا نیە، وە کەلامی الله پیت و دەنگ نیە.

**(رسالة إلى أهل زبيد في الرد على من أنكر الحرف والصوت : ١٥٤)**

سەیرکە ابن كلاب و جەماعەتەکەی هەروەک الكرابيسي و احمد الشراك وتوویانە قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە ئەوەی بڵێ قورئان مەخلوقە کافرە.

بەڵام مەبەستیان ئەوە بووە ئەو قورئانەی کە لە ئاسمانە کەلامی نەفسی الله یە ئەویان مەخلوق نیە ئەوەی بڵێ مەخلوقە کافرە، بەڵام ئەو قورئانەی سەر زەوی حیکایەت و عیبارەتە لە کەلامە نەفسیەکەی الله و مەخلوقە چونکە ئێمە بە لەفزی خۆمان ئەیکەین بە حەرف و بە صەوت، بۆیەش ئەیان ووت: لەفزمان بە قورئان مەخلوقە.

**عبدالله** ئەڵێ:

پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی ئەو کەسەی کە ئەڵێ: لەفزم بە قورئان مەخلوقە ؟

ووتی: الله تعالی فەرموویەتی: ﴿وَإِنۡ أَحَدٌ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٦].

**(السنة للخلال : ٢٠٧٠)**

ئەمە ئەو ئایەتە بوو کە ابن کلاب تەئویلی ئەکرد ئەیووت کەلامی الله نابیستن واتا ئەم قورئانە کەلامی الله نیە بەڵکو لەفزی بەندەکانە و مەخلوقە.

**الحسن بن البزار** ئەڵێ:

بە باوکی عبدالله ووترا: لوین بەڵگەی هێناوەتە لە دژی لەفزییەکان بە ئایەتی: ﴿وَإِنۡ أَحَدٌ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٦]، باوکی عبدالله ووتی: ئایا ئەمە ئەبێت جگە لە دونیادا ؟! لە کێ کەلامی الله ئەبیستێ ؟!

وە ووتی: لوین وەڵامێکی زۆر بەهێزی داوەتەوە بەم ئایەتە.

**(السنة للخلال : ٢٠٩٢)**

بروانە ووتەکەی ئیمام احمد دەربارەی ئایەتەکە کە ووتی: (ئایا ئەمە ئەبێت جگە لە دونیادا) ؟!

واتا الله تعالى ئەفەرمووێ تاکو موشریکەکان کەلامی الله ئەبیستن، موشریکەکان لە کوێ کەلامی الله ئەبیستن ؟ لە دونیا نایبیستن ؟ بەکار هێنانی ووشەی (دونیا) لێرەدا مەبەست پێی ڕەددانەوەی ووتەکەیان کە پێیان وایە ئەو قورئانەی لە دونیادا هەیە کەلامی الله نیە، بەڵکو قورئانەکەی ئاسمان کەلامی الله یە، پاشان ووتی لە کێ ئەبیستێ ؟ ئایا هەر لە مرۆڤی نابیستێ ؟ لە پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم نایبیستێ ؟ ئەمەش ڕەددە بۆیان کە پێیان وایە ئەوەی لە دەمی مرۆڤ دەرئەچێ کەلامی الله نیە بەڵکو حیکایەت و عیبارەتە لە کەلامی الله

***یعقوب بن ابراهیم الدورقي*** ئەڵێ:

بە احمد بن حنبل-م ووت: چی ئەڵێی دەربارەی ئەو کەسەی کە پێی وایە لەفزی بە قورئان مەخلوقە ؟

ووتی: ئەمانە لەلای من خراپترن لە جەهمیەکان، هەر کەسێک ئەمە بروای بێت ئەوا بروای وایە کە پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم قسەی کردووە بە شتێکی مەخلوق، وە جبریل شتێکی مەخلوقی هێناوە بۆ پێغەمبەرەکەمان، ئەمانە لەلای من خراپترن لە جەهمیەکان، قسە لەگەڵ ئەمانە مەکە، وە قسە لە هیچ شتێکی ئەم بابەتە مەکە، قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە لە هەموو ڕوویێکەوە، بەهەر جۆرێک بێت، لەسەر هەر حاڵێک بێت، هەرگیز نابێتە مەخلوق، الله تبارك وتعالى فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٦]، نەیفەرموو: (حتى یسمع کلامك یا محمد) تاکو ووتەی تۆ ئەبیستێ ئەی محمد، وە

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لا يصلح في الصلاة شيء من كلام الناس) نابێت هیچ قسەیەکی خەڵک لە نوێژدا بووترێ، وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (حتى أبلغ كلام ربي) تاکو کەلامی پەروەردگارم ئەگەیەنم.

ئەمە ووتەی جەهمە (واتا لەفزم بە قورئان مەخلوقە) ئەوەی ئەم ووتەیەی هێناوە غەزەبی الله-ی لەسەر بێت.

الدورقي ئەڵێ ووتم: ئەمانە لە دەوری ئەوە ئەخولێنەوە کە پەکی سیفەتی کەلام بکەن؟

ووتی: بەڵێ، لەعنەتی الله لەسەریان بێت.

**(السنة للخلال : ٢٠٧٢)**

بە هێمنی و تێگەیشتنەوە بروانە ووتەکانی، سەیرکە بزانە بەڵگە بە چ ئایەت و فەرموودەیەک ئەهێنێتەوە، بەمە تێئەگەیت کە لایەنی بەرامبەر چ عەقیدەیەکی هەبووە، ئاخر کەسێک بڵێ: قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، الله بە پیت و بە دەنگ قسەی پێکردووە، بەڵام فعلی عەبد مەخلوقە لە دەم و زمان جوڵاندن، بەڵام ئەو کەلامەی لە دەمی دێتە دەرەوە کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، گەر ئەمە عەقیدەی لەفزیەکان بوایە کە زۆرینەی ئاوا حاڵی بوونە بەداخەوە، ئەی بۆچی ئیمام احمد بەم ئایەت و فەرموودانە بەڵگەیان لە دژ دێنێتەوە ؟ کە خودی بوخاری بەم دوو فەرموودەیە بەڵگە ئەهێنێتەوە، وە ئەڵێ ئەوەی پێی وابێت ئەوەی لە ناو سینە و پەڕاوەکاندا هەیە کەلامی الله نیە ئەوا کافرە، سەیری بەڵگەکانی ئیمام احمد بکە هەمووی باسی ئەوە ئەکات کە ئەم قورئانە کەلامی الله یە، چونکە لایەنی بەرامبەر

پێیان وابوو ئەم قورئانەی سەر زەوی کەلامی الله نیە، بروانە ئەڵێ الله فەرمووی حتی یسمع كلام الله، نەیفەرموو حتی یسمع كلامك یا محمد، چونکە لایەنی بەرامبەر پێیان وابوو ئەو قورئانەی کە هەیە لە زەوی کەلامی الله نیە بەڵکو لەفزی بەندەکانە و حیکایەتە لە کەلامی نەفسی الله، ئایا کەسێک بڕوای وابێت کە قورئانی سەر زەوی کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، ئەوەی پێی وابێت مەخلوقە کافرە، بەڵام فعلی عەبد مەخلوقە لە دەم جوڵاندن و زمان و قورگی، ئایا کەسێک ئەمە عەقیدەی بێت ئیمام احمد ئەڵێ ئەمە هەمان ووتەی جەهمە ؟ ئایا ئەڵێ ئەمانە خراپترن لە جەهمیەکان ؟ لەکاتێکدا هیچ کام لە سەلەف خیلافیان لەوە نیە کە فعلی عەبد مەخلوقە، یەعنی ئیمام احمد تەکفیریان ئەکات و لە جەهمیەکان بە خراپتریان ئەزانێ و ئەڵێ ئەمانە ئەیانەوێ تەعتیلی کەلام بکەن ؟ لە کاتێکدا هەمان بیروباوەری احمدیان هەیە دەربارەی قورئان بەڵام بە لەفزێکی تر دەری ئەبرن، ئایا عەقیدەی جەهم هەمان عەقیدەی بوخاری بوو ؟ پێی وابوو قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، بەڵام فعلی عەبد مەخلوقە، بۆیە ئیمام احمد ئەڵێ ووتەی لەفزییەکان هەمان ووتەی جەهمە، وە خراپترن لە جەهمیەکان ؟!!

خۆ ئێمە لە سیفەتەکانی الله تعالی ئەڵێین گەر کەسێک لەفزێک بەکار بهێنیت بۆ الله کە لە قورئان و سوننەت نەبێ، گەر زانیمان مانای لەفزەکەی دروستە، ئەوا ماناکە قبوڵ ئەکەین بەڵام ئەڵێین واز لەم لەفزە داهێنراوە بهێنە، ئایا ئەو کەسانەی کە هەمان عەقیدەی احمدیان هەیە دەربارەی قورئان بەڵام بە لەفزێکی هەڵە دەری ئەبرن یان ئەچنە ناو تەفسیلێکەوە کە احمد دەری نەبریوە بەڵام هەمان مەبەستی احمدیان هەیە، هەموو ئەوانەش تەکفیر ئەکەن کە احمد تەکفیریان ئەکات، تەنها

بەم خیلافە لەفزیە احمد تەکفیریان ئەکات و ئەڵێ ئەمانە هەمان ووتەی جەهم ئەڵێنەوە و خراپترن لە جەهمیەکان ؟!!!

ئەوانەی ئەڵێن تیلاوە و قراءة مەخلوقن وە مەبەستمان پێی فعلی عەبدە لە زمان و لێو جوڵاندن و دەنگی عەبد، بەڵام المتلو والمقروء غەیر مەخلوقن و کەلامی الله یە، وە مەبەستمان پێی ئەو کەلامەیە کە لە دەمی بەندەکان دێتە دەرەوە و ئەیبیستین.

گەر هەر کەسێک پێی وایە ئەوانەی خاوەنی ئەم تەفسیلەی سەرەوەن لەفزین و تەکفیر کراون لەلای احمد، وە ووتەکەی احمد دەربارەی لەفزیەکان ئەوانیش ئەگرێتەوە، ئەمە خیلافێکی لەفزی نیە لەنێوان ئەوان و احمد، بەڵکو خیلافێکی مەعنەوییە.

ئەوا پێیان ئەڵێین فەرموون مەزهەبی احمدمان بۆ باس بکەن دەربارەی فعلی عەبد تاکو خیلافە مەعنەویەکە بزانین

ئایا احمد پێی وایە عەبد کە قورئان ئەخوێنێتەوە فعلەکەی مەخلوقە یان مەخلوق نیە ؟

گەر بڵێن احمد پێی وایە فعلی عەبد مەخلوقە، ئەوا خۆتان ئەیسەلمێنن کە خیلافی احمد لەگەڵ ئەمانە لەفزیە نەک مەعنەوی

گەر ووتتان احمد پێی وایە فعلی عەبد مەخلوق نیە، ئەوا درۆتان داوەتە پاڵی، پێتان وایە احمد موخالەفەی ئیجماعی سەلەفی کردووە کە پێیان وایە فعلی عەبد مەخلوقە

وە ئەگەر ووتتان: لەکاتی قورئان خوێندن فعلی عەبد هەر بوونی نیە، یان ووتتان بوونی هەیە بەڵام نە مەخلوقە و نە غەیر مەخلوقە، ئەوا ئەمە ووتەیەکی پوچ و باتلە کەسی عاقڵ نایکات

وە ئەگەر ووتتان فعلی عەبد بوونی هەیە لە خوێندنەوەی قورئان بەڵام احمد باسی ئەوە ناکات فعلی عەبد لەکاتی قورئان خوێندنەوە مەخلوقە یان نا، بەڵکو بە لەفزێکی تر دەری ئەبرێ تا نەبێتە پرد بۆ هیچ بیدعەچیەک بیدعەکەی پێ سەربخات، احمد ئەڵێ قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە لە هەموو بار و حاڵێکدا، وە بروای وایە وەکو هەموو ئەهلی سوننەیەک کە فعلی عەبد مەخلوقە، ئەوا دانتان پێناوە بەوەی کە ووتم خیلافی احمد لەگەڵ ئەمانەی باسم کردن کە تەفسیلیان داوە بە تیلاوە و مەتلو، وە قیرائە و مەقروء خیلافێکی لەفزییە نەک مەعنەوی

وە بێگومان دەست گرتن بە ئەلفازی ئەهلی سوننە و دوور بوون لە کەلامێک کە لە قورئان و سوننەت و ئاساری سەلەف نەهاتووە ئەولاترە و سەلامەترە، بەڵام تۆ بەمە زانایانی ئەهلی سوننە تەکفیر بکەیت ئەمە کارەساتە

**ابن أبي حاتم** ئەڵێ:

پرسیار لە أبو زرعة کرا دەربارەی فعلی بەندەکان ؟

ووتی: مەخلوقە

پێی ووترا: لەفزمان بە قورئان لە فعلی ئێمەیە.

ووتی: ئەمە ناووترێ.

**(شرح أصول اعتقاد للالكائي : ٥٩٧)**

ئایا پێتان وایە ابو زرعة پێی وایە فعلی عەبد نە مەخلوقە و نە غەیر مەخلوقیشە کاتێک قورئان ئەخوێنێتەوە ؟ یان ئەزانێ ووشەی (لەفز) ئەگەڕێتەوە بۆ قورئان و بۆ فعلی عەبدیش، بۆیە نابێ بووترێ لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، وە ئەزانی جەهمیەکان ئەم رستەیە (لەفزمان بە قورئان مەخلوقە) بەکارئەهێنن بە مەبەستی قورئان مەخلوقە، جا چۆن لەفزێکی دانراو بەکاربێنن کە لە ئەسلدا کافران دایان هێناوە بە مەبەستی قورئان مەخلوقە ؟ بۆیە نەهی کردووە لە بەکارهێنانی ئەم لەفزە.

---

ماویەتی

# اللفظية (٧)



﴿وَإِنۡ أَحَدٌ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٦]

كە ئەڵێین ئەوەی ئێمە ئەیبیستین لە قورئان بریتیە لە کەلامی الله و غەیر مەخلوقە، مانای ئەوە نیە ئێمە خودی دەنگی الله تعالى ئەبیستین، چونکە گەر بڵێین خودی دەنگی الله ئەبیستین لە قورئان خوێن، واتا ئێمە و موسى عليه السلام هیچ جیاوازیمان نیە لەو فەزیلەتەی کە بە موسى عليه السلام دراوە کە الله قسەی لەگەڵ کرد ڕاستەوخۆ کەلامی الله-ی بیست بەبێ واسطة، بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نیە کە وەک کوللابیەکان بڵێین ئەوەی ئەیبیستین و ئەیخوێنین کەلامی الله نیە، چونکە لە زماندا کەلام ئەدرێتە پاڵ ئەو کەسەی کە یەکەم جار قسەی پێکردووە نەک بدرێتە پاڵ ئەو کەسەی کە نەقلی کەلامەکە ئەکات و ئەیگەیەنێت.

بۆ نموونە: من پەیامێک بۆ ئێوە ئەنێرم بە لە ڕێگای کەسێکەوە بەناوی ابراهیم، ئێوە کە پەیامەکەی منتان پێئەگات ڕاستە لە دەمی ابراهیمەوە ئەیبیستن بەڵام هەمووتان ئەڵێن ئەمە کەلامی هودە، کەستان ناڵێن ئەمە کەلامی ابراهیمە، چونکە کەلام ئەدرێتە پاڵ ئەو کەسەی کە خاوەنی کەلامەکەیە نەک ئەو کەسەی کە ئەیگەیەنێت، بۆیە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە هۆزەکانی ئەفەرموو: کێ داڵدەم ئەدات تاکو

کەلامی پەروەردگارم بگەیەنم، ئەمە لە هەموو زمانێکدا وایە نەک تەنها زمانی عەرەبی، کەلام ئەدرێتە پاڵ ئەو کەسەی کە خاوەنی کەلامەکەیە نەک ئەوەی کە ئەیگەیەنێت، بۆیە کاتێک بێژەر کە هەواڵ ئەخوێنێتەوە ئەڵێ فلان کەس وای ووت، هەموو خەڵکی ئەڵێن فلان کەس وای ووت و ئەمە قسەکانیەتی، کەسیان ناڵێن ئەمە قسەی بێژەرەکەیە ئەگەرچی دەنگی خاوەن ووتەکەیان نەبیستبێ و لە دەمی بێژەرەکە و بە دەنگی بێژەرەکە کەلامەکە ببیستن.

هەر بۆیە کاتێک باسی لەفزییەکان ئەکرا لەلای ئیمام احمد زۆربەی جار بەم ئایەتە ڕەددی ئەدانەوە، چونکە ئەوان پێیان وابوو ئەوەی لەناو موسحەف دایە و ئەیخوێنین و ئەیبیستین کەلامی اللە نیە بەڵکو لەفزی بەندەکانە و تەعبیر و حیکایەتە لە کەلامی نەفسی اللە کە نە دەنگە و نە پیتە.

هەر بۆیەش ابن کلاب ئەم ئایەتەی تەئویل کرد، باقی ئەشعەریەکانیش تەئویلی ئەکەن، کە دێتە سەر ئایەتەکانی قسە کردنی اللە لەگەڵ موسی علیە السلام کە موسی کەلامی اللە-ی بیست هەروەک لە چەند شوێنی قورئان بە ڕوونی باسکراوە، کوللابی و ئەشعەری ئەڵێن موسی کەلامی اللە-ی بیست، ئاوا بە موجمەلی وائەزانیت ئیسباتی ئەوە ئەکەن کە اللە بە دەنگ و پیت قسەی کردووە و موسی بیستوویەتی، بەڵام کە ئەچنە ناو تەفاسیل بۆت دەرئەکەوێ تەعتیلی دەنگ و پیت ئەکەن لە کەلامی اللە، کەسێک کە بڵێ کەلامی اللە نە دەنگی هەیە و نە پیتە چۆن ئیسباتی ئەوە ئەکات کە موسی کەلامی اللە-ی بیستووە ؟!

ئەڵێن الله تعالى بە موعجیزە وایکرد کە موسی کەلامەکەی ببیستێ یان ئەڵێن لە دارەکە کەلامی دروست کرد و موسی بیستی، یان ئەڵێین وای لێکرد موسی تێبگات لە کەلامەکەی بەبێ بیستنی دەنگ.

سەبارەت بە قورئانیش کە ئەڵێن کەلامی نەفسی الله یە و دەنگ و پیت نیە

ئەی ئەو کەلامەی کە لەناو موسحەف دایە چیە ؟

ئەڵێن الله لە لوح المحفوظ دروستی کرد و جبریل وەری گرت، یان الله وایکرد کە جبریل لە کەلامە نەفسیەکەی الله تێبگات، یان ئەم لەفزانەی قورئانی لە جبریلدا دروست کرد و خستیە ناو جبریلەوە ئەویش گەیاندی بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، یان ئەڵێن لە هەوادا لەفزەکانی دروست کرد، یان ئەڵێن الله لە پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم لەفزەکەی دروست کرد

جا ئایا یەکەم کەس کێ بوو قورئانی دەربڕی بە دەنگ و بە پیتەوە لای ئەوان ؟

بێگومان مەخلوقات بوو دەریان بڕی نەک الله، جبریل و محمد بوون صلى الله عليه وسلم، ئێمەش بە هەمان شێوە، کەواتە ئەو کەلامەی کە هەیە لە قورئاندا کە بریتیە لە پیت و دەنگ الله دەری نەبڕیوە بە پیت و بە دەنگ، بەڵکو مەخلوقات دەریان بڕیوە بە پیت و بە دەنگ، بۆیەش ئەڵێن لەفزمان بە قوڕئان مەخلوقە، ئێمە لەفزەکە

دەرئەبڕین کە حیکایەتی کەلامە نەفسیەکەی الله یە، لەفزەکەش الله دروستی کردووە قسەی پێنەکردووە چونکە کەلامی ئەو پیت و دەنگ نیە.

هەر بۆیەش ئیمام احمد زۆر بەبێ دوو دڵی و بیرکردنەوە کە کەلامەکەیان ئەبیستێ ڕێک ئەڵێ ئەمانە جەهمین و کافرن، هەمان ووتەی جەهم ئەڵێنەوە، ئەگینا کەسێک هەمان عەقیدەی ئیمام احمدی هەبێ دەربارەی قورئان تەنها بڵێ فعلی من مەخلوقە، ئیمام احمد چۆن حوکمێکی ئاوا قورس ئەدات بەسەریدا ؟!

لە پۆستەکانی داهاتوو ان شاء الله دەرئەکەوێ کە ئەوانەی ئەڵێن ئیمام احمد مەبەستی لە لەفزییەکان ئەوانە بووە کە ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوقە لە دەم جوڵاندی و دەنگی کە چەندە ئیمام احمدیان ناشرین کردووە، وای نیشان ئەدەن کە کەسێکە هەر لە باسەکە حاڵی نەبووە و بەس وتوویەتی کافرن و هەر نەیزانیوە عەقیدەی بەرامبەر چۆنە، گەر بێتو تێبگەن لە بابەتەکە ئەوکات ئەزانن چەندە ئیمام احمدیان ناشرین کردووە.

---

ماویەتی

# اللفظية (٨)



ابن أبي الخير العمراني ئەڵێ:

کوللابی و ئەشعەریەکان ووتیان: ئەو کەلامەی الله کە مەخلوق نیە بریتیە لە مانایەک لە زاتی الله دا، لە زاتی الله جیا نابێتەوە، بەڵام ئەم قورئانەی کە ئەخوێندرێتەوە و ئەبیسترێ عیبارەت و حیکایەتە لە کەلامی نەفسی الله، وە ئەشعەریەکان موافقی موعتەزیلەن لەوەی کە ئەم قورئانەی ئەخوێندرێتەوە و ئەبیسترێ مەخلوقە.

**(الانتصار في الرد على المعتزلة القدرية : ٥٤٤/٢)**

هەر ابن أبي الخير العمراني ئەڵێ:

لەلای ئەشعەریەکان قورئانی عەرەبی مەخلوقە.

**(الانتصار في الرد على المعتزلة القدرية : ٥٥٨/٢)**

کە ئەڵێن قورئانی عەرەبی مەخلوقە، واتا الله تعالی قسە ناکات بە پیت و دەنگ، بۆیە ئەوەی کە هەیە لە موسحەفدا لە پیتە عەرەبیەکان مەخلوقن و ئێمە دەری ئەبڕین الله قسەی پێنەکردووە.

**ابن قدامة** ئەڵێ:

بڕاوامان وایە کە قورئان کەلامی الله و بریتیە لەو ١١٤ سورەتە، یەکەمیان سورەتی فاتیحەیە و کۆتاییەکەی المعوذات-ە (واتا سورەتی الفلق و الناس) وە قورئان بریتیە لە سورەت و ئایەت و پیت و ووشە، ئەخوێندرێتەوە و ئەبیسترێ و ئەنوسرێ، وە لەلای ئەشعەریەکان ئەم سورەت و ئایەتانە قورئان نین، بەڵکو عیبارەت و حیکایەتی قورئانن، وە مەخلوقن، وە قورئان بریتیە لە مانایەک لە زاتی الله دا، بریتیە لە یەک شت نابێتە بەش بەش و پارچە پارچە و ناژمێردرێ، وە شتێک نیە دابەزێنرێ و بخوێنرێ و ببیسترێ و بنوسرێ، وە هیچ شتێک لە موسحەفەکاندا نیە جگە لە حیبر و کاغەز، وە خیلافیان تێکەوت دەربارەی ئەم سورەتانە کە قورئانە، هەندێکیان پێیان وایە عیبارەتی جبریلە علیه السلام، جبریل دایهێناوە بە ئیلهامی الله تعالی بۆ جبریل، وە هەندێکی تریان پێیان وایە الله تعالی دروستی کردووە لە لوح المحفوظ جبریلیش لە لوح المحفوظ وەری گرت.

**(المناظرة في القرآن : ١٧-١٨)**

ابن تيمية ئەڵێ:

كوللابی و ئەشعەریەكان لەگەڵ جەهمی و موعتەزیلەكان هاوڕا بوون لەسەر مەخلوقی قورئان، كە جەهمی و موعتەزیلەكان ووتیان قورئان مەخلوقە، بەڵام كوللابی و ئەشعەری خیلافیان تێكەوت لە كوێ ئەم پیتانەی قورئان دروست بوون، ئایا لە هەوادا دروست بوون، یان لە جبریلدا دروست بوون، یان جبريل دروستی كرد، یان محمد ؟

**(مجموع الفتاوى : ٣٥/١٢)**

ابن تيمية ئەڵێ:

ئەوەی كوللابی و ئەشعەریەكان تێیدا موخالەفەی ئەهلی سوننەیان كرد ئەوە بوو كە ووتیان: ئەو قورئانەی كە دابەزیوەتە سەر زەوی كەلامی الله نیە، نە پیتەكانی و نە ماناكانی، بەڵكو لەلای ئەوان مەخلوقە، وە ئەڵێن عیبارەتە لە مانایەک لە زاتی الله دا.

**(مجموع الفتاوى : ٣٧٦/١٢)**

ابن القيم ئەڵێ:

مەزهەبی كوللابیەكان كە شوێنكەوتەی عبدالله بن سعيد بن كلاب-ن، قورئان مانایەكە لە زاتی الله دا پەیوست نیە بە قودرەت و مەشیئەتی الله، لازمی زاتی پەروەردگارە وەک سیفەتی حەیات و عیلم كە لازمی زاتی الله-ن (واتا كەلامیش

سیفەتێکی زاتیە فعلی نیە، الله هەرکات بیەوێ قسە ناکات)، وە نابیسترێ بە حەقیقی، وە پیتەکان و دەنگەکان بریتین لە حیکایەتی ئەم کەلامە نەفسیە و دەلالەتی لێئەکەن کە ئەویش مەخلوقە، **وە ئەو مانا قەدیمەی کە لە زاتی الله دا هەیە نابیسترێ، وە ئەو مانایە بریتیە لە المتلو و المقروء کە ئەویش مەخلوق نیە، وە دەنگەکان و پیتەکان تیلاوەی بەندەکانن کە ئەویش مەخلوقە**، وە ئەم مەزهەبە یەکەم کەس کە زانرابێ وای ووتبێ ابن کلاب بووە، وە ئەم مەزهەبەی لەسەر ئەم بنەمایە دانا کە کەلام بێگومان ئەبێ کەسی قسەکەر پێی هەڵسێ، وە پیتەکان و دەنگەکان مەخلوقن، جا ناکرێ شتێکی مەخلوق لە زاتی پەروەردگار ڕوو بدەن چونکە زاتی الله شتی مەخلوقی تێدا ڕوو نادات، جا ئەم پیت و دەنگانە مەخلوقن و جیان لە پەروەردگار، وە قورئانیش ناوی ئەم مانا نەفسیەیە کە مەخلوق نیە.

**(مختصر الصواعق المرسلة : ١٣٠٩-١٣١٠)**

ئەم ووتەیەی ابن القیم زۆر گرنگە، زۆر کەس واتێگەیشتوون کە بوخاری یان هەر کەسێک کە بڵێ: تیلاوە و قیرائە فعلی عەبدن و مەخلوقە، وە مەتلو و مەقروء کەلامی الله-ن مەخلوق نیە، ئەوا ئەم کەسانە لەفزین و سەلەف ئەو کەسانەیان بە جەهمی داناوە کە باسی جیاوازی نێوان تیلاوە و مەتلو و قیرائە و مەقروء ئەکەن، ئەڵێن ئەوەتا ابن حامد کە شێخی حەنبەلیەکان بووە لە سەردەمی خۆی ئەڵێ: هیچ خیلافێک نیە لەوەی کە ئیمام احمد ئەوانە بە زندیق ئەزانێ کە باسی التلاوة والمتلو والحكاية والمحكي ئەکەن، ئێ بوخاری و جەماعەتەکەی هاتوون هەمان شتیان کردووە جیاوازی نێوان تیلاوە و مەتلو ئەکەن، ئەڵێن تیلاوە فعلی عەبدە لە دەم جوڵاندنی و

دەنگی ئەمەش مەخلوقە، بەڵام مەتلو کەلامی الله یە کە بەندە ئەدای ئەکات ئەوەیان مەخلوق نیە، قیرائە و مەقروئیش بەهەمان شێوە، لە نەتیجە بوخاری و جەماعەتەکەی لەلای سەلەف زندیق و جەهمی و کافرن، تێناگەن لەوەی کە کوللابیەکان پێشەواکەیان لە سەردەمی ئیمام احمد ژیاوە ئەمە عەقیدەکەی بووە کە ابن القیم و زانای تریش باسیان کردووە.

سەیرکە ابن القیم ئەڵێ لای ابن کلاب کەلامی نەفسی الله کە مانایەکە لە زاتی الله دا نە دەنگە و نە پیتە ئەویان مەخلوق نیە و پێی ئەووترێ مەتلو، بەڵام ئەو قورئانەی کە لە زەوی ئەخوێندرێتەوە بە پیت و بە دەنگ بریتیە لە فعلی عەبد مەخلوقە و پێی ئەووترێ تیلاوە، ئێستا تێگەیشتی لای کوللابیەکان مەتلو و تیلاوە چیە ؟ ئێستا تێگەیشتی کە سەلەف بۆ ئەڵێن ئەوەی باسی تیلاوە و مەتلو بکات جەهمیە ؟ لای کوللابیەکان مەتلو = بە کەلامی نەفسی الله کە مانایەکە لە زاتی الله، نە پیتە و نە دەنگە، وە ئەڵێن ئەمە مەتلوە و مەخلوق نیە، وە لای ئەوان تیلاوە = بەو قورئانەی سەر زەوی کە ئەیخوێنینەوە بە دەنگ و بە پیت حیکایەتە و عیبارەتە لە کەلامە نەفسیەکەی الله، وە ئەڵێن ئەمە تیلاوەیە و مەخلوقە، واتا لای ئەوان ئەوەی لە زەویدا هەیە تەنها تیلاوەیە و مەخلوقە، مەتلو بوونی نیە لەسەر زەوی، ئەوەی لە ئاسمانە بریتیە لە مەتلو کە غەیر مەخلوقە ئەویش کەلامی نەفسی الله یە، بەڵام لای بوخاری و جەماعەتەکەی کە تەفسیلیان داوە بە تیلاوە و مەتلو، بڕوایان وایە کە مەتلو و تیلاوە هەردووکیان لە دونیادا بوونیان هەیە، کە عەبد قورئان ئەخوێنیتەوە

فعلەکەی خۆی لە دەم و زمان جوڵاندن و دەنگی مەخلوقە، ئەمە تیلاوەیە، بەڵام ئەوەی لە دەمی عەبد دێتە دەرەوە لەکاتی قورئان خوێندن بریتیە لە کەلامی اللّٰه و مەخلوق نیە، ئەمە مەتلوە، بۆ قیرائە و مەقروئیش هەمان شت، بۆ کتابە و مەکتوبیش هەمان شت.

---

ماویەتی

# اللفظية (٩)



**ابن القيم** ئەڵێ:

ئەوانەی ووتیان تیلاوە جیایە لە مەتلو دوو کۆمەڵەن:

یەکێکیان ووتیان: تیلاوە بریتیە لەو پیت و دەنگانەی کە ئەبیسترێن ئەویش مەخلوقە، ئەمەش ووتەی ئەشعەریەکانە.

وە کۆمەڵەی دووەم ووتیان: تیلاوە بریتیە لە خوێندنەوەمان و دەربڕینمان بە قورئان، وە مەتلو بریتیە لە قورئانی عەزیز ئەبیسترێ بە گوێیەکان بە ئەدا کردنی لە دەمی رسول الله صلى الله عليه وسلم کە بریتیە لە: (الٓمٓصٓ) و (كٓهيعٓصٓ) و (حمٓ) و (الٓمٓ) کە بریتین لە پیت و ووشە و ئایەت جبریل بەسەریدا خوێندوویەتیەوە، وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم خوێندوویەتیەوە بەسەر ئوممەت هەروەک ئەوەی جبریل بەسەریدا خوێندوویەتیەوە، وە جبریلش لە الله-وە گەیاندوویەتی وەک ئەوەی بیستوویەتی، ئەمەش ووتەی سەلەف و پێشەوایانی سوننەت و فەرموودەیە، ئەوان جیاکاری ئەکەن لە نێوان ئەو شتەی کە عەبد ئەنجامی داوە و ئەو شتەی کە پەروەردگار ئەنجامی داوە، لەلایان قورئان هەر هەمووی کەلامی الله یە پیتەکانی و ماناکانی، وە

دەنگی بەندەکان و جوڵەکانیان و ئەدا کردنیان و تەلەفوزیان هەمووی مەخلوقن جیانە لە زاتی اللە.

گەر ووترا: جا گەر بابەتەکە بەم جۆرەیە کە باستان کرد، ئەی چۆن ئیمام احمد ئینکاری لەو کەسە کرد کە بڵێ: (لەفزم بە قورئان مەخلوقە) وە تەبدیعی کرد و دایە پاڵ جەهمیەت ؟! وە ئایا میحنەکەی بوخاری هیچ شتێک بوو جگە لەم بابەتە ؟ تاکو ئەهلی حەدیث هەجریان کرد و دایانە پاڵ ئەوەی کە ئەڵێ قوڕئان مەخلوقە.

**بڕوانە (مختصر الصواعق المرسلة : ١٣٤٠-١٣٤١)**

ئینجا ابن القیم وەڵامی ئەم پرسیارە ئەداتەوە بە نەقل کردنی ووتەکانی بوخاری لە کتێبی خلق افعال العباد و هێنانی بەڵگەکانی بوخاری دەربارەی جیاکاری کردن لە نێوان قیرائە و مەقروء و تیلاوە و مەتلو کە تەواوی بەڵگەکانی لە قورئان و فەرموودەیە لەگەڵ هەندێک لە ئاساری سەلەف کە دەلالەت ئەکەن لە جیاکاری کردن لە نێوان قیرائە و تیلاوە و کیتابە کە فعلی عەبدن لەگەڵ مەقروء و مەتلو و مەکتوب کە کەلامی اللە-ن و مەخلوق نین، ئینجا ابن القیم باسی ئەوە ئەکات کە مەزهەبی بوخاری هەمان مەزهەبی سەلەفە لەم بابەتەدا و ئیمام احمدیش هەمان عەقیدەی هەبووە بەڵام بە هەمان لەفز دەری نەبڕیوە، وە ئەوانەی هەجری بوخاریان کرد بە هەڵە لە مەزهەبەکەی تێگەیشتن ... هتد، بڕوانە سەرچاوەکە

وە تەواوی ئەو زانایانەی کە جوملەتەن لەسەر عەقیدەی ئەهلی سوننەن کە هاتوون باسی ئەم بابەتەیان کردووە هەموویان دان بەوە ئەنێن کە ئەوەی بوخاری لەسەری بووە لەم بابەتە حەقە و مەنهەجی سەلەفە کە فعلی عەبد بوونی هەیە لە قورئان خوێندنەوە و فعلەکەی مەخلوقە بەڵام کەلامی الله کە ئەدا ئەکرێ و ئەبیسترێ و ئەنوسرێ و حفز ئەکرێ مەخلوق نیە، کەسیان نەیان ووتوە ئەوەی بوخاری باسی کردووە لەم جیاکارییە بیدعەیە یان کوفرە، تەنها ئەو حەنبەلیانە نەبێت کە ئەڵێن (لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە) کە بە هەڵە لە مەنهەجی ئیمام احمد تێگەیشتوون وائەزانن ئیمام احمد وتوویەتی لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە، ئەمانە زۆر دژی ووتەکەی بوخاری و هەر کەسێک بوونە کە باسی ئەم تەفسیلە بکات، بەڵام ئەبێ ئەوەش بزانرێ هەروەک چۆن بوخاری و ئەو پێشەوایانەی ئەهلی سوننە کە کەوتوونەتە ناو ئەم تەفسیلەوە کەسیان مەبەستیان مەخلوقی قورئان نەبووە وەکو لەفزییەکان، بەهەمان شێوە ئەو زانایانەی لە حەنبەلیەکانی خوراسان و قوتابیەکانی ئیمام احمد و تەبەقەکانی خوارووی ئیمام احمد وەک ابو طالب و ابو حاتم و السجزي و ابن مندە و ابن حامد کە وتوویانە لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە کەسیان مەبەستیان ئەوە نەبووە فعلی عەبد مەخلوق نیە و ئەو دەنگەی ئەبیسترێ لە عەبد خودی دەنگی الله یە و مەخلوق نیە، بەڵکو کە وتوویانە لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە مەبەستیان خودی قورئان بووە نەک فعلی عەبد لە خوێندنەوە و دەم جوڵاندن و دەنگی، بەڵام هەندێک لەوانەی دوای ئەمانە غلویان کرد تەنانەت ووتیان خودی دەنگەکە کە لە عەبد ئەبیسترێ دەنگی الله یە، ئەگینا هیچ کام لە ابو طالب و ابو حاتم و ابن مندە و السجزي و ابن حامد هێندە نەزان نەبوونە کە نەزانن فعلی

عەبد مەخلوقە، ئەمەش داهێنانی خۆم نیە بۆ خاتر گرتنی ئەم زانایانە، بەڵکو ئەو زانایانەی کە باسی ئەم بابەتەیان کردووە باسی ئەمەیان کردووە

کاتێک ئیمام احمد توشی ئەوانە هات کە ئەیان ووت: لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، زۆربەی ووتەکانی تایبەت بوو بە ڕەددانەوەی ئەوان، وە کاتێک بوخاری توشی ئەوانە بوو کە ئەیان ووت: لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە، زۆربەی ووتەکانی تایبەت بوو بە ڕەددانەوەی ئەوان، هەر بۆیە ئەوانەی کە ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە خۆیان ئەدەنە پاڵ ئیمام احمد، وە کوللابی و ئەشعەری کە پێیان وایە ئەو قورئانەی سەر زەوی مەخلوقە و بریتیە لە تیلاوە، وە کەلامی نەفسی الله مەخلوق نیە و بریتیە لە مەتلو، خۆیان ئەدەنە پاڵ بوخاری ئەڵێن بوخاری کە ئەڵێ تیلاوە مەخلوقە و مەتلو مەخلوق نیە هەمان مەبەستی ئێمەی هەیە.

وە بڕوانە ووتەکەی ابن القيم کە لەفزیەکانی کرد بە دوو کۆمەڵە، یەکێکیان کوللابی و ئەشعەریەکانن کە ووتەکانی ئیمام احمد و سەلەف لە تەکفیر کردنی لەفزیەکان مەبەست پێی ئەوان بووە، وە کۆمەڵەی دووەمی لەفزیەکان بوخاری و جەماعەتەکەین، ناوبردنیشیان بە لەفزی مەبەست پێی ئەوەیە کە چوونەتە تەفسیلەوە لە بابەتی لەفز، نەک بڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوقە و مەبەستیان مەخلوقی قورئان بێت.

---

ماویەتی

# اللفظية (١٠)



**ڕوونکردنەوەی مەزهەبی الحسين الكرابيسي و احمد الشراك و داود الأصبهاني و هاوشێوەکانیان کە هەمان مەزهەبی ابن کلاب بووە کە پێشتر باسمان کرد، پێیان وابووە ئەم قورئانەی سەر زەوی مەخلوقە و کەلامی الله نیە.**

ئەم الكرابيسي-ە کراوە بە دووانە لەگەڵ بوخاری لەم بابەتی لەفزە، هەر حوکمێک درا بێت بەسەر الکرابیسی هەمان حوکم ئەدەن بەسەر بوخاریش، گوایە الکرابیسی و احمد الشراك ئەمانەش وەکو بوخاری وتوویانە: (قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، ئەوەی بڵێ مەخلوقە کافرە، بەڵام لەفزمان بە قورئان مەخلوقە) ئیمام احمد تەنها لەسەر ئەم قسەیە تەکفیری کردن، کەواتە بوخاریش وەکو ئەوان کافرە، با هەر بڵێ قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، مادام جیاکاری ئەکات لەنێوان فعلی عەبد و کەلامی الله، ئەڵێ فعلی عەبد تیلاوەیە و مەخلوقە، کەلامی الله مەتلوە و مەخلوق نیە، بۆیە بوخاریش وەکو ئەوان کافرە!

لە پۆستەکانی پێشوو نەقلم کرد کە ابن کلاب ئەڵێ: قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، ئەوەی بڵێ مەخلوقە کافرە، مەبەستی لە هەموو ئەم قسانە ئەوە بوو کە کەلامی نەفسی الله مەخلوق نیە، بەڵام ئەم قورئانەی سەر زەوی مەخلوقە و حیکایەتە لە کەلامە نەفسیەکەی الله و ئێمە بە لەفزی خۆمان دەری ئەبڕین بە پیت و بە دەنگ، جا الکرابیسی و احمد الشراك هاوشێوەکانیان لە لەفزیەکان هەمان عەقیدەیان هەبووە کە ئەم قورئانەی سەر زەوی کەلامی الله نیە و مەخلوقە، بۆیە تەکفیر کران لەلای ئیمام احمد، نەک لەبەر ئەوە تەکفیر بکرێن کە بڵێن: فعلی عەبد مەخلوقە، وە کەلامی الله غەیر مەخلوقە.

## ابو حاتم الرازي ئەڵێ:

ووتەی جهم بن صفوان و حسین الکرابیسي و داود بن علي بریتیە لە: لەفزیان بە قورئان مەخلوقە، وە قورئانەی کە دابەزیوە بۆ پێغەمبەرمان صلی الله علیه وسلم کە جبریلی ئەمین هێناویەتی حیکایەتی قورئانە، جا ابو عبدالله احمد بن محمد بن حنبل بە جەهمی دانان، وە زانایانی ووڵاتانیش هەموویان شوێنی کەوتن لە جەهمی دانانی ئەمانە، هیچ خیلاف نیە لە نێوان ئەهلی ئەثەر لەمەدا.

**(الحجة في بيان المحجة : ١٩٢/٢)**

زۆر بەجوانی ووتەکە بخوێنەوە، لەسەر ووشە بە ووشەی بوەستە، تێبگە کە جەهمی کوری سەفوان و کەرابیسی و داود بن علي الأصبهاني هەمان عەقیدەیان هەبووە،

بڕوایان وابووە ئەم قورئانەی سەر زەوی حیکایەتی قورئانەکەی ئاسمانە کە کەلامی نەفسی اللّٰه یە، پێشتر باسمان کردووە حیکایەت مانای چیە و ئەم جەماعەتە عەقیدەیان چۆن بووە دەربارەی قورئان، ئەمەش بە شایەتی زانایەکی وەکو ابو حاتم الرازي کە خۆی لە سەردەمی کەرابیسی و داود ژیاوە، ئێستا تێگەیشتی کە ئیمام احمد کە ووتەی کەرابیسی و لەفزیەکانی ئەبیست بۆ ئەیووت ئەمە هەمان ووتەی جەهمە ؟ سەیرکە ابو حاتم جەهمی کوڕی سەفوانیش ئەخاتە ڕیزیان چونکە لە ئیمام احمد ریوایەت کراوە کە ئەڵێ پێم گەیشتووە جەهم سەرەتا ئەیووت: لەفزم بە قورئان مەخلوقە.

**بڕوانە (الإبانة الكبرى : ٢٢٥٠)**

ئاخر ئیمام احمد تێگەیشتووە لە مەزهەبەکەیان بۆیە کە ووتەیان ئەبیستێ ڕێک ئەڵێ ئەمانە جەهمین و هەمان ووتەی جەهم ئەڵێنەوە، تێبگە کەرابیسی و داود الأصبهاني کە قوتابی خۆیەتی عەقیدەیان زۆر دوورە لە بوخاری، کە باسی لەفزیەکان ئەکرێ و تەکفیر ئەکرێن ئەمانەن، نەک ئەوانەی جیاکاری ئەکەن لەنێوان فعلی عەبد و کەلامی اللّٰه، ئەگینا مەزهەبی ئەمانە وەک هی بوخاری بوایە مەبەستیان تەنها ئەوە بوایە کە فعلی عەبد مەخلوقە بۆ نابینی کەسیان لە یەک ووتەدا بڵێن فعلی عەبد مەخلوقە، بۆ هەمیشە ئەڵێن تیلاوەی من مەخلوقە و لەفزی من مەخلوقە، بۆ ئیمام احمد کە ڕەدیان ئەداتەوە باسی فعلی عەبد ناکات ؟ بۆ کە ڕەدیان ئەداتەوە ئەڵێ نەخێر قورئان مەخلوق نیە، ئێ خۆ بە حیسابی ئێوە ئەوان قورئان بە مەخلوق نازانن تەنها فعلی عەبد بە مەخلوق ئەزانن، مانای چیە هەمیشە ئیمام احمد ڕەدیان

ئەداتەوە بەوەی کە قورئان مەخلوق نیە ؟ ئایا احمد لە مەزهەبی ئەوان تێنەگەیشتووە یان ئێوە تێنەگەیشتوون ؟

ابن عبدالبر بە هەمان شێوە حسین الكرابيسي و داود الأصبهاني و ابن كلاب هەر سێکیان بە جەماعەتی حیکایەت وەسف ئەکات

**ابن عبدالبر** ئەڵێ:

الکرابیسی و عبدالله بن کلاب و ابو ثور و داود بن علي و چینی ئەمانە ئەڵێن: ئەو قورئانەی کە الله قسەی پێکردووە سیفەتێکە لە سیفەتەکانی، نابێتە مەخلوق، وە تیلاوەی قورئان خوێن و کەلامی ئەو بە قورئان کەسب و فعلی قورئان خوێنە، ئەمەیان مەخلوقە، وە حیکایەتی کەلامی الله یە، ئەو قورئانە نیە کە الله قسەی پێکردووە.

**(الانتقاء : ١٦٥)**

دانانی ابو ثور لە ڕیزی ئەمانە هەڵەیە، ابو ثور هاوڕێی کەرابیسی بووە، کاتێک کەرابیسی ووتی لەفزم بە قورئان مەخلوقە ابو ثور هەجری کرد، بۆیە ابو ثور بەریە لەم عەقیدەیە بەڵام کاتێک المروذي ووتەی احمد الشراك بۆ ابو ثور نەقل ئەکات، ابو ثور ئەڵێ: بیدعەیە.

ئیمام احمد بەمە زۆر تورە بوو لە ابو ثور، ووتی چۆن تەنها ئەڵێ بیدعەیە ! ئەمە خودی ووتەی جەهمە.

**بڕوانە (السنة للخلال : ٢٠٥٩)**

جا بڕوانە ئیمام احمد زۆر تورە بووە کە ووتنی (لەفزم بە قورئان مەخلوقە) بە بیدعە ناوببرێ، بەڵکو ئەبێ بە کوفر دابنرێ چونکە هەمان ووتەی جەهمی کوری سەفوانە

تۆش هێشتان بڕوات وایە کە لەفزیەکان ڕێک هەمان مەزهەبی بوخاریان هەبووە تەنها وتوویانە فعلی عەبد مەخلوقە، هەر ئەمە مەبەستیان بووە کاتێک وتوویانە لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، مەبەستی تریان نەبووە!

مسلمة بن القاسم الأندلسي بە هەمان شێوە حسين الكرابيسى ئەداتە پاڵ ئەوانەی کە لە پەنای بابەتی لەفز وتوویانە قورئان مەخلوقە

**مسلمة بن قاسم** (٣٥٣ ھ) لە کتێبی (الصلة) ئەڵێ:

کەرابیسی سیقە نیە لە ریوایەت، وە ئەیووت: قورئان مەخلوقە، وە مەزهەبی دەربارەی قورئان بریتی بوو لە مەزهەبی لەفزیەکان.

**(لسان الميزان : ٣٠٥/٢)**

ڕۆژانێک چەکی دەستان بۆ تەکفیر کردنی زانایانی ئەهلی سوننە تەنها الکرابیسی و احمد الشراك بوو، گوایە ئەمانە هەمان عەقیدەی بوخاریان هەبووە کەچی تەکفیر کراون تەنها لەبەر ئەوەی وتوویانە فعلی عەبد مەخلوقە کاتێک قورئان ئەخوێنێتەوە، نازانم دوای ئەم بەڵگانە دەست هەڵئەگرن و تەوبە ئەکەن و ملکەچ ئەبن بۆ حەق یان نا ؟!

**ابن منده** ئەڵێ:

مرۆڤ تەقوای الله بکات و عیبرەت وەرگرێ لە پێشینی خۆی لەوانەی کە (لەفز) مەزهەب و ووتەیان بووە، کە چۆن دەرچوو لە دونیا بە هەجر کراوی و زەم کراوی و دەرکراوی لە مەجلیسەکان و شارەکان بەهۆی عەقیدە ناشرینەکەی و ووتە خراپەکەی کە موخالفی دینی الله یە، وەک: الکرابیسی و ابن الشواط و ابن کلاب و ابن الأشعري و هاوشێوەکانیان ئەوانەی کە جیدال کردن و کەلام ڕێبازیان بووە لە دینی الله عز وجل.

**(ذم الكلام وأهله : ٤٢٤/٤)**

بڕوانە لە باسکردنی جەماعەتی لەفزییەکان ناوی چ کەسانێک ئەهێنێ، مع العلم ابن مندە لەوانەیە کە بڕوای وایە لەفزی بە قورئان مەخلوق نیە، مع العلم ئەو حاڵەی کە ئەو باسی ئەکات لە دەرکردنی لە شاران و لە مەجلیسەکان و دونیا جێهێشتن بە هەجر کراوی، ئەم وەسفانە هەمووی لەگەڵ بوخاری ئەگونجێ کە لە نەیسابوری

توشی بوو بەهۆی هەڵە تێگەیشتن لێی، کەچی ابن مندە ناوی بوخاری نابات، بەڵکو کتێبەکانی پڕە لە هێنانی ریوایەتەکانی بوخاری، تەنانەت کتێبی نوسیوە تایبەت بە باسکردنی شێخەکانی بوخاری

ابن حجر العسقلاني ئەڵێ:

لە نێوان حسین الکرابیسی و احمد (واتا ابن حنبل) هاوڕێیەتیەکی بەهێز هەبوو، کاتێک کەرابیسی موخالەفەی احمدی کرد دەربارەی قورئان، ئەم هاوڕێیەتیە بوو بە دوژمنایەتی، هەردووکیان تانەیان لەیەکتر ئەدا، حەنبەلیەکان حسین الکرابیسیان هەجر کرد، وە داود بن علي الأصبهاني و عبدالله بن سعيد بن كلاب جگە لەوانیش شوێنی مەزهەبەکەی الکرابیسی کەوتن.

**(تهذيب التهذيب : ٢ / ٣٦٠-٣٦١)**

بڕوانە ووتی کەرابیسی و ابن کلاب و داود هەمان مەزهەبیان هەبووە، وە پێشتر باسی مەزهەبی ابن کلاب-مان کرد، ان شاء الله لە پۆستەکانی دواتر باسی مەزهەبی داودیش ئەکەین کە قوتابی کەرابیسی بووە

### ابو حاتم الرازي ئەڵێ:

مەزهەب و هەڵبژاردەمان بریتیە لە شوێنکەوتنی رسول الله صلی الله علیه وسلم و هاوەڵانی و تابعین و ئەوانەی دوای ئەوان کە شوێنیان کەوتوون بە چاکە، ... (پاشان ئەڵێ) وە وازهێنان لەو کەسانەی کە تەلبیس ئەکەن و فێڵ لە خەڵکی ئەکەن و ووتەکانیان بە شتی تر ئەڕازێننەوە و تەڵەکەباز و درۆزنن، وە سەیر نەکردنی کتێبەکانی الکرابیسی و خۆ پاراستن و دوورکەوتنەوە لەهەر کەسێک کە بەرگری لێ ئەکات لە هاوەڵانی و ئەوانەی شەڕی لەسەر ئەکەن وەک داود الأصبهاني و هاوشێوەکانی و شوێنکەوتووانی.

**(شرح أصول اعتقاد للالكائي : ٣٢٣)**

داود الأصبهاني قوتابی کەرابیسیە، ابو حاتم الرازي بەیەکەوە و وەک خاوەن یەک عەقیدە باسیان ئەکات، باسکردنی درۆ و فێڵ کردن و هەڵخەڵەتاندن و ڕازاندنەوەی ووتە، هەموو ئەمانە لەگەڵ مەزهەبەکەی کەرابیسی یەک ئەگرێتەوە کە لە زاهیردا قسەیەکی ئەکرد لە باطندا مەبەستێکی تری هەبوو.

### أبو زرعة العراقي ئەڵێ:

ئەوەی باسمان کرد کە قورئان مەخلوق نیە، مەبەستمان ئەو کەلامەیە کە لە زاتی پاکی الله دا هەیە، بەڵام ئەو عیبارەتانەی کە دەلالەت لە کەلامەکە ئەکەن و کە بریتیە

لە قیرائە، ئەمەیان مەخلوقە، بەڵام زانایان ڕێگریان کرد لەوەی بووترێ مەخلوقە چونکە ناونراوە بە قورئان، ئەم ووتەیەش هەڵە تێگەیشتنی تێدا ڕوو ئەدات (واتا ووتنی قورئان مەخلوقە) وە زانایان تەبدیعی ئەو کەسەیان کرد کە بڵێ: لەفزم بە قورئان مەخلوقە وەک حسين الكرابيسي، بۆ داخستنی دەرگاکە.

**(الغيث الهامع شرح جمع الجوامع : ٧٤٥)**

ووتەی ئەشعەریەکان دەربارەی کەلامی الله وەک مین وایە، ئەبێ زۆر بە ووریایی مامەڵەی لەگەڵ بکەیت ئەگینا پێتدا ئەتەقێتەوە، سەیرکەن ابو زرعة العراقي کە ئەشعەریە ئەڵێ: کە ووتمان قورئان مەخلوق نیە، مەبەستمان کەلامی نەفسی الله یە، ئەگینا کە ئەوەی هەیە لە پیتەکان ئەمانە مەخلوقن و عیبارەتن لە کەلامە نەفسیەکەی الله، بەڵام زانایان ناهێڵن بووترێ: مەخلوقە بە ئاشکرا و بە ڕەهایی، چونکە ئەم عیبارەتانەی کە لە زەویدا هەیە ناونراوە بە قورئان، کە ووترا قورئان مەخلوقە خەڵکی بە هەڵە تێئەگەن وائەزانن کەلامی نەفسی الله مەخلوقە، هەر بۆیەش سەلەف تەبدیعی کەرابیسیان کرد چونکە ئەو دەیووت: لەفزم بە قورئان مەخلوقە، واتا ئەم قورئانەی سەر زەوی کە عیبارەتە لە کەلامی نەفسی الله مەخلوقە، ئەمەش سەرئەکێشێ بۆ ئەوەی کە خەڵکی واتێبگەن کەلامی نەفسی الله مەخلوقە کاتێک کە ئەووترێ قورئان مەخلوقە، هەر بۆیەش کەرابیسی تەبدیع کرا تاکو ئەم دەرگایە دابخەن، واتا ئەم ئەشعەریە باش تێگەیشتووە کە ووتەکەی کەرابیسی (لەفزم بە قورئان مەخلوقە = ئەم قورئانەی سەر زەوی مەخلوقە) جا ئەم ئەشعەریە کێشەی لەگەڵ ئەم ووتەیەی کەرابیسی نیە، پێی وایە سەلەفیش هەمان

عەقیدەی کەرابیسیان هەبووە، بەڵام بۆیە کەرابیسیان تەبدیع کرد چونکە خەڵک واتێئەگەن کە ووترا: قورئان مەخلوقە، واتا کەلامی نەفسی الله مەخلوقە.

**ابن حجر العسقلاني** ئەڵێ:

ئەم بابەتە ناسراوە بە بابەتی لەفز، وە بە خاوەنانی ئەم بابەتە ئەووترێ: لەفزیەکان، وە ئینکار کردنی ئیمام احمد و ئەوانەی شوێنی کەوتن زۆر توند بوو لەسەر ئەو کەسەی کە بڵێ: لەفزم بە قورئان مەخلوقە، وە ئەووترێ: یەکەم کەس کە ئەمەی ووت الحسين بن علي الكرابيسي بوو، یەکێک بوو لە هاوەڵانی شافعی کە کتێبی کۆنی شافعی نەقل ئەکرد، جا کاتێک ئەمە گەیشتەوە بە احمد تەبدیعی کرد و هەجری کرد، پاشان داود بن علي الأصبهاني ئەم شتەی ووتەوە کە سەرکردەی زاهیریەکان بوو، لەو کاتەدا لە نەیسابور بوو، جا اسحاق بن راهويه ئینکاری ئەم شتەی لێکرد و ئەمە گەیشتەوە بە احمد، جا کاتێک داود چووە بغداد احمد ئیزنی نەدا بێتە لای.

**(فتح الباري : ٤٩٢/١٣)**

**ابن أبي داود** (کوڕی ابو داود خاوەنی السنن) ئەڵێ:

زاناترین کەس بە عیلمی کەلام دوای حفص الفرد کەرابیسیە، وە حسين الكرابيسي لەو فێری عیلمی کەلام بوو.

**(تاريخ بغداد : ٦١٣/١٥)**

کەرابیسی یەکەم الوليد بن أبان الكرابيسي-ە، کەرابیسی دووەم ئەوەیانە کە باسی ئەکەین.

ئێستا زانیمان کەرابیسی چ جۆرە کەسێک بووە و چۆن وەسف کراوە، وە عەقیدەی چۆن بووە دەربارەی قورئان

ئێستاش رحمك الله سەیرکە کە باسی ووتەکەی کەرابیسی ئەکەن بۆ ئیمام احمد چۆن باسی ئەکات و بەچی ڕەددی ئەداتەوە و چ حوکمێکی لەسەر ئەدات، بەمە تێئەگەیت کە عەقیدەی کەرابیسی چۆن بووە و ئەزانی مەبەستی چی بووە لە ووتنی (لەفزم بە قورئان مەخلوقە).

**المروذي** ئەڵێ:

ووتم بە باوکی عبداللە: کەرابیسی ئەڵێ: هەر کەسێک نەڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە ئەوا کافرە.

ئیمام احمد ووتی: بەڵکو خۆی کافرە، وە ووتی: بشر المريسي مرد و حسين الكرابيسى شوێنی گرتەوە، وە پێی ووتم: ئەمە بۆتە جەهمی و عەقیدەی جەهمیەتی دەرخستووە، پێویستە تەحزیری لێ بدرێ، وە تەحزیر لەهەر کەسێک بدرێ کە شوێنی ئەکەوێ.

**(طبقات الحنابلة : ٦٢/١)**

### ابن أبي يعلى ئەڵێ:

لە کتێبی السنة-ی الخلال نەقلم کردووە کە الخلال ئەڵێ:

حنبل ووتی: بیستم باوکم پرسیاری لە باوکی عبدالله ئەکرد دەربارەی ووتەکەی کەرابیسی و ئەوەی داىهێناوە.

باوکی عبدالله بە باوکمی ووت: ئەمە ووتەی جەهمیەکانە، خاوەنی ئەم ووتەیە بانگەواز ئەکات بۆ ووتەی جەهم، کە ووتی: لەفزم بە قورئان مەخلوقە ئیتر چ شتێک ئەمێنێتەوە ؟!

**(طبقات الحنابلة : ١١١/١)**

### شاهين بن السميذع ئەڵێ:

بیستم باوکی عبدالله احمد بن حنبل ئەیووت: الحسین الکرابیسی لەلای ئێمە کافرە.

**(طبقات الحنابلة : ١٧٢/١)**

### أبو جعفر محمد بن الحسن بن بدينا ئەڵێ:

پرسیارم لە ئیمام احمد کرد ووتم: بابەتەکەی کەرابیسی ڕوویدا و خەڵکی توشی فیتنە کرد، ووتەکەی کەرابیسی لەفزم بە قورئان مەخلوقە.

ئیمام احمد ووتی: إياك إياك إياك إياك وهذا الكرابيسي، قسەی لەگەڵ مەکە، قسە لەگەڵ ئەو کەسەش مەکە کە قسەی لەگەڵ ئەکات، چوار جار یان پێنج جار ووتی (إياك).

ووتم: ئەی باوکی عبدالله ئەم ووتەیەی کەرابیسی و هەر ووتەیەک کە لەمەوە ئەبێتەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ووتەی جەهم ؟

ووتی: ئەمە هەمووی ووتەی جەهمە.

**(الإبانة الكبرى لابن بطة : ٢٢٣٩)**

### المروذي ئەڵێ:

ووتم بە باوکی عبدالله: کەرابیسی ئەڵێ: هەر کەسێک نەڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە ئەوا کافرە.

ئیمام احمد ووتی: بەڵکو خۆی کافرە، وە ووتی: بشر المريسي مرد و حسين الكرابيسي شوێنی گرتەوە.

**(الإبانة الكبرى لابن بطة : ٢٢٥٦ / ب)**

### عبدالله کوڕی ئیمام احمد ئەڵێ:

پرسیارم لە باوکم کرد ووتم: کەسانێک ئەڵێن: لەفزمان بە قورئان مەخلوقە ؟

ووتی: ئەوانە جەهمین، وە خراپترن لەو کەسەی کە توقف ئەکات، وە ووتی: ئەمە ووتەی جەهمە.

عبداللە ئەڵێ: باوکم ئەم ووتەیەی بەلامەوە زۆر گەورە بوو، وە ووتی: اللە عز وجل فەرموویەتی: {وإن أحد من المشركين استجارك فأجره حتى يسمع كلام الله} [التوبة: ٦]، وە رسول اللە صلى اللە عليه وسلم فەرموویەتی: (حتى أبلغ كلام ربي)، وە فەرموویەتی: (إن هذه الصلاة لا يصلح فيها شيء من كلام الناس) جا هەر کەس بڵێ: لەفزم بە قورئان مەخلوقە ئەوا جەهمیە.

عبداللە ئەڵێ ووتم: کەرابیسی ئەڵێ: لەفزم بە قورئان مەخلوقە.

باوکم ووتی: ئەمە ووتەیەکی خراپ و بۆگەنە، ئەمە ووتەی جەهمیەکانە، کەرابیسی درۆی کرد، ئەم شتە پیسە اللە فەزحی بکات، وە ووتی: کەرابیسی جێگای بشر المريسي گرتەوە.

**(الإبانة الكبرى لابن بطة : ٢٢٥٤)**

### ابو الحارث الصائغ ئەڵێ:

بیستم پرسیار لە باوکی عبداللە ئەکرا دەربارەی ووتەکەی حسين الكرابيسي، پێی ووترا: کەرابیسی ئەڵێ: لەفزم بە قورئان مەخلوقە.

ئیمام احمد ووتی: ئەمە ووتەی جەهمە، اللە عز وجل فەرموویەتی: {وإن أحد من المشركين استجارك فأجره حتى يسمع كلام الله} [التوبة: ٦]، ئایا کەلامی اللە لە کێ

ئەبیستێ ؟! دانانی کتێب ئەمانەی لەناوبرد، وازیان هێنا لە ئاثاری رسول الله صلى الله عليه وسلم و بەرەو عیلمی کەلام چوون.

ابو الحارث ئەڵێ: پێم ووت: گەر ووتی لەفزم بە قورئان مەخلوقە، ئەوا جەهمیە ؟

ووتی: چ شتێک ئەمێنێتەوە کە ووتی لەفزم بە قورئان مەخلوقە ؟!

**(الإبانة الكبرى لابن بطة : ٢٢٤٦)**

سەیری ئەم ووتە توندانەی ئیمام احمد بکە دەربارەی کەسێک کە ئێوە پێتان وایە تەنها وتوویەتی فعلی عەبد مەخلوقە کاتێک قورئان ئەخوێنێتەوە، ئەگینا هەمان عەقیدەی ئیمام احمدی هەبووە دەربارەی قورئان!!!

ئایا کەسێک بڵێ قورئان کەلامی الله یە بە دەنگ و بە پیت قسەی پێکردووە، مەخلوق نیە، وە ئەوەی کە ئەخوێنرێ و ئەنوسرێ و ئەبیسترێ و حفز ئەکرێ کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، بەڵام فعلی عەبد مەخلوقە لە دەم جوڵاندن و زمان و قورگ و دەنگی

تەنها بەهۆی ئەمەوە ئیمام احمد دەربارەی ئەڵێ:

ئەمە هەمان ووتەی جەهمە

ئەمە بانگەواز بۆ ووتەی جەهم ئەکات

ئەمە بۆتە جەهمی

ئەمە عەقیدەی جەهمیەتی دەرخستووە

ئەمە درۆ ئەکات

کە ووتت لەفزم بە قورئان مەخلوقە ئیتر چی ئەمێنێتەوە ؟! واتا هەمان کوفری جەهمیەکانت کردووە و وتووتە قورئان مەخلوقە، ئایا کەسێک بڵێ فعلی عەبد مەخلوقە، ئەوا هیچی نەهێشتۆتەوە و هەمان قسەی جەهمیەکانی کردووە ؟!

ئینجا وەک هەمیشە بەڵگە لە دژی کەرابیسی ئەهێنێتەوە بە ئایەتی (حتى يسمع كلام الله) گەر کەرابیسی بڕوای وابێت ئەم قورئانەی سەر زەوی مەخلوق نیە، چ مانایەکی هەیە ئیمام احمد بەم ئایەتە ڕەددی بداتەوە ؟ ئەم ئایەتە باسی ئەوە ئەکات کە ئەوەی ئەبیسترێ کەلامی الله یە، ئێ لەم بەڵگەیەی ئیمام احمد تێبگە کە کەرابیسی و لەفزیەکان پێیان وابووە ئەوەی ئەبیسترێ و ئەنوسرێ و ئەخوێندرێ و حفز ئەکرێ کەلامی الله نیە.

ئەچێتە عەقڵەوە ئیمام احمد لە دڵەوە هەمان عەقیدەی کەرابیسی هەبێ پێی وابێ فعلی عەبد مەخلوقە، بەڵام لەبەر ئەوەی کەرابیسی ئەمەی بە ئاشکرا ووتوە کافرە و جەهمیە، بەڵام ئیمام احمد لە دڵی خۆی ئەمەی شاردۆتەوە و بەیانی ناکات بۆتە ئیمامی ئەهلی سوننە ؟! ئەمە چ عەقیدەیەکە لە دڵەوە باوەڕت پێی بێت بەڵام بە زمان باسی مەکە ئەوا ئەهلی سوننەی، بەڵام گەر بە زمان بەیانت کرد ئەوا کافریت و هەمان ووتەی جەهمی کوڕی سەفوانت ووتوە !!! کێشەی جەهم ئەوە بوو ئەیووت فعلی عەبد مەخلوقە ؟!!!

ئینجا گەر ئەڵێن ئێمە لە بنەڕەتەوە هاوڕات نین کە ئەڵێی ئیمام احمد لە دڵەوە بڕوای وابووە کە فعلی عەبد مەخلوقە لەکاتی قوڕئان خوێندنەوە، بەڵکو ئیمام احمد هەر لە دڵیشەوە باوەڕی بەم تەفسیلە نەبووە و بە کوفری زانیوە.

ئەڵێم گەر فعلی عەبد بوونی نیە لەکاتی قورئان خوێندنەوە، ئەی بۆچی ئیمام احمد نەی ئەووت: لەفزم بە قورئان مەخلوق نیە ؟! خۆ بەم قسەیەی ئێوە بێت فعلی عەبد بوونی نیە و تەنها قورئان بوونی هەیە، کەواتە چ هەڵەیەک هەیە کە بووترێ لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە ؟! بۆ ئیمام احمد تەبدیعی ئەو کەسانە ئەکات کە ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە ؟!

ئینجا ئەوکات دانی پێ ئەنێن کە لە قورئان خوێندنەوە فعلی عەبد بوونی هەیە، بۆیە ئیمام احمد نەی ووتوە لەفزم بە قورئان مەخلوق نیە، چونکە ئەوکات فعلی عەبدیش ئەبێتە غەیر مەخلوق، بە هەمان شێوەش بۆیە نەی ووتوە لەفزم بە قورئان مەخلوقە چونکە ئەوکات قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق، لەبەر ئەوەی ووشەی (لەفز) موجمەلە ئەکرێ فعلی عەبد بگرێتەوە، ئەکرێ قورئانیش بگرێتەوە، بۆیە لەفز نە بە مەخلوق نە بە غەیر مەخلوق وەسف ناکرێت لە پاڵ قورئاندا.

کەواتە دانتان پێنا کە ئیمام احمد بڕوای وایە فعلی عەبد بوونی هەیە لەکاتی قورئان خوێندنەوە -گەر دانیشی پێ نەنێن بە زەبری بەڵگە اعترافتان پێ ئەکەین لە پۆستەکانی دواتر ان شاء اللە-، ئەمەش هێندە روونە پێویستی بە بەڵگە نیە، کەس ئینکاری ناکات مەگەر شێت بێت، چونکە هەموو کەس ئەزانێت کاتێک کە قورئان ئەخوێنێتەوە

کارێکی ئەنجام داوە و قورئان خوێندنەوە یەکێکە لە کردارە چاکەکان، کرداری مرۆڤیش هەمووی مەخلوقە.

جا کە دانتان نا بە بوونی فعلی عەبد لەکاتی قورئان خوێندنەوە، ئایا ئیمام احمد بڕوای وابووە ئەم فعلەی عەبد مەخلوقە یان نا ؟ گەر بڵێن بڕوای وابووە مەخلوق نیە ئەوا درۆتان کرد و ئیمام احمدتان کرد بە مبتدع، ئەسلەن گەر بڕوای وابوایە فعلی عەبد مەخلوق نیە ئەوا زۆر بە ئاسانی ئەیووت لەفزم بە قورئان مەخلوق نیە، چونکە ئەوکات لەفزەکە بۆ فعلی عەبد بگەڕێتەوە یان بۆ قورئانە هەردووکی هەر مەخلوق نین و قسەکە ڕاست دەرئەچوو.

وە ئەگەر بڵێن ئیمام احمد بڕوای وایە فعلی عەبد بوونی هەیە، بەڵام لەکاتی قورئان خوێندنەوە فعلی عەبد نە مەخلوقە و نە غەیر مەخلوقە، ئەوا ئەمە وڕێنە کردنە و هیچ مانایەکی نیە و خاوەنی ئەم قسەیە شایستەی وەڵامدانەوە نیە بەهۆی کەم عەقڵیەکەی، چونکە هیچ کەسێکی عاقڵ ئەم قسەیە ناکات.

وە ئەگەر ئەڵێن ئیمام احمد بڕوای وایە فعلی عەبدەکە مەخلوقە -کە جگە لەمە هیچ جاری ترتان نیە- بەڵام ئیمام احمد ئەم تەفسیلە بە زمان دەرنابڕێ تەنها ئەڵێ: قورئان کەلامی اللە یە و لە هەموو ڕووێک و بارێک و حاڵێکدا غەیر مەخلوقە، وە فعلی عەبدەکان مەخلوقن، ئەوا ئەوکات هەمان قسەی منتان کردۆتەوە کە ئیمام احمد لە دڵەوە بڕوای وایە فعلی عەبد مەخلوقە لە قورئان خوێندنەوە بەڵام قورئانەکە کەلامی اللە یە و مەخلوق نیە، کەواتە چۆن ئیمام احمد کەرابیسی و هاوشێوەکانی

تەکفیر ئەکات و بە جەهمیان ئەزانێت و ئەڵێ ئەمانە هەمان قسەی جەهم ئەکەن، لەکاتێکدا لە دڵەوە خۆشی بڕوای بە هەمان ووتەی ئەوان هەیە ؟!!!!

کەواتە لە نەتیجە دەرکەوت کە کەرابیسی و لەفزییەکان مەبەستیان ئەوە نەبووە کە فعلی عەبد مەخلوقە، بەڵکو مەبەستیان ئەوە بووە ئەم قورئانەی سەر زەوی مەخلوقە، هەر بۆیە ئیمام احمد دوو دڵ نەبووە لە تەکفیر کردنیان و بە جەهمی زانیون، وە ووتەکەی ئەوانی یەکسان کردووە بە ووتەی جەهم بن سەفوان.

---

ماویەتی

ان شاء اللە پۆستی داهاتووش هەر لەسەر کەرابیسیە

# بەشێک

هەر کەسێک بڵێ من وتوومە تەفسیل بدەن و تەنها بەوە مەوەستن کە بڵێن (قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە) بەڵکو زیاتر ڕوونی بکەنەوە بڵێن کاغەز و حیبر و دەنگی عەبد و جوڵەی زمان و لێوی مەخلوقە، کە پرسیارتان لێکرا دەربارەی قورئان بەم جۆرە تەفسیلی پێ بدەن نەک تەنها بڵێن (قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە).

هەر کەس ئەم شتانەی سەرەوە ئەداتە پاڵم ئەوا درۆی کردووە، ئەمە عەقیدەی منە (قورئان کەلامی الله یە مەخلوق نیە لە هیچ بارێکدا) بەڵام باسێک هاتە پێشەوە لەسەر تەفسیلەکەی بوخاری و بابەتی لەفزییەکان، من هاتووم ئەڵێم ئەم بابەتە کتێبی لەسەر ئەنوسم بەڵام بۆم نەگونجا کردم بە پۆست، ئێ باشە ئێستا ئەم بابەتە چۆن ڕوون بکەمەوە ؟ نابێ بڵێم لەفزییەکان کێ بوون و عەقیدەیان چی بوو ؟ نابێ ڕوونی بکەمەوە بوخاری چی ووتوە و مەبەستی چی بووە ؟ ئەی نابێ لەسەر ناوەڕۆکی ووتەکانیان قسە بکەم، ئەی کە بوخاری ئەم تەفسیلە ئەدات و ئەڵێ فعلی عەبد مەخلوقە کاغەز مەخلوقە حیبر مەخلوقە، بەڵام قورئان کە ئەبیسترێ و ئەنوسرێ و ئەخوێندرێ و حفز ئەکرێ مەخلوق نیە، چی بڵێم ؟ بڵێم درۆی کرد فعلی عەبد مەخلوق نیە دەستان خۆشبێ تەکفیرتان کرد ؟ یان ئەبێ بڵێم ڕاستە فعلی عەبد و

دەنگی عەبد مەخلوقە ناکرێ لەسەر ئەمە تەکفیر بکرێ و یەکسان بکرێ بە لەفزیەکان کە بڕوایان وابوو ئەو قورئانەی سەر زەوی مەخلوقە، بەڵام ئیمام احمد ئەم تەفسیلەی نەداوە چونکە توشی کەسانێک بوو کە ئەیان ووت ئەم قورئانەی سەر زەوی مەخلوقە ئەمەیان بە بابەتی لەفز دەرئەبڕی، بوخاری توشی کەسانێک بوو وەک خۆی باسی ئەکات پێیان وابووە حیبر و کاغەز و دەنگی عەبد ئەمانە هیچی مەخلوق نین! ئینجا بەڵگەیان بۆ ئەهێنێت لە قورئان و سوننەت کە ئەمانە مەخلوقن، ئیمام احمد توشی کەسێک نەبووە کە بڵێ دەنگی عەبد مەخلوق نیە، کە بوخاری توشی کەسێک ئەبێ ئەڵێ دەنگی عەبد مەخلوق نیە حەتمەن وەڵامی بوخاری وەک وەڵامی احمد نابێت چونکە ڕەددی دوو کەسی جیا ئەدەنەوە، ئینجا لەگەڵ هەموو ئەمانەش گەر هەمان وەڵامی سەلەفی دابوایەوە ڕەنگە بە هەڵە لێی حاڵی نەبوان و سەلامەتتر بوایە بۆی، من هاتووم ئەمە ڕوون ئەکەمەوە خۆ ئەبێ قسەی لەسەر بکەم، خۆ ناکرێ بڵێم خەڵکینە ئەم بابەتەتان بۆ روون ئەکەمەوە کە چۆن بووە، بەم جۆرەیە: قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، تەواو باسەکە داخەن و هیچی تر مەڵێن، ئێ هەمووتان ئەمە ئەزانن ئەمە کەی ڕوونکردنەوەیە ؟ خۆ ئەبێ باسی ئەو شتانە بکەم کە ووتراون ئینجا کە بڕوام بەم تەفسیلە هەیە لە دڵەوە مانای ئەوە نیە بڵێم ئێوەش هەمیشە تەفسیل بدەن و باسی بکەن، بەڵام لە مەقامی روونکردنەوە ئەبێ باس بکرێ، گەر ئەڵێن ئێمە هەر لە دڵیشەوە بڕوامان بەم تەفسیلە نیە ئەوا گەر کافر نەبن بەلانی کەم بیدعەچین، بۆیە بەیان کردنی عەقیدەم لەسەر بابەتێک و روونکردنەوەی ئەو ووتانەی لەسەر بابەتەکە ووتراون جیاوازە، ئەگینا کەی بیستووتانە من لە ووتەکانم جارێک باسی ئەم تەفسیلە بکەم یان

دەعوەی بۆ بکەم و خەڵکی بۆ هاندەم ؟ بەڵام کە ڕووداوێک روویدا تۆ ئەبێ قسەی لەسەر بکەیت و ووتە و مەبەستەکان روون بکەیتەوە.

بۆ نموونە ئێستا کەسێک ئەڵێ کاغەز و حیبر مەخلوق نین، تۆ چۆن وەڵامی ئەدەیتەوە ؟ ئەڵێی قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە ؟ ئێ ئەویش هەمان شت ئەڵێ کێشەی نیە لەمە، بەڵام ئەڵێ کاغەز و حیبر مەخلوق نین، چی ئەکەیت ؟ بۆی روون ئەکەیتەوە کە کاغەز و حیبر مەخلوقن، یان ئەڵێی باسی ناکەم چونکە سەلەف ئەم تەفسیلەیان نەداوە ؟ یەعنی گەر پێت ووت کاغەز مەخلوقە ئینسان دروستی ئەکات وە ئەوەی تێیدا نوسراوە کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، ئەوا تۆ تەفسیلت پێدا بوویتە بیدعەچی یان کافر ؟!

ئەمەش دەقی ووتەی خۆمە کە لە پۆستی شەشەمی لەفزیەکان نوسیومە :

(وە بێگومان دەست گرتن بە ئەلفازی ئەهلی سوننە و دوور بوون لە کەلامێک کە لە قورئان و سوننەت و ئاساری سەلەف نەهاتووە ئەولاترە و سەلامەتترە، بەڵام تۆ بەمە زانایانی ئەهلی سوننە تەکفیر بکەیت ئەمە کارەساتە)

کەواتە من پێشتر ڕوونم کردۆتەوە لەگەڵ ووتەکەی سەلەفم لەوە زیاتر و کەمتر ناڵێم، بەڵام کەس لەسەر ئەمە تەکفیر و تەبدیع ناکەم کە بڵێ فعلی عەبد مەخلوقە و بابەتەکە بە جۆرێک تەفسیل پێ بدات کە هیچ ناڕوونیەک نەهێڵێتەوە و نەیکات بە پردێک بۆ ئەهلی کوفر و بیدعە، لە کاتێکدا ئەم تەفسیلە خودی عەقیدەی ئەهلی

سوننەیە نەک دانراوی خۆی بێت، نەشم زانیوە ئەهلی سوننە بڕوایان بە تەفسیلێک هەبێت لە دڵەوە بەڵام بڵێن ئەوەی دەری ببڕێت کافرە یان مبتدع ! وە پاشان گەر سەلەف ئەم تەفسیلەش بە دەم باس ناکەن خۆ هیچ کام لە سەلەف نەی ووتوە ئەوەی بڵێ کاغەز و حیبر و فعلی عەبد مەخلوقە کافرە یان مبتدعە، گەر شوێنکەوتەی سەلەفن بە چ بەڵگەیەک ئەهلی ئەم تەفسیلە تەکفیر و تەبدیع ئەکەن ؟ سەلەف وتوویانە نابێ بووترێ ئیمان مەخلوقە یان غەیر مەخلوقە، وە نابێ بووترێ لەفزمان بە قورئان مەخلوقە یان غەیر مەخلوقە، چونکە هەردوو ووشەی ئیمان و لەفز هەم کەلامی اللە ئەگرێتەوە و هەم فعلی عەبد، بۆیە ئەم دوو ووتە ڕەهایە بۆ هیچ کامیان نابێ، بەڵام کوا سەلەف وتوویانە ئەوەی بڵێ فعلی عەبد و کاغەز و حیبر مەخلوقە جەهمیە ئەوەی بڵێ مەخلوق نیە مبتدعە، تاکو تۆ بەمە زانایان تەکفیر و تەبدیع بدەیت، وا لە خەڵک بکەیت کە نەزانن کاغەز و حیبر و دەنگی خۆیان مەخلوقە یان نا، سەرگەردان بمێنن تیایدا، ئینجا ئیمام احمد خۆشی لە بابەتی لەفزیەکان تەفسیلێکی داوە کە هیچ کەس پێش ئەو ئەم تەفسیلەی نەداوە، پێشتر هەمیشە ئەووترا قورئان کەلامی اللە یە و مەخلوق نیە، لەمە زیاتر نەئەووترا، کاتێک لەفزیەکان پەیدا بوون ئیمام احمد ووشەیەکی تری بۆ زیاد کرد و تەفسیلی پێدا تا کوفرەکەیان روون بکاتەوە، ووتی قورئان کەلامی اللە یە و مەخلوق نیە لە هیچ بارێکدا و لە هیچ حاڵێکدا و لە هیچ ڕووێکدا، واتا بنوسرێ بخوێندرێ ببیسترێ حفز بکرێ لە هیچ کامیان نابێتە مەخلوق و هەمیشە غەیر مەخلوقە، ئەم ووشانە (لە هیچ بارێکدا و لە هیچ حاڵێکدا و لە هیچ ڕووێکدا) پێشتر نە ووترابوو کاتێک لەفزیەکان پەیدا بوون ئیمام احمد ئەمەی ئەووت، لە بابەتی واقفەش پێش ئەوەی واقفە دروست

بوون خەڵک ئەیان ووت قورئان کەلامی الله یە، هەر ئەمەندە هیچی تریان نەئەووت چونکە هەمووان ئەیانزانی مەخلوق نیە بۆیە باسی مەخلوق نەبوونیان نەئەکرد، بەڵام کە واقفە دروست بوون ئیمام احمد قبوڵی نەئەکرد تەنها بڵێن کەلامی الله یە، بەڵکو ئەبێ بڵێن مەخلوق نیە، بوخاریش ئەڵێ کەسانێک وائەزانن فعلی عەبد مەخلوق نیە لە قورئان خوێندنەوە ئێستا ئەبێ بۆیان باس بکرێ کە فعلی عەبد مەخلوقە، گەر ئەڵێن جا ئەمە چی تێدایە خۆ مەعلومە قورئان لە هیچ کاتێکدا نابێتە مەخلوق، با باسیش نەکرا بێت پێشتر بەڵام خۆ ووتەکە حەقە، وە خەڵکی ئەزانن قورئان مەخلوق نیە، ئێ بوخاریش ئەڵێ ئەهلی سوننە ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوقە منیش وائەڵێم خۆ قسەیەکی هەڵەم نەکردووە، منیش بۆیە ئەمەم ووت تاکو ڕەددی کەسانێکی پێ بدەمەوە هەروەک چۆن ئیمام احمد ئەم ووشانەی زیاد کرد تا ڕەددی لەفزیەکانی پێ بداتەوە، هەروەک چۆن ابن المبارك ووشەی (حەد)ی زیاد کرد تا ڕەددی جەهمیەکانی پێ بداتەوە، هەروەک چۆن بەشێک لە ئەهلی سوننە ووتیان الله دادەبەزێ بە زاتی خۆی ووشەی (زات) زیاد کرا بۆ ڕەددانەوەی جەهمیەکان، ئێ هەموو ئەهلی سوننەش کۆکن کە فعلی عەبد مەخلوقە هەمیشە، منیش لێرەدا ئەڵێم فعلی عەبد مەخلوقە تا بۆ ئەوانە روونی بکەمەوە کە پێیان وایە مەخلوق نیە، بەڵام کاتێک کێشە دروست ئەبوو کە ووتەکە مانای جیاوازی هەڵگرتبوایە و خەڵکانێک ئەم ووتەیە بۆ شتی تر بەکار بهێنن وەک بابەتی لەفز و ئیمان، هەندێک بڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوقە و مەبەستیان قورئان بێ، یان بڵێن ئیمان مەخلوقە و مەبەستیان لا اله الا الله بێت، گەر ئەڵێن ئاخر ئەمانە ئەهلی سوننە لێیان قبوڵ کردوون کەس ڕەددی نەداونەتەوە لەم تەفسیلانە، ئێ خۆ بوخاریش کەس لەسەر ئەوە تەکفیر و تەبدیعی نەکردووە کە

بڵێ کاغەز و حیبر و فعلی عەبد مەخلوقە، کەس نەهاتووە بڵێ ئەوەی ووتی ئەمانە مەخلوقن کافرە یان مبتدع، بەڵکو لەسەر ئەوە هەجر کرا وایان زانی لە لەفزیەکانە و ئەڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە.

وە دووبارەی ئەکەمەوە فێڵتان لێ نەکەن بە بابەتی لەفز و ئیمان، کە سەلەف حوکمدان لەسەر ئەم دوو ووشە موجمەلەیان مەنع کردووە، چونکە ووشەی لەفز و ئیمان ئەکرێ فعلی عەبد بگرنەوە ئەکرێ کەلامی الله بگرنەوە بۆیە بە ڕەهایی ناووترێ مەخلوقن یان مەخلوق نین

بەڵام فعلی عەبد روونە و هەمووان ئەیزانن کە مەخلوقە، لەم جۆرە شتانە نیە کە نابێ بووترێ مەخلوقە و نە غەیر مەخلوقە، هەندێک کەس بابەتی لەفز و ئیمان قیاس ئەکەنەوە سەر فعلی عەبد، کە ئەمە هەڵەیە چونکە فعلی عەبد ڕوونە مانای چیە هیچ اشکالێک روونادات لەوەی بووترێ مەخلوقە، بۆیە هەمیشە بەم پرسیارانە بیانگرن بڵێن کە قورئان ئەخوێنینەوە کارێکمان ئەنجام داوە یان نا ؟ گەر ووتی نا هیچ کارێک بوونی نیە بەڵکو زاتی الله قورئانەکە ئەخوێنێتەوە و دەنگەکە هی الله یە و نەک هی تۆ، ئەوا بەم وەڵامەیان ئەگەن بە کوفر، گەر ووتیان بەڵێ ئەمە کارێکە ئەنجامت داوە، پێی بڵێ فعلەکەی من مەخلوقە یان نا ؟ گەر ووتی نە مەخلوقە و نە غەیر مەخلوقە ! ئەوا ووڕێنە ئەکات و باتلی مەزهەبەکەی روون ئەبێتەوە، گەر ووتی مەخلوق نیە فعلەکەت ئەوا بیدعەچیە و بگرە هەندێک لە سەلەف ئەمە تەکفیر ئەکەن، گەر ووتی فعلەکەت باس ناکرێ مەخلوقە یان نا سەلەف ئەم تەفسیلەیان

نەداوە، بڵێ سەلەف لە بابەتی لەفز و ئیمان کە دوو ووشەی موجمەلن ئەمەیان ووتووە لە بابەتی فعلی عەبد کەی ووتراوە فعلی عەبد بە هیچ شتێک وەسف ناکرێ نە مەخلوق نە غەیر مەخلوق ؟ گەر ووتی فعلەکەت مەخلوقە بەڵام بە دەم دەری نابڕین تەنها لەناو دڵی خۆمان بڕوامان وایە کاتێک عەبد قورئان ئەخوێنێتەوە فعلەکەی مەخلوقە، ئەوا ئەوکات تۆش پێی بڵێ: ئەمە هەمان ووتەکەی بوخاریە، بۆ تۆ لە دڵتەوە باوەرت پێی هەبێ ئەهلی سوننەی، بەڵام بوخاری بە دەم باسی بکات کافرە یان مبتدع ؟!

وە هەمیشە لێیان بپرسن بۆ ئیمام احمد تەبدیعی ئەوانەی ئەکرد کە ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە ؟ ئێ خۆ قورئان مەخلوق نیە، بۆچی دژی ئەم ووتەیە بوو ؟ گەر ووتی لەبەر ئەوەیە چونکە ووشەی لەفز فعلی عەبدیش ئەگرێتەوە بۆیە ئیمام احمد نەی ئەووت لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە، ئەوا بەم وەڵامدانەوەی دانی پێداناوە کە فعلی عەبد بوونی هەیە و مەخلوقە بۆیە نابێ بووترێ لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە.

ئینجا ئەوەش بزانن هەموو زانایەک لە سەلەف ئیمام احمد بە تایبەتی کە ئیمامی ئەهلی سوننەیە کاتێک ئەڵێن نابێ ئەم شتە بووترێ حەتمەن ئەم شتە قەدەغە کراوێکی تێدایە ئەزانن ووتەکە موجمەلە و مانای تر هەڵئەگرێ و تلبیس و هەڵە تێگەیشتن تێیدا روو ئەدات، هەرگیز لەخۆیانەوە مەنعی ووتەیەک ناکەن لە هەواو هەوەسە کە نەزانن خەلەلێکی تیایە، بۆیە کە من پێتان ئەڵێم سەلەف ڕێگریان لەم ووتەیە کردووە بۆتانی روون ئەکەمەوە کە بۆچی رێگریان لێکردووە و ووتەکە مانای

چی ئەدات، ئەوانەشی کە ئەڵێن نابێ بووترێ فعلی عەبد مەخلوقە یان غەیر مەخلوقە لەم بابەتە، لێیان بپرسن بۆچی ؟ گەر ووتیان سەلەف نەیان ووتوە، بڵێ خۆ سەلەف نەیان ووتوە ئەوەی بڵێ فعلی عەبد مەخلوقە کافرە، سەلەف لە بابەتی لەفز و ئیمان ئەمەیان باسکردووە، هەر بۆیەش من زۆر تەرکیزم لە ڕوونکردنەوەی مەزهەبی لەفزییەکان کرد سەرەتا تاکو بزانرێ ووتنی فعلی عەبد مەخلوقە جیایە لە مەزهەبی لەفزییەکان.

ووشەی لەفز دوو مانا لەخۆ ئەگرێ فعلی عەبد و کەلامی الله بۆیە ناووترێ مەخلوقە یان غەیر مەخلوق

ووشەی ئیمان بە هەمان شێوە

بەڵام فعلی عەبد تەنها یەک مانا لەخۆ ئەگرێت و فعلی عەبد ئەگرێتەوە بۆیە سەلەف قەدەغەیان نەکردووە بووترێ فعلی عەبد مەخلوقە.

# اللفظية (١١)



## ئەم پۆستە تەواوکەری پۆستی پێشووە باسی مەزهەبی کەرابیسی ئەکەین.

پێشنیارم وایە پۆستی ژمارە (١٠) بخوێننەوە ئینجا ئەم پۆستە بخوێننەوە

لە پۆستی پێشوو بینیمان هەریەک لە ابو حاتم الرازي و ابن منده و ابن عبدالبر و ابن حجر و ابو زرعة العراقي مەزهەبی کەرابیسیان یەکسان کرد بە مەزهەبی ابن کلاب، کە گوایە ئەم قورئانەی سەر زەوی حیکایەت و عیبارەتە لە کەلامی الله

بەڵام هەندێک لە زانایان پێیان وایە مەزهەبی کەرابیسی لە شتێکدا جیابووە لە مەزهەبی ابن کلاب، کەرابیسی بڕوای وابووە کە الله بە بە پیت و دەنگ قسە ئەکات، قورئانەکەی ئاسمان مەخلوق نیە، بەڵام ئەم قورئانەی سەر زەوی مەخلوقە، بەڵام ابن کلاب ئەگەرچی پێی وابووە قورئانەکەی سەر زەوی مەخلوقە وەکو کەرابیسی،

بەڵام نەفی ئەوەی کردووە کە الله بە پیت و بە دەنگ قسە بکات بەڵکو الله کەلامی نەفسی هەیە نە دەنگە و نە پیتە.

هۆکاری ئەم جیاکارییەش لە نێوان مەزهەبی ئەم دووانە بۆ ئەوە ئەگەڕێتەوە کە یەکەم کەس ناسرا بە ووتنی (لەفزمان بە قورئان مەخلوقە) کەرابیسی بوو، وە یەکەم کەس ناسرا بە ووتنی (کەلامی نەفسی الله) ابن کلاب بوو، جا کاتێک ئەم دووانە بە دامەزرێنەری دوو بیدعەی کوفری دائەنرێن ئەمە مانای ئەوەیە کە مەزهەبیان لەم ڕووەدا جیابووە، بەڵام هەردووکیان هاوڕان کە ئەم قورئانەی سەر زەوی مەخلوقە، هەر بۆیەش هەندێک زانایان بەیەکەوە باسیان ئەکەن و بە خاوەن یەک عەقیدە باسیان ئەکەن دەربارەی قورئان چونکە هەردووکیان بروایان وایە ئەم قورئانەی سەر زەوی مەخلوقە.

بەڵگە لەسەر ئەوەی هەندێک زانا جیاکاری ناکەن لە نێوان مەزهەبی لەفزیەکان کە کەرابیسی پێشەوایانە لەگەڵ مەزهەبی کوللابیەکان کە ابن کلاب پێشەوایانە

**ابو نصر السجزي** ئەڵێ:

الفصل الخامس: في بيان أن فرق اللفظية والأشعرية موافقون للمعتزلة في كثير من مسائل الأصول وزائدون عليهم في القبح وفساد القول في بعضها.

واتا: ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە فرقە لەفزی و ئەشعەریەکان هاوڕای موعتەزیلەن لە زۆرێک لە بابەتە عەقیدەییەکان و زیاتریش لەوان ووتەی ناشرین و خراپیان هەیە لە هەندێک بابەتدا.

**(الرد على من أنكر الحرف الصوت : ١٣٧)**

سەیرکە فرقە لەفزیەکان کە پێشەوایەکەیان کەرابیسیە لەگەڵ فرقە ئەشعەریەکان باس ئەکات کە ئەشعەریەکان هەمان عەقیدەی کوللابیان هەیە دەربارەی قورئان، بەڵام ابن کلاب ئەڵێ حیکایەت، ابو الحسن الاشعري ئەڵێ عیبارەت، چونکە ابو الحسن الاشعري پێی وایە شتێک حیکایەتی شتێک بکات هەمان شتەکە دەرئەهێنێتەوە، بۆیە خۆی ئەپارێزی لە ووشەی حیکایەت، لە بڕی ئەو ووشەی عیبارەت بەکارئەهێنی لەگەڵ هەبوونی هەمان مانا و مەبەستی ابن کلاب، واتا خیلافەکەیان لەفزییە هەردووکیان پێیان وایە ئەم قورئانەی سەر زەوی دەلالەتە لە کەلامە نەفسیەکەی اللە، ئەویان ئەڵێ حیکایەتە، ئەوی تریان ئەڵێ عیبارەتە.

السجزي ووتی ئەمانە هاوڕای موعتەزیلەن لە زۆر بابەتی عەقیدەیی، یەکێکیش لەو بابەتە عەقیدەییانەی کە باسی ئەکات ئەوەیە کە هەردووکیان پێیان وایە قورئان مەخلوقە، جا ئێستا پێم بڵێن ئەوانەی وتوویانە فعلی عەبد مەخلوقە لەکوێ هاوڕای موعتەزیلەیان کردووە دەربارەی قوڕئان ؟!

بەڵگەیەکی تر لە جیاکاری نەکردن لە نێوان لەفزیەکان و ابن کلاب

**سعد الزنجاني** دەربارەی (ابن كلاب) ئەڵێ:

بڕوای وایە کە الله هیچ کەلامێکی نیە ببیسترێ لێیەوە، وە جبریل هیچی نەبیستووە لە الله لەو شتانەی کە گەیاندوویەتی بە پێغەمبەرانی، وە ئەوەی کە دابەزیوە بەسەر پێغەمبەران حیکایەتی کەلامی الله بووە، کەلامی الله نە فرمانە نە نەهیە نە خەبەرە نە پرسیارە، وە ئەم شتانە لە الله-وە ئەزانرێ بە ڕێگای تر، وە الله ووشەی نیە و هیچ زمانێکی نیە، جا ئەم ئایەتانەی قورئانی بە درۆ دانا ﴿قُل لَّوۡ كَانَ ٱلۡبَحۡرُ مِدَادًا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّي لَنَفِدَ ٱلۡبَحۡرُ قَبۡلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّي وَلَوۡ جِئۡنَا بِمِثۡلِهِۦ مَدَدًا﴾، وە فەرمایشتی: ﴿وَلَوۡ أَنَّمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن شَجَرَةٍ أَقۡلَٰمٌ وَٱلۡبَحۡرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦ سَبۡعَةُ أَبۡحُرٍ مَّا نَفِدَتۡ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾، وە تەحەددا کردن و ئیعجازی بەتاڵ کردەوە لە فەرمایشتی الله: ﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِسُورَةٍ مِّثۡلِهِۦ﴾، ﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِعَشۡرِ سُوَرٍ مِّثۡلِهِۦ مُفۡتَرَيَٰتٍ﴾، موخالەفەی هەموو ئوممەتی کرد بەوەی کەلامی الله و کتێبی الله بوونی نیە لە زەویدا، وە ئەو و الأشعري و جگە لەوانیش لە لەفزیەکان بڕوایان وایە کەلامی الله لە حەقیقەتدا نە عەرەبیە و نە نەصرانیە و نە عیبرانیە و نە سریانیە، وە بە هیچ زمانێک لە زمانەکان نیە، وە ناکرێ سورەت و ئایەت بێت و جوزء و ژماردنی هەبێت، وە ناکرێ دابەزێ بۆ هیچ کام لە پێغەمبەران لە حەقیقەتدا، وە بوونی نیە لە هیچ شوێنێک، نە لە دڵدا نە لە زماندا و نە لە موصحەفدا.

**(شرح المنظومة الرائية في السنة : ١١١-١١٣)**

جوان سەیری ئەو ووتانەی بکە کە ووتی: (ابن كلاب و ابو الحسن الأشعري و جگە لەوانیش لە لەفزییەکان بڕوایان وایە کەلامی الله لە حەقیقەتدا نە عەرەبیە و نە نەصرانیە و نە عیبرانیە و نە سریانیە، وە بە هیچ زمانێک لە زمانەکان نیە، وە ناکرێ سورەت و ئایەت بێت و جوزء و ژماردنی هەبێت، وە ناکرێ دابەزێ بۆ هیچ کام لە پێغەمبەران لە حەقیقەتدا، وە بوونی نیە لە هیچ شوێنێک، نە لە دڵدا نە لە زماندا و نە لە پەڕاودا) ئەمە مانای چیە ؟ واتا لەفزییەکانیش هاوڕای ئەوانن کە ئەم قورئانەی سەر زەوی مەخلوقە، ئیمامی لەفزییەکانیش کەرابیسیە، بڕوایان وایە کەلامی الله بوونی نیە لە زەویدا ئەوەی هەیە حیکایەت و تەعبیرە لە کەلامە نەفسیەکەی الله کە نە دەنگە و نە پیتە، بۆیەش ئیمام احمد هەمیشە بەم ئایەتە ڕەددی ئەدانەوە (حتى يسمع كلام الله) چونکە ئەوان بڕوایان وانەبوو ئەوەی لەسەر زەوییە کەلامی الله بێت، ئەگینا گەر کێشەی ئەوان ئەوەبێ کە بڵێن فعلی عەبد مەخلوقە، ئەوا چ زەحمەتیەکی تێدا بوو بڵێن فعلی عەبد مەخلوقە هەروەک بوخاری ووتی ؟ ئەی ئیمام احمد بۆ لە ڕەددانەوەیان هەمیشە باسی ئەوە ئەکات ئەو قورئانەی سەر زەوی کەلامی الله و قورئان مەخلوق نیە ؟ ئیمام احمد لێیان تێناگات مەزهەبیان چیە ؟ یان ئەوان نازانن مەزهەبی خۆیان بەیان بکەن و بڵێن مەبەستمان ئەوەیە فعلی عەبد مەخلوقە ؟ یان ئەوان ئەزانن چی ئەڵێن، ئیمام احمدیش ئەزانێ چی ئەڵێن، بەڵام تۆ نازانیت لەفزییەکان کێن، وائەزانی ئەوانەن کە ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوقە، تەحەدداتان ئەکەم یەک زانای ئەهلی سوننە بهێنن تەنها یەک زانا کە لە پێناسەی فرقەی لەفزییەکاندا بڵێ: لەفزییەکان ئەوانە بوون کە ئەیان ووت: فعلی عەبد و کاغەز و حیبر و دەنگی عەبد مەخلوقە، خۆ زۆر زانا باسی لەفزییەکانی کردووە یەکێک بهێنن ئەم

ووتانەی دابێتە پاڵ لەفزیەکان، بەڵکو هەرچی زانا هەیە لە چوارچێوەی جەهمیەکان باسیان ئەکەن کە مەبەستیان ئەوە بووە بڵێن قورئان مەخلوقە، هەروەک لە پۆستەکانی سەرەتا باسمان کرد ئیمام احمد ووتی جەهمیەکان بوون بە سێ بەش، بەشێکیان بە ئاشکرا ووتی قورئان مەخلوقە، بەڵام لەفزیەکان و واقفیەکان ویستیان بە فێڵ بڵێن قورئان مەخلوقە، بۆیە ئیمام احمد ووتی هەر سێکیان هەمان ووتەیان هەیە و هەر سێکیان کافرن.

ڕەحمەتتان لێبێ هۆش بێننەوە بەر خۆتان و تێبگەن، ئێمە باسی لەفزیەکان ئەکەین کە سەلەف تەکفیریان کردوون، ئەبێ بزانین لەفزیەکان کێ بوونە و عەقیدەیان چۆن بووە و ئیمامەکەیان کێیە، تاکو لە حوکمی سەلەف تێبگەین بۆ ئەوان کافرن، ئاخر تۆ کە کەسێک تەکفیر ئەکەیت مەناتەکانی تەکفیر کردن لە شەرعدا دیارە، ئەڵێی ئەمە کافرە لەبەر ئەم شتە، کەس ناتوانێ بڵێ لەخۆمەوە کەسێک تەکفیر ئەکەم بەبێ هەبوونی مەناتی تەکفیر تێیدا، یان مەناتێک باس بکات کە لە عەقیدەی ئەهلی سوننە مەناتی تەکفیر نەبێ، ئاخر وەرە پێم بڵێ مەناتی تەکفیری لەفزیەکان چیە ؟ گەر ئەڵێی ئەوەیە مەبەستیان بووە بڵێن قورئان مەخلوقە، ئەوا بارك الله فيك تەواوە، گەر ئەڵێی مەناتی تەکفیریان ئەوە بووە تەنها بڕوایان وابووە فعلی عەبد مەخلوقە لە دەنگی و لە جوڵەی زمان و لێوی، ئەمە کارەساتە، ئینجا وەرە بزانە ئیمامەکەیان چی ووتوە، یەک ووتەی هەیە بڵێ مەبەستم ئەوەیە فعلی عەبد مەخلوقە ؟ یەک زانا ئەبینیت لە وەسفی ئەم فرقەیەدا بڵێ: لەفزیەکان ئەوانە بوون کە ئەیان ووت فعلی عەبد مەخلوقە ؟ ئیللا ئەو کەسانە نەبن کە لە عەقیدە هێندە شارەزا نین و دەورێکی ئەوتۆیان نەبووە لە باسکردن و ڕوونکردنەوەی عەقیدەی سەلەف و

تێگەیشتن لێی، ئەوەندەی کە فێریشی بوونە لە ابن تیمیة فێری بوونە، وەک الذهبي بە جۆرێک باسی کەرابیسی ئەکات کە ئیمام احمد ناشرین ئەکات لەبەرچاوی خەڵک، بە پشت بەستن بە ریوایەتێک کە هیچ کام لە کتێبەکانی سەلەف بوونی نیە بەڵکو دژەکەی بوونی هەیە

**الذهبي** ئەڵێ:

المروذي ئەڵێ: ووتم بە باوکی عبدالله کەرابیسی ئەڵێ: لەفزم بە قورئان مەخلوقە، وە هەروەها ووتی: ئەڵێم: قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە لە هەموو ڕووێکەوە، بەڵام لەفزم بە قورئان مەخلوقە، وە هەر کەسێک نەڵێ: لەفزم بە قورئان مەخلوقە ئەوا کافرە.

باوکی عبدالله ووتی: بەڵکو خۆی کافرە، قاتله الله، جا جەهمیەکان چ شتێکیان ووت جگە لەمە ؟! ووتیان قورئان کەلامی الله یە، پاشان ووتیان مەخلوقە، ئەم ووتەیە سودی پێناگەیەنێت ووتەکەی کۆتایی ووتەکەی سەرەتای هەڵوەشاندەوە کاتێک ووتی لەفزم بە قورئان بە مەخلوقە.

**(تاريخ الإسلام : ٨٥/١٨)**

ئەم ووتەیەی کە الذهبي ئەیداتە پاڵ کەرابیسی گوایە وتوویەتی قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە لە هیچ ڕووێکەوە، ئەمە ووتەیەکی هەڵەیە و هەڵەی ئەم ووتەیەش

ڕوونە، چونکە ئەم ووشانە (لە هەموو ڕووێکەوە، لە هەموو بارێکەوە، لە هەموو حاڵێکەوە) سەلەف هەرگیز نەیان ووتوە تا ئەوکاتەی کەرابیسی ووتی لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، ئیمام احمد ئەم ووشانەی زیاد کرد بۆ ڕەددانەوەی لەفزیەکان، واتا قورئان بخوێندرێ و بنوسرێ و ببیسترێ و حفز بکرێ لە هەموو حاڵێکیدا غەیر مەخلوقە بەهۆی هەڵسانی عەبدی مەخلوق بەم کارانە قورئانەکە نابێتە مەخلوق، جا کەسێکی وەکو کەرابیسی کە خۆی ئەم ووتانە بەکارهاتوون لە دژی خۆی بۆ وەڵامدانەوەی کوفرەکەی، چۆن خۆی هەمان ئەم ووتانە ئەڵێتەوە کە بۆ ڕەددانەوەی خۆی بەکارهاتووە ؟! مع العلم هیچ کام لە کتێبەکانی سەلەف کە قوتابیەکانی ئیمام احمد و حەنبەلیەکان خاوەنین ئەم ووتەیە باس ناکەن لە کەرابیسیەوە، الذهبي بە حیساب ئەم ووتەیە لە المروذي نەقل ئەکات، کەچی الخلال کە قوتابی المروذي-ە ڕاستەوخۆ ئەم ڕووداوە لە المروذي نەقل ئەکات باسی ئەوە نەکات کە کەرابیسی قسەی لەم جۆرەی کردبێ، تەنها وتوویەتی لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، عبدالله کوری ئیمام احمدیش تەنها ئەمە لە کەرابیسی نەقل ئەکات کە وتوویەتی لەفزم بە قورئان مەخلوقە لەمە زیاتر نا، تەنانەت ابن أبي يعلى لە طبقات الحنابلة لە ابو الحارث الصائغ و حنبل بن اسحاق و المروذي لە هەر سێکیانەوە نەقل ئەکات کە بە ئیمام احمد ئەڵێن کەرابیسی ئەڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە، هیچ کام لە حەنبەلیەکان ئەوانەی ناسراون بە ریوایەت کردنی ووتەکانی ئیمام احمد ئەم ووتەیە نادانە پاڵ کەرابیسی، تەنانەت کەسیان ریوایەتیان نەکردووە کە کەرابیسی بڵێ قورئان مەخلوق نیە، چ جای ئەوەی ریوایەتی بکەن کە کەرابیسی بڵێ قورئان مەخلوق نیە لە هیچ ڕووێکەوە، بەڵام الذهبي گەر تۆزێک عەقڵی هەبوایە ئەبوایە لە

قسەکانی ئیمام احمد تێبگات کە کەرابیسی چی ووتوە، نەک بڵێ کەرابیسی ووتەکەی حەقە بەڵام احمد بۆیە تەکفیری کرد تاکو دەرگاکە دابخات و کەس لەم ڕێگایەوە نەڵێ قورئان مەخلوقە!!! لای ئەو تەکفیر کردن ئاو خواردنەوەیە، واتا ئیمام احمد ئەزانێ ووتەکەی کەرابیسی حەقە بەڵام تاکو ووتەکەی نەبێتە پرد بۆ جەهمیەکان کەرابیسی تەکفیر ئەکات! حیساب بکە مێشێکی کوشتووە بە خەیاڵی دانایەت لەسەر ووتنی حەق خەڵک تەکفیر بکات بە بیانووی ئەوەی نەوەک ووتەکەیان ببێتە فیتنە!!! ئەم جۆرە تێگەیشتنەیە کە ئیمام احمد ناشرین ئەکات لەم بابەتە، ئەمە لایەقە بە پێگەی ئیمام احمد خەڵک لەسەر ووتنی حەق تەکفیر بکات تەنها بۆ داخستنی دەرگای فیتنە ؟! ئینجا خۆ لە ووتەکانی ئیمام احمد دیارە کەرابیسی مەبەستی چی بووە بەڵام الذهبي تێناگات، ئیمام احمد ئەڵێ جا جەهمیەکان چیان ووت جگە لەمە ؟! ئایا جەهمیەکان ئەیان ووت قورئان مەخلوقە بە راشکاوی ؟ یان ئەیان ووت قورئان کەلامی الله یە و لە هیچ ڕوویێکەوە مەخلوق نیە، بەڵام لەفزی ئێمە مەخلوقە بۆیە تەکفیر کران ؟ حەتمەن ئەوەی یەکەم ووتەی جەهمیەکان بوو، بەڵام الذهبي لە مەزهەبی کەرابیسی تێنەگەیشتووە بەم ووشەیە (لە هەموو ڕوویێکەوە) هەڵخەڵەتاوە یان خۆی هەڵخەڵەتاندووە، ئیمام احمد ئەڵێ جەهمیەکان ووتیان قورئان کەلامی الله یە، پاشان ووتیان مەخلوقە، کەرابیسیش هەمان شتی ئەوانی ووت، ئێ دە تێبگە واتا ووتەکەی کەرابیسیش ئەوە بووە کە قورئان مەخلوقە، خۆ ئیمام احمد درۆ بە دەمی ناکات، یان کەسێکی هێندە بێ باک نیە لە ووتەی کەسێک دڵنیا نەبێت و تەکفیری بکات و شتێکی بداتە پاڵ کە بەریە لێی، تەنانەت کە ئەڵێ ووتەکەی کۆتایی ووتەکەی سەرەتای هەڵوەشاندەوە، واتا ئەو سەرەتا ووتی قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە،

دواتر ئەڵێ لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، ئێ لەم حاڵەدا قورئانی سەر زەوی کرد بە مەخلوق کە بەندەکان بە لەفزی خۆیان دەری ئەبڕن، ئیتر ووتەکەی سەرەتای هەڵوەشاندەوە.

ابن كثير ئەویش لە الذهبي شێخی هەمان شتی وەرگرتووە و پێی هەڵخەڵەتاوە ئەڵێ قسەکەی کەرابیسی حەق بوو هەمان قسەی بوخاری بوو، بەڵام ئیمام احمد بۆ ئەوەی باسەکە یەکلا بکاتەوە و بۆ ئەوە نەچێت کە بووترێ قورئان مەخلوقە کەرابیسی تەکفیر کرد!!! ئاخر کابرا گەر عەقیدەی سەحیح بوو لەفزەکەی هەڵە بوو پێی ئەووترێ ئەم لەفزە بەکار مەهێنە، چۆن تەنها لەسەر ئەمە تەکفیر ئەکرێ!!! تەنانەت ڕەحمەتیش بۆ کەرابیسی ئەنێرێ!!! ئەڵێ داود الأصبهاني ئەویش بە هەمان شێوەی کەرابیسی بووە!!!

**بڕوانە (طبقات الشافعيين : ١٣٣)**

ئەوەمان بیرنەچێ هەریەک لە کەرابیسی و الذهبي و ابن كثير شافعی مەزهەبن، ابن كثير ناسراوە بە گەورە وەسف کردنی شافعی مەزهەبەکان تەنانەت ئەوانەش کە کافرن و کوفرەکانیان ڕوونە لە ئەشعەریە شافعی مەزهەبەکان هیچ ڕەخنە و زەمێک ئاراستەیان ناکات تەنها ئەوەیە خۆی وەک ئەوان تەئویلی سیفات ناکات، ئەگینا ڕەحمەت بۆ ابو اسحاق الشيرازي ئەنێرێت و زۆر بە گەورە وەسفی ئەکات لە کاتێکدا

ابو اسحاق پێی وایە ئەوەی ئەشعەری نەبێت کافرە! تەنانەت رەحمەت بۆ ابن القشيري ئەنێرێ و مەدحی ئەکات لە کاتێک خۆی ئەڵێ قوتبی ئەشعەریەکان بوو

بەڵام الذهبي لە میزان الاعتدال جەزم ناکات بەوەی کە کەرابیسی مەبەستی چی بووە

**الذهبي** دەربارەی کەرابیسی ئەڵێ:

ئەیووت: قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە لەفزم بە قورئان مەخلوقە.

الذهبي ئەڵێ: گەر مەبەستی تەلەفوز بێت (واتا فعلی عەبد) ئەوا باشە، چونکە فعلی ئێمە مەخلوقە، وە ئەگەر مەبەستی ئەوە بێت مەلفوز مەخلوقە (واتا قورئان)، ئەوا ئەمە بوو کە احمد و سەلەف ئینکاریان لێ کرد و بە جەهمی بوونیان دانا.

**(ميزان الاعتدال : ٥٤٤/١)**

لێرەدا الذهبي دڵنیا نیە کەرابیسی مەبەستی چی بووە، بەڵام خۆ ئەبوایە لە مەوقیفی ئیمام احمد تێبگات کە کەرابیسی مەبەستی چی بووە، ئەوەتا خۆی ئەڵێ گەر کەرابیسی مەبەستی مەخلوقی قورئان بێت ئەوا ئەمە بوو کە ئیمام احمد و سەلەف ئینکاریان لێ کرد و بە جەهمی بوونیان دانا، ئێ مادام ئەمە ئەزانیت خۆ ڕوونە ئیمام احمد کەرابیسی بە جەهمی دانا و تەکفیری کرد، کەواتە تێبگە کە کەرابیسی مەبەستی مەخلوقی قورئان بووە.

**ابن تيمية** ئەڵێ:

بوخاری نەی ووتوە لەفز مەخلوقە، وە نەی ووتوە غەیر مەخلوقە، هەروەک احمد نەهی لە هەردووکیان کرد، وە ئەوەی بوخاری وتوویەتی مەخلوقە فعلی عەبد و سیفەتەکانیانە، وە احمد و جگە لەویش لە سەلەف نەیان ووتوە فعلی عەبد مەخلوق نیە، ئەگەرچی بێدەنگیش بووبن لێی بەهۆی ڕوون و ئاشکرایی باسەکە، وە لەبەر ئەوەش کە مەبەستیان بوو ڕەددی جەهمیەکان بدەنەوە، وە ئەوەی احمد وتوویەتی مەخلوق نیە کەلامی الله یە نەک سیفەتی عەبدەکان، وە بوخاری نەی ووتوە کەلامی الله مەخلوقە، بەڵام احمد مەبەستی ڕەددانەوەی ئەو کەسە بوو کە کەلامی الله ئەکات بە مەخلوق کاتێک کە ئەیگەیەنێت لە الله-وە، وە بوخاری مەبەستی ئەو کەسە بوو کە ئەڵێ: فعلی عەبدەکان و دەنگەکانیان مەخلوق نین، وە هەردووک مەبەستەکە دروستن و دژایەتی نیە لە نێوانیان.

**(مجموع الفتاوى : ١٦/٣٩٢)**

بڕوانە ئەم ووتەیە (بەڵام احمد مەبەستی ڕەددانەوەی ئەو کەسە بوو کە کەلامی الله ئەکات بە مەخلوق کاتێک کە ئەیگەیەنێت لە الله-وە، وە بوخاری مەبەستی ئەو کەسە بوو کە ئەڵێ: فعلی عەبدەکان و دەنگەکانیان مەخلوق نین) ئەو کەسەی کە ئەڵێ کەلامی الله ئەبێتە مەخلوق کاتێک بەندەکان ئەیگەیەنن، ئەمە لەفزیەکان بوون کە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، واتا کاتێک ئێمە ئەیگەیەنین بە لەفزی خۆمان قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق، کە ئەوانەی جیاوازی ئەکەن لەنێوان

مەزهەبی کەرابیسی و ابن کلاب پێیان وایە لەمەدا جیاواز بوون، ابن کلاب نەفی ئەوەی ئەکرد الله بە پیت و بە دەنگ قسە بکات ئەیووت کەلامی نەفسی هەیە، بەڵام کەرابیسی نەفی دەنگ و پیتی نەئەکرد، بەڵام ئەیووت کە بەندەکان بە لەفزی خۆیان قورئان دەرئەبڕن قورئانەکە ئەبێتە مەخلوق، وە بوخاریش ڕەددی ئەوانەی ئەدایەوە کە ئەڵێن فعلی عەبد و دەنگی عەبد مەخلوق نیە، بۆیە بەڵگەی هێنایەوە بۆیان کە دەنگی عەبد و فعلی عەبد مەخلوقن.

هشام بن عمار ئەویش لەفزی بووە ئەیووت قورئان بە لەفزی جبریل و محمد عليهما السلام ئەبن بە مەخلوق، ئیمام احمد تەکفیری کرد، ووتی ئەمە جەهمیە جورئەتی لە کەرابیسی زیاترە، کەرابیسی جورئەتی نەکرد باسی جبریل و محمد بکات

**بڕوانە (السنة للخلال : ٢٠٩٦)**

بەڵام ڕیوایەتێک هاتووە لە تاریخ دمشق کە هشام بن عمار حاشا ئەکات لەوەی کە ئەو لەفزی بێت و هەمان عەقیدەی کەرابیسی هەبێت، جا لە قسەکانی هشام بن عمار دەرئەکەوێ کە کەرابیسی عەقیدەی چۆن بووە

### عبدالله بن محمد بن منصور البزاز ئەڵێ:

بیستم هشام بن عمار پێیگەیشت کە کەسانێک ئەیدەنە پاڵ لەفزییەکان، جا هشام تورە بوو ووتارێکی دا، تێیدا سەنای الله تعالی کرد، وە وەسفی کرد بە شەش ئایەتەکەی سەرەتای سورەتی الحدید، وە خوێندیەوە بەسەرمان و باسی عەزەمەتی الله تعالی کرد بە جۆرێک کە گوێگران سەرسام بوون پێی بەهۆی جوانی ووتەکانی، پاشان باسی قورئانی کرد ووتی: کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە هەر کەسێک بڵێ قورئان یان قودرەتی الله یان عیززەتی الله مەخلوقە ئەوا ئەم کەسە لە کافرانە، بە هشام ووترا: ئەی چی ئەڵێی دەربارەی ئەو کەسەی کە ئەڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە ؟ ووتی: (قل هو الله أحد، الله الصمد، لم يلد ولم يولد) ئەمەی کە خوێندمەوە کەلامی الله یە، پێی ووترا: کەسانێک لە بغداد باسی ئەوە ئەکەن کە تۆ نامەت بۆ کەرابیسی ناردووە، هشام ووتی: کەرابیسی کێیە ؟ هەرگیز نەم بینیوە، وە نازانم کێیە، والله هەرگیز نامەم بۆی نەنوسیوە.

**(تاريخ دمشق : ٣٢/٣٧٠)**

هشام بن عمار جەهمیە لە بابەتی سیفات ئەمەی لەسەر چەسپاوە گەر لەفزیش بێت یان نەبێت، بەڵام لەم ڕیوایەتە بۆت دەرئەکەوێ کە هەموو خەڵکی ئەزانن لەفزییەکان کێن، بۆیە کاتێک پرسیاری بابەتی لەفز و کەرابیسی لێئەکەن، چەند ئایەتێکی قورئان ئەخوێنێتەوە و ئەڵێ ئەم ئایەتانە کەلامی الله-ن، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت بەریە لە لەفزییەکان چونکە ئەوان پێیان وایە ئەوەی ئەبیسترێ و

ئەنوسرێ و ئەخوێندرێ کەلامی الله نیە، گەر بە کەلامی الله-ش وەسفی بکەن بە مەجازی پێی ئەڵێن کەلامی الله نەک بە حەقیقی.

پوختەی ئەم پۆستە: هەریەک لە کەرابیسی و ابن کلاب بڕوایان وایە ئەم قورئانەی سەر زەوی مەخلوقە، جا کەرابیسی هاوڕای ابن کلاب بێ لە نەفی کردنی دەنگ و پیت یان نا، بەڵام لە مەخلوقی قوڕئان هاوڕان.

ان شاء الله لە پۆستی داهاتوو باسی مەزهەبی داود الأصبهاني ئەکەین کە قوتابی کەرابیسی بووە

---

ماویەتی

# بەشێک

پێم خۆشە موسڵمانی سوننی توند دەست بە دینەکەی و مەزهەبی ئەهلی سوننە بگرێت و هیچ شل بوونەوەیەکی تێدا قبوڵ نەکات، لە هەمان کاتیشدا هیچ توندی و زیادەڕەوییەک قبوڵ نەکات کە لە مەزهەبی ئەهلی سوننە نیە.

گەر بینیان کەسێک ئەیەوێ عەقیدەی جەهمی زیندوو کاتەوە تێیاندا یان هەر بیدعەیەک بخاتە ناویانەوە و بانگەشەی بۆ بکات ئەوا ئەبێ شەقی تێهەڵدەن و ڕیسوای بکەن و نێوانی لەگەڵ دابڕن و هەجری بکەن و تەحزیری لێ بدەن، تا ئەوکاتەی تەوبە ئەکات، چۆن بە بیدعەکەی ناسرا ئاواش ئەبێ بە تەوبەکەی بناسرێت و هەموو خەڵکی بزانن تەوبەی کردووە، نەک سینگ دەرپەڕێنێت و هاش و هوش بکات دواتر کە زانی هەڵەیە لە نێوان خۆیی و الله دا بە نهێنی تەوبە بکات و بیەوێت هەر لەسەر ئەهلی سوننە حیساب بکرێت.

بە هەمان شێوەش کەسێک کە غلو ئەکات و کاریگەر ئەبێت بە خەواریجەکان و گومڕاکان لەخۆیەوە حوکمی تەکفیر و تەبدیع ئەدات، دواتر کە زانرا هەڵە بووە ئەبێ ئەمەش شەقی تێهەڵدرێ و ڕیسوا بکرێت و بە ئەهلی سوننە حیساب نەکرێ کە بە جەهلەوە کەوتۆتە تەکفیر کردن و تەبدیع کردنی ئەهلی سوننە

نابێ ئەهلی سوننە تەنها کێشەیان لەگەڵ شلڕەوەکان هەبێت، بەڵکو ئەبێ بە هەمان شێوە توندڕەوەکانیش بە ئەهلی سوننە نەزانن و دژایەتیان بکەن، نابێ هەمیشە بۆ حوکمدان بە جەهمی بوون و بیدعی بوونی خەڵکی ئازا و بێ باک بن، بەڵام بۆ حوکمدان لەسەر غولاتەکان کە لە مەزهەبی ئەهلی سوننە حاڵی نەبوونە بە جەهلەوە حوکم ئەدەن بەرامبەریان شل بن و بڵێن هەر بەڕێزە و ئەهلی سوننەیە و نەیزانی و هەڵە تێگەیشتنێکی بچووک بوو.

گەر تۆ وەک ئەهلی سوننەیەک تەنها شل بوونەوە لە دین بە بیدعە و گومڕایی ئەزانیت و دژایەتی ئەکەیت، بەڵام زیادەڕەوی و حوکم دان بە تەکفیر و تەبدیع بە جەهلەوە بەلات شتێکی هێندە گەورە نیە، گەر بۆشت روون بوویەوە ئەو کەسانە هەڵەن هیچ مەوقیفێکی توند نانوێنی بەرامبەریان، ئەوا تۆ ئەهلی سوننەی بە تامی خەواریج، چونکە خەواریجەکان هەمیشە کێشەیان لەگەڵ ئەوەیە کەسێک کافر بوو تەکفیر نەکرێ کەسێک مبتدع بوو تەبدیع نەکرێ، بەڵام گەر کەسێک بە هەڵە تەکفیر و تەبدیع کرا هێندە بەلایەنەوە گەورە نیە و دژایەتی ناکەن.

بۆیە لێرەوە ئەیڵێم لەم بابەتی لەفزە و هەموو بابەتێکی تر، گەر بۆتان ڕوون بوویەوە لە کۆتایی کە من ئەمەوێ بانگەشە بکەم بۆ لەفزییەکان یان بۆ هەر بیدعەیەک کە ئەهلی سوننە بە بیدعە یان بە کوفریان زانیوە، ئەوا شەقم تێهەڵدەن و ڕیسوام بکەن گەر بەڕاستی ئەهلی سوننەن و خەمخۆرن بۆ دین و عەقیدەی خۆتان و خەڵکی، ئەبێ پێم بووترێ تۆ هاتووی خەڵکی توشی کوفر و بیدعە بکەیت، ئێمە دژایەتیت ئەکەین و بە ئەهلی سوننەت نازانین.

وە هەر کەسێکیش کە دواتر بۆتان ڕوون بوویەوە کە لە باسەکە حاڵی نەبووە لەخۆیەوە ئەهلی سوننە تەکفیر و تەبدیع ئەکات ئەوا ئەبێ ئەویش شەق تێهەڵدرێ و تەبدیع بکرێ و هەجر بکرێ، مادام سینگی دەرپەڕاندووە و بە ئاشکرا بانگەشەی کردووە بۆ عەقیدەکەی، ئەبێ پێی بووترێ تۆ لە باسەکە حاڵی نەبوویتە هاتووی لەخۆتەوە ئەهلی سوننە تەکفیر و تەبدیع ئەکەیت و ئەتەوێ خەڵکیش وەکو خۆت گومڕا بکەیت.

بەڵام ئەوەی بەبێ دەنگی دانیشتووە و قسەی بۆ کەس نەکردووە و باسی هیچی نەکردووە ئەوا لەنێوانی خۆیی و الله دا تەوبە ئەکات کە حەق بۆ روون بوویەوە، بەڵام ئەوانەی قسەیان کردووە و بانگەشەیان کردووە ئەبێ بە ئاشکرا تەوبەکەیان ئیعلان بکەن بۆ خەڵکی و پێی بناسرێن ئەوکات وەکو ئەهلی سوننە حیساب بکرێن، جا من بم یان هەر کەسێک بێت.

گەر بە ڕاستگۆییەوە ئەهلی سوننە بین ئەوا ئەمەیە عەقیدەی ئەهلی سوننە هەروەک چۆن دژایەتی شلرەویان کردووە ئاواش دژایەتی غلویان کردووە، بەڵام گەر ووتت ئەویان جەهمیە و مبتدعە، بەڵام ئەوی تریان برامانە نەیزانی و هەڵەیەکی بچووک بوو کە خەڵکی تەکفیر و تەبدیع کرد، ئەوا تۆ ئەهلی سوننەی بە تامی خەواریج.

# بەشێک

١١ پۆستە باسی کوفری لەفزییەکان ئەکەم

هاتووە ئەڵێ گوایە من وتوومە: ئاساییە بڵێی لەفزم بە قورئان مەخلوقە مادام مەبەستت قورئان نیە!

گەر من ئەمەم ووتوە الله ریسوام بکات

گەر نەم ووتوە الله ریسوات بکات

ئامین

هەموو پۆستەکانیش ماون چیم ووتوە

بەڵام نەخوێندەواری ئێوە ئەقۆزنەوە

من پێشتریش ووتم فێڵتان لێ نەکەن بڵێن سەلەف نەیان وتووە ئیمان مەخلوقە یان غیر مخلوق، یان لەفز مەخلوقە یان غیر مخلوق، چونکە ئەمانە دوو ووشەی

موجمەلن، بەڵام ئەمانە هاتوون ووشە ڕوونەکانیش ئەکەن بە موجمەل، ئەڵێن نابێ بڵێی کاغەز مەخلوقە، نابێ بڵێی حیبر مەخلوقە، نابێ بڵێی دەنگی عەبد و فعلی عەبد مەخلوقە، ووتە روونەکان یەکسان ئەکەن بە ووتە موجمەلەکان، تەحەدایان ئەکەم یەک ووتەی سەلەف بهێنن کە بڵێن نابێ بڵێی دەنگم مەخلوقە، نابێ بڵێی کاغەز مەخلوقە، نابێ بڵێی حیبر مەخلوقە، گەر ئەمانەت ووت کافری جەهمی، سەلەف وتوویانە نابێ بووترێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە تیلاوەم بە قورئان مەخلوقە قیرائەم بۆ قورئان مەخلوقە، چونکە هەموو ئەمانە لەفزی موجمەلن ئەکرێ بگەڕێنەوە بۆ قورئانیش، بەڵام کوا کام سەلەف وتوویەتی باسی مەخلوقی دەنگی عەبد و فعلی عەبد و کاغەز و حیبر مەکەن، وای لێهاتووە بڵێن مەڵێن تەلەفزیۆن مەخلوقە کاتێک کە قورئانی تێدایە چونکە قورئانەکە لە تەلەفزیۆنەکە دێتە دەرەوە، ئەو مۆبایلەی دەستت کە قورئانی تێدایە مەڵێ مەخلوقە ! ئینجا ئێمە ووتەی سەلەفمان هەیە کە ئەگەر بڵێی فعلم مەخلوقە بەڵام بە لەفزێکی موجمەل دەری بڕیت لێت قبوڵ ناکرێ، هەروەک ابو زرعة ووتی نابێ بڵێی لەفزم بە قورئان مەخلوقە چونکە لەفزیشم هەر فعلی خۆمە، فعلی منیش مەخلوقە، ئیشکال لەوە نیە بووترێ فعلم مەخلوقە بەڵام کە ووتت لەفزم با مەبەستیشت فعلت بێ ئەوا ووتەکەت موجمەلە، هەروەک حرب لە اسحاق بن راهویە ئەپرسێ کەسێک ئەڵێ تیلاوەم بە قورئان مەخلوقە، چونکە تیلاوە کەلامی خۆمە کەلامی منیش مەخلوقە، اسحاق ئەڵێ ئەمە بیدعەیە ئیقرار ناکرێ لەسەر ئەمە.

چونکە تیلاوەم بە قورئان و لەفزم بە قورئان و قیرائەم بۆ قورئان هەموو ئەمانە کە قورئانی لەپاڵ هات ئەکرێ مەخلوقیەکە بۆ قورئان بگەڕێتەوە، بە خیلافی ئەوەی کە

ئەڵێی فعلی عەبد مەخلوقە و قورئان کەلامی الله یە مەخلوق نیە ئەمە بە هیچ جۆرێک مەخلوقیەکە ناگەڕێتەوە بۆ قورئان، وە تەحەددایان ئەکەم یەک سەلەف بهێنن کە لەسەر ئەوە خەڵکی تەکفیر کردبێ کە بڵێ فعلی عەبد مەخلوقە بەڵام قورئانەکە کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، هەرچی حوکمی سەلەف هەیە دەربارەی ووشە موجمەلەکان بووە وەک قیرائە و تیلاوە و لەفز، وە دڵنیاتان ئەکەمەوە ئەوانەی کە دەست گرتن بە سوننەت پێمان ئەفرۆشنەوە عەقیدەیان لەم بابەتە پارچەیەکە لە گومڕایی کە یان کافرن یان مبتدع، وە هیچ چاریان نیە لە یەکێک لەم دووانە دەرچن، تەنانەت قسەم لەگەڵ هەندێکیان کردووە عەقیدەی لە کوفرەکە نزیکتر بووە، وتوویەتی من نازانم دڵی ئینسان کە قورئانی تیایە کاغەز کە قورئانی تیایە حیبر کە قورئانی پێ نوسراوە، نازانم ئەمانە مەخلوقن یان نا، بیریشی لێ ناکەمەوە، واتا نەک بڵێ لە دڵی خۆم ئەزانم کاغەز و دڵ و حیبر مەخلوقن بەڵام دەری نابڕم، بەڵکو ئەیووت هەر بیریشی لێ ناکەمەوە و نایزانم! ئێ چۆن بڵێی نازانم قورئان مەخلوقە یان نا کافریت، بەهەمان شێوە بڵێی نازانم شتێکی مەخلوقی وەک کاغەز و دڵی مرۆڤ و حیبر مەخلوقن یان نا، ئەوا نزیکی لە کوفر چونکە توقف ئەکەیت لە مەخلوق بوونی شتێکی مەخلوق، بەمە ئەم شتە مەخلوقە لە زاتی الله و سیفەتەکانی نزیک ئەکەیتەوە، گەر ئەڵێن ئێمە لە دڵەوە ئەزانین فعلی عەبد و دەنگی و کاغەز و دڵی و حیبر ئەمانە مەخلوقن، بەڵام بە دەم دەری نابڕین تەنها لە دڵمان بڕوامان پێیەتی، ئەوا ئەوکات هەمان عەقیدەی بوخاریتان هەیە لە دڵەوە، بەڵام بوخاری بە دەم دەری بڕی کافرە یان مبتدع، بەڵام ئێوە کە لە دڵی خۆتان شاردتانەوە ئەهلی سوننەن! ئەمە ڕێک عەقیدەی مونافیقەکانە ئەوەی لە دڵتە بیشارەوە و دەری مەبڕە! گەر دەرت بڕی

کافری یان مبتدع ! ئەمە چ عەقیدەیەکە لە دڵەوە بڕوات پێی بێت ئەهلی سوننەی بەڵام بە دەم دەری بڕیت کافریت یان مبتدع ؟!

گەر ووتیان ئەم پرسیارانە دروست نین و بیدعەن، بڵێ کوا بەڵگەم نیشان بدە، سەلەف باسی ووتە موجمەلەکان ئەکەن ئەڵێن نابێ بووترێ مەخلوقە یان نا، خۆ نەیان ووتوە ئەوەی وازحیش بێت و هیچ ناڕوونی دروست نەکات هەر نابێ بووترێ مەخلوقە، ئەمانە وایان لێکردوون تەنها توقف مەکەن لە قورئان، بەڵام ئاساییە توقف بکەیت لە دڵ و کاغەز و رادیۆ و تەلەفزیۆن و مۆبایل کاتێک قورئانیان تیایە ! ئێ چۆن توقف کردن لە کەلامی الله نەڵێی مەخلوق نیە کوفرە، ئاواش توقف کردن لە شتێک کە مەخلوقە بڵێی حوکمی لەسەر نادەم و نازانم مەخلوقە یان نا ئەوا کافریت و ئەبیتە یەکێک لە واقفەکان کە ئیمام احمد بە شکاکة ناوی ئەبردن واتا شکیان هەیە کەلامی الله مەخلوقە یان نا، ئێوەش شکتان هەیە کاغەز و حیبر و دڵ مەخلوقن یان نا !

گەر ئەڵێن شکمان نیە لە دڵی خۆمان ئەزانین مەخلوقن بەڵام بە دەم دەری نابڕین، ئەوا دانتان پێناوە هەمان عەقیدەی بوخاریتان هەیە لە دڵەوە، بەڵام چونکە بوخاری لە کتێب عەقیدەکەی باسکرد کافرە، ئێوە وەک موونافیقەکان عەقیدەکە لە دڵتان ئەشارنەوە بڕواتان وایە گەر دەری بڕن کافر ئەبن! ڕێک وەک عەقیدەی منافقەکان کوفرێکتان لە دڵتان شاردۆتەوە جورئەت ناکەن دەری بڕن کە باوەڕتان پێیەتی

با زنجیرە پۆستەکان تەواو بن ئەوکات وەڵامی ئەوانەش ئەدەمەوە کە جەهلەکەیان شاردۆتەوە لەژێر پەردەی دەست گرتن بە سوننەتەوە، بەڵام با پۆستەکانیان نەسڕنەوە یان تەعدیلی نەکەن، لە ئێستاوەش وێنەی پۆستەکانیان ئەگرم یان کۆپی ئەکەم.

تۆش تۆزێ ووریا با بە جەهمی بوون و دەست گرتن بە سوننەت فریوت نەدات، والله تۆزێک عاقڵ بیت ئەزانیت لە دوو چار زیاتری نیە، یان لە دڵەوە نازانێ فعلی عەبد و دەنگی و زمان و دەم و لێوی و دڵی و کاغەز و حیبر مەخلوقن و توقف ئەکات لێیان، کە ئەمە کوفرە وەک ئەوە وایە توقف بکەیت لە قورئان نەڵێ غیر مەخلوقە، وە یان ئەزانێ ئەمانە مەخلوقن بەڵام ئەڵێ دەری نابڕم شوێنی سلف ئەکەوم، ئەوکات دانی پێناوە کە هەمان عەقیدەی بوخاری هەیە، بەڵام ئەم لە دڵی ئەشارێتەوە، وە بوخاری باسی ئەکات، ئەمە چ عەقیدەیەکە بیشاریتەوە ئەهلی سوننەی باست کرد کافریت و جەهمیت! لە کاتێکدا بە لەفزێک باسی ئەکەیت هیچ کام لە سلف نەی ووتوە ئەوەی ئەم لەفزانە دەربڕێ کافرە یان مبتدع، بەڵام لەخۆیەوە هاتووە ئەم هەموو شتە وازحانەی قیاس کردۆتە سەر شتی موجمەل کە سلف قەدەغەیان کردووە بووترێ، گەر ووتیان ئەی ئیمام احمد بۆ نەی ووت کاغەز و حیبر و دەنگی عەبد مەخلوقن ؟ بڵێ جا کێ لەسەردەمی ئیمام احمد ئەمانەی کردبوو بە غیر مخلوق یان نەی ئەزانی مەخلوقن یان نا تا ئیمام احمد باسی بکات ؟ ئەسلەن کێ گومانی لە مەخلوقی ئەمانە هەبوو تاکو باس بکرێن ؟ ئەی اسحاق بن راهویە ناڵێ: کێ گومان ئەکات لە مەخلوقی دڵ ؟

مەبەستی باسکردنی ئەندامەکانی لەش نیە، لەو کاتە باسی ئەکات کە دڵ قورئان لەخۆ ئەگرێت کە قورئان مەخلوق نیە، بەڵام کەس گومانی نیە کە دڵەکە مەخلوقە، هەروەک ئەمە ریوایەتیش کراوە لە ئیمام احمد لەلای ابن بطة بەڵام ئەگەرچی ریوایەتە مونکەرە، بەڵام کە ابن بطة لە کتێبێکی عەقیدەیی لە بابەتی لەفزیەکان ئەم ریوایەتە ئەهێنێ ئەوا مانای ئەوەیە کە بەلایەوە کێشە نیە بووترێ زمان و دڵ و چاو و گوێ مەخلوقن کە قورئانی غیر مەخلوق ئەخوێنن و حفزی ئەکەن و ئەیبینن و ئەیبیستن، هەروەک لە ریوایەتەکە هێناویەتی لە ئیمام احمدەوە.

# اللفظية (١٢)



## ڕوونکردنەوەی مەزھەبی داود الأصبهاني قوتابیەکەی کەرابیسی دەربارەی قورئان

**اللالكائي** ئەڵێ:

وأخبرنا عبيدالله قال أخبرنا أحمد بن كامل قال حدثني أبو عبدالله الوراق ووتی:

من کتێبەکانی داود الأصبهاني-م ئەنوسیەوە، جا ڕۆژێکیان من لەلای داود بووم لە مەدخەلی ماڵەکەیدا لەگەڵ ژمارەیەک لە کەسانی غەریب، پرسیاری قورئانی لێکرا

داود ووتی: ئەو قورئانەی کە الله فەرموویەتی: (لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ) وە فەرموویەتی: (فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ) مەخلوق نیە، بەڵام ئەو قورئانەی کە لەناوماندایە لەشگران و ئافرەتی خوێن بینیو دەستی لێئەدەن مەخلوقە.

القاضي أحمد بن كامل ووتی: ئەمە مەزھەبی الناشئ-ە، وە ئەمە کوفرە بە الله-ی العظیم.

**(شرح أصول اعتقاد : ٦١٣)**

الناشئ: ابو العباس الناشئ موعتەزیلەیە

**الخطيب البغدادي** هەر لە ابو عبدالله الوراق ریوایەت ئەکات کە ئەڵێ:

بیستم پرسیار لە داود کرا دەربارەی قورئان

داود ووتی: ئەو قورئانەی کە لە لوح المحفوظ-ە مەخلوق نیە، بەڵام ئەو قورئانەی کە لەنێوان خەڵکی دایە مەخلوقە.

**(تاريخ بغداد : ٣٤٨/٩)**

**ابن أبي حاتم** ئەڵێ:

ابو علي القوهستاني ووتی: بیستم اسحاق بن راهویە ئەیووت: فلان کەس -واتا داود الأصبهاني- ووتەی سێیەمی هەیە دەربارەی قورئان، ووتەیەکی خراپە، جا بەردەوام پرسیار ئەکرا لە اسحاق کە ووتەکەی چیە ؟

اسحاق ووتی: عەقیدەی لەفزیەکانی دەرخستووە، واتا وتوویەتی لەفزم بە قورئان مەخلوقە.

**(شرح أصول اعتقاد : ٦٠٦)**

**الحسين الخرقي** ئەڵێ:

پرسیارم لە ابو بكر المروذي كرد دەربارەی چیرۆكی داود الأصبهاني و ئەوەی باوكی عبدالله ئینكاری لێ كردووە

ووتی: داود چووە خوراسان بۆلای اسحاق بن راهويه، جا قسەیەكی كرد ابو نصر بن عبدالمجيد و چەند شێخێك لە ئەهلی حەدیث شایەتیاندا لەسەری كە وتوویەتی: قورئان محدث-ە.

**المروذي** ئەڵێ:

وحدثني محمد بن إبراهيم النيسابوري ووتی: اسحاق بن ابراهيم بن راهويه كاتێك ووتەكەی داودی بیست لە ماڵەكەی پەلاماری داودی دا و لێیدا و ئینكاری لێ كرد، ئەمە چیرۆكەكەیەتی.

**محمد بن الحسن بن صبيح** ئەڵێ:

بیستم داود الأصبهاني ئەیووت: قورئان محدث-ە، وە لەفزم بە قورئان مەخلوقە.

ئەم سێ ریوایەتەی کۆتایی ابن تيمية نەقلی کردووە لە کتێبی سوننەی الخلال.

بڕوانە (**التسعينية لابن تيمية : ١ / ٣٤١-٣٤٤**)

بەڵام ابن تيمية بێ ئاگا بووە لە عەقیدەی داود ئەڵێ پێم وابێ اسحاق بن راهويه لەسەر ئەوە ئینکاری لێ کردووە کە وتوویەتی لەفزم بە قورئان مەخلوقە، ئەگینا کە وتوویەتی: قورئان محدث-ە مەبەستی مەخلوقی قورئان نەبووە، لەمەشدا پشتی بە ووتەی ابو الحسن الاشعري بیستووە لە مقالات الاسلاميين کە گوایە مەبەستی لە محدث-ی قورئان مەخلوقی قورئان نەبووە ئەویش ووتەکەی صەریح نیە ئەڵێ پێم گەیشتووە کە هەندێک فەقیھ ئەڵێن قورئان محدث-ھ و مەخلوق نیە لەوانەش داود الأصبهاني، بەڵام داود خۆی بە صەریحی ئەڵێ ئەم قورئانەی سەر زەوی مەخلوقە بەڵام قورئانەکەی ئاسمان غەیر مەخلوقە، ئەم ووتەیەشی لەسەر ئەساسی عەقیدەی لەفزی بوون ووتوە، چونکە لەفزیەکان پێیان وایە کە قورئان بە لەفزی بەندەکان ئەبێتە مەخلوق.

پێشتریش هێنامان کە ابو حاتم الرازي کەرابیسی و داودی لەپاڵ یەکتر هێنا ووتی ئەمانە پێیان وایە ئەم قورئانەی سەر زەوی حیکایەتی کەلامی الله یە و مەخلوقە، وە لە شوێنێکی تریش کە باسی سەیر نەکردنی کتێبەکانی کەرابیسی ئەکات ڕێک بەدوایدا ناوی داود ئەهێنێت وەک بەرگریکار لە کەرابیسی و قوتابی کەرابیسی باسی ئەکات.

ان شاء الله لە پۆستی داهاتوو باسی عەقیدەی احمد الشراك ئەکەین

# بەشێک

ئەڵێن باسکردنی بابەتی لەفزییەکان سودی چیە خۆ موسڵمان نەشی زانێت هیچ زیانی بۆی نیە!

ئەم قسەیەی سەرەوە واتا:

ئاساییە بە هەڵە لە بابەتی لەفزییەکان حاڵی بین و بە سەدان زانا تەکفیر بکەین و تەبدیعیان بکەین کە لەفزیش نەبوونە بەڵام بەهۆی تێنەگەیشتن لە بابەتەکە کردوومانن بە لەفزی و بە ناحەق تەکفیر و تەبدیعمان کردوون.

ئەمانە لایان ئاساییە سەدان زانا بە هەڵە تەکفیر بکەن و لە باسەکە تێنەگەن و بە جەهلەوە حوکمی لەسەر بدەن، تەکفیر کردنی زانا یان تەبدیع کردنی لایان وەک پان کردنەوەی مێشوولەی لێ هاتووە، بۆیە بەلایانەوە زۆر کارێکی بێ قیمەتە ڕوونی بکەیتەوە لەفزییەکان کێ بوونە و بۆ تەکفیر کراون.

تەنها تەرکیزیان لەوەیە قورئان نەکرێ بە مەخلوق، بە خەیاڵیان نایەت خەڵکی توقف بکەن لە شتانێکی مەخلوقی وەکو دڵ و کاغەز و حیبر و دەنگی عەبد، کە لە دڵیشەوە

نەزانن ئەمانە مەخلوقن یا نا، یان لە دڵ باوەڕیان وابێت ئەمانە مەخلوقن بەڵام قەناعەتیان پێکردوون کە لەهەر کاتێک لە کاتەکان ئەم بڕوایەی دڵیان دەرخست ئەبن بە کافر، بۆیە ئەبێ وەکو موونافیق لە ناخیان حەشاری بدەن ئەگەرچی کەسانێک کاغەز بکەن بە غەیر مەخلوق بۆت نەبێ پێی بڵێی کاغەز مەخلوقە.

ئەمە ڕێک ووتەکەی ابن قتیبة ئەخاتەوە یادم کە هەر لە بابەتی لەفزیەکان ئەم قسەیە ئەکات ئەڵێ خەڵکی هێندە هۆگری ووشەی (غیر مخلوق) بوونە و هێندە ڕائەکەن لە ووشەی (مخلوق) تا وای لێهاتووە بە دووری نازانم گەر کەسێک بڵێ عەرش و کورسی غەیر مەخلوقن، کەسانێک دوایان بکەون لەمەدا، ئەمڕۆش بەهۆی بابەتی لەفزی وایان لێهاتووە شتە هەرە وازحەکان بکەن بە غامز و بڵێن نازانین کاغەز و حیبر و دڵ و زمان و دەم و لێوی ئینسان مەخلوقن یان نا لەکاتی قورئان خوێندن، کە ئەمەش هیچ خەتەری لەوە کەمتر نیە کەلامی الله کە غەیر مەخلوقە توقفی لێ بکەیت بڵێی نازانم مەخلوقە یان نا، وە هەر کەسێک توانی لە پۆستەکانی من یەک ووشە بدۆزێتەوە من باسم کردبێ سەلەف ووتبێتیان ووتنی ئەم ووشەیە بیدعەیە یان کوفرە، ئەوا با نیشانمی بدات تا تەوبەی لێ بکەم، بەڵام لەخۆتەوە کۆمەڵێک ووشەی روون قیاس بکەیتە سەر هەندێک ووشەی ناڕوون کە سەلەف قەدەغەیان کردووە بووترێن، ئەوا ئەمە قسە و حوکمی خۆتە نەک هی سەلەف.

# اللفظية (١٣)



## ڕوونکردنەوەی عەقیدەی احمد الشراك دەربارەی قورئان

احمد الشراك لە سەردەمی ئیمام احمد ژیاوە لە لەفزییەکان بووە، ئەیووت لەفزم بە قورئان مەخلوقە.

**ابو طالب** ئەڵێ:

ووتم بە باوکی عبدالله: نامەم بۆ نوسراوە لە طرسوس کە الشراك پێی وایە قورئان کەلامی الله یە، بەڵام کاتێک کە خوێندمەوە تیلاوەم مەخلوقە

ئیمام احمد ووتی: قاتله الله، ئەمە خودی ووتەکەی جەهمە.

ابو طالب ئەڵێ ووتم: پیاوێک ووتی: قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، بەڵام لەفزم بە قورئان مەخلوقە

ئیمام احمد ووتی: هەر کەس ئەم قسەیە بکات ئەوا هەموو شتێکی ووتوە (واتا ئەوەی جەهمیەکان وتوویانە ئەویش وتویەتی) قورئان کەلامی الله یە لە هەموو حاڵێکدا، بەڵگەش لەسەری فەرموودەکەی ابو بکر-ە، ابو بکر ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿الٓمٓ (١) غُلِبَتِ ٱلرُّومُ (٢)﴾ پێی ووترا: ئەم ووتەیە هاوەڵەکەت هێناویەتی، ابو بکر ووتی: نەخێر والله، بەڵکو کەلامی الله یە.

ئیمام احمد ووتی: ئەم ئایەتە و جگە لەویش کەلامی الله یە

ابو طالب ئەڵێ ووتم: بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ﴾ ئەمەی تازە خوێندمەوە کەلامی الله یە ؟

ئیمام احمد ووتی: بەڵێ والله کەلامی الله یە، وە هەر کەسێک بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە ئەوا هەموو شتێکی ووتوە، چی ئەمێنێتەوە کاتێک ووتی لەفزم ؟! گەر نەگەڕایەوە لەم ووتەیە خۆتی لێ بپارێزە و قسەی لەگەڵ مەکە، ووتەی ئەم پیاوە وەک ووتەکەی الشراك-ە، أخزاه الله.

**ابو طالب** ئەڵێ:

ووتم ئەی باوکی عبدالله من بەڵگەم هێناوەتەوە لە دژی لەفزیەکان بە قورئان و فەرموودە، حەز ئەکەم بەڵگەکانت بۆ باس بکەم:

الله عز وجل فەرموویەتی: ﴿وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ ئایا لە محمد کەلامی الله نەبیستراوە ؟

الله عز وجل فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾

الله تبارك وتعالى فەرموویەتی: ﴿أَفَتَطۡمَعُونَ أَن يُؤۡمِنُواْ لَكُمۡ وَقَدۡ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ يَسۡمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعۡدِ مَا عَقَلُوهُ﴾

وە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ﴾

وە فەرموویەتی: ﴿وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ﴾

وە فەرموویەتی: ﴿وَأَنۡ أَتۡلُوَاْ ٱلۡقُرۡءَانَۖ﴾

وە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ جَعَلۡنَا بَيۡنَكَ وَبَيۡنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ حِجَابٗا مَّسۡتُورٗا﴾

وە فەرموویەتی: ﴿فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنۡهُۚ﴾

لە هەموو حاڵێکدا هەر قورئانە.

وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە فەرموودەی جابر رضي الله عنه فەرموویەتی: (إن قريشا منعوني أن أبلغ كلام ربي)

وە پێغەمبەر عليه السلام فەرمووی بە معاوية بن الحكم رضي الله عنه: (إن هذه الصلاة لا يصلح فيها شيء من كلام الآدميين إلا القرآن)

قورئان جیایە لە کەلامی مرۆڤ

وە ابو بكر الصديق رضي الله عنه ووتی: نەخێر بەڵکو کەلام و ووتەی الله یە.

باوکی عبدالله پێی ووتم: چەند بە چاکی بەڵگەت لە دژیان هێناوەتەوە، جبريل بە شتێکی مەخلوق هات بۆلای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ؟! وە پێغەمبەریش عليه السلام بە شتێکی مەخلوق هات بۆ خەڵکی ؟!

ابو طالب ئەڵێ ووتم: ئەتوانم بڵێم: ئەمە ووتەی جەهمە، وە لە هەموو حاڵێکدا قورئان کەلامی الله عز وجل-ە ؟

ووتی: بەڵێ.

**بروانه (السنة للخلال : ٢٠٥٦)**

**المروذي** ئەڵێ:

ووتم بە باوکی عبدالله احمد بن محمد بن حنبل: نامەی ابن حباب النجار بۆمان هاتووە لە طرسوس، ووتەکەی الشراك-ی تێدایە و شایەتیان داوە لەسەری.

باوکی عبدالله ووتی: تەحزیری لێ ئەدرێ

المروذي ئەڵێ: الشراك ووتبووی: لەفزم بە قورئان مەخلوقە.

**(السنة للخلال : ٢٠٥٨)**

## المروذي ئەڵێ:

ووتم بە باوکی عبدالله: من بە ابو ثور-م ووت و پرسیارم لێیکرد دەربارەی الشراك، ابو ثور ووتی: ئەمە بیدعەیە

ئیمام احمد زۆر توڕە بوو، ووتی: ئاوا ئەیەوێ بڵێ بیدعەیە ؟! ئەمە خودی ووتەکەی جەهمە.

**(السنة للخلال : ٢٠٥٩)**

## اسحاق بن حنبل ئەڵێ:

نامەیەکم نیشانی باوکی عبدالله دا کە لە طرسوس بۆم هاتبوو دەربارەی الشراك، تێیدا بەڵگەیان لە دژی هێنابوویەوە بە فەرمایشتی الله عز وجل: ﴿بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ﴾، وە لە فەرموودەی أبو أمامة رضي الله عنه کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هو أشد تفصيا من صدور الرجال من النعم عن عقلها)، وە فەرموودەکەی ابن الأشعث الباهلي دەربارەی قورئان کە تێیدا هاتووە: ئەوەی لە سینەماندا هەیە لە قورئان مەخلوق نیە.

باوکی عبداللە ووتی: چەند بە چاکی بەڵگەیان لە دژی هێناوەتەوە.

**(السنة للخلال : ٢٠٥٩ / أ)**

سەیری کۆی ئەو بەڵگانە بکە کە ئیمام احمد و ابو طالب و خەڵکی طرسوس هێناویەتیانەوە لە دژی الشراك کاتێک وتوویەتی: لەفزم بە قورئان مەخلوقە، ئیمام احمد لە شوێنێک ئەڵێ ئەمە خودی ووتەکەی جەهمی کوڕی سەفوانە، ئایا کێشەی جەهم ئەوە بوو ووتەیەکی موجمەلی بەکار ئەهێنا ؟ ئەیووت لەفزم بە قورئان مەخلوقە مەبەستی لە لەفز فعلی خۆی بوو کە ئەیووت مەخلوقە بەڵام قورئانی بە مەخلوق نەئەزانی ؟!!!

ئیمام احمد ئەڵێ بەپێی ووتەی لەفزیەکان بێت ئەبێ بووترێ جبریل شتێکی مەخلوقی هێنا بۆ پێغەمبەر علیهما الصلاة والسلام، وە پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم شتێکی مەخلوقی بۆ خەڵکی هێنا!

ئەپرسم ئایا کەسێک مەبەستی بێت بڵێ فعلم مەخلوقە کە ئەمە ووتەیەکی حەقە، بەڵام بە ووتەیەکی ناڕوون دەری ببڕێ بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە، مەبەستی لە لەفز فعلی خۆی بێت نەک قورئان، بەڵکو قورئان بە غەیر مەخلوق بزانێت، ئایا بۆی روون ئەکرێتەوە واز لەم ووتەیە بهێنە، یان پێی ئەووترێ: تۆ لە جەهمیەکان پیستری، کافری، کۆنە زندیقی، ووتەکەت هەمان ووتەی جەهمە، پێت وایە قورئان مەخلوقە، پێت وایە جبریل بە شتێکی مەخلوق هاتووە بۆلای پێغەمبەر علیهما الصلاة والسلام ؟! هەموو ئەم قسانەی پێ ئەووترێ و تەکفیر ئەکرێ تەنها لەسەر ئەوەی بە ووتەیەکی

ناڕوون عەقیدەکەی خۆی دەربڕی ؟! هەست ناکەن بەم هەڵە تێگەیشتنەتان لە بابەتی لەفزییەکان و مەبەستیان ئیمام احمد زۆر ناشرین ئەکەن و لەکەداری ئەکەن، کەچی وائەزانن زۆر توندن لەسەر سوننەت و دەست گرتوون پێیەوە.

تێبگەن رحمکم اللە ئیمام احمد زۆر باش لێیان تێگەیشتووە ئەزانێ چی ئەڵێن و مەبەستیان چیە، خەڵکی تریش لێیان تێئەگات بۆیە بەم ئایەت و فەرموودانە بەڵگەیان لە دژ ئەهێننەوە کە تێیاندا هاتووە ئەوەی لە زەویدا ئەخوێندرێ و ئەبیسترێ و لە سینەی خەڵکدایە کەلامی اللە یە و مەخلوق نیە، گەر ئەڵێی چۆن زانیان ئەوەی بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە مەبەستی قورئانە، خۆ ئاگاداری دڵی نین ؟ گەر ئەم پرسیارەت کرد ئەوا موژدەت لێبێ کە هێشتا لە مەزهەبی لەفزییەکان تێنەگەیشتووی، چونکە خودی ووتەی لەفزییەکان هەر ئەمە بوو هیچی تر نەبوو، ئەیان ووت قورئان کەلامی اللە یە و مەخلوق نیە، بەڵام لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، مەبەستیان لە قورئانی یەکەم قورئانی ئاسمان بوو، مەبەستیان لە قورئانی دووەم ئەوەی سەر زەوی بوو بە لەفزی بەندەکان ئەبێتە مەخلوق، ئەمە جگە لەوەی کە جەهمیە پاراوەکان بڕگەی یەکەمیان نەئەووت تەنها ئەیان ووت لەفزم بە قورئان مەخلوقە، چونکە بڕوایان بە هیچ کەلامێکی غەیر مەخلوقی اللە نەبوو، ئەیان ووت اللە هەر کەلامی نیە، موعتەزیلەش بە هەمان شێوە، ئەیان ووت قورئان کەلامی اللە یە و اللە خەلقی کردووە، بەڵام کەرابیسی و باقی لەفزییەکانی تر و کوللابی و ئەشعەریەکان ئیسباتی کەلامێکی غەیر مەخلوقیان ئەکرد بۆ اللە کە لە ئاسمانە،

بەڵام ئەوەی زەوی لەفزی بەندەکانە و مەخلوقە، بۆیە مەڵێ چۆن زانیان کابرا مەبەستی قورئانە کاتێک ئەڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە، چونکە خودی ووتەی لەفزیەکان کە بە جەهمی دانراون هەر ئەمە بووە، ئینجا هەموو زانایان ئەڵێن واقفی و لەفزی پیسترن لەو جەهمیەی کە بە ڕاشکاوی ئەڵێ قورئان مەخلوقە، بۆ ؟ چونکە ئەوان فێڵ ئەکەن و بە ئاشکرا دەری نابڕن، جا کاتێک لەفزیەکان بە ئاشکرا وەک مەخلوقیەکان بڵێن قورئان مەخلوقە، چ فێڵێک بوونی ئەمێنێت لە ووتەکەیان کە ئیمام احمد و زانایان باسی ئەکەن ؟ ئەی بۆ کران بە سێ گروپ: مەخلوقی و واقفی و لەفزی، گەر هەمان ووتەیان هەبێ ؟ حەتمەن ووتەی دووانەکەی تر جیایە و فێڵی تیایە بۆیە بە تەڵەکەباز و هەڵخەڵەتێنەر وەسف کراون لای ئیمام احمد، بۆیە هەر کەس ووتی لەفزم بە قورئان مەخلوقە ئەڵێن جەهمیە، چونکە ئەمە ووتەی لەفزیەکان بوو لەمە زیاتریان نەئەووت، گەر بڵێی ئەی کەسێک ووتی لەفزم بە قورئان مەخلوقە و مەبەستی ئەوانی نەبوو ؟ یەکەم شت ئەم ووتەیە پێشتر بوونی نەبووە لەناو خەڵک واتا ووتەیەکی ناسراو و باو نەبووە خەڵک بیزانن و بە مەبەستی تر بەکاری بهێنن، بۆیە ئەوەی ئەم ووتەیە ئەڵێ دیارە لەوانە و هەمان مەبەستی ئەوانی هەیە، ئەمە حوکمە گشتیەکەیە هەر کەس ووتی لەفزم بە قورئان مەخلوقە جەهمیە، بەڵام کەسێک دوای بیستنی ووتەکەیان بکەوێتە داویان کە عیلمی نەبێت و لە ووتەکەیان تێنەگات، بڵێ ئەمە چی تیایە بڵێی لەفزم بە قورئان مەخلوقە، خۆ مەبەستم فعلی خۆمە، ئەمەیان ڕاستەوخۆ تەکفیر ناکرێ، هەر بۆیەش ئیمام احمد ئەڵێ گەر ئەهلی کەلام بوو یان خاوەن عیلم بوو کافرە، گەر جاهیل و عەوام بوو فێر ئەکرێ دوای ئیقامە حوججە کافرە، خۆ ئەمە ڕوونە و ئیمام احمد باسی کردووە کە

هەندێکیان بە ووشەی شاز ناوی ئەبەن، کە ئەمە ریوایەتی کورەکەیەتی لە باوکیەوە لە سوننەی عبدالله هاتووە، الخلال و جگە لەویش ئەمەیان ریوایەت کردووە، ووتەی شاز بەسەر ئەم هەموو پیاوە گەورەیە تێپەڕ نابێت کە هەر ئەمانە بوون مەزهەبی ئیمام احمدیان بڵاو کردەوە، ئەی هۆکاری ئەم جیاکارییە چیە بۆ عالیم و جاهیل ؟ چونکە هەیە ئەمە ئەڵێت و هەمان مەبەستی نیە، هەروەک اسحاق بن راهویە و ابو زرعة باسی ئەکەن، ئیمام احمدیش لەم تەفسیلەدا لە حوکمدان لەسەر عالیم و جاهیل هەمان مەبەستی هەیە، هەروەک عبدالله ی کوڕی لە سوننە لە باوکی ریوایەت ئەکات ئەڵێ هەر کەس بەڕەو قورئان بچێت بە لەفز یان بە غەیری لەفز مەبەستی مەخلوقی قورئان بێت ئەوا جەهمیە، وە زانایانی تریش ئەمەیان باسکردووە کە مەبەستەکە قورئان بێت کافرە وەک لە پۆستەکانی پێشوو ووتەی زاناکانمان هێنا، بەڵام خودی ووتەکە باو نیە لەناو خەڵک و دانراوی جەهمیەکانە، واتا ووتەیەکی شائعی ناو خەڵک نیە تا توقف بکرێ لە خاوەنی ووتەکە، ئەم ووتەیە دانراوی لەفزیەکانە بۆیە ئەوەی ئەمە بڵێ جەهمیە و کافرە، مەگەر ئیللا بزانرێ مەبەستی قورئان نیە مەبەستی فعلی خۆیەتی ئەوکات کافر نیە، بەڵام هەر ئەبێ واز لەم ووتەیە بهێنێت چونکە بیدعەیە.

اسحاق بن راهویە ووتەیەکی هەیە دەربارەی قورئان روونی ئەکاتەوە کە ئەگەر مەبەستی خاوەن ووتەکە بزانێت حوکمی جیایە، ئەویش ووشەی (محدث)ە، واتا نوێ، ئەمەش بۆ شتی مەخلوق بەکاردێت هەموو مەخلوقێک محدث-ە، بەڵام مەرج

نیە هەموو محدث-ێک مەخلوق بێت، ئەم بابەتەش ئەگەڕێتەوە بۆ تەفسیری ئایەتی:
﴿مَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّن رَّبِّهِم مُّحۡدَثٍ إِلَّا ٱسۡتَمَعُوهُ وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ﴾ [الأنبياء: ٢]

لەم ئایەتە مەبەست لە (محدث) چیە ؟

جەهمیەکان استدلال بەم ئایەتە ئەکەن بۆ مەخلوقی قورئان، ئەڵێن الله لەم ئایەتە قورئانی بە محدث ناوبردووە، محدث-یش مەخلوقە، اسحاق پێی وایە محدث لەم ئایەتە مانای مەخلوق نیە

حرب ئەڵێ لێم پرسی ئەم ئایەتە مانای چیە ؟

ووتی: نوێیە لە عەرشەوە، دوا کتێبە لە عەرشەوە دابەزیوە.

حرب ئەڵێ: پاشان پرسیاری ئەمەم لێکردەوە، ووتی: نوێترین کتێبە لەلایەن ڕەحمانەوە.

**(السنة لحرب : ٣٦٤)**

واتا نوێیە بە نسبەت ئێمەوە کە پێمان ئەگات پێشتر پێمان نەگەیشتووە، نەک خودی قورئانەکە مەخلوق بێت، هەروەک ئیمام احمد ئەڵێ بە نسبەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نوێیە، پێشتر قورئانی نەزانیوە دواتر الله فێری کردووە و بۆ ئەو نوێیە

بەڵام ئەوەی مەبەستمە لەم ڕیوایەتە ئەمەیە:

حرب ئەڵێ بیستم اسحاق ئەیووت: هەر کەسێک بڵێ: قورئان محدث-ە بەو مانایەی کە مەخلوقە، ئەوا کافرە بە الله ی العظیم.

**(السنة لحرب : ٣٦٤)**

سەیرکە اعتباری دانا بۆ نیەتی کەسەکە، گەر بزانێ کەسەکە مەبەستی مەخلوقی قورئان نیە تەکفیری ناکات.

ابن أبي حاتم ئەڵێ:

پرسیار لە أبو زرعة کرا دەربارەی فعلی بەندەکان ؟

ووتی: مەخلوقە

پێی ووترا: لەفزمان بە قورئان لە فعلی ئێمەیە

ووتی: ئەمە ناووترێ.

**(شرح أصول اعتقاد للالكائي : ٥٩٧)**

سەیرکە کەسەکە ئەڵێ: باشە گەر فعلی عەبد مەخلوقە، خۆ لەفزیش هەر فعلی خۆمانە، کەواتە بۆچی نەڵێین لەفزمان بە قورئان مەخلوقە ؟

سەیرکە لێرەدا ابو زرعة کە نیەتی کەسەکە ئەزانێ، تێئەگا کە مەبەستی لە مەخلوقیەکە قورئان نیە بەڵکو مەبەستی فعلی خۆیەتی، بۆیە تەنها نەهی لێ ئەکات ئەم ووتەیە بەکار بهێنێت چونکە ئەمە ووتەیەکی داهێنراوە و ووتەیەکی موجمەلە، لەفزەکە ئەکرێ بۆ قورئان و بۆ فعلی عەبدیش بگەڕێتەوە، بۆیە ووتەی موجمەل ناووترێ، حەتمەن گەر ئەمەی بە کوفر زانیبوایە دوای زانینی نیەتی کەسەکە بەم جۆرە وەڵامی نەئەدایەوە تەنها بڵێ (ئەمە ناووترێ) بەڵکو ئەیووت ئەمەش کوفرە ئەگەرچی مەبەستت قورئانیش نەبێت و مەبەستت فعلی خۆت بێت، چونکە خۆی ووتەی هەیە لە عەقیدەکەی لەگەڵ ابو حاتم الرازي هەردووکیان ئەڵێن ئەوەی بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە کافرە

دووبارە سەیری بەڵگەکان بکەوە کە لە دژی احمد الشراك بەکارهاتوون، سەیرکە ئیمام احمد زۆر لە ابو ثور توڕە ئەبێ کە ووتەی لەفزییەکان بە بیدعە ناو ئەبات، ئەڵێ چۆن ئەڵێ ئەمە بیدعەیە! ئەمە خودی ووتەی جەهمی کوری سەفوانە

ئەپرسم ئایا کەسێک بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە، تەنها مەبەستی فعلی خۆی بێت و قورئان بە غەیر مەخلوق بزانێت، بەڵام بەم ووتە هەڵەیە مەبەستەکەی دەربڕێ، ئایا ئیمام احمد توڕە ئەبێ کە پێی بووترێ بیدعەیە ؟ ئایا ئەڵێ ئەمە خودی ووتەی جەهمە ؟ یان تێگەیشتووە لەفزیەکان لەم ووتەیە مەبەستیان چیە بۆیە ئاوا توڕە ئەبێت ؟

سەیری ووتەکەی حنبل بن اسحاق بکە ئەڵێ خەڵکی طرسوس بەم ئایەتە بەڵگەیەکان لە دژی الشراك هێناوەتەوە ﴿بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ﴾ ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوەی لە سینەی خەڵک دایە قورئانە، ئایا گەر الشراك مەبەستی ئەوە بێت فعلی خۆی مەخلوقە نەک قورئان، چ مانایەکی هەیە بەم ئایەتە بەڵگەی لە دژ بهێننەوە ؟ تێبگە لەفزییەکان ئەیان ووت ئەم قورئانەی ئەخوێندرێ و ئەنوسرێ و ئەبیسترێ و لە سینەدا حفز ئەکرێ مەخلوقە و لەفزی بەندەکانە، بۆیە بەم ئایەتانە وەڵامیان ئەدەنەوە، ئینجا سەیرکە ئیمام احمد ئەڵێ چەند بە جوانی بەڵگەیەکان لە دژی هێناوەتەوە، نەی ووت ئەم بەڵگانە پەیوەندی چیە بە ووتەکەی الشراك.

ئینجا گەر هەر سووری بڵێی: نیەتی کەسەکەش بزانم و بە ڕوونی لێی تێبگەم مەبەستی مەخلوقی فعلی خۆیەتی، قورئان لە هەموو ڕووێکدا بە غەیر مەخلوق بزانێت، ئەوا هەر کافرە

ئەوا پێت ئەڵێم فەرموو مەناتی تەکفیرەکەمان پێ بڵێ لەم حاڵەتە دیاریکراوە

گەر ووتت قورئان بە مەخلوق ئەزانێ بۆیە کافرە، ئەوا کابرا بە ئاشکرا خۆی بەری ئەکات ئەڵێ قورئان لە هیچ ڕووێک مەخلوق نیە، بەڵکو مەبەستم فعلی خۆمە مەخلوقە، گەر ئەڵێی گەر بشزانم مەبەستی مەخلوقی فعلی خۆیەتی نەک قورئان ئەوا هەر کافرە چونکە سەلەف تەکفیریان کردووە، ئەوا ئەپرسین پێمان بڵێ مەناتی تەکفیرەکەی چیە ؟ سەلەف کەسیان تەکفیر نەکردووە بەبێ زانینی مەناتی تەکفیر، خۆ ئەبێ بزانین بۆ تەکفیریان کردووە، نابێ بزانین هۆکاری تەکفیرەکە چیە ؟

ئینجا یەک کەس بهێنە کە بڵێ فعلی خۆم مەخلوقە بەڵام قورئان مەخلوق نیە لە هیچ ڕووێکەوە، بەمە تەکفیر کرا بێت لەلایەن سەلەفەوە، گەر بەڵگە بەوانە ئەهێنیتەوە کە ووتویانە لەفزمان و تیلاوەمان و قیرائەمان بە قورئان مەخلوقە بەڵام قورئان مەخلوق نیە، بەمە تەکفیر کراون لەلای ئیمام احمد، ئەوا وەڵامی ئەوەمان داوەتەوە لەم پۆستەدا.

---

ماویەتی

# بەشێک

سەرەتاش ووتم ئێستاش ئەیڵێمەوە

گەر لەم باسە تێناگەیت هەر مەیخوێنەوە، زەحمەت لەخۆت مەکە بڵێی ئیللا ئەبێ بە جۆرێک لە ووتەکان تێبگەم، ئاساییە مەیخوێنەوە، ئەترسم بە هەڵە حاڵی بیت و بکەویتە هەڵەوە، چونکە من باسی کۆمەڵێک ووتە و مەزهەب و بابەت ئەکەم مەرج نیە هێنانی هەر ووتەیەک و موناقەشە کردنی مانای ئەوە بێت من موافقی ووتەکەم، یان کە بابەتێک روون ئەکەمەوە مەرج نیە مەبەستم روون کردنەوە و قسە کردن لەسەر خودی ئەم بابەتە بێت، بەڵکو ئەمەوێ لە ڕێگای ئەم بابەتەوە بۆ بابەتێکی تر بچم کە ئەوەی سەرەتا وەک مەدخەلێک بەکار ئەهێنم.

## بەشێک

دوو کەسی جەزائیری ئەم بابەتی لەفزە و مەسەلەی بوخاریان زیندوو کردەوە

یەکێکیان لە تەکفیر عامەکان بوو، کە بوخاری تەکفیر کرد و هەموو تەفسیلێک لەم بابەتە بە کوفر ئەزانێت تەنانەت تەفسیلەکە سەلەفیش نەهی لێ نەکردبێ و تەفسیلێکی حەق بێت، عومیەکانیش هەموویان دوای ئەم شێخەیان کەوتن لەم بابەتەدا

کەسەکەی تر بە حیساب عومی نەبوو، ڕەددی عومیەکانی ئەدایەوە و زۆر توند بوو لەسەریان، بەڵام هەموو ئامۆژگاریەکانی سەلەفی خستە ژێر پێی لەوەی کە لەگەڵ مبتدع دانەنیشێت و قسەی لەگەڵ نەکات، ئەوە بوو چوو قسەی لەگەڵ شێخی عومیەکان کرد و هەندێک تەنازولاتی کرد بۆیان و کەناڵەکانی سڕیەوە و کتێبەکانی پێشووی کە لە دژی عومیەکان نوسیبووی سڕیەوە و ئامۆژگاری خەڵکی ئەکرد بیسڕنەوە، بەم کارەی عومیەکانی زۆر دڵخۆش کرد و ووتیان ئەویش تەوبەی کرد و ئێستا تەکفیری عام ئەکات، بەڵام تاکو ئێستاش عەقیدەی ڕوون نیە لەم بابەتە کە بە چی گەیشتووە و لەسەر چی ماوەتەوە لەم بابەتە، وە لەسەرچی تەوبەی کردووە، کە ئەمەش مەنهەجی ئەهلی سوننە نیە لەگەڵ سەرانی بیدعە و گومڕایی دابنیشیت لەبری ئەوەی ئەوان بێنە سەر عەقیدەی تۆ، تۆ بچیتە سەر عەقیدەی ئەوان یان لە

بەشێک لە بیدعەکانیان هاوڕایان بیت، یان بە جۆرێکی تەم و مژاوی باسی بابەتەکە بکەیت کەس نەزانێت لەگەڵ کام لایەنی و لەچی پەشیمانی و لەسەرچی ماویت.

جا ئەم کەسەی دووەم کە ئەمە حاڵیەتی ئەو کوردانەی کە تەکفیری عموم ناکەن بەڵام تەکفیری بوخاری و هەر کەسێک ئەکەن کە هەر تەفسیلێک بدات هەر چەندە حەقیش بێت، ئەم عەقیدە هەڵەیان لەم کەسە وەرگرتووە بۆیە ئەبینیت گەر بڵێ کاغەز و حیبر و دەنگی عەبد مەخلوقن بەڵام قورئان مەخلوق نیە ئەوا هەر لەفزیت و کافریت، جیاوازی لەنێوان ئەوە ناکەن سەلەف نەهیان لەکام ووتە کردووە و خاوەنی کام ووتەیان بە لەفزی و جەهمی داناوە، لەخۆیانەوە کۆمەڵێک ووتەی تریان زیاد کردووە ئەڵێن ئەمانەش جەهمین لە کاتێکدا یەک سەلەفیان نیە کە بڵێ خاوەنی ئەم ووتانە جەهمین

ئەمەش ووتەی شێخەکەیانە:

كل من تكلم في اللفظ أو التلاوة أو الصوت ومثله تفاصيل الحبر والورق والمداد ونحوها فقال مخلوق وفيها قرآن فهذه هي عين اللفظية كلها سواء حتى وإن صرح بعد ذلك أنه يعتقد أن القرآن غير مخلوق، فافهم هذه تنجو من اللفظية الجهمية نسأل الله العافية.

واتا: هەر کەسێک قسە بکات لە لەفز یان تیلاوە  یان دەنگ، وە بەهەمان شێوە باسی تەفاسیلی حیبر و کاغەز و هاوشێوەکانیان بکات بڵێ مەخلوقن و قورئانیان تیایە، ئەمە خودی مەزهەبی لەفزییەکانە، ئەگەرچی دوای ئەمە بڵێ قورئان مەخلوق نیە، لەمە تێبگە ڕزگارت ئەبێ لە لەفزییە جەهمیەکان.

سەلەف نەهیان لە ووتەی موجمەل کردووە کە مانای حەق و باتل لەخۆ بگرێت وەک ووتنی لەفزم بە قورئان مەخلوقە، تیلاوەم بە قورئان مەخلوقە، کەلامم بە قورئان مەخلوقە، قیرائەم بە قورئان مەخلوقە، چونکە لە هەموو ئەم ووتانە ئەکرێ مەخلوقیەکە بۆ قورئانیش بگەڕێتەوە.

بەڵام کوا کام سەلەف وتوویەتی نابێ بڵێی کاغەز و حیبر مەخلوقە ؟ ئاخر ووتنی ئەمانە کەی ووتەی موجمەلە تا خاوەنەکەی بکرێ بە جەهمی ؟

ئینجا کام لەم ووتانە لەپاڵ قورئاندا هاتوون تاکو بڵێین ئەمە ووتەیەکی موجمەلە ئەکرێ مەخلوقیەکە بگەڕێتەوە بۆ قورئان ؟

ئینجا کاتێک زانیت کەسەکە مەبەستی قورئان نیە، هەر هیچ نەبێ بڵێ کافر نیە بەڵام ووتەکەی هەڵەیە نابێ ئەمانە لەپاڵ قورئان بەکار بهێندرێن و بە مەخلوق وەسف بکرێن، ئاخر لەم حاڵەتەدا تەکفیری ئەکەیت بەبێ بوونی کوفر تیایدا! هەروەک ئەم کەسە بوخاری و غەیری ئەویش تەکفیر ئەکات کە دڵنیاشە مەبەستیان شتە مەخلوقەکانە نەک قورئان!

ئینجا هەر خۆشی ئەڵێ لە مێشکدا شتە مەخلوقەکان و قورئان لە یەکتر جیا ئەکرێنەوە، بەڵام کە دەرت بڕین تێکەڵ ئەبن و جیا ناکرێنەوە ئەوکات مەخلوقیەکە بۆ هەردووکیان ئەگەڕێتەوە!

ئەمە ڕێک وەک عەقیدەی مونافیقەکانە، چۆن مونافیقەکان کوفریان لە دڵیان حەشار ئەدا، ئەیان ووت دەری بڕین ئەکوژرێین، ئەمانەش فێرتان ئەکەن کە ئێوە عەقیدەیەکتان لە دڵ حەشارداوە گەر بێتو لەهەر کاتێکدا عەقیدەکەتان دەربڕن ئەوا ئەبن بە کافر!!!

ئێ هەر هیچ نەبێ بڵێ نابێ ئەم تەفسیلانە بووترێن، نەک بڵێی ١٠٠% بزانم مەبەستی شتە مەخلوقەکانە و قورئان بە غەیر مەخلوق ئەزانێت ئەوا هەر کافرە، لە کاتێکدا تۆش لە دڵی خۆتدا هەمان بڕوای ئەوت هەیە بەڵام دەری نابڕی!

ئینجا کەسانێک وەک بڵێی من هاتووم بوومەتە لەفزی و بە ووتەکانی سەلەف ڕازی نیم، ئەڵێن نەکەن باسی نەکەن ئەوە بڵێن کە سەلەف وتوویانە زیاتر نەڵێن ئەمە باوەڕی منە و باوەڕم بووە کە (قورئان کەلامی الله یە و لە هیچ حاڵێکدا مەخلوق نیە) ئەوەی سەلەف وتوویانە لە هەمووی بە چاکتر و باشتر و سەلامەتتری ئەزانم، بەڵام من خەریکی ڕوونکردنەوەی مەزهەبی لەفزییەکان و ڕوونی ئەکەمەوە کە چیان ووتوە و مەبەستیان چی بووە، ئینجا ئەوە ڕوون ئەکەمەوە کە هەندێک کەس هەندێک قسەیان کردووە هیچ پەیوەندی بە لەفزییەکانەوە نیە و بەڵکو لەفزییەکانیان بە کافر زانیوە، ناکرێ لەسەر ئەم ووتانە تەکفیر بکرێن و بکرێن بە لەفزی، یان لە مەقامی

ڕەددانەوەی کەسانێک قسانێکیان کردووە کە ناحەق نین، نابێ بەمە بکرێن بە مبتدع لەکاتێکدا مەبەستیان روونکردنەوە و رەددانەوەی کەسانێک بووە کە بە هەڵە لە هەندێک شت حاڵی بوونە، من هاتووم ئەمە ڕوون بکەمەوە، بەرگری کردن لەو کەسە کە بە ناحەق تەکفیر کراوە مانای ئەوە نیە کە من بانگەواز ئەکەم بۆ ئەوەی کە ئەبێ ووتەی زیاتر و کەمتر لەوەی سەلەف بووترێ، نابێ بوەستین بەوەی سەلەف باسیان کردووە، بەڵام کەسانێک تێگەیشتنیان وایە کە باسی ووتەی کەسێک ئەکەیت و بەرگری لێ ئەکەیت بەرامبەر ئەو ناحەقیانەی بەرامبەری کراوە، وائەزانن تۆ ئەڵێی من ووتەکانی ئەوم پێ باشترە لە هی سەلەف، واز لە ووتەکانی سەلەف بهێنن و وەرنە سەر ووتەکانی ئەو.

لەگەڵ خەمخۆریمان بۆ بەیان کردنی مەزهەبی سەلەف، ئەبێ لە هەمان کاتدا روونی بکەینەوە لەم بابەتەدا چ ووتەیەک کوفرە و چ ووتەیەک بیدعەیە و چ ووتەیەک هەڵەیە، نەک وا خەڵکی حاڵی بکەین تەنها بڵێن (قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە) ئەوەی لەمە زیاتری ووت کافرە، جا هەر ووتەیەک بێت تەنانەت حەقیش بێت، هەست بەوە ناکەن کە ئەمە وائەکات لە داهاتوو کۆمەڵێک کەس بە ناحەق تەکفیر بکرێن، هێندە ترساندوویانن بەوەی لەوە زیاتر هیچ مەڵێن، وایان لێهاتووە هەموو ووتەیەک جگە لەمە بە کوفر ئەزانن تەنانەت گەر سەلەفیش بە کوفریان نەزانی بێت، جا کەسانێک کە بە ناحەق خەڵکیان تەکفیر کرد تۆ ناچاری روونی بکەیتەوە کە کام ووتە کوفرە و کامەی کوفر نیە، ئەم روونکردنەوەیە مانای ئەوە نیە تۆ بەوە ناوەستی کە سەلەف لەسەری وەستان، ئەتەوێ شتانێکی زیاتر بڵێی کە ئەوان لێی بەرین.

# بەشێک

سبحان الله بە زۆر ئەیانەوێ شتێک بدەنە پاڵم کە نەم ووتوە نەم ووتوە، ئێستاش ئەیڵێمەوە کەسێک بڵێ کاغەز و حیبر و فعلی عەبد مەخلوقە نە تەکفیری ئەکەم نە تەبدیع، تاکو بەڵگە نەهێنن لە سەلەف کە خاوەنی ئەم ووتەیە تەکفیر یان تەبدیع ئەکەن ئەوا منیش تەکفیری ناکەم و تەبدیعی ناکەم، هەر تەفسیلێکی تریش هەر کەس باسی کردبێ گەر حوکمی سەلەفی لەسەر بوو ئەوا هەمان حوکم ئەدەم، گەر حوکمی سەلەف لەسەر ئەم ووتەیە دیاریکراوە نەبوو حوکمی لەسەر نادەم، وەک غولاتەکان کە تا ئێستاش لە بابەتەکە حاڵی نەبوونە و نازانن لەفزییەکان کێن، لەم ڕستەیە یەک ووشە زیاتر بڵێی جا هەر ووشەیەک بێت حەق بێت یان باتل ڕێک ئەتکەن بە لەفزی، ئەم رستەیە ⬅ (قورئان کەلامی اللە یە و مەخلوق نیە)

ئێستاش ئەیڵێمەوە خاوەنی ووتەیەک تەکفیر و تەبدیع ناکەم کە سەلەف نەیان ووتبێ خاوەنی ئەم ووتەیە کافرە یان مبتدع، جا هەر کەسێک پێی وایە مادام من ئەم قسەیە ئەکەم ئەوا منیش یەکێکم لەوان ئەوا ئەمە زۆرداری خۆتە ئەیسەپێنی بەسەرم، سەبارەت بە حاڵی بوخاریش تاکو ئێستا نەهاتوومە سەر ڕووداوەکەی نەیسابور

لەنێوان بوخاری و الذهلي، وە تاکو ئێستا نەهاتوومەتە سەر ووتەکانی بوخاری لە کتێبی خلق افعال العباد، کە ئەمانەم بۆ کۆتایی هەڵگرتووە، سبحان الله نەفس چەندە زاڵە یەعنی بە زۆر ئەیانەوێ وەک زۆرانبازی لێ بکەن بڵێن تۆ ئەمەو ئەوەت ووتووە ئێستا حاشای لێ ئەکەیت چونکە ئەزانی توش بوویت! یەعنی هەندێک ووتە هەر بە درۆ ئەدەنە پاڵم کە واللە لێی بەریمە و هەرگیز بە ئاساییم نەزانیوە، سبحان الله پێیان قورسە بڵێن بە هەڵە تەکفیرمان کردیت یان تەبدیع، ئەیانەوێ بە زۆر وای لێبکەن کە کوفریان لە من دیوە یان بیدعە بۆیە تەکفیر و تەبدیعیان کردووم، چونکە گەر بەیانی دەرکەوت بۆ خەڵکی ئەوان هەڵەن، کەس یەخەیان نەگرێ بڵێ بۆ فلانت بە ناحەق تەکفیر کرد یان تەبدیع، ئەیانەوێ هەر لە ئێستاوە ووتەیەکم بدەنە پاڵ تاکو بەیانی بڵێن لەبەر ئەم ووتەیە تەکفیرمان کرد یان تەبدیع.

سبحان الله بە هەڵە لە پۆستەکان حاڵی ئەبن بەهۆی کەمی ئاستی تێگەیشتنیان، کە ڕوونی ئەکەیتەوە ئەڵێی واللە من مەبەستم ئەمە و ئەوە نەبووە، ناڵێ باشە من بە هەڵە لێت حاڵی بووم، ئەڵێ نەخێر درۆ ئەکەیت کە زانیت تێکەوتی ووتەکەت گۆڕی! ئێ ووتەکانم هەمووی ماون، گەر ئەڵێن گۆڕیویەتی ئەوا کەسانی تر کۆپیان کردووە لەوانی وەربگرن، ئێستاش ئەیڵێمەوە ئەوەی بڵێ کاغەز و حیبر و فعلی عەبد مەخلوقە، بەمە نە تەکفیری ئەکەم نە تەبدیع، وە لەگەڵ ئەوەم توسع نەکرێ لە ڕەددانەوەی کوفر و بیدعە، بەڵام کەسێکی ئەهلی سوننە توسع بکات لە ڕەددانەوەی کەسانێک بەمە تەکفیری ناکەم و تەبدیعی ناکەم مادام مەبەستەکەی بە جوانی ڕوون بکاتەوە،

بەڵام بێگومان بەکارهێنانی هەندێک ووتە بە هەڵە ئەزانم کە سەلەف نەیان ووتبێ یان ئەهلی بیدعە بەکاری بهێنن، کە دواتر ئەچمە سەری مەبەستم کام ووتانەیە، هەر بۆیەش سەرەتا کە یەکەم پۆستم کرد ووتم کەس وەڵامم نەداتەوە تاکو تەواو ئەبم، چونکە ئەزانم کە پێش تەواو بوون ڕەددیان دامەوە شتانێک باس ئەکەن کە من هێشتا باسم نەکردووە هەڵم گرتووە بۆ کۆتایی، جا لە کۆتایی کە باسم کرد ئەڵێن ئەها بۆی دەرکەوت هەڵەیە قسەکانی گۆڕی.

من تاکو ئێستا باسی ئەو ووتانەی بوخاریم کردووە کە ئەڵێ کاغەز و حیبر و فعلی عەبد و دەنگی عەبد و دڵی عەبد مەخلوقە، بەڵام ئەوەی عەبد ئەینوسێ لە پەڕاوەکان کەلامی اللّٰه یە و مەخلوق نیە، ئەوەی لە عەبد ئەبیسترێ کەلامی اللّٰه یە و مەخلوق نیە، ئەوەی عەبد حفزی ئەکات لە دڵی کەلامی اللّٰه یە و مەخلوق نیە، ئەوەی عەبد ئەیخوێنێ کەلامی اللّٰه یە و مەخلوق نیە، کە بوخاری لە ڕەددانەوەی کەسانێک ئەمانەی ووتوە کە پێیان وابووە دەنگی عەبد و کاغەز و حیبر مەخلوق نین، جا بوخاری و کەسی تریش لەسەر ئەمە تەبدیع ناکەم چ جای تەکفیر، ئەمەم چەندین جار باسکردووە لە پۆستەکان ئێستاش ئەیڵێمەوە، سەبارەت بەوەش کە بوخاری ئەڵێ تیلاوە و کیتابە و قیرائە فعلی عەبدن و مەخلوقن، بەڵام مەتلو و مەکتوب و مەقروء کەلامی اللّٰه-ن مەخلوق نین، ئەمەم لەکاتی هێنانی ووتەکەی ابن کلاب باسکرد کە ئەویش ئەڵێ تیلاوە فعلی عەبدە مەخلوقە، بەڵام مەتلو کەلامی اللّٰه یە مەخلوق نیە، ووتم کەسانێک بە ووتەکەی ابن حامد هەڵخەڵەتاون کە ئەڵێ ئیمام احمد ئەوانەی

باسی تیلاوە و مەتلو بکەن بە زندیقیان ئەزانێ، جا وائەزانن ووتەکەی بوخاری و ابن کلاب هەمان شتە حوکمەکە لەسەر بوخاریش تەنزیل ئەکەن، کەچی نازانن ابن کلاب مەبەستی لە مەتلو کەلامی نەفسی بوو، وە مەبەستی لە تیلاوە فعلی عەبد بوو کە قورئان ئەخوێننەوە، واتا ئەم قورئانەی سەر زەوی فعلی عەبدە و مەخلوقە، کە بوخاری ئەمانە تەکفیر ئەکات، هەر ئەمەندەم باسکردووە، جارێ نەچوومەتە سەر تەواوی ووتەکانی لە خلق افعال العباد، وە من ئەم ووتەیەش بە دروست نازانم کە بووترێ چونکە ئەهلی کوفر هەمان ووتە بەکار ئەهێننەوە و بۆ شاردنەوەی کوفرەکەیان ئەوەی لە مەزهەبی کوللابیەکان تێنەگات وائەزانێ هەمان عەقیدەی بوخاریان هەبووە چونکە لە زاهیردا هەمان ووتە ئەڵێن، بەڵام ئەبێ ئەوەش بزانین بوخاری هەمیشە لەگەڵ ئەم ووتانەی ئەیووت ئەوەی ئەنوسرێ و حفز ئەکرێ و ئەخوێندرێ و ئەبیسترێ کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، ئەوەی بڕوای وانەبێت کافرە، کە کوللابیەکان ئەمە ناڵێن، بەڵام چەند بەشێکی ووتەکانیان تقاطع ئەکات کە ئەگەر هێندە توسع نەکرابوایە لە ڕەددانەوەیان نەئەگەیشت بەمە، جا گەر تۆ لەوانەی نازانی هەڵە چیە و بیدعە چیە و کوفر چیە و حاڵی کەسەکە چۆنە و لە چ مەقامێکە و چ پاڵنەرێک وای لێکردووە ئەم قسانە بکات، بەڵکو هەموو ووتەیەک لەم بابەتە بە کوفر ئەزانیت ئەوا کێشەی خۆتە، من وەک تۆ نیم، وە والله دامنابوو کە لە کۆتایی ئەمە باس بکەم کە هەندێک ووتەی بوخاری بە هەڵە ئەزانم و لەگەڵی نیم بووترێ چونکە ئەهلی بیدعە بەکاری ئەهێنن بە مەبەستی تر، بەڵام ئێستا ناچار بووم باسی بکەم، تاکو لە کۆتایی کە ئەم قسانەم کرد کەس نەڵێ زانیویەتی هەڵەیە ئێستا هاتووە پاشەکشە ئەکات و قسەکانی گۆڕیوە، بەڵام بوخاریش لەوە تێگەیشتووە بۆیە هەرکات

باسی ئەم تەفسیلە ئەکات تەرکیز لەوە ئەکات کە ئەو قورئانەی سەر زەوی لە هیچ بارێکدا مەخلوق نیە، وە ئێستاش ئەیلێمەوە با لە مێشکتان بچەسپێ، کەسێک پێی وابێت حیبر و کاغەز و فعلی عەبد غەیر مەخلوقە، کەسێکیش بێت بۆی روون بکاتەوە کە ئەمانە مەخلوقن بەڵام کەلامی الله لە هیچ حاڵێکدا مەخلوق نیە، ئەوا کارەکەی هیچ بە کوفر و بیدعە و هەڵە نازانم، چونکە کە کەسێک بڵێ کاغەز و حیبر مەخلوقە تۆ ناتوانی بەم ووتەیە رەددی بدەیتەوە (قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە) ئێ ئەویش هەمان شت ئەڵێ کێشەی نیە، بەڵام شتی مەخلوق ئەکات بە غەیر مەخلوق، خۆ ئەبێ بۆی روون بکەیتەوە ئەم شتانە مەخلوقن.

# بەشێک

ئەوانەی لە بابەتی لەفزییەکان تێنەگەیشتوون و قسەی تێدا ئەکەن، بەرەو حاڵێکتان ئەبەن کە کەسانێک تەکفیر ئەکەن گەر بێتو پێتان بووترێ کوفری ئەم کەسانە چی بوو کە تەکفیرتان کردن ؟ ئەوا لە وەڵامدا ئەڵێن: نازانین، یان باسی شتێک ئەکەن کە خۆشیان دڵنیان ئەمە کوفر نیە، بگرە خۆشیان لە دڵەوە بڕوایان پێیەتی.

بەڵام هێندە زانای کافر و زندیق لێمان کراون بە ئیمام، ئێستا وامان لێهاتووە بەلامانەوە ئاسایی بێت زانایان تەکفیر بکەین مادام قسەیان لەسەرە، ئەوەمان بیرچۆتەوە زانایان ڕێز و پێگەی خۆیان هەیە و پارێزراوە و هیچی لێ کەم نابێتەوە تاکو ئەو کاتەی بە یەقینەوە لەسەریان ئەچەسپێ کافرن یان مبتدع.

ئەوەی مەوقیفی منیش لاواز ئەکات لەم بابەتەدا ئەوەیە کە من لەبەرەی تەکفیر نیم، لایەنی تر بەبێ هەبوونی کوفر خەڵک تەکفیر بکات کەس یەخەی پێ ناگرێ چونکە هەمیشە لە ڕیزی تەکفیری زانایان بووینە و دژی ئەوانە بووین کە دفاعیان کردووە

لێیان، بەڵام ئەوەی بەرگریەکە ئەکات ناڵێ هەی زندیقی جەهمی، ئەڵێ باسەکە ئاوا نیە هەڵە حاڵی بوونە، ئاخر ئێوە خەڵک تەکفیر ئەکەن بەبێ بوونی کوفر تێیدا.

کە ئەم ووتانە ئەبیستن لێت، ئەڵێن: ئەمە عەقیدەی شلە، خەریکی پینە کردن و دفاع کردنە لە کافران و بە کەم نیشاندانی کوفرەکانیانە، سەیری ووتەی ئەوی تر بکە زۆر راشکاوانە ئەڵێ جەهمی کافر، دیارە ئەویان عەقیدەی پتەوترە و شتێک زیاتر ئەزانێ، بەڵام ئەوەی تر بەس خەریکی پینە کردنە.

# بەشێک

ئەم پرسیارە بۆ هەندێک کەسە هیوادارم وەڵامی بدەنەوە

قارێئێک هەبوو لە سەردەمی ئیمامی عمر رضي الله عنه بە ناوی (معاذ القارئ) بەوە ناسراو بوو کە دەنگی زۆر بەرز بوو لە قورئان خوێندنەوە، شەوان خەڵک بەهۆی بەرزی دەنگی ئەو لە خەو هەڵئەستان

ئیمام عمر کاتێک ئەبیستێ معاذ القارئ دەنگی زۆر بەرز کردۆتەوە کە قورئان ئەخوێنێتەوە، ئەڵێ: (إن أنكر الأصوات لصوت الحمير).

وسمع عمر معاذا القارئ يرفع صوته بالقرآن، فقال: (إن أنكر الأصوات لصوت الحمير).

**(خلق أفعال العباد : ٧٣)**

---

پرسیارەکەم ئەمەیە:

ئیمامی عمر مەبەستی چیە لەم ووتەیە ؟

گەر بڵێن مەبەستی قورئانەکەیە پەنا بە الله ئەوا کوفرتان داوەتە پاڵ ئیمام عمر، گەر بڵێن مەبەستی دەنگی قاریئەکە بووە نەک کەلامی الله، ئەوا دانتان بەو تەفسیلە داناوە کە چەندەها زانای لەسەر تەکفیر یان تەبدیع ئەکەن.

# اللفظية (١٤)



## تێگەیشتن لە مەزهەبی لەفزییەکان و ڕوونکردنەوەی زیاتر لەسەری

دوای ئەوەی جەهمیەکان لاواز بوون و فیتنەی خلق القرآن هەڵگیرا جەهمیەکان بوێری ئەوەیان نەما بە ئاشکرا بڵێن قورئان مەخلوقە، هاتن لە ڕێگای ترەوە بە فێڵەوە ئەمەیان ووت، واقفە و لەفزی دروست بوون بە ناڕاستەوخۆ ئەیان ووت قورئان مەخلوقە، یەکێکیان بە ڕێگای توقف کردن نەیان ئەووت قورئان مەخلوق نیە، لەفزییەکانیش لە ڕێگای لەفز ووتیان لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، بۆیە ئیمام احمد ئەڵێ ئەمانە پیسترن لە جەهمیەکان خەڵک فریو ئەدەن کاتێک تەنگاو بکرێن هەموویان ئەڵێن قورئان مەخلوقە، جا هەر کەسێکیش بیەوێ فێڵ بکات فێڵێک ناکات کە هەموو خەڵکی بزانن ئەمە فێڵە، بەڵکو شتانێک بەکار ئەهێنێت تاکو خەڵکی پێ فریو بدات، ئەگینا گەر فاسدی و باتلی ووتەکەی بۆ هەموو کەس ڕوون بێت ئەوا ئەوکات هیچ فێڵ کردنێک بوونی نیە لە ووتەکەیدا، بۆیە

لەفزیەکان هاتن ووتیان لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، خەڵکانێک واحاڵی ئەبن مەبەستیان لە لەفز ووتەی بەندەکانە نەک ووتەی الله، لە کاتێکدا ئەوان مەبەستیان مەخلوقی قورئانە، بەڵام ووتەیەکی موجمەل بەکار ئەهێنن تاکو رەواج بە کوفرەکەیان بدەن لەناو خەڵکی چونکە گەر بە ڕاشکاوی بڵێن قورئان مەخلوقە ئەوا باتلی و پوچی ئەم ووتەیان لای خەڵکی عەوامیش روون ئەبوو، هەروەک ابن بطة باسی ئەوە ئەکات کە ئیمام احمد درکی بەم فێڵەیان کرد و کوفرەکەیانی بۆ خەڵکی روون کردەوە.

ابن بطة ئەڵێ:

بزانن رەحمەتی الله-تان لێبێ کە بەشێک لە جەهمیەکان بە فێڵی دڵیان و پیسی ڕەئیەکانیان و ناشرینی ئارەزووەکانیان بڕوایان وابوو کە قورئان مەخلوقە، جا ناوێکی تریان لە مەخلوقی قورئان نا بە بیدعەیەک کە دایان هێنا، بۆ فێڵ کردن و چەواشە کردنی خەڵکی عەوام، بۆ ئەوەی کوفرەکەیان بشارنەوە و ئیلحادەکەیان شاراوە و ناڕوون بێت بۆ ئەو کەسانەی کە عیلمیان کەمە و سروشتیان لاوازە، جا ووتیان: (ئەو قورئانەی کە الله قسەی پێکردووە و فەرموویەتی کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە ئەو قورئانەی کە ئێمە ئەیخوێنینەوە بە زمانەکانمان و ئەینوسین لە پەڕاوەکانمان ئەو قورئانە نیە کە کەلامی الله یە، بەڵکو حیکایەتە بۆ ئەو قورئانە بە لەفزی ئێمە، وە لەفزی ئێمەش بە قورئان مەخلوقە) جا کوفرەکەیان وورد و شاراوە کرد، وە فێڵیان کرد بۆ ئەوەی کوفر بخەنە ناو خەڵکیەوە بە ناڕوونترین ڕێگا و ووردترین مەزهەب و شاراوەترین جۆر، بەڵام بە حەمد و منەت و چاکی تەوفیق دانی الله ئەم کوفرە شاراوە

نەبوو بۆ زانایە گەورە و ڕەخنەگرە عاقڵەکان، قیناعیان لابرد لەسەر ئەو کوفرە ناشرینەی کە شاردبوویانەوە، جا کوفریان دەرکەوت بۆ زانایان و خەڵکی عەوامیش، وە ئەو کەسەی کە ئەمەی زانی و هەستی پێکرد و ناشرینیەکەی ووتەکەیانی زانی شێخی صالح و پێشەوای زانا و عاقڵ باوکی عبدالله بوو احمد بن محمد بن حنبل رحمه الله.

**بڕوانە (الإبانة الكبرى : ٢٢٢٨)**

تێبگەن رحمكم الله کە ئەمە ووتەی لەفزییەکان بووە، هیچ کێشەیان لەگەڵ ئەوە نەبوو بڵێن قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، بەڵام بە ووتەی دواتر قورئانیان ئەکرد بە مەخلوق کاتێک ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، هەروەک ابن بطة باسی کرد، هەر بۆیە ئیمام احمد ئەیووت ووتەکەی کۆتاییان ووتەی سەرەتایان هەڵئەوەشێنێتەوە، سەیرم لە کەسانێک دێت تاکو ئێستاش بەڵگە بەم ریوایاتانە ئەهێننەوە کە کابرا وتوویەتی قورئان مەخلوق نیە بەڵام لەفزم بە قورئان مەخلوقە، کەچی ئیمام احمد هەر تەکفیری کردووە!

ئێ خودی کوفری لەفزییەکان هەر ئەمە بوو کە ابن بطة باسیکرد، ئەوانیش ئەیان ووت قورئان مەخلوق نیە بەڵام لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، بەمە قورئانیان ئەکرد بە مەخلوق، بۆیە هەرکەس بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە جەهمیە و برایەوە، ئیللا مەگەر بە دیاریکراوی بزانرێ کەسەکە مەبەستی لە مەخلوقی لەفز مەخلوقی قورئان نیە، بەڵکو مەبەستی مەخلوقی فعلی خۆیەتی، لە ووتەی جەهمیەکان تێناگات و بە هەڵە حاڵی بووە لە ووتەکە، ئەوکات تەکفیر ناکرێت و بۆی روون ئەکرێتەوە کە ئەبێ

واز لەم ووتە داهێنراوە بهێنێت، بۆیە ئەوانەی کە تا ئێستاش لە مەزهەبی لەفزیەکان حاڵی نەبوونە ئەڵێن ئەها سەیرکەن فلان کەس ووتی قورئان مەخلوق نیە تەنها ووتی لەفزم بە قورئان مەخلوقە کەچی تەکفیر کرا!

تێناگات لەوەی کە ئەم ووتەیە دانراوی جەهمیەکان بوو بۆ ئەوەی بە فێڵ بڵێن قورئان مەخلوقە، بۆیە لە ئەسلدا هەر کەس ووتی لەفزم بە قورئان مەخلوقە ئەوا جەهمیە تا ئەو کاتەی ئەزانرێ لەم ووتەیە تێناگات و بە هەڵە بەکاری هێناوە، هەر بۆیەش سەلەف لە حوکمدان لەسەر واقفی و لەفزی تەفسیل ئەدەن بەڵام لە حوکمدان لەسەر ئەوانەی کە ئەڵێن قورئان مەخلوقە تەفسیل نادەن.

الآجري کە مامۆستای ابن بطة-یە لە کتێبی الشریعة بابێکی داناوە بە ناونیشانی:

(ذكر اللفظية، ومن زعم أن هذا القرآن حكاية للقرآن الذي في اللوح المحفوظ، كذبوا)

واتا: باسکردنی لەفزیەکان، وە هەر کەسێک پێی وابێت ئەم قورئانەی سەر زەوی حیکایەتی قورئانەکەی لوح المحفوظ-ە، ئەوا درۆیان کردووە.

**الآجري** ئەڵێ:

ئەوەی بڵێ: ئەم قورئانەی کە خەڵک ئەیخوێنێتەوە کە لە پەڕاوەکاندایە حیکایەتی قورئانەکەی لوح المحفوظ-ە، ئەوا ئەمە ووتەیەکی مونکەرە زانایان ئینکاری لێ

ئەکەن، وە بە خاوەنی ئەم ووتەیە ئەووترێ: قورئان بە درۆت ئەخاتەوە و ووتەکەت ڕەت ئەکاتەوە، وە سوننەتیش بە درۆت ئەخاتەوە و ووتەکەت ڕەت ئەکاتەوە.

الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٦]، الله تعالى هەواڵیدا کە خەڵکی کەلامی الله تعالى ئەبیستن، نەیفەرموو: حیکایەتی کەلامی الله.

الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ [الأعراف: ٢٠٤]، الله هەواڵیدا کە گوێگر کەلامی الله ئەبیستێ، نەیفەرموو: حیکایەتی کەلامی الله.

الله تعالى فەرموویەتی: ﴿إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ﴾ [الإسراء: ٩].

الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْاْ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ (٢٩) قَالُواْ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ (٣٠)﴾ [الأحقاف: ٢٩-٣٠].

الله تعالى فەرموویەتی: ﴿قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓاْ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا (١) يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ (٢)﴾ [الجن: ١-٢]، نەیفەرموو: حیکایەتی قورئان ئەبیستن، وە جنەکان نەیان ووت: ئێمە حیکایەتی قورئانمان بیست، وەک ئەوانەی کە بیدعەیەکی گومڕاییان داهێنا ووتیان، کە پێچەوانەی قورئان و سوننەت و ووتەی ئیماندارانە.

الله تعالى فەرموویەتی: ﴿فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِۚ﴾ [المزمل: ٢٠].

**بڕوانە (الشريعة : ٢٣٢)**

سەیری ئەو ئایەتانە بکە کە الآجري هێناویەتی بۆ ڕەددانەوەیان، ابو طالب کە قوتابی ئیمام احمد بوو بەشێک لەم ئایەتانەی هێنابوویەوە لە دژی لەفزییەکان، کە ئیمام احمد ئایەتەکانی بیست ووتی: چەند بە چاکی بەڵگەت لە دژیان هێناوەتەوە.

## عبدالله کوڕی ئیمام احمد ئەڵێ:

پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی ئەو کەسەی کە ئەڵێ: لەفزم بە قورئان مەخلوقە ؟

ووتی: بە خاوەنی ئەم ووتەیە ئەووترێ: لا إله إلا الله مەخلوقە ؟ لەم ووتەیەیدا مولزەم ئەبێت کەوا بڵێت.

وە پێی ئەووترێ: لەفزی جبریل بە قورئان مەخلوقە ؟ وە لەفزی محمد بە قورئان مەخلوقە ؟

عبدالله ئەڵێ باوکم ووتی: ئەمە ووتەیەکی پیس و خراپە، ئەمە ووتەی جەهمیەکانە.

وە ووتی: وە پێم گەیشتووە لەفزییەکان نعیم (واتا نعیم بن حماد) ئەدەنە پاڵ ئەم ووتەیە، وە درۆیان کرد بە دەمی نعیم، نازانین نعیم کتێبێکی دانا بێت و بیخوێنێتەوە بەسەر خەڵک، دانانی ئەم کتێبانە بیدعەیە.

**(السنة للخلال : ٢٠٦٧)**

ئیمام احمد لەفزییەکان مولزەم ئەکات بەوەی کە بڵێن لا إله إلا الله مەخلوقە

باشە گەر لەفزییەکان مەبەستیان لەم ووتەیە مەخلوقی فعلی خۆیان بێت نەک قورئان، ئەوکات ئەم ئیلزام کردنەی ئیمام احمد بۆیان چ مانایەکی ئەبێت ؟! بە پێی تێگەیشتنی ئێوە لەفزییەکان ناڵێن قورئان مەخلوقە تەنها ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوقە، کەواتە بۆچی ئیمام احمد مولزەمیان ئەکات بەوەی کە بڵێن لا إله إلا الله مەخلوقە ؟! خۆ ئەوکاتیش هەمان وەڵام ئەدەنەوە و ئەڵێن دەنگی عەبدەکە مەخلوقە و ئەوەی عەبد دەری ئەبڕێ مەخلوق نیە، کەواتە ئیمام احمد سەرکەوتوو نەبوو لە ئیلزام کردنەکەی، بە شتێک ئەیەوێ بیانگرێ کە ئەوان وەڵامیان بۆی حازرە!

گەر لەم بابەتە تێبگەن وەک خۆی ئەوا ئەزانن ئیمام احمد چەندە بلیمەت بووە لە ڕەددانەوەیان، بەڵام کە وەک خۆی تێی ناگەن وا خەڵکی و خۆشتان حاڵی ئەکەن کە ئیمام احمد بە شتانێک ڕەددیان ئەداتەوە هیچ پەیوەندی بە باسەکە نیە! هەمیشە لە ڕەددانەوەیان ئەڵێ نەخێر قورئان مەخلوق نیە، ئێ باشە ئەوان ئەیان ووت قورئان مەخلوق نیە بەڵام لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، ئەم وەڵامەی ئیمام احمد چ مانایەکی هەیە ؟! بیر بکەنەوە

**المروزي** ئەڵێ:

باوکی عبدالله پێی ووتم: پێم گەیشتووە کە نعیم ئەیووت: لەفزم بە قورئان مەخلوقە، گەر ئەمەی ووتبێ ئەوا الله لە گۆڕەکەیدا لێی خۆش نەبێت.

**(السنة للخلال : ٢٠٦٨)**

## مؤمل بن إهاب ئەڵێ:

ووتم بە نعیم بن حماد: چی وای لێکردیت بڵێی: لەفزم بە قورئان مەخلوقە ؟

ووتی: والله ئەمەم نەوتووە تەنها بۆ بەڵگە هێنانەوە لە دژیان نەبێت.

ووتم: مەگەڕێوە بۆ ووتنی ئەم ووتەیە.

ووتی: من داوای لێخۆشبوون لە الله ئەکەم لە ووتنی، مەبەستم هیچ نەبووە لە ووتنی جگە لە ڕەددانەوە و بەڵگە هێنانەوە لە دژیان.

**(السنة للخلال : ٢٠٦٩)**

ئەم دوو ریوایەتە بۆ روونکردنەوەی عەقیدەی نعیم بن حماد هێنام رحمه الله

## یعقوب بن ابراهيم الدورقي ئەڵێ:

ووتم بە احمد بن حنبل: چی ئەڵێی دەربارەی ئەو کەسەی کە پێی وایە لەفزی بە قورئان مەخلوقە ؟

ووتی: ئەمانە لەلای من خراپترن لە جەهمیەکان، ئەوەی پێی وابێت لەفزی بە قورئان مەخلوقە ئەوا پێی وایە پێغەمبەرمان صلى الله عليه وسلم قسەی بە شتێکی مەخلوق

کردووە (تكلم بمخلوق) وە جبريل بە شتێکی مەخلوق هاتووە بۆلای پێغەمبەرمان، ئەمانە لەلای من خراپترن لە جەهمیەکان، قورئان کەلامی الله و غەیر مەخلوقە لە هەموو ڕووێک و لە هەموو حاڵێکدا، هەرگیز نابێتە مەخلوق (لا يكون مخلوقا أبدا) الله تبارك وتعالى فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٦]، نەیفەرموو: تاکو کەلامی تۆ ئەبیستێ ئەی محمد (ولم يقل: حتى يسمع كلامك يا محمد).

**بڕوانە (السنة للخلال : ٢٠٧٢)**

با هەڵوەستەیەکی وورد بکەین لەسەر ئەم ریوایەتە

پرسیار لە ئیمام احمد ئەکەن دەربارەی ئەو کەسەی کە ئەڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە

- ئیمام احمد ئەڵێ ئەمانە خراپترن لە جەهمیەکان.

ئایا ئەو کەسەی بڵێ قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە بەڵام فعلی عەبد مەخلوقە، ئەو کەسە خراپترە لە جەهمیەکان کە ئەڵێن قورئان مەخلوقە ؟ یان ئیمام احمد ئەزانێ لەفزییەکان بە شاراوەیی و ناراستەوخۆ ئەڵێن قورئان مەخلوقە وەکو ژەهر بە شاراوەیی کوفرەکەیان ئەخەنە ناو خەڵکیەوە بۆیە ئەڵێ خراپترن لە جەهمیەکان ؟

- ئیمام احمد ئەڵێ ئەوەی پێی وابێت لەفزم بە قورئان مەخلوقە، پێی وایە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم قسەی بە شتێکی مەخلوق کردووە (تكلم بمخلوق).

ئەم ووتەیەی ئیمام احمد زۆر روونە کە لەفزیەکان ئەیان ووت ئەو قورئانەی کە بەندەکان بە لەفزی خۆیان دەری ئەبڕن مەخلوقە، ئەگینا بۆ ئەڵێ پێیان وایە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم قسەی کردووە بە شتێکی مەخلوق ؟ خۆ گەر مەبەستی لەفزیەکان ئەوە بوایە فعلى عەبد مەخلوقە کەلامی الله مەخلوق نیە، ئەوا ئەم ووتەیەی ئیمام احمد ناراست دەرئەچوو کە دەربارەی لەفزیەکان ووتی، وە ناتوانێ بە هیچ جۆرێک مولزەمیان بکات بەم ووتەیە، چونکە بە گوێرەی فەهمی ئێوە لەفزیەکان نەیان ووتوە قورئان مەخلوقە تەنها وتوویانە فعلى عەبد مەخلوقە، لە نەتیجەدا ئەبێ بووترێ ئیمام احمد لە ووتەی لەفزیەکان حاڵی نەبووە بۆیە ئەم قسانەی کردووە ؟!!! لە کاتێکدا ئیمام احمد خۆی ئوستازی ئەم بابەتانە بووە و کەس وەک ئەوەی ئاگاداری ووتەی جەهمیەکان نەبووە، بۆیە تەنها لەو کاتەدا ووتەکەی ئیمام احمد راست دەرئەچێ دەربارەیان کە ئەوان مەبەستیان لەم ووتەیە مەخلوقی قورئان بێت.

- ئیمام احمد ئەڵێ لەفزیەکان مولزەم ئەبن کە بڵێن جبریل شتێکی مەخلوقی بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هێناوە، واتا قورئان، ئایا لەفزیەکان گەر مەبەستیان مەخلوقی قورئان نەبێ ئیمام احمد بۆ مولزەمیان ئەکات بەمە، خۆ بە گوێرەی فەهمی ئێوە بێ لەفزیەکان ئەڵێن: ئەو قورئانەی کە جبریل هێناویەتی مەخلوق نیە، بەڵام دەنگی جبریل و فعلی جبریل مەخلوقە ئەگینا قورئانەکە مەخلوق نیە، بە پێی فەهمی

ئێوە بێ دیسان لە نەتیجە وادەرئەکەوێ ئیمام احمد تێنەگەیشتووە لە لەفزیەکان، بە شتانێک مولزەمیان ئەکات کە لە ئەسلەوە ئەوان لێی بەرین.

- ئیمام احمد ئەڵێ قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە لە هیچ بار و حاڵێکدا، قورئان هەرگیز نابێتە مەخلوق.

سەیری ئەم ووتەیە بکە قورئان هەرگیز نابێتە مەخلوق، لە ڕەددانەوەی لەفزیەکان ئەم قسەیە ئەکات، ئایا ئەمە مانای ئەوە نیە کە لەفزیەکان ئەیان ووت: کاتێک بە لەفزی خۆمان قورئان دەرئەبڕین قورئان ئەبێتە مەخلوق ؟ ئەگینا چ مانایەکی هەیە ئیمام احمد بڵێ قورئان هەرگیز نابێتە مەخلوق ؟ تێبگە واتا لەفزیەکان لە حاڵێک لە حاڵەکان قورئان ئەکەن بە مەخلوق، ئەویش ئەو کاتەیە کە بەندەکان بە لەفزی خۆیان دەری ئەبڕن، بۆیە ئیمام احمد ئەڵێ هەرگیز قورئان نابێتە مەخلوق، سەیرکە بە هیچ جۆرێک باسی فعلی عەبد ناکات، کە ئێوە پێتان وایە لەفزیەکان مەبەستیان فعلی عەبد بووە نەک قورئان.

- ئیمام احمد دیسان بەڵگە بەم ئایەتە ئەهێنێتەوە لە دژی لەفزیەکان (حتى يسمع كلام الله) تاكو كەلامی الله ئەبیستێ، ئایەتەکە بەڵگەیە کە ئەم قورئانەی ئەخوێندرێ کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، گەر کابرای لەفزی مەبەستی مەخلوقی فعلی عەبد بێت ڕەددانەوەی بەم ئایەتە مانای چیە ؟

ئینجا ئیمام احمد ئەڵێ الله فەرمووی کەلامی الله ئەبیستێ، نەیفەرموو کەلامی محمد ئەبیستێ، ئەم ووتەیەی ئیمام احمد لە ڕەددانەوەی لەفزییەکان مانای ئەوەیە کە لەفزییەکان قورئان ئەکەن بە مەخلوق کاتێک بە لەفزی خۆیان دەری ئەبڕن.

إن شاء الله لە پۆستەکانی داهاتوو لە نموونەی ئەم ڕیوایەتانە پۆست ئەکەم، لەبەر درێژ بوونەوە بەمەندە وازم هێنا لەم پۆستە، وە لەو کاتەوەی من دەستم کردووە بەم زنجیرە پۆستە چەندین ڕیوایەتی لەم جۆرەم پۆست کردووە، بۆیە بەوە هەڵتان نەخەڵەتێنن بڵێن ئەمانە ڕیوایەتی شاز و دەگمەن ئەهێنن، وازیان لە ڕیوایەتە زۆر و باوەکان هێناوە، بەڵکو بە عەکسەوە گەر هەموو ڕیوایەتەکان کۆ بکرێتەوە دەرئەکەوێ کامەی روونە و باوە، وە کامەی شازە و ناروونە.

---

ماویەتی

# بەشێک

**الغزالي** (٥٠٥ هـ) ئەڵێ:

کەلامی الله نوسراوە لە پەڕاوەکاندا، حیفز کراوە لە دڵەکاندا، ئەخوێندرێتەوە بە زمانەکان، بەڵام کاغەز و حیبر و نوسین و پیت و دەنگ هەموویان مەخلوقن.

**ابن أبي الخير العمراني** (٥٥٨ هـ) دەربارەی ئەم ووتەیەی الغزالي ئەڵێ:

سەبارەت بە ووتەکەی کە کاغەز و حیبر مەخلوقن، ئینکاری لەمە ناکرێ، پیت بریتی نیە لە خودی حیبرەکە و خودی کاغەزەکە، بەڵام ووتەکەی کە قورئان نوسراوە لە پەڕاوەکاندا و حیفز کراوە لە دڵەکاندا و ئەخوێندرێتەوە بە زمانەکان، گەر مەبەستی لەم ووتەیە قورئان بێت کە کەلامی الله یە بە حەقیقی، ئەوا ئەڵێین ئەمە دروستە، وە پوچەڵ بۆتەوە کە الله کەلامێکی هەبێت لە زاتی خۆیدا لێی جیا نەبێتەوە، وە ئەمەش ووتەی ئەهلی حەدیثە، وە ئەگەر مەبەستی لەم ووتەیە عیبارەتی ئەو قورئانە بێت کە لە زاتی الله دایە، ئەوا ئەم ووتەیەی ووتەیەکی بەتاڵە هیچ مانایەکی نیە جگە لە خۆداپۆشین بە ووتەی ئەهلی حەدیث، وە ئەم ووتەیەی بەڵگەیە لەسەری کە ووتی قورئان نوسراوە لە پەڕاوەکاندا ،چونکە گەر ئەو بە ڕاشکاوی بڵێ قورئان نەنوسراوە

لە پەڕاوەکاندا بەڵکو ئەوەی نوسراوە دەلالەت ئەکات لە قورئان، ئەوکات ووتەکەی موخالفی ئەوە ئەبوو کە پێشەوایانی موسڵمانان لەسەرینە، بەڵام ووتەکەی داپۆشیوە.

**بڕوانە (الانتصار في الرد على المعتزلة القدرية : ٢ / ٥٩٤-٥٩٥)**

**الغزالي** (٥٠٥ هـ) ئەڵێ:

سێ ووشە هەیە: قیرائە و مەقروء و قورئان، مەقروء کەلامی الله یە کە لە زاتی الله دایە، بەڵام قیرائە عیبارەتی قاریئە، وە قورئان ناوێکی هاوبەشە سیفەتی الله ئەگرێتەوە کە کەلامە، هەر ئەمەش مەبەستی سەلەف بوو کە ئەیان ووت قورئان مەخلوق نیە، وە قیرائەتیش ئەگرێتەوە کە بریتیە لە فعلی قاریئەکە کە مەخلوقە.

**ابن أبي الخير العمراني** (٥٥٨ هـ) دەربارەی ئەم ووتەیەی الغزالي ئەڵێ:

دانت پێدانا کە قورئان بریتیە لەو سورەت و ئایەتانە، وە بانگەشە کردنت بۆ ئەوەی کە مەقروء کەلامێکە لە زاتی الله دا، ئەم ووتەیە سەلیم نیە و بەڵگەی لەسەر نیە نە لە قورئان و نە لە سوننەت و نە ئیجماع، ... (ئینجا ئەڵێ) بەڵام قیرائەتی قارئ جوڵاندنی ئالەتی قسە کردنیەتی و فعلی قاریئە، وە ئەوەی ئەیبیستین و تێ ئەگەین قورئانە کە ئیجماعی لەسەرە.

**بڕوانە (الانتصار في الرد على المعتزلة القدرية : ٥٩٦/٢)**

لە باسێک کە وەک خۆی تێنەگەیشتووی تازە خەریکە تێی ئەگەیت، ئەمە لە کاتێکدا پێشتر (واتا پێش ئەوەی لە باسەکە حاڵی بیت) حوکمت داوە لەسەر خەڵک، کە ئێستا خەریکە لە باسەکە ئەگەیت ئەمە ئەبێ ڕاتچڵەکێنێ بڵێی من هیچ حوکمێک نادەم لەم بابەتە لەسەر کەس چونکە من پێشتر بە هەڵە لەم باسە حاڵی ببوم، ئێستا خەریکە بۆم ڕوون ئەبێتەوە، ئەو حوکمانەی پێشتر داومە لەسەر هەر کەسێک بێت ئەوا لەسەر ئەساسی هەڵە تێگەیشتنەکەم داومە، دووبارە پێداچوونەوە و خوێندنەوە ئەکەم بە باسەکە، گەر ئەڵێی من ئەهلی گەڕان و خوێندنەوە نیم بۆ ئەم باسە، ئێ واللە ئەهلی ئەوەش نیت حوکم بدەیت لەسەر کەس لەم باسە.

بەڵام دوای ئەمانەش هەر وازت نەهێنا و سوور بووی قسە بکەیت لە باسەکە و حوکم لەسەر ئەم و ئەو بدەیت، ئەوا بیرت ئەهێنمەوە لە اللە بترسە، ئەمە دینە دین.

# بەشێک

گوێ لەمە بگرن

پۆستی داهاتوومان لەسەر ئەم دەنگەیە

https://t.me/Huud1/180

https://t.me/Lafziakan001/89

ئەم دەنگەی سەرەوە شێخی عمومیەکانە کابرای جەزائیری کە حەز ناکەم ناوی ببەم هەرگیز، ئەڵێ: ابن عباس کە ئەڵێ الله تعالی لوح المحفوظ ی دروست کرد، ئەمە ئاساییە کە لوح المحفوظ بە مەخلوق وەسف بکرێ، چونکە ئەمە پێش نوسینی کەلامی الله یە لە لوح المحفوظ، بەڵام دوای نوسینی کەلامی الله لە لوح نابێ بووترێ لوح مەخلوقە!

چونکە بە پێی مەزهەبی خۆی هەموو ئەم ووتانە لە ووتەی لەفزییەکانن گەر ووتت حیبر و کاغەزیش مەخلوقن ئەوا ئەبیتە لەفزی و جەهمی ! بۆیە دوای نوسینی کەلامی الله لە لوح، نابێ لوح بە مەخلوق وەسف بکرێ، بەڵام پێش نوسینی کەلامی الله تێیدا ئاساییە!

ئەمە ووتەکەی ابن عباس-ە کە باسی دروستکردنی لوح المحفوظ ئەکات

(خَلَقَ اللَّهُ اللَّوْحَ المَحْفُوظَ كَمَسِيرَةِ مِائَةِ عامٍ فَقالَ لِلْقَلَمِ: قَبْلَ أنْ يَخْلُقَ الخَلْقِ اكْتُبْ عِلْمِي فِي خَلْقِي فَجَرى بِما هو كائِنٌ إلى يَوْمِ القِيامَةِ)

جا شێخی عمومیەکان ئەڵێ:

ئەم ووتەیەی ابن عباس باسی سەرەتای دروستکردنی لوح ئەکات ئەوکات کەلامی الله ی تێدا نەنوسرا بوو، بەڵام دوای نوسینی کەلامی الله لە لوح، نابێ لوح بە مەخلوق وەسف بکرێ!

باشە خۆ کاتێک ابن عباس ئەم قسەیەی کرد و لەوحی بە مەخلوق وەسف کرد، ئەوکات کەلامی الله لە لوح نوسرا بوو.

گەر ئەڵێن ابن عباس باسی سەرەتای دروستکردنی لوح ئەکات پێش نوسینی کەلامی الله تێیدا، بەڵام دوای نوسینی کەلامی الله تێیدا نابێ بووترێ لوح مەخلوقە!

ئەپرسم:

گەر من لە ساڵی ٢٠٢٠ چەند پەڕە کاغەزێک دروست بکەم لە لۆکە، لە ساڵی ٢٠٢١ قورئانی تێدا بنوسمەوە، تەنها بۆم هەیە لە ساڵی ٢٠٢٠ ئەم پەڕانە کە دەستکردی

خۆمە بڵێم مەخلوقە ؟ لە ساڵی ٢٠٢١ بۆم نیە بڵێم ئەم پەڕانە من دروستم کردوون لە لۆکە ؟

یەعنی ئاساییە لە ساڵی ٢٠٢١ بە کەسێک بڵێم: ئەم پەڕانە من دروستم کرد لە لۆکە ساڵی پار

ئەویش پێم بڵێ: واتا ئەم پەڕانە دروست کراون ؟

منیش بڵێم: نا وامەڵێ، مەڵێ دروستکراون، ئێستا قورئانی تێدا نوسراوە، ئەبێ بڵێی ئەم پەڕانە تۆ دروستت کردوون لە ساڵی ٢٠٢٠

واتا لە ساڵی ٢٠٢١ مەڵێن ئەم پەڕانە دروستکراون لەلایەن هود، بەڵکو بڵێن: هود ساڵی ٢٠٢٠ ئەم پەڕانەی دروست کرد، چونکە ساڵی ٢٠٢٠ پێش کاتی نوسینی قورئانە تێیدا، بۆیە دوای ساڵی ٢٠٢٠ نابێ بووترێ مەخلوقە !!!

ئێوە پتەوی عەقیدە تەنها لەوە ئەبیننەوە قورئان نەکرێ بە مەخلوق، بەلاتانەوە گرنگ نیە شتانی مەخلوق بخرێنە ڕیزی الله و سیفەتەکانی بە غەیر مەخلوق وەسف بکرێن، یان توقف بکرێ لە وەسف کردنیان بە مەخلوق، ئێ باشە سەلەف توقف ئەکەن لە ووتە موجمەلەکان کە کەلامی الله و فعلی عەبد ئەگرێتەوە، نە بە مەخلوق و نە بە غەیر مەخلوق وەسفیان ناکەن، بەڵام ئێوە بۆ ئەو شتانەشی بۆ زیاد ئەکەن کە ڕوونە مەخلوقن ؟

ئەی ئەم عەقیدەیە مولزەمتان ناکات بەوەی کە توقف بکەن لە وەسف کردنی ئینسانی موسڵمان بە مەخلوق ؟

چونکە هەموو ئینسانێکی موسڵمان قورئان لە سینەیدا هەیە، حافز قورئانەکان قورئان بە کاملی لە سینەیاندا هەیە، ئەی بۆ بە مەخلوق وەسفیان ئەکەن ؟ ئەی مۆبایلی هەمووومان قورئانی تێدا نیە ئەیخوێنینەوە، بۆچی توقف ناکەن لە مەخلوقی مۆبایل ؟

**الكرجي القصاب** (٣٦٠ هـ) ئەڵێ:

قوله: ﴿بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٌ مَّجِيدٌ (٢١) فِي لَوۡحٍ مَّحۡفُوظٍۭ (٢٢)﴾ [البروج: ٢١-٢٢]

لە قیرائەکاندا (محفوظٍ) بە مجرور هاتووە، واتا مەحفوز ئەبێتە وەسفی لەوح، بەڵام لە قیرائەی نافع و ابن محیصن (محفوظٌ) بە رەفع هاتووە، ئەبێتە وەسفی قورئان، بەڵام ئەم قیرائەتە هیچ وەجهێکی نیە تەنها ئەوە نەبێت کە بڵێین محفوظ واتا مکتوب، مانای ئایەتەکە وای لێدێت: ئەمە قورئانێکی مەجیدە نوسراوە لە لەوح، چونکە لەوح مەخلوقە حفزی پاراستنی بۆ بەکاردێت، بەڵام قورئان حفزی پاراستنی بۆ بەکار نایەت.

قال الكرجي القصاب:

قوله: ﴿بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٌ مَّجِيدٌ (٢١) فِي لَوۡحٍ مَّحۡفُوظٍۭ (٢٢)﴾ [البروج: ٢١-٢٢]

وجه القراءات فيه الخفض على أن يكون من نعت اللفظ، ليصير اللوح هو المحفوظ، وأما قراءة نافع، وابن محيصن (في لوح محفوظ) ، برفع " الظاء " على أن يكون نعتا للقرآن، فلا وجه له إلا أن يجعل المحفوظ في معنى المكتوب أي هو قرآن مجيد مكتوب في لوح، لأن اللوح مخلوق تقع عليه حفظ الحراسة، والقرآن لا يقع عليه حفظ الحراسة.

**(النكت : ٤ / ٥٠٣-٥٠٤)**

---

گەر لە ووتەکەی الكرجي القصاب حاڵی نابن بە کورتی ئەمە بزانن

بل هو قرءانٌ مجيد - في لوحٍ محفوظ

قورئان زەممەی لەسەرە بە مەرفوعی هاتووە

لەوح کەسرەی لەژێرە بە مەجروری هاتووە

گەر محفوظ زەممەی لەسەر بێت و مەرفوع بێت ئەوا ئەبێتە وەسفی قورئان

وە ئەگەر محفوظ کەسرەی لەژێر بێت و مەجرور بێت ئەوا ئەبێتە وەسفی لەوح

واتا ماناکە لەنێوان ئەم دووانەیە

قورئان مەحفوزە یان لەوح مەحفوزە

لە هەموو قیرائەکان محفوظ بە مەجرور هاتووە بۆتە وەسفی لەوح، تەنها لە قیرائەی نافع بە مەرفوعی هاتووە بۆتە وەسفی قورئان

الطبري ئەڵێ هەردووک قیرائەکە دروستن، بەڵام الکرجي القصاب پێی وایە نابێ قورئان بە مەحفوز وەسف بکرێ چونکە شتی مەخلوق پێویستی بە پاراستنە نەک قورئان کە کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، بۆیە لە قیرائەی نافع محفوظ تەئویل ئەکات ئەڵێ بە مانای مکتوب بێت ئەوکات ماناکە گونجاو ئەبێت!

بەڵام دوور لە ووتەکانی ئەو بۆ توجیە کردنی ئەم قیرائەتە کە ڕاستە یان هەڵەیە، ئەوەی مەبەستمە لێرەدا وەسف کردنی لەوحە بە مەخلوق.

# اللفظية (١٥)



## تێگەیشتن لە مەزهەبی لەفزییەکان و ڕوونکردنەوەی زیاتر لەسەری

**ابو داود** ئەڵێ:

پرسیارم کرد لە احمد ووتم: ئەوانەی ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوقە؟

ووتی: ئەم ووتەیە خراپترە لە ووتەی جەهمیەکان، هەر کەسێک پێی وابێت لەفزی بە قورئان مەخلوقە ئەوا پێی وایە جبریل علیه السلام شتێکی مەخلوقی هێناوە، وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم قسەی کردووە بە شتێکی مەخلوق.

**(السنة للخلال : ٢٠٧٣)**

جبریل شتێکی مەخلوقی هێناوە، وە پێغەمبەر قسەی کردووە بە شتێکی مەخلوق علیهما الصلاة والسلام، یەکسان کردنی ئەمە بە ووتەی لەفزییەکان، ڕوونی ئەکاتەوە

کە لەفزیەکان ئەیان ووت قورئان بە لەفزی بەندەکان ئەبێتە مەخلوق، ئەگینا گەر لەفزیەکان مەبەستیان ئەوە بێت فعلی عەبد لە دەم جوڵاندنی مەخلوقە و قورئانەکە غەیر مەخلوقە، ئەوا ئیمام احمد بە هەڵە داچووە لەم ووتەیەی و تێنەگەیشتووە لە عەقیدەی لەفزیەکان، بۆیە هێندە خۆتان بە ئیمام احمد هەڵمەواسن ئەوەتا خەریکە ناشرینی ئەکەن بە جۆرێک باسی ئەکەن کە لە بابەتەکە حاڵی نەبووە لە خۆیەوە قسەی کردووە کە هیچ پەیوەندی بە لەفزیەکانەوە نیە!

### عبداللە کوڕی ئیمام احمد ئەڵێ:

پرسیارم لە باوکم کرد ووتم: کەسانێک ئەڵێن: لەفزمان بە قورئان مەخلوقە ؟

ووتی: ئەوانە جەهمین، وە خراپترن لەو کەسەی کە توقف ئەکات، وە ووتی: ئەمە ووتەی جەهمە.

عبداللە ئەڵێ: باوکم ئەم ووتەیەی بەلامەوە زۆر گەورە بوو، وە ووتی: اللہ عز وجل فەرموویەتی: {وإن أحد من المشركين استجارك فأجره حتى يسمع كلام الله} [التوبة: ٦]، وە رسول الله صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (حتى أبلغ كلام ربي)، وە فەرموویەتی: (إن هذه الصلاة لا يصلح فيها شيء من كلام الناس).

**(السنة للخلال : ٢٠٧٥)**

سەیرکە ئیمام احمد ئەڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە ووتەی جەهمی کوڕی سەفوانە، ئایا جەهم ئەیووت قورئان مەخلوقە یان ئەیووت فعلی عەبد مەخلوقە ؟

ئینجا سەیری ئایەت و فەرموودەکان بکە بەڵگەن لەسەرچی ؟ بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەم قورئانەی بەندەکان ئەیخوێننەوە کەلامی الله یە نەک کەلامی مرۆڤ، جا کە بەڵگەی لایەنێکت زانی ئەبێ تێبگەی لایەنی بەرامبەر چ عەقیدەیەکی هەبووە تا لایەنەکەی تر بەم بەڵگانە وەڵامی بداتەوە، حەتمەن بە گوێرەی فەهمی ئێوە بۆ عەقیدەی لەفزیەکان ئەم بەڵگانە هیچ پەیوەندییان بە باسەکەوە نیە!

عبدالله بن عبدالملك ئەڵێ:

پیاوێک وەستا لەلای نعیم بن حماد، ووتی: ئەی باوکی عبدالله چی ئەڵێی دەربارەی کەلامی الله ؟

نعیم ووتی: غەیر مەخلوقە.

ووتی: ئەی کەلامی جبریل ؟

نعیم ووتی: ئەوەی کەلامی فریشتە بێ مەخلوقە، جا کاتێک فریشتەکە وەحی هەڵگرت ئەوا کەلامێکی غەیر مەخلوق ئەدا ئەکات.

ووتی: ئەی کەلامی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ؟

نعیم ووتی: مەخلوقە، جا کاتێک قسەی کرد بە قورئان ئەوا کەلامێکی غەیر مەخلوقی ئەدا کردووە.

پاشان نعیم ووتی: (بسم الله الرحمن الرحيم) ئەمە کەلامێکی غەیر مەخلوقە، جا کاتێک وەحی بە کۆتا هات لەنێوانمان ئەوا قسەت لەگەڵ ئەکەین بە کەلامێکی مەخلوق.

پیاوەکە ووتی: ئەی باوکی عبدالله بەڵگەی ئەم ووتانە لە کوێیە ؟

نعیم ووتی: چونکە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (صلاتنا هذه لا يصلح فيها شيء من كلام الناس) ئەو کەلامەی ئەیڵێین قورئانە.

**(السنة للخلال : ٢٠٧٦)**

الخلال ئەم ریوایەتەی نعیم-ی هێناوە لە ڕەددانەوەی ئەوانەی کە ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، نعیم ئەڵێ کەلامی مرۆڤ و فریشتە هەمووی مەخلوقە، بەڵام مرۆڤ و فریشتە کاتێک قورئان ئەخوێننەوە ئەوا کەلامێکی غەیر مەخلوق ئەدا ئەکەن، باشە ئەوانەی واحاڵی بوونە کە لەفزییەکان ئەڵێن: فعلی عەبد مەخلوقە بەڵام ئەو قورئانەی کە عەبد ئەیخوێنێ غەیر مەخلوقە، پێم بڵێن جیاوازی ووتەکەی ئەوان و نعیم چیە ؟ خۆ بە پێی فەهمی ئێوە بێت بۆ مەزهەبی لەفزییەکان ئەوا نعیم بە هەمان ووتەی خۆیان ڕەددیان ئەداتەوە !!! الخلال تێنەگەیشتووە لە مەزهەبی لەفزییەکان بۆیە بە ووتەیەک ڕەددیان ئەداتەوە کە هەمان ووتەی خۆیانە ؟! یان هەمووان ئەزانن لەفزییەکان ئەیان ووت قورئان بە لەفزی بەندەکان ئەبێتە مەخلوق

بۆیە سەلەف بەم ئایەت و فەرموودانە ڕەددیان ئەدانەوە کە تێیدا هاتووە ئەوەی مرۆڤ ئەدای ئەکات کەلامی الله یە و مەخلوق نیە ؟ بیر بکەرەوە.

پێشتریش باسم کرد هەر کەسێک ووتەی کەسێک نەقل بکات و بیگەیەنێت و ئەدای بکات ئەوا ووتەکە ووتەی کەسی یەکەمە نەک کەسی دووەم، بەهۆی گەیاندنی ووتەکە لەلایان کەسی دووەم ووتەکە نابێتە هی کەسی دووەم، هەروەک من گەر پەیامتان بۆ بنێرم بە کەسێک بەناوی ابراهیم، ئێوە لە دەمی ابراهیم ووتەکەی من ئەبیستن، بەڵام هەمووتان ئەڵێن ئەمە ووتەی هودە، کەس ناڵێ ئەمە ووتەی ابراهیمە چونکە لە ابراهیمەمان بیست، بە هەمان شێوە کەلامی الله غەیر مەخلوقە، کاتێک جبریل کەلامی الله ئەگەیەنێت بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەوا کەلامەکە هەر کەلامی الله یە و مەخلوق نیە ئەگەرچی جبریل و کەلامی جبریل مەخلوق بێت، بە هەمان شێوە کاتێک رسول الله صلى الله عليه وسلم کەلامی الله بە ئوممەتەکەی ئەگەیەنێت ئەوا کەلامێکی غەیر مەخلوق ئەگەیەنێت ئەگەرچی کەلامی خۆی مەخلوق بێت

حنبل بن اسحاق ئەڵێ:

بیستم بە باوکی عبدالله ووترا: کەسێک بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە، قسەی لەگەڵ ئەکرێ ؟

ووتی: جا چی ماوەتەوە ؟! ئەم کەسە قسەی لەگەڵ ناکرێ، وە نوێژ ناکرێ لە دوای ئەو کەسەی کە ئەڵێ قورئان مەخلوقە، وە لە دوای ئەو کەسەش ناکرێ کە توقف ئەکات، وە لە دوای ئەو کەسەش ناکرێ کە ئەڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە، وە ئەگەر نوێژی کرد لە دوای یەکێک لەوان و نەیزانی، پاشان زانی، ئەوا نوێژەکەی دووبارە ئەکاتەوە.

حنبل ئەڵێ: پاشان باوکی عبدالله ووتی: جا چی ماوەتەوە کە توقف-ی کرد و گومانی هەبوو کەلامی الله غەیر مەخلوقە ؟! یان ووتی لەفزم بە قورئان مەخلوقە ؟! ئەی چۆن نوێژ تەواو ئەبێت پێی ؟! نوێژ تەواو نابێت بە شتێکی مەخلوق.

**(السنة للخلال : ٢٠٧٧)**

ئیمام احمد کە ئەڵێ: جا چی ماوەتەوە ؟!

واتا خاوەنی ووتەکە شتێکی یەکجار گەورە و خراپی ووتوە، واتا وتوویەتی قورئان مەخلوقە بۆیە هیچ نەماوەتەوە، جەهمیەکانیش هەر ئەمەیان ئەووت، ئەگینا کەسێک تەنها بڵێ فعلی عەبد مەخلوقە کەلامی الله مەخلوق نیە، کە ئەمە عەقیدەی ئیمام احمد و هەموو ئەهلی سوننەیە، بەمە تەکفیر ناکرێت و ناووترێ نوێژی لە دوا مەکەن، گەر حاڵیتان نەزانی دواتر بۆتان دەرکەوت نوێژەکە دووبارە بکەنەوە، ئەوپەڕی ئیمام احمد نەهی ئەکرد لە ووتنی ئەم ووتەیە گەر کێشەی ئەوان تەنها دەربڕینی مەبەستیان بووایە بە ووتەیەکی موجمەل، چونکە وەک ئەوەی ئێوە باسی ئەکەن کە لەفزیەکان مەبەستیان بووە بڵێن فعلی عەبدەکە مەخلوقە نەک قورئان،

بە پێی ئەمە بێت لەفزییەکان زۆر زیاتر لە خەواریج و مورجیئە و بەشێک لە قەدەریەکان و بەشێک لە شیعە شایەنی ئەوە بوون تەکفیر نەکرێن، ئەمانە تەکفیر نەکراون لەگەڵ ئەم هەموو عەقیدەیەی کە هەیانە موخالفی دەقی صەریحی قورئان و سوننەتە، بەڵام لەفزییەکان تەنها ووتیان فعلی عەبد مەخلوقە و قورئان مەخلوق نیە ئیمام احمد بەمە تەکفیری کردن و ووتی ئەمانە لە جەهمیەکان خراپترن و هەمان ووتەی جەهمی کوڕی سەفوان ئەڵێنەوە !!! بیر بکەرەوە، تێبگە باسەکە شتێکی ترە بەڵام تۆ لێی حاڵی نەبووی.

ووتەکەی کۆتایی ئیمام احمد پشت شکێنەرە بۆتان، یان ئەبێ دان بەوە بنێن بە هەڵە لە عەقیدەی لەفزییەکان حاڵی بوونە، بڵێن ئێستا بۆمان دەرکەوت لەفزییەکان مەبەستیان لە ووتنی (لەفزمان بە قورئان مەخلوقە) مەخلوقی قورئان بوو، وە یان ئەبێ ئیمام احمد بدەنە پاڵ بیدعەچیەکان.

ئیمام احمد لە کۆتایی ریوایەتەکە ئەڵێ: کە ووتی لەفزم بە قورئان مەخلوقە ئەی چۆن نوێژی پێ تەواو ئەبێت ؟ نوێژ بە شتی مەخلوق تەواو نابێت

ئەم ووتەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لەفزییەکان ئەیان ووت قورئان بە لەفزی بەندەکان ئەبێتە مەخلوق، بۆیە ئیمام احمد ئەڵێ نوێژ بە شتێکی مەخلوق تەواو نابێت، چونکە وەک لە فەرموودەدا هاتووە نوێژ نابێ قسەی خەڵکی تێدا بێت، ئەمە ڕوونی ئەکاتەوە کە ئەوان پێیان وابوو قورئان بە لەفزی ئێمە ئەبێتە مەخلوق.

گەر دانتان بەمە نا ئەوا باشە، ئەگینا ئەچینە سەر ئەگەری دووەم کە ناچار ئەبن ئیمام احمد بدەنە پاڵ بیدعەچیەکان.

گەر ئەڵێن نەخێر لەفزییەکان مەبەستیان ئەوە نەبوو قورئان مەخلوقە، بەڵکو بڕوایان وابوو قورئان غەیر مەخلوقە، بەڵام پێیان وابوو فعلی عەبد مەخلوقە لە دەم جوڵاندن و دەنگی و زمانی، بۆیە کە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە مەبەستیان فعلی خۆیان بوو

لێرەدا مولزەم ئەبن کە بڵێن ئیمام احمد پێی وایە فعلی عەبد لە دەم جوڵاندن و دەنگی ئەمانە مەخلوق نین، چونکە ئێوە پێتان وایە ئیمام احمد ڕەددی ئەوەیان ئەداتەوە کە ووتویانە فعلی عەبد مەخلوقە، ئێ ئیمام احمد ووتی نوێژ تەواو نابێت بە شتی مەخلوق، گەر ڕەددی ئەوەیان بداتەوە کەواتە ئیمام احمد پێی وایە لەناو نوێژدا فعلی عەبد مەخلوق نیە! ئێوەش زۆرینەتان گەر نەڵێم هەمووتان بڕواتان وایە لە دڵی خۆتاندا کە فعلی عەبد لە دەم و لێو جوڵاندن و دەنگی مەخلوقە، بەڵام بە دەم دەری نابڕن پێتان وایە گەر بە دەم دەرتان بڕی ئەوا تێکەڵ بوون ڕوو ئەدات و مەخلوقیەکە بۆ قورئانیش ئەگەڕێتەوە، بەڵام بە پێی ئەگەری دووەم ئیمام احمد پێی وایە فعلی عەبد لەناو نوێژدا مەخلوق نیە، نابێ لە دڵیشەوە بە مەخلوقی بزانیت، چونکە ئەحکامی شەرعی لەسەر حەقیقەتی شتەکان ئەدرێ نەک لەسەر ئەوەی خەڵکی چۆن شتەکە دەرئەبڕن، تۆ گەر لەناو دڵی خۆت بڕوات وایە فعلی عەبد مەخلوقە ئەوا ئیمام احمد ئەڵێ نابێ نوێژ شتی مەخلوقی تێدا بووترێ وەک لە فەرموودەکە هاتووە (لا

يصلح فيها شيء من كلام الناس) کەواتە ئیمام احمد ئەڵێ فعلی عەبد لەناو نوێژدا مەخلوق نیە!!!

گەر ئەڵێن نا ئیمام احمد مەبەستی فعلی عەبد نیە مەبەستی ئەوەیە قورئان نابێتە مەخلوق بە لەفزی بەندەکان، بەم ووتەیە ڕەددی لەفزییەکان ئەداتەوە کە بڕوایان وابوو قورئان بە لەفزی بەندەکان ئەبێتە مەخلوق، بۆیە بەم فەرموودەیە ڕەددیان ئەداتەوە

ئەوا ئەوکات گەڕاونەتەوە بۆ ئەگەری یەکەم و دانتان بەوە ناوە کە لەفزییەکان ئەیان ووت قورئان مەخلوقە نەک بڵێن فعلی عەبد مەخلوقە.

---

ماویەتی

ئەم پۆستەی کۆتایی کە بۆتە سێ پۆست زۆر بە ووردی بیخوێننەوە چونکە ڕەنگە تێگەیشتنی ئاڵۆز بێت بۆ هەندێکتان بە تایبەتی بەشی کۆتاییەکەی

ئەمەش بۆیە باس ئەکەم چونکە ئەبینم خاوەن کەناڵەکان هەندێکیان هێشتا لە ناوەڕۆکی باسەکە حاڵی نەبوونە کە لەفزییەکان کێ بوون، ئەی ئەو خەڵکەی چاوی لەسەر ئەم کەناڵانەیە چاوەڕێ ئەکات دوو شت فێر بێت لێیانەوە ئەبێ ئەوان چۆن لە باسەکە حاڵی بن ؟!

# اللفظية (١٦)



## تێگەیشتن لە مەزهەبی لەفزییەکان و ڕوونکردنەوەی زیاتر لەسەری

حنبل بن اسحاق ئەڵێ:

بیستم باوکی عبدالله باسی فەرموودەی معاوية بن الحكم السلمي کرد، ووتی: ئەم فەرموودەیە بەڵگەی تێدایە کە کەلامی الله عز وجل مەخلوق نیە، وە نوێژ دروست و تەواو ئەبێت بە کەلامی الله، وە کەلامی بەنی ئادەم ناکرێ لە نوێژدا بووترێ، رسول الله صلى الله عليه وسلم جیاکاری کرد لە نێوان قسە کردن بە قورئان و قسە کردن بە غەیری قورئان لە نوێژدا کاتێک فەرمووی: (لا يصلح فيها شيء من كلام الآدميين).

گەر بەم جۆرە بوایە ئەوا نوێژی پێوە دروست و تەواو نەئەبوو، هەروەک چۆن نوێژ دروست و تەواو نابێت بە غەیری قورئان لە کەلامی خەڵکی، جا ڕوونی کردەوە قیرائەتی قورئان و کەلامی خەڵک جیاوازن، نوێژ دروست و تەواو نابێت تەنها بە قیرائەی قورئان نەبێت، وە قیرائەی بەنی ئادەم لە نوێژدا وەک قسە کردنیان نیە بە

غەیری قورئان، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نوێژی بە دروست و تەواو دانا بە قسە کردنیان بە قورئان، وە قسە کردنیان بە غەیری قورئان نوێژیان دروست و تەواو ناکات.

وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (إنما هي التسبيح والتكبير وقراءة القرآن) پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەم فەرموودەدا ڕوونی کردەوە کە نوێژ دروست و تەواو ئەبێت بە قیرائەتی قورئان، وە بە غەیری قورئان دروست و تەواو نابێت، وە لا اله الا الله و سبحان الله لە قورئاندا هەن و نوێژیان پێ دروست و تەواو ئەبێت.

حنبل ئەڵێ: پاشان باوکی عبدالله ووتی: حەز ناکەم بچمە ناو ئەم باسە، وە حەز ناکەم قسەی تێدا بکەم.

**(السنة للخلال : ٢٠٧٩)**

فەرموودەی معاوية بن الحكم السلمي ئەوەیە کە ئەم هاوەڵە لەناو نوێژدا ئەبیستێ کەسێک ئەپژمێ، ئەویش پێی ئەڵێ: يرحمك الله، پاشان دوای تەواو بوونی نوێژەکە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فێری ئەکات کە لەناو نوێژدا نابێ خەڵکی قسە بکەن، بەڵکو تەنها تەکبیر و تەسبیح و خوێندنی قورئانە.

سەرەتا لە ووتەکەی کۆتایی ئیمام احمد دەست پێ ئەکەم کە ووتی: حەز ناکەم باسی ئەم بابەتە بکەم و قسەی تێدا بکەم، بەڵام کاتێک کەسانێک دەست ئەکەن بە گومڕا کردن و چەواشە کردنی خەڵک ناچار ئەبێت قسەی تێدا بکات و ڕوونی بکاتەوە و بە

شتانێک بەڵگەیان بۆ بهێنێتەوە کە وەک مانگە شەو لە شەوی ساماڵدا ڕوونن، بەڵام کە کەسانێک بە ئەنقەست خۆیان لەم حەقیقەتانە بدزنەوە و مەبەستیان کوفر بێ، یان بەهۆی نەفامی و جەهلەوە تێینەگەن تۆ ناچاری هەندێک شتیان بۆ باس بکەیت کە چاوەڕێت نەئەکرد ڕۆژێک لە ڕۆژان پێویست بکات ڕوونکردنەوەی لەسەر بدەیت و باسی بکەیت، ئەگینا واللە منیش هەرگیز حەزم نەکردووە هیچ کاتێک قسە لەم بابەتە بکەم و زیندووی بکەمەوە، بەڵام کە ئەبینم کەسانێک پەیدا بوونە بەناوی دەست گرتن بە مەنهەجی سەلەف و پتەوی عەقیدەوە حوکمی تەکفیر ئەدەن لەسەر هەر کەسێک کە بڵێ کاغەز و حیبر و فعلی عەبد مەخلوقە و قورئان کەلامی اللە یە و مەخلوق نیە، هەموو جۆرە قسە کردنێک لەم باسە بە کوفر ئەزانن لە کاتێکدا سەلەف قسەیان لەسەر بابەتی لەفز و تیلاوە و قیرائە کردووە کە ئەمانە لەفزی موجمەلن بە مەخلوق و غەیر مەخلوق وەسف ناکرێن لە پاڵ قورئان، کەچی ئەمانە هاتوون شتە ڕوونەکانیشیان قیاس کردۆتە سەری بەبێ ئەوەی یەک سەلەفیان هەبێت لەمەدا، ئینجا جاهیلی واهەیە ئەڵێ ئەی بۆ ئیمام احمد نەیووت کاغەز مەخلوقە ؟! ئاخر لە سەردەمی ئەودا چ ئەحمەقێک گومانی هەبوو لە مەخلوقی کاغەز تا ئیمام احمد بۆی ڕوون بکاتەوە و باسی بکات ؟ هەیانە ئەڵێ لە دڵیشەوە نازانم کاغەز و حیبر دڵ و سینەی مرۆڤ و فعلەکانی لە کاتی قورئان خوێندنەوە مەخلوقن یان نا !!! هەیانە ئەڵێ لە دڵەوە ئەزانم مەخلوقن بەڵام بە زمان دەری نابڕن، هەر کەس بە زمان ئەو حەقیقەتە دەربڕێ کە لە دڵەوە بڕوام پێیەتی ئەوا لەفزیەکی جەهمیە و کافرە !!! سبحان اللە عەقیدەکەت لەناو دڵت حەشاردەی ئەهلی سوننەی، لەکاتی ڕوونکردنەوە کە پێویستی کرد عەقیدەکەت بە زمان دەربڕی ئەوا ئەبیتە جەهمی

لەلای ئەوان !!! خۆزگە ئەمزانی چۆن زانیتان ئەم شتانە مەخلوقن کە لەناو دڵی خۆتان بە مەخلوقی ئەزانن ؟ ئایا لە دەمی زانایان بیستان یان بە وەحی خرایە ناو دڵتان بەبێ دەربڕینی بە زمان ؟ وە خۆزگە ئەمزانی گەر توشی کەسێک بن بڵێ: (قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە دەنگی عەبد و فعلی عەبد و کاغەز و حیبر ئەوانیش مەخلوق نین) بە چ بەڵگەیەک و بە چ ووتەیەک وەڵامی ئەم کەسەتان ئەدایەوە ؟ ئەتان ووت قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە ؟ ئێ ئەویش هەمان شت ئەڵێ کێشەی نیە، بەڵام فعلی عەبد و کاغەز و حیبر ئەکات بە غەیر مەخلوق، بە چ بەڵگەیەک بۆی ئەسەلمێنن کە ئەمانە مەخلوقن ؟ یان وازی لێدەهێنن و ئەڵێن مادام ئیمام احمد قسەی تێدا نەکردووە ئێمەش وەڵامی نادەینەوە!

ئاخر گەر ئێوە لەسەر ووتنی حیبر و کاغەز مەخلوقە خەڵک تەکفیر و تەبدیع نەکەن ئێمە بۆچی باسی بابەتێکی لەم جۆرە ئەکەین ؟

ئاخر گەر ئێوە هەمان بیروباوەڕی کەسێکتان هەبێ لە دڵەوە و ئەم شتانە بە مەخلوق بزانن بەڵام ئەوەی لەکاتی پێویست دەری ببڕێ بە زمان بۆ ڕوونکردنەوەی باسەکە بۆ کەسانێک کە بە هەڵە حاڵی بوونە، بەمە تەکفیر یان تەبدیعی بکەن، ئێمە چۆن بێدەنگ بین و هەڵەکانتان بۆ ڕاست نەکەینەوە ؟

ئاخر گەر ئێوە جیاوازی نەکەن لە نێوان مەزهەبی ابن کلاب کە ئەیووت تیلاوە فعلی عەبدە و مەخلوقە، بەڵام مەتلو کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، مەبەستی لە تیلاوە قورئانی سەر زەوییە و مەبەستی لە مەتلو کەلامی نەفسی الله یە کە بێ پیت و بێ دەنگە لەلای ئەو، جیاوازی ئەم عەقیدەیە نەکەن لەگەڵ مەزهەبی ئەو کەسەی کە

ئەڵێ تیلاوە فعلی عەبدە و مەخلوقە، بەڵام مەتلو ئەوەیە کە ئەخوێندرێتەوە و کەلامی الله یە مەخلوق نیە، ئەوەی ئەیبیستین و ئەینوسین و حیفزی ئەکەین لە سینەدا و ئەیخوێنین کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، گەر تۆ نەتزانی مەزهەبی ابن کلاب چیە هاتی حوکمی ئەو کەسە و حوکمی ابن کلاب-ت یەکسان کرد و هەردووکیانت تەکفیر کرد ووتت هەمان ووتەیان هەیە بەهۆی جەهلتەوە بە عەقیدەی فرقەکان، بە جەهلەوە کەسانێکت تەکفیر کرد بە حیسابی خۆت هەمان حوکمی سەلەف لەسەر ابن کلاب تەنزیل ئەکەیتە سەری، لەولاوە کەسێک کە ئەبینێ لەخۆتەوە خەڵکی تەکفیر ئەکەیت و لە کرۆکی باسەکە حاڵی نەبوویتەوە، ئەویش دێت بۆت روون ئەکاتەوە ئەڵێ هەڵە حاڵی بووی، ابن کلاب ئەمە مەزهەبەکەی بووە، بەڵام ئەم کەسە مەزهەبی وانیە تۆ بە هەڵە لە باسەکە حاڵی بووی، کە ئەو ئەڵێ تیلاوە فعلی عەبدە و مەخلوقە، مەتلو کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، ووتەکەی تەواو پێچەوانەی ابن کلاب-ە بگرە تەکفیری هەر کەسێک ئەکات کە بیروباوەری ابن کلاب-ی هەبێ، کەچی تۆ هێندە جاهیلی ئەو کەسەش تەکفیر ئەکەیت کە باسەکەت بۆ روون ئەکاتەوە، ئەڵێی ئەویش تەفسیلیدا و بووە لەفزی، ئاخر کە جاهیلەکان بە هەڵە لە باسەکە حاڵی بوون و نەیانزانی ڕاست چیە و هەڵە چیە و بیدعە چیە و کوفر چیە، هەموو قسە کردنێک لەم باسە بە کوفر یان بیدعە بزانن، تۆ ناچاری ڕوونکردنەوە بدەیت کە کامەی کوفرە و کامەی بیدعەیە و کامەی هەڵەیە و کامەی ڕاستە، بەڵام هێندە ئەحمەقن روونکردنەوەی تۆ بۆ راستکردنەوەی هەڵەی خۆیان ئەویش بە تەفسیلی بیدعی و کوفری ئەزانن، ئەتکەن بە مبتدع یان کافر، لایان گرنگ نیە لە باسەکە حاڵی نەبن وەکو خۆی و بە هەڵە خەڵک تەکفیر بکەن و تەبدیع بکەن، ئەڵێن تەنها بڵێن

قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، ئیتر هەرکەسێک جگە لەمە یەک شتی تری ووت هەمووی کافرە، هەر کەسێکیش هات روونکردنەوەیدا کە هەموو قسە کردنێک لەم باسە کوفر نیە، دەرەجاتی هەیە، ئەویش ئەخەنە ناو بازنەکەوە تەکفیری ئەکەن یان تەبدیع، ئاخر گەر جاهیلانێکی وەکو ئێوە بە هەڵە لەم باسە حاڵی نەبن ئێمە بۆ دێین قسە لەم باسە ئەکەین و روونکردنەوە ئەدەین لەسەری ؟ ئێمەش وەک سەلەف ئەڵێین قورئان کەلامی الله یە مەخلوق نیە، چ پێویست ئەکات روونکردنەوە لەسەر مەخلوقی ئەو شتانە بدەین کە ڕوونن مەخلوقن ؟ بەڵام کەسێک ئەم شتە مەخلوقانە بە مەخلوق ناو ببات، تۆش ووتەکەی یەکسان بکەی بە ووتەی ئەو کەسەی کە ئەڵێ قورئان مەخلوقە، هەمان حوکم بدەیت لەسەر هەردووکیان، ئەوکات ئێمە ناچار ئەبین ئەحمەقێکی وەک تۆ تێبگەیەنین کە کاغەز و حیبر و فعلی عەبد مەخلوقن لەسەر ئەم شتانە خەڵک تەکفیر ناکرێ، گەر ئەحمەقی تۆ نەبوایە ئێمەش نەئەچووینە ناو ئەم باسانەوە و قسەمان تێدا نەئەکرد

کە ئەڵێم (تۆ) مەبەستم کەسێکی دیاریکراو نیە، مەبەستم هەموو ئەو کەسانەیە کە هەمان بیروباوەریان هەیە لەم بابەتە

ئینجا ئێستا ئەچمە سەر ریوایەتەکە کە وەک باقی ریوایەتەکانی تر سودی لێ ئەبینین بۆ تێگەیشتن لە مەزهەبی لەفزیەکان

ئیمام احمد ووتی: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەی تێدایە کە کەلامی الله عز وجل مەخلوق نیە)

سەیرکەن دووبارە و دەبارە ئیمام احمد لە ڕەددانەوەی لەفزیەکان باسی ئەوە ئەکات کە ئەوەی کەسی نوێژکەر بە دەمی دادێت لە نوێژدا کەلامی اللە یە و مەخلوق نیە، ئەڵێ فەرموودەکە بەڵگەی تێدایە کە کەلامی اللە مەخلوق نیە، ئێ دە تێبگە کە لەفزیەکان ئەیان ووت کەلامی اللە مەخلوقە کە عەبد بە لەفزی خۆی دەری ئەبڕێ، بۆیە ئیمام احمد بەم فەرموودەیە ڕەددیان ئەداتەوە، گەر لەفزیەکان مەبەستیان مەخلوقی قورئان نەبوایە، ئەم فەرموودەیە چۆن ئەبووە بەڵگە لە دژیان ؟

ئینجا با بێین ئەم فەرموودەیە بکەین بە بەڵگە لەسەر ئەوانەی کە ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوقە بەڵام کەلامی اللە کە عەبد ئەیخوێنێ و ئەینوسێ و ئەیبیستێ و حیفزی ئەکات مەخلوق نیە، بزانین فەرموودەکە ئەبێتە بەڵگە لە دژیان ؟

فەرموودەکە باسی ئەوە ئەکات ئەوەی کەسی نوێژکەر لە نوێژدا ئەیڵێت کەلامی اللە یە و مەخلوق نیە

ئێ ئەم جەماعەتەش هەمان شت ئەڵێن، کەواتە ئەم فەرموودەیە بە هیچ جۆرێک نابێتە بەڵگە لە دژیان

ئینجا ئێستا وەک پۆستی پێشوو استدلال کردن بە ووتەکەی ئیمام احمد پێچەوانە ئەکەینەوە لە دژی ئەوانەی کە خۆیان بە ئیمام احمد هەڵئەواسن و کوێرانە هەموو کەسێک تەکفیر ئەکات کە هەر قسەیەکی کردبێ لەم باسە

ئیمام احمد ئەڵێ: (گەر بەم جۆرە بوایە ئەوا نوێژی پێوە دروست و تەواو نەئەبوو)

لێرەدا رەددی لەفزییەکان ئەداتەوە ئەڵێ گەر بەو جۆرە بێت کە ئێوە باسی ئەکەن قورئان بە لەفزی بەندەکان ببێتە مەخلوق، ئەوا نوێژ دروست و تەواو نەئەبوو بە قورئان خوێندنەوە، چونکە لەو کاتەدا عەبد شتێکی مەخلوقی ئەخوێنند

بەڵام گەر بە پێی فەهمی ئێوە بۆ مەزهەبی لەفزییەکان لەم ووتەیەی ئیمام احمد بڕوانین ئاوا دەرئەچێ:

لەفزییەکان نەیان ئەووت قورئان مەخلوقە، بەڵکو ئەیان ووت فعلی عەبد مەخلوقە کە قورئانەکە ئەخوێنێتەوە، بەڵام قورئانەکە کەلامی اللە یە و مەخلوق نیە

کەواتە ووتەکەی ئیمام احمد لە رەددانەوەی لەفزییەکان کە ووتی: (گەر بەم جۆرە بوایە ئەوا نوێژی پێوە دروست و تەواو نەئەبوو) ئاوای لێدێت:

ئیمام احمد پێی وایە لە نوێژدا فعلی عەبد مەخلوق نیە، گەر فعلی عەبد مەخلوق بوایە ئەوا نوێژی پێوە دروست و تەواو نەئەبوو!!!

لە نەتیجەدا ئیمام احمد پێی وایە فعلی عەبد لە نوێژا غەیر مەخلوقە، ئەوەی بڵێ فعلی عەبد مەخلوقە ئەوا ئیمام احمد بەم فەرموودەیە رەددی ئەداتەوە کە مەخلوق نیە!!!

گەر ئەڵێن نا، ئیمام احمد بە هیچ جۆرێک باسی فعلی عەبد ناکات بەڵکو باسی قورئان ئەکات کە نابێتە مەخلوق، فەرموودەکەش هەر باسی قورئان ئەکات نەک فعلی عەبد، ئەوکات دووبارە و دەبارە دانتان بەوە داناوە کە لەفزیەکان ئەیان ووت قورئان مەخلوقە نەک بڵێن فعلی عەبد مەخلوقە، بۆیە نابێ ئەوەی بڵێ فعلی عەبد مەخلوقە هەمان حوکمی لەفزیەکانی لەسەر بدرێت.

---

ماویەتی

# بەشێک

هەندێک شت هەیە زۆر ڕوونە بەڵام الله هیدایەتت نەدات بۆی ئەوا وەک کوێر ئەوەستی لە ئاستیدا، لەبەردەمیشت بێت نایبینیت

بۆ نموونە:

کاتێک لەفزییەکان دەرکەوتن ووتیان (لەفزمان بە قورئان مەخلوقە) لە پەنای ئەم ووتە فێڵاویەوە ئەیان ووت قورئان مەخلوقە

لە بەرامبەردا ووتەیەک هەیە زۆر باوە کە ئیمام احمد و سەلەف لە دژی لەفزییەکان بەکاری دێنن، کە پێش پەیدابوونی لەفزییەکان ئەم ووتەیە بوونی نەبوو، ئەویش ئەم ووتەیە: (قورئان مەخلوق نیە لە هیچ بارێکدا و لە هیچ حاڵێکدا)

کەسێک الله هیدایەتی دابێت هەر تەنها سەیری وەڵامی سەلەف بکات بۆ لەفزییەکان دەست بەجێ تێئەگات کە مەزهەبی لەفزییەکان چی بووە، سەلەف کە هەمیشە لە ڕەددانەوەی لەفزییەکان ئەیان ووت قورئان مەخلوق نیە لە هیچ بارێکدا و لە هیچ حاڵێکدا، واتا لەفزییەکان ئەیان ووت قورئان لە بارێک لە بارەکاندا ئەبێتە مەخلوق، ئەویش ئەوکاتەیە کە بەندەکان بە لەفزی خۆیان دەری ئەبڕن.

# بەشێک

یەکێک لە هۆکارە هەرە دیارەکان کە وائەکات گەڕان و بەحث بەدوای بابەتێک عیلمی دەرنەچێت ئەوەیە کەسەکان بابەتەکان ئەبەستنەوە بە کەسێکی دیاریکراو، لەبڕی ئەوەی سەرەتا لە بابەتەکە تێبگات چۆنە، لە حوکمدان لەسەر کەسەکە ئەڕواتە ناو بابەتەکە، هێندەی بەلایەوە گرنگە حوکمی کەسەکە بزانێت هێندە بەلایەوە گرنگ نیە لە باسەکە تێبگات وەکو خۆی، نازانێت کە حوکمدان لەسەر کەسەکان بە گوێرەی تێگەیشتن لە بابەتەکە ئەدرێ، گەر بە دروستی لە بابەتەکە تێنەگەیشتن حوکمیش بە هەڵە ئەدەن.

بۆ نموونە ئەم بابەتی لەفزییە

زۆرینەی لە حوکمدان لەسەر بوخاری داخیلی بابەتەکە بوونە، ئەم باسەیان بەستۆتە بە بوخاری، هێندەی بەلایانەوە گرنگە حوکمی بوخاری بزانن هێندە بەلایانەوە گرنگ نیە لە باسەکە تێبگەن

هەر بۆیە من ١٦ پۆستە باسی لەفزییەکان ئەکەم تاکو ئێستا لە یەک پۆستیش ووتەیەکی بوخاریم نەهێناوە لە کتێبەکەی، چونکە ئەبێ سەرەتا تێبگەین ئەم بابەتی لەفزییە چۆنە و لەفزییەکان کێن و بۆ تەکفیر کراون، ئینجا بزانین ووتەی سەلەف چی بووە لەسەر ئەم بابەتە و لێکەوتەکانی، ئینجا دواتر وەرە باسی ئەوە بکە بوخاری یان هەر کەسێکی تر چی ووتوە، وە حوکمی ئەم ووتەیە چیە لەلای سەلەف، ئاخر کە تۆ هێشتا لە باسەکە حاڵی نەبوویتە چیت داوە لە حوکمی ئەم و ئەو، دە وەرە سەرەتا لە باسەکە تێبگە بە دروستی ئینجا وەرە حوکم بەسەر ئەم و ئەو بدە.

# اللفظية (١٧)



## تێگەیشتن لە مەزهەبی لەفزییەکان و ڕوونکردنەوەی زیاتر لەسەری

**محمد بن مسلم** ئەڵێ:

پرسیارم لە باوکی عبدالله احمد بن حنبل کرد دەربارەی لەفزییەکان ؟

ووتی: ئەوان خراپترن لە واقفەکان، فێڵ لە خەڵک ئەکەن و فریویان ئەدەن، الله عز وجل فەرموویەتی: (حتى يسمع كلام الله)، وە فەرموویەتی: (يسمعون كلام الله ثم يحرفونه)، لە کێ ئەبیستن ؟

محمد بن مسلم ئەڵێ: احمد پێی ووتم: قورئان چۆن تەسەروفی پێ بکرێ کەلامی الله یە، وە لەفزییەکان جەهمین.

محمد بن مسلم ئەڵێ ووتم: ئایا زانیویە یەکێک لە جەهمیەکان ووتبێتێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە ؟

ووتی: پێم گەیشتووە المريسي ئەمەی ئەووت.

**(السنة للخلال : ٢٠٨٠)**

ئیمام احمد باسی فێڵ و فریوی لەفزیەکانی کرد کە خەڵک هەڵئەخەڵەتێنن، فێڵەکەشیان ئەمەیە کە ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوقە خەڵکی وائەزانن باسی فعلی عەبد ئەکەن، کەچی مەبەستیان ئەوەیە قورئان بە لەفزی بەندەکان ئەبێتە مەخلوق، هەر بۆیە ئیمام احمد لەگەڵیدا ئەم دوو ئایەتە ئەهێنێ کە هەردووکیان باسی ئەوە ئەکەن ئەوەی خەڵکی ئەیبیستن لە قورئان بریتیە لە کەلامی الله، بە دەربڕینی کەسێکی مەخلوق کەلامی الله نابێتە مەخلوق.

وە ئیمام احمد باسی ئەوەی کرد کە پێی گەیشتووە بشر المريسي ئەیووت لەفزم بە قورئان مەخلوقە، هەرچەندە بشر المريسي زۆر بە ڕوون و راشکاوی ئەیووت قورئان مەخلوقە و دەورێکی گرنگی هەبوو لە فیتنەی خلق القرآن، بەڵام دیارە بەم شێوازەش کوفرەکەی دەربڕیوە، یان ڕەنگە لە سەرەتا وای ووتبێ هەروەک ئیمام احمد لە ڕیوایەتێک ئەڵێ پێم گەیشتووە جهم بن صفوان لە سەرەتادا ئەیووت لەفزم بە قورئان مەخلوقە.

وە عثمان بن سعيد الدارمي ووتەی قوتابیەکەی بشر المريسي نەقل کردووە و داویەتیە پاڵ لەفزیەکان لە شوێنێکدا، کە لە کتێبی (النقض) ڕەددی قوتابیەکەی ئەداتەوە و هەمیشە بە (المعارض) ناوی ئەبات

## عثمان بن سعيد الدارمي لە ڕەددی قوتابیەکەی بشر المريسي ئەڵێ:

سەبارەت بە ووتەکەت کە ئەڵێی: (القراءة والقارئ والمقروء هەر یەکێک لەمانە مانایەکی جیای هەیە) ئەم ووتەیە مەزهەبی لەفزیەکانە، نازانین لە کوێ ئەم ووتەیەت دۆزیەوە و بەرچاوت کەوت و چۆن تەقلیدت کردەوە، جارێکیان تۆ جەهمی، وە جارێکیان واقفی، وە جارێکیان لەفزی، وە ئەگەر کتێبەکە درێژ نەبوایەوە ئەوا بابەتی القارئ والقراءة والمقروء-مان بۆت ڕوون ئەکردەوە.

**(النقض : ٣٤٨)**

ئەوانەی لە مەزهەبی لەفزیەکان تێنەگەیشتوون وائەزانن تەنها بە باسکردنی فعلی قورئان خوێنەکە و قورئانەکە ئەوا بوویتەتە لەفزی، ئەڵێن ئەوەتا ئەم کەسە تەنها باسی ئەوەی کرد کە قیرائە جیایە لە مەقروء، فعلی عەبد جیایە لە قورئانەکە، تەنها بەم ووتەیە الدارمي بە لەفزی ناوی برد، ووتی ئەمە مەزهەبی لەفزیەکانە، جا هەر کەسێک باسی ئەم تەفسیلە بکات لەفزییە و کافرە!

لە کاتێکدا گەر بێتو ووتەکەی الدارمي وەکو خۆی نەقل بکەن ئەوا ئەبێت ئەویش بکەن بە لەفزی، چونکە الدارمي خۆی ئەڵێ گەر لەبەر درێژ بوونەوەی کتێبەکە نەبێت ئەوا بۆتی ڕوون ئەکەمەوە القراءة والقارئ والمقروء چیە، ئێ حەتمەن هەر ڕوونکردنەوەیەک بدات لەم بابەتە ئەوا جۆرێکە لە تەفسیل دان بەم بابەتە، ئینجا پاشان تۆ ئەبێ بزانیت ئەم کەسە کێیە کە الدارمي ڕەددی ئەداتەوە و چ عەقیدەیەکی هەیە دەربارەی قورئان، بڕوانە لاپەرەکانی (٣٤٥ - ٣٤٦ - ٣٤٧ - ٣٤٨) الدارمي ووتەی

ئەم کەسە نەقل ئەکات کە بە ڕوونی ئەڵێ: (قورئان مەخلوقە، وە هەر کەسێک بڵێ قورئان غەیر مەخلوقە ئەوا کافرە)

بەڵام کاتێک تەنها چەند شتێک لەملا و ئەولا کۆپی ئەکەیت بەبێ ئەوەی بە تەواوی بابەتەکە بخوێنیتەوە وائەزانی ئەم کەسە کێشەی تەنها ئەوە بووە کە ئەیووت فعلی عەبد جیایە لە کەلامی الله، ئینجا هەر کەس هەمان قسەی ئەو بکات ڕێک ئەیدەیتە پاڵ لەفزییەکان بە بەڵگەی ئەوەی الدارمي تەنها بەم ووتەیە ئەم کەسەی دایە پاڵ لەفزییەکان ئەگینا خۆ ئەم کەسە نەی ووتبوو قورئان مەخلوقە!!! کە شتەکان ناخوێنیتەوە تەنها چەند دێڕێک نەقل ئەکەیت لە کتێبەکان هەر ئەمەیە نەتیجەکەی، ئەگینا گەر تەواوی بابەتەکە بخوێنیتەوە ئەزانیت ئەم کەسە چ عەقیدەیەکی هەبووە

**هارون بن عبدالله البزار** ئەڵێ:

ووتم بە باوکی عبدالله: کەسانێک ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوقە ؟

بە توڕەییەوە ووتی: ئەمە ووتەیەکی خراپ و پیسە.

ووتم: ئایا ناڵێین قورئان کەلامی الله یە غەیر مەخلوقە لە هەموو حاڵێکدا و لە هەموو ڕووێکدا ؟

ووتی: بەڵێ:

**بڕوانە (السنة : ٢٠٨١)**

دووبارە و دەبارە سەیرکە بە چ ووتەیەک ڕەددی لەفزییەکان ئەداتەوە، ئەوان ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، ئەویش لە وەڵامدا ئەڵێ قورئان لە هەموو بارێکدا غەیر مەخلوقە، واتا لەفزییەکان ئەیان ووت ئەوکاتەی بە لەفزی خۆمان دەری ئەبڕین ئەبێتە مەخلوق.

### حنبل بن اسحاق ئەڵێ:

بیستم باوکی عبدالله ئەیووت: ئەوانەی ووتیان لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، ئەمە ووتەی جەهمیەکانە.

**(السنة للخلال : ٢٠٨٥)**

### احمد بن الحسين ئەڵێ:

الطالقاني بە باوکی عبدالله-ی ووت: چی ئەڵێی دەربارەی لەفزییەکان ؟

باوکی عبدالله ووتی: جەهمین هیچ گومانی تێدا نیە.

**بڕوانە (السنة للخلال : ٢٠٨٧)**

تا ئێستا بیستووتە زانایەکی سەلەف بڵێ: هەندێک کەس هەن بڕوایان وایە قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، بەڵام هەر جەهمین ؟ مەبەستم بابەتی قورئانە بە تەنها نەک سیفەتەکانی تری الله، چونکە ئەم بابەتە تایبەتە بە قورئان، هەیە لە سیفاتی تر

جەهمیە بەڵام بڕوای وایە قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، بەڵام لە بابەتی لەفز باسەکە باسی قورئانە، هیچ زانایەک وتوویەتی فلان کەس دەربارەی قورئان بڕوای وایە کەلامی الله یە و مەخلوق نیە بەڵام هەر جەهمیە ؟ ئاخر گەر لەفزییەکان نەڵێن قورئان مەخلوقە چۆن تەنها بە باسکردنی ئەوەی فعلی عەبد مەخلوقە بوون بە جەهمی و تەکفیر کران و یەکسان کران بەو کەسەی کە ئەڵێ قورئان مەخلوقە ؟!!!

کەسی ئاواش هەیە تاکو ئێستا لە مەزهەبی لەفزییەکان حاڵی نەبووە ئەڵێ ئەها فلان ووتی قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، بەڵام لەفزم بە قورئان مەخلوقە، لەسەر ئەم ووتەیە بە جەهمی دانرا!

ئاخر گەر تێبگەیت لەفزییەکان کێ بوون هەرگیز ئەم قسەیە ناکەیت، چونکە لەفزییەکانیش هەر ئەمەیان ئەووت، لەفزییەکانیش ئەیان ووت قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، بەڵام لەفزمان بە قورئان مەخلوقە

جعفر بن محمد ئەڵێ:

ووتم بە باوکی عبدالله چۆنی ئەبینی من ئەڵێم هەر کەس بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە کافرە ؟

ووتی: ئەمە ووتەی جەهمە، ئەمە ووتەی جەهمە، ئەمە ووتەی جەهمە، وە جەهمیەکان تەکفیر ئەکرێن.

**(السنة للخلال : ٢٠٨٩)**

سەیرکە لەفزییەکان کێ بوون و چ عەقیدەیەکیان هەبووە، ئایا جەهمی کوڕی سەفوان ئەیووت فعلی عەبد مەخلوقە، وە قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە ؟ بۆیە ئیمام احمد ووتەی لەفزییەکان یەکسانیان ئەکات بە ووتەی جەهمی کوڕی سەفوان ؟ یان لەفزییەکان وەکو جەهم بڕوایان وابوو قورئان مەخلوقە بەڵام بە جۆرێکی تر دەریان ئەبڕی ؟

**اسحاق** ئەڵێ:

بیستم باوکی عبدالله ئەیووت: هەر کەسێک پێی وابێت لەفزی بە قورئان مەخلوقە ئەوا کافرە.

وە ووتی: کە جبریل هاتە لای پێغەمبەر صلی الله علیهما قورئانی بەسەردا خوێندەوە، ئایا تیلاوەی جبریل بە قورئان بەسەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم مەخلوق بوو ؟!

**(السنة للخلال : ٢٠٩٠)**

ووتەکەی ئیمام احمد ڕوونە کە لەفزییەکان ئەیان ووت قورئان بە لەفزی بەندەکان ئەبێتە مەخلوق، بۆیە ئەڵێ: ئایا کاتێک جبریل قورئانی بەسەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم خوێندەوە مەخلوق بوو ؟

جا لێرەدا ناچار ئەبن کە بڵێن ئیمام احمد باسی قورئان ئەکات نەک فعلی جبریل، چونکە گەر بڵێن ئیمام احمد ڕەددی ئەو کەسانە ئەداتەوە کە ئەڵێن فعلی عەبد

مەخلوقە، ئەوکات ئەبێ بڵێن ئیمام احمد پێی وایە فعلی عەبد مەخلوق نیە وەک لە ووتەکەی دیارە ئینکاری لەوە ئەکات کە تیلاوەی جبریل بە قورئان مەخلوق بێت، وە ئەگەر ئەڵێن نەخێر ئیمام احمد ڕەددی ئەوانە ئەداتەوە کە ئەیان ووت قورئان بە لەفزی بەندەکان ئەبێتە مەخلوق، ئەوا ئەوکات هەمان قسەی ئێمەتان کردووە دەربارەی لەفزییەکان، وە تێگەیشتوون کە لەفزییەکان ئەیان ووت قورئان ئەبێتە مەخلوق بە لەفزی بەندەکان.

---

ماویەتی

# اللفظية (١٨)



## تێگەیشتن لە مەزهەبی لەفزییەکان و ڕوونکردنەوەی زیاتر لەسەری

**یعقوب بن بختان** ئەڵێ:

بیستم باوکی عبدالله ئەیووت: جەهمیەکان بوون بە چەند چینێک، باسی لەفزییەکانی کرد پاشان ووتی: الله عز وجل فەرموویەتی: ﴿فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ [مريم: ٩٧].

یعقوب ئەڵێ: پێم ووت: فەرمایشتی الله عز وجل: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة ٦]، کەلامی الله عز وجل-یان لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بیست ؟

ووتی: بەڵێ.

**(السنة للخلال : ٢٠٩٣)**

سەیرکە لە ڕەددانەوەی لەفزییەکان باسی ئەوە ئەکات کە ئەوەی بیستیان لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کەلامی الله بوو.

لەخۆت بپرسە ئەو کەسەی کە ئەڵێ قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، بەڵام فعلی عەبد مەخلوقە، ئەم ئایەتە و استدلال کردن پێی چ ڕەددێکی تێدایە بۆ ئەو کەسە ؟!
ئایا هیچ پەیوەندی بەو هەیە ؟ بەڵام ئەی ئەو کەسەی کە ئەڵێ: ئەوەی ئەیبیستن لە بەندەکان مەخلوقە و کەلامی الله نیە، ئایەتەکە ئەبێتە ڕەد بۆی ؟ بەڵێ بێگومان، بۆیە ئیمام احمد زۆربەی جار بەم ئایەتە ڕەددی لەفزییەکانی ئەدایەوە

**يعقوب بن بختان** ئەڵێ:

ووتم بە باوکی عبدالله: عبدوس الرازي ووتی: کاتێک قورئانم خوێند مەبەستم پێی نوێژ و پاداشت بوو ئەوا مەخلوقە، وە کاتێک قورئانم خوێند مەبەستم پێی الله بوو ئەوا مەخلوق نیە.

باوکی عبدالله ووتی: لا فرج الله عن هذا، ئەمە ووتەیەکی خراپە.

**(السنة للخلال : ٢٠٩٤)**

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: لە نوێژدا ناکرێ کەلامی خەڵکی تێدا بێت، بەڵکو تەنها تەکبیر و تەسبیح و قورئان خوێندنەوەیە

ئیمام احمد ئەم فەرموودەیەی ئەکردە بەڵگە لە دژی لەفزیەکان، ئەیووت ئەم فەرموودەیە بەڵگەی تێدایە کە ئەوەی نوێژکەر لەناو نوێژدا ئەیڵێ کەلامی اللّٰه یە و مەخلوق نیە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ڕوونی کردۆتەوە کە نوێژ بە شتی مەخلوق دروست و تەواو نابێت، کەچی عبدوس الرازي ئەڵێ: کە قورئان ئەخوێنم لەناو نوێژدا یان بۆ پاداشت وەرگرتن ئەیخوێنم لەو کاتانەدا قورئانەکە مەخلوقە، بەڵام کاتێک بە نسبەت اللّٰه قورئان ئەخوێنم ئەوکات قورئان کەلامی اللّٰه یە و مەخلوق نیە، واتا ئەویش لەفزیە قورئانەکە بە لەفزی بەندەکان ئەکات بە مەخلوق، بەڵام بە نسبەت اللّٰه غەیر مەخلوقە، بۆیە ئەم ریوایەتەم هێنا تاکو کەس نەیکات بە بەڵگە وابزانێ ئەم پیاوە ئەڵێ: قورئان خوێندنی من فعلی منە و مەخلوقە، بەڵام قورئان کەلامی اللّٰه یە و مەخلوق نیە، نەخێر واناڵێ، ئەڵێ قورئان مەخلوقە کاتێک من ئەیخوێنم لە نوێژدا

### الحسين بن عبدالله ئەڵێ:

پرسیارم لە ابو بكر المروذي کرد دەربارەی چیرۆکی هشام بن عمار، ووتم باوکی عبدالله ئینکاری چ شتێکی لێکرد ؟

ووتی: نامەیەکم بۆ هات لە دمشق تێیدا هاتبوو: پرسیارمان بۆ بکە لە باوکی عبدالله کە هشام بن عمار وتوویەتی: لەفزی جبريل و محمد عليهما السلام بە قورئان مەخلوقە.

منیش پرسیارم لە باوکی عبدالله کرد دەربارەی نامەکەیان.

ووتی: قاتله الله، الكرابيسي جورئەتی نەکرد باسی جبريل و محمد صلى الله عليهما بکات، ئەمە بۆتە جەهمی، قاتله الله.

**(السنة للخلال : ٢٠٩٦)**

سەیرکە ئیمام احمد لەگەڵ ووتەکەی هشام باسی کەرابیسی ئەکات، کەرابیسی تەنها ئەیووت لەفزم بە قورئان مەخلوقە، بەڵام هشام باسی لەفزی جبريل و محمد صلى الله عليهما کرد، واتا هەر بە ڕوونی ئەڵێ: جبريل بە شتێکی مەخلوق دابەزیوە بۆ سەر پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم شتێکی مەخلوقی هێناوە بۆ ئوممەتەکەی، جورئەتی زیاتر بوو لە کەرابیسی، بەڵام کوفرەکەی کەرابیسی شاراوەتر بوو تەنها ئەیووت لەفزم بە قورئان مەخلوقە.

بەڵام ڕیوایەتێک هاتووە کە هشام بن عمار حاشا ئەکات لەوەی کە ئەو لەفزی بێت و هەمان عەقیدەی کەرابیسی هەبێت، جا لە قسەکانی هشام بن عمار دەرئەکەوێ کە کەرابیسی عەقیدەی چۆن بووە

## عبدالله بن محمد بن منصور البزاز ئەڵێ:

بیستم هشام بن عمار پێیگەیشت کە کەسانێک ئەیدەنە پاڵ لەفزیەکان، جا هشام تورە بوو ووتارێکی دا، تێیدا سەنای الله تعالى کرد، وە وەسفی کرد بە شەش

ئایەتەکەی سەرەتای سورەتی الحدید، وە خوێندیەوە بەسەرمان و باسی عەزەمەتی الله تعالی کرد بە جۆرێک کە گوێگران سەرسام بوون پێی بەهۆی جوانی ووتەکانی، پاشان باسی قورئانی کرد ووتی: کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە هەر کەسێک بڵێ قورئان یان قودرەتی الله یان عیززەتی الله مەخلوقە ئەوا ئەم کەسە لە کافرانە، بە هشام ووترا: ئەی چی ئەڵێی دەربارەی ئەو کەسەی کە ئەڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە ؟ ووتی: (قل هو الله أحد، الله الصمد، لم يلد ولم يولد) ئەمەی کە خوێندمەوە کەلامی الله یە، پێی ووترا: کەسانێک لە بغداد باسی ئەوە ئەکەن کە تۆ نامەت بۆ کەرابیسی ناردووە، هشام ووتی: کەرابیسی کێیە؟ هەرگیز نەم بینیوە و نازانم کێیە، والله هەرگیز نامەم بۆی نەنوسیوە.

**(تاريخ دمشق : ٣٧٠/٣٢)**

سەیرکە ئایەتی قورئان ئەخوێنێتەوە پاشان ئەڵێ ئەوەی خوێندمەوە کەلامی الله یە، تاکو بۆیان بسەلمێنێ ئەو لەفزی نیە و هەمان عەقیدەی کەرابیسی نیە، تێبگە بۆچی بەم ووتەیە بەری بوونی خۆی نیشان ئەدات لە کەرابیسی و لەفزییەکان ؟ واتا کەرابیسی و لەفزییەکان ئەیان ووت قورئان بە لەفزی بەندەکان ئەبێتە مەخلوق، ووتەکەی هشام وەک ووتەی ئیمام احمدە کاتێک بە ئایەتی (حتى يسمع كلام الله) ڕەددی لەفزییەکانی ئەدایەوە، ئەیووت کەلامی الله ئەبیستن لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، چونکە لەفزییەکان پێیان وابوو کاتێک عەبد قورئان ئەخوێنێ قورئانەکە وەک کەلامی ئینسان وایە کە قسە ئەکات، کەلامی ئینسانیش مەخلوقە بۆیە قورئانەکەش مەخلوقە بە لەفزی عەبد، بەڵام کە الله قسەی بە قورئان کردووە

ئەوکات مەخلوق نیە، بۆیە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، واتا کاتێک عەبد قورئان دەرئەبڕێ قورئانەکە ئەبێتە مەخلوق.

---

ماویەتی

# اللفظية (١٩)



## تێگەیشتن لە مەزهەبی لەفزییەکان و ڕوونکردنەوەی زیاتر لەسەری

**ابو داود** ئەڵێ:

پارچە کاغەزێکم نوسی و ناردم بۆ باوکی عبداللّٰه کە ئەوکات خۆی حەشاردابوو، ووتم: پیاوێک ئەڵێ: تیلاوە مەخلوقە، وە لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، وە قورئان مەخلوق نیە، ڕات چیە لەسەر خۆپاراستن لێی و هەجر کردنی ؟ وە ئایا پێی ئەووترێ مبتدع ؟ وە بیروباوەڕی دڵ لەسەرچی دائەمەزرێ دەربارەی تیلاوە و لەفز ؟ وە وەڵام چۆنە لەم بابەتەدا ؟

ووتی: ئەم کەسە هەجر ئەکرێ، وە ئەم کەسە لە سەرووی مبتدعە، پێم وانیە ئیللا جەهمی بێت، وە ئەمە ووتەی جەهمیەکانە، قورئان مەخلوق نیە.

عائشة ووتی: پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ﴾ [آل عمران: ٧]، پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم فەرمووی: (کاتێک بینیت کەسانێک شوێنی ئایەتە موتەشابیهەکان ئەکەون ئەوا خۆتانیان لێ بپارێزن، ئەوانە ئەو کەسانەن کە اللە عز وجل باسی کردوون) قورئان مەخلوق نیە.

**(الإبانة الكبرى لابن بطة : ٢٢٤٠)**

ئەڵێن ئەها کابرا ووتی قورئان مەخلوق نیە، بەڵام لەفزم بە قورئان مەخلوقە، واتا کابرا مەبەستی فعلی خۆی بووە مەخلوقە کە ئەیووت لەفزم بە قورئان مەخلوقە، مەبەستی مەخلوقی قورئان نەبووە، چونکە ووتی قورئان مەخلوق نیە، کەچی ئیمام احمد بە جەهمی دانا، کەواتە کەسێک بڵێ قورئان مەخلوق نیە تەنها بڵێ فعلی عەبد مەخلوقە ئەوا جەهمیە، چونکە ئەم کابرایەش مەبەستی هەر فعلی خۆی بووە نەک قورئان!!!

ئەمە ووتەی کەسانێکە کە هێشتا تێنەگەیشتوون لە عەقیدەی لەفزیەکان، وائەزانن لەفزیەکان کە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، مەبەستیان ئەوە بوو فعلی عەبد مەخلوقە نەک قورئان، بۆیە ئەوەی بڵێ فعلی عەبد مەخلوقە ئەوا لەفزیە و جەهمیە!

هێشتا لەوە حاڵی نەبوونە کە لەفزییەکان مەبەستیان لەم ووتەیە مەخلوقی قورئان بوو، لە هەمان کاتیشدا ئەیان ووت قورئان کەلامی اللہ یە و مەخلوق نیە، بەڵام کە عەبد بە لەفزی خۆی قورئان دەرئەبڕێ قورئانەکە ئەبێتە مەخلوق، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمەش چەندەها بەڵگەمان خستۆتە ڕوو لە پۆستەکانی پێشوو، کە پێم باش نیە لێرە دووبارەیان بکەمەوە، نامەوێ پۆستەکان ببن بە دووبارە، ئەمەوێ لەهەر پۆستێک قسە لەسەر ریوایەتی نوێ بکەم، لەم ریوایەتەشدا دووبارە و دەبارە ڕوونی ئەکەینەوە کە لەفزییەکان مەبەستیان مەخلوقی قورئان بوو.

ابو داود بە ئیمام احمد ئەڵێ: کابرا ئەڵێ قورئان مەخلوق نیە، بەڵام لەفزم بە قورئان مەخلوقە

کەچی ئیمام احمد لە وەڵامدا ئەڵێ: ئەمە ووتەی جەهمیەکانە، قورئان مەخلوق نیە، پاشان فەرموودەکە ئەهێنێت دوای فەرموودەکە دیسان ئەڵێ قورئان مەخلوق نیە!

باشە ئیمام احمد لە قسە تێناگات ؟ نازانێ مەسەلە چیە لەخۆیەوە قسە فڕێ ئەدات ؟ ابو داود ووتی کابرا ئەڵێ قورئان مەخلوق نیە، کەچی ئیمام احمد لە وەڵامدا دوو جار ئەڵێ قورئان مەخلوق نیە!!!

ئێ باشە کابرا خۆی ئەڵێ قورئان مەخلوق نیە، ئیمام احمد ئەوە تۆ باسی چی ئەکەیت ؟ نامەکەت بە هەڵە خوێندۆتەوە ؟ یان لە نامەکە تێنەگەیشتووی لەخۆتەوە وەڵامت داوەتەوە ؟ ئەمە چ وەڵامێکە ئەیدەیتەوە ؟

ئەمە وەکو ئەوە وایە کەسێک بڵێ: الله لەسەر عەرشە، تۆش بڵێی نەخێر، ئەمە قسەی جەهمیەکانە، الله لەسەر عەرشە، الله لەسەر عەرشە!!!

ئێ باشە ئەویش هەر ووتی الله لەسەر عەرشە، ئیتر بۆ جەهمیە ؟

هیوادارم تێبگەن کە ئەو کەسانەی کە خۆیان بە ئیمام احمد هەڵواسیوە لافی ئەوە لێئەدەن کە شوێنکەوتەی ئەون و بە توندی دەستیان گرتووە بە مەزهەبەکەی و دژایەتی بیدعە ئەکەن و توندن لەسەر سوننەت، ئەم جۆرە کەسانە جگە لە ناشرین کردنی ئیمام احمد هیچی تر ناکەن لەم بابەتە، چونکە لە سەرەتاوە بابەتەکەت بە هەڵە تێئەگەیەنن نازانی لەفزیەکان کێن، کە دواتر وەڵامەکانی ئیمام احمد ئەبینیت و بەراوردی ئەکەیت لەگەڵ تێگەیشتنەکەت بۆت دەرئەکەوێ کە ووتەکانی ئیمام احمد هیچ پەیوەندی بەم باسەوە نیە، ڕەددی کەسانێک ئەداتەوە بەوەی کە قورئان مەخلوق نیە، کەچی کەسەکە خۆی ئەڵێ قورئان مەخلوق نیە، بەم فەهمە هەڵەیەوە بۆ بابەتەکە ئیمام احمد ناشرین ئەکەن، بەڵام گەر بێتو لە بابەتەکە تێبگەن وەکو خۆی ئەوکات ئەزانن کە ئیمام احمد وەڵامەکانی زۆر وورد بووە و بە باشی لە مەبەستی جەهمیەکان حاڵی بووە ئەزانێ چی ئەڵێن و ئەزانێ چۆن وەڵامیان ئەداتەوە، بۆیە ئەڵێ قورئان مەخلوق نیە، هەروەک لە پۆستەکانی پێشوو ڕوونمان کردۆتەوە کە ئیمام احمد ئەڵێ خەڵکی هەڵئەخەڵەتێنن بەم ووتەیە مەبەستیان مەخلوقی قورئانە کە ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، بۆیەش لەم ریوایەتەدا دوو جار ئەڵێ قورئان مەخلوق نیە.

ابو داود کە ئەڵێ ئەوکات ئیمام احمد خۆتی حەشاردابوو، مەبەستی سەردەمی خەلیفەی عەباسی الواثق-ە، چونکە ئەو بە ئیمام احمدی ووتبوو لەهەر شوێنێک بتبینم ئەتکوژم، بۆیە ئیمام احمد خۆی حەشاردابوو لە دەستی الواثق

**يعقوب بن ابراهيم الدورقي** ئەڵێ:

احمد بن حنبل پێی ووتم: لەفزییەکان لە دەوری ووتەی جەهم ئەخولێنەوە، پێیان وایە جبریل شتێکی مەخلوقی هێناوە بۆ مەخلوقێک.

**(الإبانة الكبرى لابن بطة : ٢٢٤١)**

ووتەی جەهمی کوڕی سەفوان ئەوە بوو کە قورئان مەخلوقە، کە ئەڵێ لەفزییەکان لە دەوری ووتەی ئەو ئەخولێنەوە واتا مەبەستیان مەخلوقی قورئانە، پاشان ئەڵێ لەفزییەکان پێیان وایە جبریل شتێکی مەخلوقی هێناوە بۆ مەخلوقێک واتا بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، الله گەر کوێری نەکردبێت لە ئاست حەقدا ئەوا ئەبێ تێبگەیت کە لەفزییەکان مەبەستیان مەخلوقی قورئان بوو، ئەو کەسەی کە ئەڵێ قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە بەڵام فعلی عەبد مەخلوقە، ئەم کەسە لەکوێ پێی وایە جبریل شتێکی مەخلوقی هێناوە بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ؟ ئەم ووتەیەی ئیمام احمد تەنها ئەوانە ئەگرێتەوە کە ئەڵێن قورئان بە لەفزی بەندەکان ئەبێتە مەخلوق.

### احمد بن ابراهیم ئەڵێ:

پرسیارم لە احمد بن حنبل کرد، ووتم: ئەوانەی کە ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوقە ؟

ووتی: ووتەی ئەوانە خراپترە لە ووتەی جەهمیەکان، هەر کەسێک پێی وابێت لەفزی بە قورئان مەخلوقە ئەوا پێی وایە جبریل شتێکی مەخلوقی هێناوە، وە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم قسەی کردووە بە شتێکی مەخلوق.

**(الإبانة الكبرى لابن بطة : ٢٢٤٢)**

ئیمام احمد ئەڵێ ئەوەی بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە ئەوا پێی وایە جبریل شتێکی مەخلوقی هێناوە و پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم قسەی کردووە بە شتێکی مەخلوق، ئەمە زۆر ڕوونە کە لەفزیەکان پێیان وابوو قورئان بە لەفزی بەندەکان ئەبێتە مەخلوق، بۆیە ئەڵێ پێیان وایە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم قسەی کردووە بە شتێکی مەخلوق، وە ئەوانەی کە ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوقە بە ڕوونی باسی ئەوە ئەکەن کە ئەوەی عەبد ئەینوسێ و ئەیخوێنێ و ئەیبیستێ و حفزی ئەکات کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، بەڵام فعلی عەبدەکە مەخلوقە، بۆیە ووتەکەی ئیمام احمد هەرگیز ئەوان ناگرێتەوە

**يعقوب الدورقي** ئەڵێ:

ووتم بە احمد بن حنبل: ئەوانەی کە ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوقە ؟

ووتی: قورئان لە هەر ڕووێکدا بێت هەرگیز نابێتە مەخلوق، الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٦]، نەیفەرموو: (حتى يسمع كلامك يا محمد) تاکو کەلامی تۆ ئەبیستێ ئەی محمد.

یعقوب ئەڵێ ووتم: ئەمانە لە دەوری ابطال و تعطیل ئەخولێنەوە ؟

ووتی: بەڵێ، وە ووتی: لەعنەتی الله-یان لەسەر بێت.

**(الإبانة الكبرى لابن بطة : ٢٢٤٤)**

سەیری ئەم ووتەیە بکە (قورئان لەهەر ڕووێکدا بێت هەرگیز نابێتە مەخلوق) واتا قورئان بنوسرێ و بخوێنرێ و حیفز بکرێ و ببیسترێ هەر کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، بە فعلی عەبد کە ئەمانە ئەنجام ئەدرێن قورئانەکە نابێتە مەخلوق، باشە ئیمام احمد بۆ لە ڕەددی لەفزییەکان ئەم قسەیە ئەکات گەر لەفزییەکان مەبەستیان ئەوە نەبێت کە قورئان بە لەفزی عەبد ئەبێتە مەخلوق ؟!

سەیری ووتەکەی ئیمام احمد بکە دوای هێنانی ئایەتەکە کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خەڵکی کەلامی الله ئەبیستن لە پێغەمبەر نەک کەلامی خۆی، بۆیە ئیمام احمد ئەڵێ: الله فەرمووی: (حتى يسمع كلام الله)، نەیفەرموو: (حتى يسمع كلامك يا محمد)، واتا لەفزییەکان ئەیان ووت عەبد کە بە لەفزی خۆی قورئان دەرئەبڕێ قورئانەکە ئەبێتە

کەلامی عەبدەکە، وە کەلامی عەبدیش مەعلومە کە مەخلوقە، بۆیە قورئان بە لەفزی عەبد مەخلوقە.

---

ماویەتی

# بەشێک

قال أبو الشيخ الأصبهاني:

حَدَّثَنَا أَبُو بِشْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ عِمْرَانَ بْنِ الْجُنَيْدِ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِسْحَاقَ الدَّشْتَكِيُّ، حَدَّثنَا إِسْحَاقُ يَعْنِي ابْنَ سُلَيْمَانَ، حَدَّثنَا أَبُو سِنَانٍ قَالَ: أَقْرَبُ الْخَلْقِ مِنَ اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى اللَّوْحُ، وَهُوَ مُعَلَّقٌ بِالْعَرْشِ، فَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يُوحِيَ بِشَيْءٍ كَتَبَ فِي اللَّوْحِ، فَيَجِيءَ اللَّوْحُ حَتَّى يَقْرَعَ جَبْهَةَ إِسْرَافِيلَ، وَإِسْرَافِيلُ قَدْ غَطَّى وَجْهَهُ بِجَنَاحِهِ أَوْ جَنَاحَيْهِ، لَا يَرْفَعُ بَصَرَهُ إِعْظَامًا لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، فَيَنْظُرَ فِيهِ، فَإِنْ كَانَ إِلَى أَهْلِ السَّمَاءِ دَفَعَهُ إِلَى مِيكَائِيلَ، وَإِنْ كَانَ إِلَى أَهْلِ الْأَرْضِ دَفَعَهُ إِلَى جِبْرِيلَ، فَأَوَّلُ مَا يُحَاسَبُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ اللَّوْحُ، يُدْعَى بِهِ، تَرْعَدُ فَرَائِصُهُ، فَيُقَالُ لَهُ: هَلْ بَلَّغْتَ؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، فَيَقُولُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى: مَنْ يَشْهَدُ لَكَ؟ فَيَقُولُ: إِسْرَافِيلُ، فَيُدْعَى إِسْرَافِيلُ تَرْعَدُ فَرَائِصُهُ، فَيُقَالُ لَهُ: هَلْ بَلَّغَكَ اللَّوْحُ؟، فَإِذَا قَالَ إِسْرَافِيلُ: نَعَمْ، فَيَقُولُ اللَّوْحُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي نَجَّانِي مِنْ سُوءِ الْحِسَابِ.

**(العظمة : ٢ / ٧٠٤-٧٠٥)**

ریوایەتەکە هەمووی ناکەم بە کوردی، تەنها ئەو بەشەم مەبەستە کە ابو سنان تێیدا لەوحی مەحفوز بە مەخلوق وەسف ئەکات، ئەڵێ: (لەوح نزیکترین دروستکراوە لە الله تبارك وتعالى).

وە لێرەدا باسی سەرەتای دروست بوونی لەوح ناکات، وەک ئەو جاهیلانەی کە ئەڵێن دروستە باسی سەرەتای دروست بوونی لەوح بکەیت، بەڵام دوای نوسینی کەلامی الله تێیدا نابێ بووترێ لەوح مەخلوقە، گەر ووتت ئەوا جەهمی، کەچی ابو سنان دوای ئەوەش هەر بە مەخلوق وەسفی ئەکات بە گشتی باسی ئەکات کە ئەڵێ نزیکترین دروستکراوە لە الله تعالى، پێشتریش لە الكرجي القصاب نەقلمان کرد کە لەوح بە مەخلوق وەسف ئەکات، ئینجا خۆزگە ئەزانم چ زانایەکی ئەهلی سوننە وتوویەتی کوفرە دوای نوسینی کەلامی الله بلێی لەوح مەخلوقە، تەنها سەرەتای دروست بوونی بۆت هەیە بلێی مەخلوقە ؟!!! جگە لە شێخە ئەحمەقەکەی عمومیەکان کە خۆیی و اتباعەکانی وەک شوان و مێگەلە مەڕ دێنە بەرچاوم، بیەوێ بیانبات بۆ هەر شاخ و دەشت و کێوێک ئەوا بە ئاسانی ئەیانبات، جا یەکێک لەوانەی کە دوای ئەم شێخە ئەحمەقە کەوتووە هیچ ووتەیەکی پێنەبوو لە سەلەف کە بڵێن نابێ بووترێ لەوح مەخلوقە دوای ئەوەی کەلامی الله ی تێدا نوسراوە، ئەزانێ تەنها ووتەی شێخەکەی بە دەستەوەیە لەم بابەتە هاتبوو ئەمەی قیاس ئەکردە سەر شتێکی تر کە هیچی دەست نەکەوت لەمەدا جگە لەوەی خۆی کرد بە گاڵتەجاڕ

ئەیووت: سەرەتا لەوح کە دروستکرا کەلامی اللە ی تێدا نەنوسرابوو، لەم کاتەدا ئاساییە بڵێی لەوح مەخلوقە ئەمە مەرحەلەی سەرەتایە، دواتر کە کەلامی اللە نوسرا لە لەوح لەمە بەدواوە نابێ کەس لەوح بە مەخلوق وەسف بکات هەرکەس بە مەخلوقی وەسف بکات جەهمیە!!!

بۆ ڕوونکردنەوەی ووتەکە سەیرەکەی قیاسی ئەکردە سەر شتێک کە خۆی کرد بە گاڵتەجاڕ، ئەیووت: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (اللە پێش ئەوەی مەخلوقات دروست بکات لە عماء دابووە، ژێرەوە و سەرەوەی هەوا بووە)

جا ئەم کەسە ئەیووت: اللە سەرەتا لە عماء دابووە، ئایا ئەکرێ ئێستاش بڵێین اللە لە عماء دایە ؟ نەخێر ئێستا اللە لە سەرووی عەرشە، لەوحیش بە هەمان شێوە سەرەتا کە دروستکرا کەلامی اللە ی تێدا نەبوو ئەووترا مەخلوقە، دواتر کە کەلامی اللە ی تێدا نوسرا کوفرە بڵێی لەوح مەخلوقە!!!

سەیری ئەم قیاسە ؟! ئەمە وەک ئەوە وایە ئەڵێن: (هات کل بدات لە چاوی تا جوانی بکات، کەچی کوێری کرد)

سەیارەکە مەخلوقە

سەیارەکە لە جادە وەستاوە

سەیارەکە لە باخچە وەستاوە

سەیارەکە لەلای فیتەرە

سەیارەکە لە غەسلە

شوێنی سەیارەکە گۆڕا، بەڵام سەیارەکە هەر مەخلوقە و هەرگیز وەسفی مەخلوق لەسەر لاناچێت

ئەم ئەحمەقە هاتووە ئەیەوێ گۆڕینی شوێنی سەیارەکە قیاس بکاتە سەر ئەوەی کە ئەکرێ چۆن سەیارەکە شوێنی گۆڕا، ئاواش وەسفی مەخلوق بوون لە دەست بدات و بگۆڕێ!!!

ئایا سەیارەکە کە لە باخچەوە چوو بۆ فیتەر، بەمە سەیارەکە سیفەتی مەخلوقی لە دەستدا ؟!

الله تعالى پێش دروستکردنی عەرش و دوای دروستکردنی عەرش هەر خالق-ە

مەخلوقاتیش لە هەموو کات و شوێنێکدا هەر مەخلوقن

والله گەر ووتەی سەلەفت بە دەستەوە بوایە ئەوا نەئەهاتی ئەم قیاسە سەقەتە بکەیت و خۆت بکەیت بە گاڵتەجاڕ، وە ئەگەر ووتەی سەلەفت بە دەستەوە بوایە کە بڵێن هەرکەس ووتی لەوح مەخلوقە دوای نوسینی کەلامی الله تێیدا ئەوا کافرە، خێرا نەقلت ئەکرد ناچار نەئەبووی بۆ پینە کردنی وڕێنەی شێخە ئەحمەقەکەت خۆت بکەیتە گاڵتەجاڕ .

ئینجا بۆ قەلەمیش هەمان شت، ئەڵێ ئەو قەلەمەی کە کەلامی الله ی پێ نوسراوە لە لەوح، ئەویش کە لە فەرموودە هاتووە الله قەلەمی دروست کرد، ئەمە مەرحەلەی

سەرەتا بووە ئاساییە بە مەخلوق وەسف بکرێ، بەڵام دوای نوسینی کەلامی الله لە لەوح بەم قەلەمە، دوای ئەمە نابێ قەلەم بە مەخلوق وەسف بکرێ ئەگینا کافریت!!!

ئێ باشە فەرموودەی سەحیح هەیە باسی دروستکردنی قەلەم ئەکات و زۆر مەشهورە، هەروەها دەربارەی دروستکردنی لەوحیش ڕیوایەت هاتووە لە صەحابە و تابعین کە باس ئەکەن الله تعالی لەوحی لەچی دروستکردووە .

تۆ ئەڵێی ئەمە سەرەتایە پێش نوسینی کەلامی الله، دوای نوسینی کەلامی الله بڵێی لەوح و قەلەم مەخلوقن کافریت

گریمان قسەی تۆ بێت

ئێ خۆ ئەبوایە زانایانی ئەهلی سوننە لە ریوایەت کردنی ئەم فەرموودە و ئاثارانە کە باسی مەخلوقی لەوح و قەلەم ئەکەن وەکو شێخەکەت خەمخۆر بوان بۆ دینی خەڵک، ڕوونیان کردبوایەوە کە نابێ ئێستا کەسمان لەوح و قەلەم بە مەخلوق وەسف بکەین ئەمە کوفرە، یەعنی باسەکەتان والێکردووە زاهیری فەرموودە و ئاثارەکان کوفر بەدوای خۆیان ئەهێنن گەر روونکردنەوە نەدرێ لەسەریان، چونکە لەلای هەر کەسێکی عەوام ئەو فەرموودە و ئاثارانە باس بکەیت کە الله لەوح و قەلەمی دروستکردووە ڕێک خەڵکەکە ئەچێتە مێشکیان کە لەوح و قەلەم مەخلوقن، ئەبێ پێیان بووترێ ئەمە پێش نوسینی کەلامی الله بووە لە لەوح، دوای نوسینەکە نابێ بووترێ مەخلوقن ئەگینا کافر ئەبین!

سبحان الله ئەم کوفرە ووردە کە خەڵکێکی زۆر توشی ئەبن بەهۆی هەڵە تێگەیشتن لە فەرموودە و ئاثارەکان، هیچ زانایەکی سەلەف نەهات بەیانی بکات تەنها شێخە ئەحمەقەکەی ئێوە نەبێت!

ئینجا شێخەکەیان ئەوکاتە ئەم ڕوونکردنەوەیەیدا کە کەسانێک واحاڵی ببون ئێستاش ئەکرێ بووترێ لەوح مەخلوقە، ئینجا شێخەکە هات ڕوونکردنەوەیدا ووتی کەسانێک وائەزانن من وتوومە لەوح مەخلوقە، ئەمە لە سەرەتادا بووە پێش نوسینی کەلامی الله تێیدا، دوای نوسین نابێ بووترێ مەخلوقە!

واتا خۆشی ئەزانێ کە زاهیری ئەم فەرموودە و ئاثارانە بەرەو کوفریان ئەبات گەر ئەم ڕوونکردنەوە گرنگەیان بۆ نەدرێ، کە ئەم عەللامەیە ئەم گەورەییەی پێ بەخشرا لەناو زانایانی ١٥ سەدە هات ئەمەی ڕوونکردەوە و خەڵکی نەجاتدا لەم کوفرە!!!

ئینجا قوتابیەکی ئەم شێخە ئەویش پۆستی کردبوو نوسیبووی تێبینیەکی زۆر گرنگ ئاگاداربن، لە پۆستەکەی وا دیار بوو کە خۆشی بڕوای وابوو کە ئێستاش لەوح مەخلوقە لەسەر زاهیری ئاثارەکان، بەڵام شێخ بۆی ڕوونکردنەوە کە ئێستا نابێ بووترێ لەوح مەخلوقە! نەجاتی بوو لەم کوفرە!

مەزهەبە بۆگەنەکەتان تانەدانە لە فەرموودە و ئاثار بە ناڕاستەوخۆ، جەهل و لووتبەری ئێوەی گەیاندووە بەم حاڵە، وائەزانن کە بە خەڵکیتان ووت زندیق و جەهمی ئیتر ئێوە میراتی سەلەفن بۆ ئەم خەڵکە ماونەتەوە، کەس وەک ئێوە پتەو نیە لە سوننەت و دژایەتیکردنی کوفر و بیدعە، ئەم حوکمانە جنێو نین لەگەڵ هەموو هەڵچوونێک بێن بە دەمتان، کە ئێوە بە خەڵک ئەڵێن جەهمی و زندیق ئەوانیش

ناتوانن هەمان شتتان پێ بڵێن مانای ئەوە نیە ئێوە بە بەڵگە و حوججە زاڵ بوونە بەسەریان، بەڵکو شەهوەتی تەکفیر زاڵە بەسەر ئەحمەقی وەک ئێوە، خەڵکی تر لە الله ئەترسێ ئەزانێ کوفر هەیە، لە ژێریەوە بیدعە هەیە، لە ژێریەوە تاوان و هەڵە هەیە، نەک ئەوەی سەری بەرز کردەوە بەرامبەرمان هەمووی زندیق و جەهمی بێت، بە دروستکردنی هاش و هوش و گاڵتە کردن و هەرا دروستکردن و ناوبردنی خەڵک بە جەهمی بەمە ئەتوانی سەرنجی گەمژەکان ڕابکێشیت و سیناریۆ دروست بکەیت وابزانن کەسی بەرامبەر کەوتۆتە ناو کوفرێکی زۆر زەقەوە بۆیە تۆ ئاوا دەنگت بەرزە و سنگت دەرپەڕاندووە، بەڵام کەسێک کە الله هیدایەتی داوە و شوێنی بەڵگە ئەکەوێ نەک سیناریۆی خۆ فش کردنەوە، ئەوا ئەزانێت ئێمە چی ئەڵێین و ئێوەش چی ئەڵێن، بەڵگەی ئێمە چیە و بەڵگەی ئێوە چیە.

# اللفظية (٢٠)



## تێگەیشتن لە مەزهەبی لەفزییەکان و ڕوونکردنەوەی زیاتر لەسەری

**ابو اسحاق الهاشمي** ئەڵێ:

پرسیارم کرد لە باوکی عبدالله احمد بن حنبل، ووتم: گەر پێیان ووتین: قورئان بە لەفزمان مەخلوقە، ئایا پێیان ئەڵێین: قورئان بە لەفزمان مەخلوق نیە، یان بێ دەنگ ئەبین ؟

ووتی: گوێ بگرە چیت پێ ئەڵێم، قورئان لە هەموو رووێکەوە غەیر مەخلوقە.

ابو اسحاق ئەڵێ: پاشان باوکی عبدالله ووتی: جبریل کاتێک قورئانی ووت بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئایا قورئان لە جبریلەوە مەخلوق بوو ؟! وە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کاتێک قورئانی ووت ئایا قورئان لە پێغەمبەرەوە مەخلوق بوو ؟! ئەمە لە پیسترین و خراپترین ووتەکانە.

ابو اسحاق ئەڵێ: پاشان باوکی عبدالله ووتی: پێم گەیشتووە لە جەهمەوە کە لە سەرەتادا ئەمەی ئەووت.

**(الإبانة الكبرى لابن بطة : ٢٢٥٠)**

سەیرکەن ئیمام احمد لە ڕەددی لەفزیەکان ئەڵێ: ئایا کاتێک جبریل قورئانی بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ووت قورئان لە جبریلەوە مەخلوق بوو ؟ وە کاتێک پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم قورئانی ووت قورئان لە پێغەمبەرەوە مەخلوق بوو ؟

ئینکاری لەوە ئەکات کە مەخلوقات قورئان دەربڕن بە لەفزی خۆیان قورئانەکە ببێتە مەخلوق، کە ئەمە عەقیدەی لەفزیەکان بوو قورئان کاتێک بە لەفزی بەندەکان دەرئەبڕدرێ مەخلوقە، هەر بۆیە ئیمام احمد هەمیشە لە ڕەددی لەفزیەکان ئەڵێ قورئان مەخلوق نیە، تەنانەت کە لەفزیەکان ئەڵێن قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە بەڵام لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، ئیمام احمد لە ڕەددی ئەمەدا هەر ئەڵێ قورئان مەخلوق نیە، هەر بۆیە داود الأصبهاني کە ئەویش ئەیووت لەفزم بە قورئان مەخلوقە کە قوتابی کەرابیسی بوو بە ڕاشکاوی ئەڵێ قورئانەکەی اللوح المحفوظ مەخلوق نیە بەڵام ئەم قورئانەی سەر زەوی مەخلوقە، پێی وایە قورئان تەنها نسبەت بە الله تعالى مەخلوق نیە کە الله قسەی پێ کردووە، بەڵام کە مەخلوقات دەری ئەبڕن یان ئەینوسن و ئەیبیستن ئەبێتە مەخلوق، هەر بۆیە ابو حاتم الرازي ئەڵێ: مەزهەبی جەهم و کەرابیسی و داود ئەوەیە ئەم قورئانەی سەر زەوی حیکایەتی قورئانەکەی لەوحی مەحفوزە، هەروەک لە پۆستەکانی پێشتر نەقلم

کرد، وە بە درێژی مەزهەبەکەیانم باسکرد کە پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەمەوە ئەتوانن بگەڕێنەوە بۆی.

گەر کەسێک بڵێ لەفزییەکان مەبەستیان تەنها ئەوە بوو فعلی عەبد مەخلوقە ئەگینا قورئانەکە کە عەبد دەری ئەبڕێ و ئەینوسێ و ئەیبیستێ و حفزی ئەکات مەخلوق نیە، تەنها لەسەر ئەمە تەکفیر کران کە فعلی عەبدیان لەکاتی نوسین و خوێندنی قورئان بە مەخلوق ناوئەبرد نەک قورئانەکانە!!!

ئەوا دووبارە و دەبارە ووتەکەی ئیمام احمد ئەم فەهمەیان هەڵئەوەشێنێتەوە کە لە چەندین پۆست بە ریوایەتی جیا جیا ئەوەمان روون کردەوە کە هەرگیز وەڵامەکانی ئیمام احمد لەگەڵ فەهمی ئێوە بۆ مەزهەبی لەفزییەکان یەک ناگرێتەوە.

ئیمام احمد بۆ هەردەم لە رەددی لەفزییەکان ئەڵێ قورئان مەخلوق نیە ؟ بۆ جارێک لە رەددی لەفزییەکان نەیووت: نابێ فعلی عەبد لەکاتی قورئان خوێندنەوە بە مەخلوق وەسف بکرێ ؟ خۆ گەر ئەمە ووتە و مەبەستی لەفزییەکان بوایە ئەوا ئەولاتر بوو ئیمام احمد لە رەددانەوەیان باسی ئەمە بکات، کەچی بۆ یەک جاریش باسی ئەمە ناکات بڵێ: نابێ فعلی عەبد لەکاتی خوێندن و نوسینی قورئان بە مەخلوق وەسف بکرێ، هەمیشە لە رەددی ئەواندا ئەیووت قورئان مەخلوق نیە لە هیچ رووێکدا

لەم ریوایەتەدا ئیمام احمد ئەڵێ کاتێک جبریل قورئانی بە پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم ووت ئایا قورئان لە جبریلەوە مەخلوق بوو ؟

سەیرکە ناڵێ ئایا فعلی جبریل مەخلوق بوو ؟ بەڵکو ئەڵێ ئایا قورئانەکە لە جبریلەوە مەخلوق بوو، گەر مەبەستی لەفزیەکان ئەوە بوایە کە فعلی جبریل مەخلوق بووە قورئانەکە غەیر مەخلوقە، ئەوا ئەم ووتەیەی ئیمام احمد ناگونجێ ببێتە رەد بۆیان، چونکە ئیمام احمد لە ووتەکەیدا بە روونی دیارە کە قورئانەکە لە جبریلەوە مەخلوق نەبووە کە وتوویەتی، بۆیە وەکو ئینکار کردن ئەپرسێ ئایا مەخلوق بوو ؟! واتا نەخێر مەخلوق نەبوو، کەوابێ گەر رەددی ئەوان بداتەوە کە وتوویانە فعلی عەبد مەخلوقە ئەوا ووتەکەی ئیمام احمد ئاوای لێدێت: ئایا فعلی جبریل مەخلوق بوو کاتێک قورئانی گەیاند ؟ نەخێر مەخلوق نەبوو، کەواتە ئیمام احمد پێی وایە فعلی عەبد لەکاتی قورئان خوێندنەوە مەخلوق نیە! کە ئەمە مەزهەبی ئەوانەیە کە ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە بگرە لەویش خراپترە، کە حاشا ئەمە مەزهەبی ئەم ئیمامە بێت، بۆیە ووتەکەی زۆر ڕوونە کە باسی قورئانەکە ئەکات نەک فعلی عەبدەکە، هەروەک لە چەندین ریوایەتی تر ئەڵێ ئەوەی بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە ئەوا پێی وایە جبریل بە شتێکی مەخلوق هاتووە .

وە لە پۆستێکدا ووتەی ئیمام احمد-مان هێنا کە استدلال بە فەرموودەی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم کە فەرموویەتی: (نوێژ نابێت قسەی خەڵکی تێدا بێت، بەڵکو تەنها تەکبیر و تەسبیح و قورئان خوێندنە) ووتەی ئیمام احمد لەسەر ئەم فەرموودەیە ڕوونی ئەکاتەوە کە لەفزییەکان مەبەستیان چی بوو لە ووتەکەیان، وە

هەرگیز ووتەی ئیمام احمد لەگەڵ ئەوە یەک ناگرێتەوە کە بووترێ لەفزییەکان تەنها ئەیان ووت فعلی عەبد مەخلوقە، ئەگینا ئەبێ ئیمام احمد بدەنە پاڵ ئەوانەی کە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە، بگرە ئەبێ بیدەنە پاڵ ئەوەی کە پێی وابووە فعلی عەبد غەیر مەخلوقە، وە من لەسەرمە بەڵگەکان بخەمە ڕوو، ئەوەی تاقەتی نیە بخوێنێتەوە یان ناگەڕێتەوە بۆ پۆستەکانی پێشوو، یان پۆستەکانی پێشوو لە مێشکیدا وەک بەنزین بە هەوا دائەچێت و نازانێ باسی چی کراوە ئەوا هەموو ئەمانە کێشەی خۆیەتی.

---

ماویەتی

# اللفظية (٢١)



## اللفظية المثبتة

دوای ئەوەی ئیمام احمد زۆر رەددی ئەوانەی دایەوە کە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، وە کوفرەکەیانی بۆ خەڵکی بەیان کرد، وە ووتەکانی لە زۆربەی شار و وولاتان بڵاو بوویەوە کە لەفزییەکان جەهمین، دوای ئەمانە جارێکیان ابو طالب کە قوتابی ئیمام احمد بوو ئایەتی: (قل هو الله أحد) ئەخوێنێتەوە لەلای ئیمام احمد، ئیمام احمد پێی ئەڵێ: ئەوەی خوێندتەوە مەخلوق نیە

ابو طالب واحاڵی ئەبێت لە ووتەکەی ئیمام احمد کە لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە، جا نامە بۆ خەڵکی (نصیبین) ئەنێرێت و پێیان ئەڵێ لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە، ئینجا کە ئەم هەواڵە ئەگاتەوە بە ئیمام احمد زۆر تورە ئەبێت لە ابو طالب و تورەیی بە روخساریەوە دیار ئەبێت، بە ابو طالب ئەڵێ بۆ خەڵکی ڕوون بکەوە کە من شتی ئاوام نەووتوە، وە ئەم ووتەیە بسڕەوە، ئەم ووتەیە بیدعەیە نەم بیستووە هیچ زانایەک بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوق نیە، ابو طالب لە ترسان ئەلەرزی لە بەردەم

ئیمام احمد، ئەڵێ ئیمام احمد وەک شێر پەلاماری دام، وە ابو طالب ئەڵێ گەر لەبەر ئەوە نەبێت کە حەز ناکەم نێوانم دابڕم لەگەڵ موسڵمان ئەوا قسەم لەگەڵت نەئەکرد.

دواتر ابو بكر المروذي کە قوتابی نزیکی ئیمام احمد بوو کتێب ئەنوسێت بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە ئیمام احمد بەری بووە لەوەی کە بڵێ لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە، هەروەک چۆن ئەوانەی بە جەهمی داناوە کە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، ئەوانەشی بە مبتدع داناوە کە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە، وە الخلال لە کتێبی السنة بەشێکی تایبەت کردووە بە ڕەددانەوەی ئەوانەی کە ئەڵێن: لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە، تێیدا بەشێک لە ڕیوایەتەکانی کتێبەکەی المروذي هێناوە کە تێیدا هاتووە ئیمام احمد لەفزییە مەخلوقیەکانی بە جەهمی داناوە، وە لەفزییە غەیر مەخلوقیەکانی بە مبتدع داناوە

جێگای خۆیەتی بپرسین بۆچی ئیمام احمد ڕێگای نەداوە بووترێ لەفزمان بە قورئان غەیر مەخلوقە ؟

هەروەک لە پۆستەکانی سەرەتادا ڕوونمان کردەوە کە ووشەی (لفظ) ووشەیەکی موجمەلە، بۆ فعل بەکاردێت، وە بۆ مەفعولیش بەکاردێت، کە فعلەکە فعلی مرۆڤە و مەفعولەکەش کەلامی الله یە کە عەبد ئەیخوێنێ، بە هەمان شێوە ووشەی (تلاوة و قراءة) هەردووکیان بە مانای فعل و بە مانای مەفعولیش دێن لە زمانی عەرەبی، بۆیە ئیمام احمد نە ئەیووت لەفزم بە قورئان مەخلوقە، نە ئەیووت لەفزم بە قورئان

غەیر مەخلوقە، چونکە ووتەکە موجمەلە ئەکرێ فعلی عەبد بگرێتەوە و ئەکرێ قورئانیش بگرێتەوە، کە ووترا مەخلوقە قورئانەکەش ئەگرێتەوە، کە ووترا غەیر مەخلوقە فعلی عەبدیش ئەگرێتەوە، تیلاوە و قیرائەش بە هەمان شێوە، جا لەبەر ئەوەی فعلی عەبدەکە مەوجودە بۆیە نابێ بووترێ تیلاوەم بە قورئان و قیرائەم بە قورئان و لەفزم بە قورئان غەیر مەخلوقە

**ابو بكر بن زنجويه** ئەڵێ:

بیستم احمد بن حنبل ئەیووت: هەر کەسێک بڵێ: لەفزم بە قورئان مەخلوقە ئەوا جەهمیە، وە هەر کەسێک بڵێ: لەفزم بە قورئان مەخلوق نیە ئەوا بیدعەچیە قسەی لەگەڵ ناکرێ.

**(السنة للخلال : ٢١٢٢)**

**الخلال** ئەڵێ:

لە هەموو هاوەڵانی ئیمام احمد چەسپاوە کە ئیمام احمد ئینکاری کردووە لەو کەسەی کە ئەمە بڵێ (واتا بڵێ لەفزم بە قورئان غەیر مەخلوقە) وە فرمانی کردووە هەجر بکرێن.

**(السنة للخلال : ٢١٢٧)**

**المروذي** ئەڵێ:

بیستم علي بن شعیب -هاوەڵی شعیب بن حرب- ئەیووت: قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە هەر کەسێک بڵێ قورئان مەخلوقە ئەوا کافرە، وە لەفز نە بە مەخلوق و نە بە غەیر مەخلوق ئەزانین (واتا نە ئەڵێین لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، وە نە ئەڵێین لەفزمان بە قورئان غەیر مەخلوقە) وە هەر کەسێک بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوق نیە قسەی لەگەڵ ناکەین و هەجری ئەکەین.

المروذي ئەڵێ پێم ووت: بە هیچ یەکێک لە زانایان گەیشتووی کە بڵێ: لەفزم بە قورئان غەیر مەخلوقە، یان دەنگم بە قورئان غەیر مەخلوقە ؟

ووتی: پەنا بە الله!.

**(السنة للخلال : ٢١٣٦)**

سەیرکە ئەڵێ نەم بیستووە یەک زانا بڵێ دەنگم بە قورئان غەیر مەخلوقە، پەنا بە الله کە زانایان ئەمە بڵێن.

لە بەرامبەریشدا هیچ ووتەیەکی سەلەفمان نیە کە بڵێن: ئەوەی بڵێ دەنگم بە قورئان مەخلوقە جەهمیە، بۆ ؟ چونکە دەنگەکە وازحە ووتەیەکی ڕوونە کە دەنگی عەبدە، خەڵکی بە دەنگی من و تۆ کەلامی الله ئەبیستن نەک بە دەنگی الله بیبیستن، بەڵام ووشەی (لەفز و تیلاوە و قیرائە) ووتمان موجمەلن ئەکرێ فعلی عەبد بگرنەوە، وە ئەکرێ قورئانەکەش بگرنەوە، هەر بۆیەش نابینین هیچ کام لە لەفزیەکان بڵێن: دەنگمان بە قورئان مەخلوقە، تەنها ئەیان ووت لەفز و قیرائە و تیلاوەمان بە قورئان

مەخلوقە، چونکە فێڵەکەیان لەگەڵ ئەم ووشە موجمەلانە ئەچووە سەر، بەڵام لەگەڵ ووشەی ڕوون ناچێتە سەر و مەرامەکەیان نایەتە دی لەگەڵیدا.

**المروذي** ئەڵێ:

پرسیار لە ابو السائب کرا دەربارەی کەسانێک کە پێیان وایە: لەفزەکانیان و دەنگەکانیان کە قورئانی پێ ئەخوێنن غەیر مەخلوقە.

ابو السائب بە خەتی خۆی نوسی: ئەمە بیدعەیە، وە ئەمین نیم لەوەی کە ئەم ووتەیە لە بیدعەش زیاتر بێت (واتا بگات بە کوفر)، وە قورئان کەلامی اللّٰه یە و مەخلوق نیە.

**(السنة للخلال : ٢١٤٨)**

لەبەر ئەوەی اللفظية المثبتة لە کۆتایی ژیانی ئیمام احمد سەری هەڵدا، وە سەرهەڵدانەکەی لەلایەن هەڵە تێگەیشتنی قوتابیەکەی بوو نەک فرقەیەکی دیاریکراو هەبن لە سەردەمی ئیمام احمد ئەمە بڵێن، بۆیە ئەبینین ئیمام احمد کەمترین ووتەی هەیە لەسەر ئەوانەی کە ئەڵێن لەفزمان بە قورئان غەیر مەخلوقە، بە پێچەوانەی اللفظية المنفية کە ئیمام احمد لەگەڵیان ژیا بۆ ماوەی ٧ساڵ، زۆرترین ڕەددی دانەوە، هیچ زانایەک نیە لە دونیا وەک ئیمام احمد باسیان بکات و قسەیان لەسەر بکات.

بەڵگەش بۆ ئەوەی کە ووتنی (لەفزم بە قورئان غەیر مەخلوقە) لە کۆتایی تەمەنی ئیمام احمد روویدا.

کاتێک ئیمام احمد پێی ئەگاتەوە کە ابو طالب نامەی بۆ کەسانێک ناردووە نوسیویەتی لەفزم بە قورئان غەیر مەخلوقە، ئەمەش دراوەتە پاڵ ئیمام احمد خەڵکی وائەزانن ووتەی ئەوە، ئیمام احمد بە ابو طالب ئەڵێ: نامە بنوسە بۆ ئەو کەسانەی کە نامەت بۆ ناردوون، پێیان بڵێ کە من ئەم شتەم بە تۆ نەووتوە.

**بڕوانە (السنة للخلال : ٢١١٠)**

لێرەدا ئیمام احمد بە ابو طالب ئەڵێ چۆن نامەت بۆ خەڵکی نصیبین نارد بە هەڵە ئەم شتەت پێ ووتن، ئاواش نامەیان بۆ بنێرە کە من شتی ئاوام بە تۆ نەووتوە

**فوران ئەڵێ:**

ابو طالب بە خەتی خۆی بۆ خەڵکی نصیبین-ی نوسی دوای مردنی باوکی عبدالله، پێی ڕاگەیاندن کە باوکی عبدالله نەهی کردووە بووترێ لەفزم بە قورئان غەیر مەخلوقە.

## زكريا بن الفرج ئەڵێ:

چووم بۆ لای عبدالوهاب الوراق کاغەزەکەی وەرگرت و خوێندیەوە، پێی ووتم: کێ ئەمەی پێ ووتوی لە احمدەوە ؟ (واتا کێ ئەم ووتەیەی نەقل کردووە لە ئیمام احمدەوە بۆت)

پێم ووت: فوران

عبدالوهاب ووتی: فوران سیقەیە، جێگای متمانەیە لە گەیاندنی ووتەکانی احمد

زکریا ئەڵێ: پێش ئەمەش ابو بكر المروذي ئەمەی بە عبدالوهاب ڕاگەیاند بوو (واتا پێی ووتبوو ئیمام احمد نەهی لەم ووتەیە کردووە) جا بەمە بوو بە دوو شایەت لەلای عبدالوهاب (واتا فوران و المروذي).

**بڕوانە (السنة للخلال : ٢١١١)**

سەیرکەن ئیمام احمد زۆر توڕە بوو لە ابو طالب، پێی ووت کە بۆ خەڵکی نصیبین نامە بنێرێت کە من ئەم ووتوە لەفزم بە قورئان غەیر مەخلوقە، کەچی فوران کە قوتابی ئیمام احمدە ئەڵێ: ابو طالب دوای مردنی ئیمام احمد نامەی بۆ خەڵکی نصیبین نوسی کە ئیمام احمد بەرییە لەم ووتەیە، ئەمەش بەڵگەیە کە ئەم ڕووداوە لە کۆتایی ژیانی ئیمام احمد ڕوویداوە، تەنانەت عبدالوهاب الوراق کە قوتابی نزیکی ئیمام احمدە کەچی لە ئیمام احمدەوە نەیبیستووە کە نەهی بکات لەم ووتەیە، بۆیە فوران و المروذي پێی ڕائەگەیەنن و شایەتی ئەدەن کە ئیمام احمد ئەمەی ووتوە و فرمانی بە ابو طالب کردووە کە خەڵکی ئاگادار بکاتەوە، جا گەر ئەم ڕووداوە لە

سەردەمی ئیمام احمد بوایە ئەوا عبدالوهاب ناچار نەئەبوو لە فوران و المروذي تەئکید بکاتەوە ئایا ئەمە راستە یان نا، بەڵکو راستەوخۆ لە ئیمام احمدی ئەپرسی، بەڵام ئەوکات ئیمام احمد مردبوو.

**المروذي** ئەڵێ:

نامەکەی ابو طالب-م بینی کە بە خەتی خۆی نوسیبووی بۆ خەڵکی نصیبین دوای مردنی باوکی عبدالله، پێی ڕاگەیاندن کە باوکی عبدالله نەهی کردووە بووترێ لەفزم بە قورئان غەیر مەخلوقە.

**(السنة للخلال : ٢١٠٩ / ج)**

ئەم ریوایەتانە ئەوە دەرئەخات کە ماوەیەکی کورت دوای دەرکەوتنی ئەم هەڵەیە لە ابو طالب ئیمام احمد وەفاتی کردووە، مەبەستیشم لە روونکردنەوەی ئەمە ئەوە بوو کە بۆچی ئیمام احمد ووتەی کەمترە لەسەریان بە بەراورد لەگەڵ اللفظية المنفية کە قسەی زۆر لەسەر کردوون، بێگومان گەر ئیمام احمد ماوەیەکی زۆر لەگەڵیان ژیابوایە و لە سەردەمی ئەو ئەم ووتەیە تەشەنەی کردبوایە لەناو خەڵکی بڵاوەی کردبوایە ئەوکات قسەی زۆر لەسەر ئەکرد و زۆر لایەنی ئەم باسە روون ئەبوویەوە بۆمان کە ئێستا بەهۆی کەمی ووتەکانی ئیمام احمد لە رەددانەوەی ئەوان وای لێهاتووە بە مەخلوق دانانی شتانێکی مەخلوق بە کوفر بزانرێ!!!

الخلال هەر لەم بەشەی کە تایبەتی کردووە بە ڕەددانەوەی اللفظية المثبتة چەند ریوایەتێک ئەهێنێت کە مانای ریوایەتەکان ئاماژە بەوە ئەدەن فعلی عەبد کە مەخلوقە مەوجودە لە قورئان خوێندنەوە، بۆیە نابێ بووترێ لەفزم بە قورئان غەیر مەخلوقە

**ابو داود السجستاني** ئەڵێ:

بیستم يحيى بن حبيب بن عربي ووتی: ووتم بە معتمر بن سليمان: ئیمامێکی قەدەریمان هەیە، ئایا نوێژی لەدوا بکەم ؟

ووتی: هەر کەسێک پێی وابێت کەلامی بەندەکان مەخلوق نیە، وەکو ئەو کەسەیە کە پێی وایە ئاسمان مەخلوق نیە، وە زەوی مەخلوق نیە، نوێژ لەدوای ئەمە ناکرێ.

**(السنة للخلال : ٢١٠٧)**

**مسدد** ئەڵێ:

من لەلای يحيى بن سعيد القطان بووم، يحيى بن اسحاق بن توبة العنبري هات، يحيى بن سعيد پێی ووت: بۆ مسدد بگێڕەوە حماد بن زيد چی ووت دەربارەی ئەوەی کە لێت پرسی

يحيى بن اسحاق ووتی: پرسیارم لە حماد بن زيد كرد دەربارەی ئەو كەسەی كە ئەڵێ: قسەی خەڵكی مەخلوق نیە ؟

حماد بن زيد ووتی: ئەمە ووتەی ئەهلی كوفرە.

يحيى بن اسحاق ووتی: پرسیارم لە معتمر بن سليمان كرد دەربارەی ئەو كەسەی كە ئەڵێ: قسەی خەڵكی مەخلوق نیە ؟

معتمر بن سليمان ووتی: ئەمە كوفرە.

**(السنة للخلال : ٢١٠٨)**

هیچ كام لە حماد بن زيد و معتمر بن سليمان بە بابەتی لەفزیەكان نەگەیشتوون، بەڵكو بە فیتنەی خلق القرآن-یش نەگەیشتوون كە لە سەردەمی مەئمون سەری هەڵدا، لێرەدا ووتەی هەردووكیان دەربارەی كەلامی خەڵكە كە قسە ئەكەن دوور لە بابەتی قورئان، ووتەكەیان ڕەددە بۆ قەدەرییەكان.

بەڵام لەخۆت بپرسە بۆ الخلال ئەم ڕیوایەتە ئەهێنێت لە ڕەددانەوەی ئەوانەی كە ئەڵێن لەفزمان بە قورئان غەیر مەخلوقە ؟!

خۆ كاتێک عەبد قورئان ئەخوێنێ كەلامی عەبد بوونی نیە، كەلامەكە كەلامی اللّٰه یە عەبد ئەیگەیەنێت، كەلامی عەبد بوونی نیە تەنها فعلی عەبد بوونی هەیە كە قورئانەكە ئەخوێنێتەوە، ئەوانەی كە ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوقە بەڵام لەكاتی قورئان خوێندنەوە باسی فعلی عەبد ناكەین و ناڵێین مەخلوقە، ئەبێ چۆن تێبگەن

لەم ریوایەتە کە الخلال لە ڕەددانەوەی اللفظیة المثبتة ریوایەت ئەهێنێ کە ئەڵێ: ئەوەی بڵێ کەلامی عەبد مەخلوقە کافرە ؟! خۆ حەتمەن حماد و معتمر و جگە لەوانیش لە ئەهلی سوننە لەلایەن براوەتەوە کە عەبد بەخۆی و قسە و کردارەکانی هەمووی مەخلوقن، بۆیە ئەڵێن ئەوەی بڵێ کەلامی عەبد مەخلوق نیە کافرە، مەبەستیان ئەوە نیە کە نابێ کەلامی عەبد بە مەخلوق وەسف بکرێ، وە نابێ بە غەیر مەخلوق وەسف بکرێ، جا الخلال بۆچی ئەم ریوایەتە ئەهێنێت لە بابەتی لەفز بە قورئان ؟ خۆ ئەگەر الخلال وەکو ئێوە توقف بکات لە فعلی عەبد لەکاتی قورئان خوێندنەوە نە بە مەخلوق و نە بە غەیر مەخلوق وەسفی بکات ئەوا هێنانی ئەم ریوایەتە لەم بابەتەدا کێشە دروست ئەکات بۆ خودی الخلال، چونکە ئێوە پێتان وایە الخلال و جگە لەویش لە ئەهلی سوننە توقف ئەکەن لە فعلی عەبد لەکاتی قورئان خوێندنەوە، بەڵام حماد و معتمر و هەموو ئەهلی سوننەش توقف ناکەن لە کەلامی عەبد کاتێک قسە ئەکات بەڵکو بە دڵنیاییەوە بە مەخلوقی ئەزانن بۆیە تەکفیری ئەوە کەسە ئەکەن کە بە مەخلوقی نەزانێت، کەواتە هێنانی ئەم ریوایەتە خزمەت ناکات بە عەقیدەکەی ئێوە و الخلال حەسەب فەهمی ئێوە، بگرە حەسەب فەهمە سەقەتەکەتان بۆ تێگەیشتن لە مەزهەبی لەفزیەکان ئەبێ بڵێین کە هێنانی ئەم دوو ریوایەتە لەلایەن الخلال خزمەت بە عەقیدەی اللفظیة المنفیة ئەکات، چونکە ئێوە پێتان وایە اللفظیة المنفیة کە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە تەنها مەبەستیان ئەوە بوو فعلی عەبدەکە مەخلوقە کە قورئانەکە ئەخوێنێتەوە ئەگینا قورئانەکە کە لە عەبدەکە ئەبیسترێ مەخلوق نیە، ئێ الخلال-یش لە باسی

لەفزیەکان ئەم دوو ریوایەتە ئەهێنێ، مانای دوو ریوایەتەکە بە جۆرێک لە جۆرەکان مەزهەبی ئەوان بەهێز ئەکات!

کەسیش فەلسەفە لێنەدات بڵێ حماد و معتمر باسی کەلامی عەبد ئەکەن کە قسە ئەکات، باسی ئەوە ناکەن کە عەبد قورئان ئەخوێنێتەوە، خۆم لەبڕی جارێک دوو جار ئەمەم باسکرد، چەواشەکار زۆر بوونە بۆیە ناچارم تەئکیدی لێ بکەمەوە، نەخوێندەواریش زۆرن، جا چەواشەکار و نەخوێندەوار بەیەکتر بگەن ئیتر الله رەحم بکات، نەخوێندەوارەکە خۆی ناخوێنێتەوە هەموو سەرچاوەی وەرگرتنی ئەبێتە ووتەی چەواشەکارەکە کە لەسەر یەک پەنجە عەقڵی ئەسوڕێنێ.

---

ماویەتی

# اللفظية (٢٢)



**المروزي** ئەڵێ:

ووتم بە باوکی عبدالله: پیاوێک لەم ناوچەیە قسەیەکی کردووە خەڵکی دانیشتوون قسە و باس ئەکەن لەسەر ووتەکەی، وە چوونە بۆلای عبدالوهاب پرسیاریان لێیکردووە، عبدالوهاب وتوویەتی: برۆن بۆلای باوکی عبدالله، وە چوونە بۆلای چەند شێخێکیش نەیانزانیوە چی بڵێن، وە ووتەکەی ئەم کەسەیان بۆلای تۆ هێناوە تاکو نیشانتی بدەن لەم کاغەزە دایە، باوکی عبدالله ووتی: کاغەزەکەم پێ بدە، منیش پێم دا، لە کاغەزەکەدا هاتبوو: (الله عز وجل عەقڵی بۆ دروست کردووین، خێر و شەڕی نیشانداوین، وە ڕێگای ڕاستی بۆ دیاری کردووین، وە واجبی کردووە کە شوکرانەی بکەین لەسەر ئەو نیعمەتانەی کە پێی داوین، جا پیاوێک پێی ووت: بەم جۆرە ئیمانمان مەخلوقە و نوێژەکانمان مەخلوقە ؟ ئەویش ووتی: بەڵێ، ئیمان مەخلوقە، وە ئیمانیش قەول و عەمەلە، زیاد ئەکات و کەمیش ئەکات، وە نیەت و شوێنکەوتنی سوننەتە، وە من ووتم ئیمان مەخلوقە لە ڕووی جوڵە و فعلەوە، لەم ڕووەدا مەخلوقە نەک لە ڕووی ووتەوە مەخلوق بێت، هەر کەسێک بڵێ: ئیمان مەخلوقە، مەبەستی ووتنی شایەتمان بێت ئەوا کافرە، وە دوای ئەمە ووتەکانم نیشانی باوکی

عبدالله ئەدرێ، گەر هەڵە بێت ئەوا لێی پەشیمانم و تەوبە ئەکەم بۆ لای الله، گەر ڕاستیش بێت ئەوا الحمد لله)

المروذي ئەڵێ: ابو عبدالله کاغەزەکەی خوێندەوە تاکو گەیشت بەم ووتەیە: (من کە ووتم ئیمان مەخلوقە مەبەستم ئەوەیە لە ڕووی جوڵە و فعلەوە مەخلوقە)، باوکی عبدالله کاغەزەکەی فڕێدا لە دەستی، وە زۆر تووڕە بوو، پاشان ووتی: ئەم کەسە شایستەی ئەوەیە تەحزیری لێ بدرێ و قسەی لەگەڵ نەکرێ، ئەمە خودی ووتەی جەهمە، ئەڵێ ووتم ئیمان مەخلوقە لە ڕووی جوڵەوە! ئەمە وەکو ووتەکەی کەرابیسیە پێی وابوو جوڵەکان مەخلوقن، ئەمە ووتەی جەهمە، هاوار بە حاڵی، کە ووتی ئیمان مەخلوقە ئیتر چ شتێک ئەمێنێتەوە ؟! پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئیمان شایەتیدانی لا إله إلا الله یە) ئایا لا إله إلا الله مەخلوقە ؟! ئەم پیاوە لە کوێیە ؟ وە لەلای کێ ماوەتەوە ؟ وە لەگەڵ کێ دائەنیشێت ؟

المروذي ئەڵێ ووتم: کەسێکی غەریبە

ووتی: تەحزیری لێ بدەن، ئەهلی کەلام سەرفراز نابن، پاشان زۆر تووڕە بوو، وە فرمانی کرد خۆمانی لێ بپارێزین، پاشان باوکی عبدالله ووتی: سەیرکە چۆن تەوبەی پێش ووتەکەی خستووە، ئەڵێ گەر باوکی عبدالله ئینکاری لێکردم تەوبە ئەکەم! بۆچی ئەیەوێ قسەیەک بکات کە ئینکاری لێ ئەکەم ؟!

**(الإبانة الکبری لابن بطة : ٢٥٣٦)**

### اسحاق بن عيسى البزاز ئەڵێ:

پیاوێک لە (صور) هات بۆ لامان، ناسراو بوو بە الصوري متكلم، شێوەی ڕێک و جوان بوو وەک بڵێی زاهید و لەخوا ترس بوو، پێی سەرسام بووین، پاشان چەند شتێکی باسکرد پێمانی ئەوت: ئیمان مەخلوقە، زەکات مەخلوقە، حەج مەخلوقە، جیهاد مەخلوقە، ئێمەش نەمان ئەزانی چۆن وەڵامی بدەینەوە، چووین بۆلای عبدالوهاب الوراق چیرۆکەکەیمان بۆ گێڕایەوە، عبدالوهاب ووتی: نازانم ئەمە چیە، بڕۆن بۆلای باوکی عبداللە احمد بن حنبل ئەو شارەزا و لێزانی ئەم بابەتانەیە، ئێمەش چووین بۆلای باوکی عبداللە ئەو شتانەمان پێ ووت کە بە عبدالوهاب-مان ووت، باوکی عبداللە پێی ووتین: ئەمانە بابەتی جەهمی کوڕی صەفوانن، حەفتا بابەتە، بڕۆن ئەم کەسە بەدەر نێن لەلای خۆتان.

**(السنة للخلال : ١٦٨٦)**

### ابن بطة ئەڵێ:

بیستم ابو بكر النجاد ئەیووت: لە فرقە لەناو چووەکان کەسانێک شتێکیان داهێنا کە زانایان ئینکاریان لێ کرد، وە باسی ئەوەی کرد کە الصوري چووە بغداد لەلای ڕاستی بغداد مایەوە، واخۆی دەرخست کە زاهید و دونیا نەویستە، وە لە هەندێک لە ووتەکانی ووتی: (ئیمان مەخلوقە، وە من مەبەستم جوڵەیە)، جا خەڵکیش قسە و باسیان لەسەری کرد، کەسانێک پشتیوانیان ئەکرد و کەسانێکیش ئینکاریان لێ

ئەکرد، پرسیاریان لە عبدالوهاب و هارون الحمال کرد، ئەوانیش ووتەکەیان نیشانی احمد بن حنبل دا.

**(الإبانة الكبرى لابن بطة : ٢٥٣٥)**

هەر سێ ڕیوایەت باسی هەمان کەس ئەکات کە بە پیاوێک بە الصوري ناسراو بووە وتوویەتی ئیمان مەخلوقە، وە کە ئەڵێم ئیمان مەخلوقە مەبەستم ئەوەیە فعل و جوڵە مەخلوقە نەک ووتە کە شایەتمانە.

جا دوو جەزائیریەکە و جەماعەتەکەیان ئەڵێن ئەوەتا لەفزییەکانیش کە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە تەنها مەبەستیان ئەوە بوو فعلی عەبد مەخلوقە نەک قورئان، پێیان بڵێ بەڵگەتان چیە ؟ ڕێک ئەم ریوایەتەی ابن بطة ئەهێنن کە ئیمام احمد ئەڵێ: ئەمە ووتەکەی وەک ووتەی کەرابیسیە پێی وایە حەرەکات مەخلوقە، کەواتە کەرابیسیش مەبەستی ئەوە بوو فعلی عەبد مەخلوقە نەک قورئانەکە کە عەبد ئەیخوێنێ، بۆیە ئەوەی بڵێ فعلی عەبد مەخلوقە کاتێک قورئان ئەخوێنێ ئەوا لەفزییە و کافرە ئەگەرچی بڵێ قورئانەکەی کە ئەیخوێنم غەیر مەخلوقە!

بۆیە ئەڵێم دوو جەزائیریەکە چونکە لە دونیادا کەس ناناسم بەم جۆرە لە مەزهەبی لەفزییەکان تێگەیشتبێ جگە لەم دوو جەزائیریە گومڕایە و کلکەکانیان، الله لەناویان ببات

ئەم پیاوە هاتووە ئەڵێ فعل مەخلوقە، مادام فعل مەخلوقە ئیمانیش قەول و عەمەلە، کەواتە ئەڵێم ئیمان مەخلوقە، واتا ئەم ووتەیەی ووت کە ئیمام احمد خەڵکی لەسەر بە جەهمی دائەنا، ئەوەی بڵێ ئیمان مەخلوقە جەهمیە، ئەوەی بڵێ ئیمان مەخلوق نیە مبتدعە، ئاخر کە تۆ ووتت ئیمان مەخلوقە یەکەم شت شایەتمانی لا الە الا اللّٰه ئەگرێتەوە، واتا لا الە الا اللّٰه ئەکەیت بە مەخلوق.

**ابن بطة** ئەڵێ:

قسە لەم بابەتە ئەوەیە کە ئەهلی عیلم لەسەری بوونە و تەسلیم ئەبین بەوەی کە ئەوان وتوویانە، هەر کەسێک بڵێ: ئیمان مەخلوقە ئەوا کافرە بە اللّٰه العظیم، چونکە ئەسلی ئیمان و لووتکەکەی بریتیە لە شایەتیدانی لا الە الا اللّٰه، وە هەر کەسێک بڵێ: ئیمان مەخلوق نیە ئەوا مبتدعە، چونکە قەدەرییەکان ئەڵێن: فعل و جوڵەی بەندەکان مەخلوق نین.

**(الإبانة الكبرى : ٣٤٦/٢)**

جا لێکچوونی ووتەی ئەم کەسە و کەرابیسی لەوەدا بوو کە ئەم پیاوە ئەڵێ مادام فعلی عەبد مەخلوقە ئەوا ئەڵێم ئیمان مەخلوقە، کەرابیسیش ئەیووت مادام کەلامی عەبد و فعلی عەبد هەمووی مەخلوقە، قورئانیش مادام عەبد دەری ئەبڕێ و قسەی پێ ئەکات ئەوا وەک کەلامی عەبد ئەبێتە مەخلوق، بۆیە ئەیووت لەفزم بە قورئان مەخلوقە، قورئان لەلای لەفزییەکان تەنها بە نسبەت اللّٰه غەیر مەخلوقە، ئەگینا کە

عەبد بە لەفزی خۆی دەری ببڕێ وەک کەلامی خۆی وایە، هەر بۆیە هەمیشە ئیمام احمد لە ڕەددی لەفزییەکان ئەم ئایەتەی ئەهێنایەوە (حتى يسمع كلام الله) ئیمام احمد ئەیووت: الله فەرمووی: کەلامی الله ئەبیستێ، نەیفەرموو کەلامی محمد ئەبیستێ، خۆ گەر لە ڕەددەکەی ئیمام احمد تێبگەیت ئەوا ئەبێ بزانیت مەزهەبی ئەوان چی بووە کە ئیمام احمد بەم ووتەیە ڕەددیان ئەداتەوە، ئینجا ژمارەیەک زانا لە ڕەددی لەفزییەکان ئەبینیت شیعری شاعیرێکی کۆن ئەهێنن بە لەفزییەکان ئەڵێن: گەر تۆ ئێستا ئەم شیعرە بخوێنیتەوە شیعرەکە هەر هی شاعیرەکەیە نابێتە هی تۆ، تۆ تەنها گەیاندووتە، ئەمە ڕوونە لەفزییەکان ئەیان ووت مادام کەلامی عەبد مەخلوقە کە قورئانەکە ئەگەیەنێت قورئانەکە لەسەر زمانی عەبد وەک کەلامی عەبدی لێدێت و ئەبێتە مەخلوق، ئینجا پێشتریش باسی مەزهەبی کەرابیسی و احمد الشراك و داود الاصبهاني و لەفزییەکانم کردووە کە چیان ووتوە و زانایان چۆن باسیان کردوون و بەچی ڕەددیان داونەتەوە، احمد الشراك کە لە طرسوس ووتی تیلاوەم بە قورئان مەخلوقە، خەڵکی طرسوس بەم ئایەتە ڕەددیان دایەوە ﴿بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ﴾ ئیمام احمد کە ئەمەی بیست ووتی: چەند بە چاکی ڕەددیان داوەتەوە، سەرسام بوو بە وەڵامەکە، ئاخر تێبگە گەر احمد الشراك مەبەستی تەنها ئەوە بێت فعلی خۆی مەخلوقە بۆچی خەڵک بەم ئایەتە ڕەددی ئەدەنەوە کە ئەڵێ: ئەوەی لە سینەی خەڵکی دایە قورئانە ؟ ئاخر ئەوانەی کە ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوقە و قورئانەکە غەیر مەخلوقە خۆیان ئەم ئایەتە ئەهێننەوە، گەر هەمان مەزهەبیان هەبێ چۆن ئایەتێک کە لە دژیان بەکار هاتووە خۆیان ئەیهێننەوە ؟! ئەم احمد الشراك-ە کە لە سەردەمی المتوكل ڕایکرد بۆ عبادان لەوێش بە زەبری

هێزی دەسەڵات دەریان کرد، کەرابیسی چونکە هاو مەزهەبی بوو ئەیووت: احمدی داماویان دەرکرد لە عبادان و دەسەڵاتیان هێنایە سەری، ئەمانە کافرن لە یەهود و نەصارا کافرترن، هەروەک پێشتریش ووتبووی ئەوەی نەڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە کافرە، داود الاصبهاني کە ئەویش لەفزی بوو قوتابی کەرابیسی بوو بە ئاشکرا ئەیووت: قورئانەکەی لوح المحفوظ مەخلوق نیە، بەڵام قورئانەکەی زەوی مەخلوقە، هەروەها موسی بن عقبة ئەیووت: ئەوەی پێی وابێت قورئان لە سینەی دایە ئەوا پێی وایە بەشێک لە الله لە سینەی دایە!!! ئەمانە بروایان وابوو کە نابێ عەبدی مەخلوق کە خۆیی و هەموو شتەکانی مەخلوقە کەلامێکی غەیر مەخلوق ئەدا بکات یان بینوسێ یان حفزی بکات، هەموو ئەمانە کە لە عەبد بەدی ئەکرێن مەخلوقن، جا دوو فاقی ئەمانە لەوە دایە ووتەی الذهلي دەربارەی بوخاری وەرئەگرن کە ئەڵێ بوخاری لەفزییە کە بوخاری خۆی حاشا لەمە ئەکات و ئەڵێ درۆیە، بەڵام ووتەی ابو حاتم الرازي دەربارەی کەرابیسی وەرناگرن کە ئەڵێ جەهم و کەرابیسی و داود الاصبهاني هەمان عەقیدەیان هەبوو پێیان وابوو ئەم قورئانەی کە جبریل هێناویەتی حیکایەتی قورئانەکەی لەوحی مەحفوزە.

ئینجا با بێین سەیر بکەین ئەم هەموو زانایە لە سەلەف و خەلەف کە هاتوون باسی لەفزییەکانیان کردووە، کامەیان وتویەتی لەفزییەکان فرقەیەک بوون ئەیان ووت فعلی عەبد مەخلوقە بەڵام قورئانەکە کە عەبد ئەیخوێنێ غەیر مەخلوقە ؟ ئاخر گەر ئەمە مەزهەبیان بوایە دونیا پڕ ئەبوو لە نەقل کردنی ئەم ووتەیە و ڕەددانەوەی،

کەچی کەسیان بەم جۆرە باسیان ناکەن، تەنانەت ابن بطة کە ئەم ڕیوایەتەی هێناوە ئایا وەکو ئێوە لە مەزهەبی لەفزییەکان حاڵی بووە ؟ سەیری ئەو بابە بکەن کە تایبەتی کردووە بۆ لەفزییەکان بزانە چۆن باسیان ئەکات، لە پۆستی پێنجەمی لەفزییەکان هێنامان لێرەش

دووبارەی ئەکەمەوە بەهیوای ئەوەی کەسێک بیخوێنێتەوە

**ابن بطة** ئەڵێ:

بزانن ڕەحمەتی الله-تان لێبێ کە بەشێک لە جەهمیەکان بە فێڵی دڵیان و پیسی ڕەئیەکانیان و ناشرینی ئارەزووەکانیان بڕوایان وابوو کە قورئان مەخلوقە، جا ناوێکی تریان لە مەخلوقی قورئان نا بە بیدعەیەک کە دایان هێنا، بۆ فێڵ کردن و چەواشە کردنی خەڵکی عەوام، بۆ ئەوەی کوفرەکەیان بشارنەوە و ئیلحادەکەیان شاراوە و ناڕوون بێت بۆ ئەو کەسانەی کە عیلمیان کەمە و سروشتیان لاوازە، جا ووتیان: (ئەو قورئانەی کە الله قسەی پێکردووە و فەرموویەتی کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە ئەو قورئانەی کە ئێمە ئەیخوێنینەوە بە زمانەکانمان و ئەینوسین لە پەڕاوەکانمان ئەو قورئانە نیە کە کەلامی الله یە، بەڵکو حیکایەتە بۆ ئەو قورئانە بە لەفزی ئێمە، وە لەفزی ئێمەش بە قورئان مەخلوقە) جا کوفرەکەیان وورد و شاراوە کرد، وە فێڵیان کرد بۆ ئەوەی کوفر بخەنە ناو خەڵکیەوە بە ناڕوونترین ڕێگا و ووردترین مەزهەب و شاراوەترین جۆر، بەڵام بە حەمد و منەت و چاکی تەوفیق دانی الله ئەم کوفرە شاراوە نەبوو بۆ زانایە گەورە و ڕەخنەگرە عاقڵەکان، قیناعیان لابرد لەسەر ئەو کوفرە

ناشرینەی کە شاردبوویانەوە، جا کوفریان دەرکەوت بۆ زانایان و خەڵکی عەوامیش، وە ئەو کەسەی کە ئەمەی زانی و هەستی پێکرد و ناشرینیەکەی ووتەکەیانی زانی شێخی صالح و پێشەوای زانا و عاقڵ باوکی عبدالله بوو احمد بن محمد بن حنبل رحمه الله، وە ڕوونکردنەوەی کوفرەکەیان ڕوون و ئاشکرایە لە کتێبی الله عز وجل و سوننەتی پێغەمبەرەکەی محمد صلى الله عليه وسلم، قورئان و سوننەت بە درۆی خستوونەتەوە بە حەمدی الله، الله عز وجل فەرموویەتی: {وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ} [التوبة: ٦]، نەیفەرموو: (حتى يسمع حكاية كلام الله)، وە الله تعالى فەرموویەتی: {وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِتُوا} [الأعراف: ٢٠٤]، الله هەواڵیدا کە گوێگر گوێ لە قورئان ئەگرێ، نەیفەرموو: گوێ لە حیکایەتی قورئان ئەگرێ، وە الله تعالى فەرموویەتی: {وَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ حِجَابًا مَسْتُورًا} [الإسراء: ٤٥]، وە الله عز وجل فەرموویەتی: {وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ} [الأحقاف: ٢٩]، وە الله تعالى فەرموویەتی: {قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ} [الجن: ٢]، وە نەیفەرموو: (إنا سمعنا حكاية قرآن عجيب) ئێمە حیکایەتی قورئانێکی سەیرمان بیست، وە الله تعالى فەرموویەتی: {فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ}، وە الله تعالى فەرموویەتی: {وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِي الْقُرْآنِ وَحْدَهُ} [الإسراء: ٤٦]، وە الله تعالى فەرموویەتی: {وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ} [الإسراء: ٨٢]، وە نەیفەرموو: ئێمە لە حیکایەتی قورئان دائەبەزێنین.

(ئینجا دوای هێنانی بەڵگە لە فەرموودەوە کە ئەمەی لەسەر زەویە قورئانە نەک حیکایەتی قورئان بێت) پاشان ابن بطة ئەڵێ:

ئەم بەڵگانە و هاوشێوەکانیان لە قورئان و سوننەت و ووتەی هاوەڵان و تابعین و فوقەهای موسڵمانان بەڵگەیە بۆ کەسی عاقڵ لەسەر درۆی ئەم کۆمەڵەیە لە جەهمیەکان ئەوانەی کە فێڵیان کرد و وورد بوونەوە لە ووتنی: قورئان مەخلوقە.

**بڕوانە (الإبانة الكبرى : ٢٢٢٨)**

سەیرکەن ئەمە پێناسە و وەسفی ابن بطة بوو بۆ لەفزیەکان و مەزهەبەکەیان بە ڕوونی ئەڵێ مەبەستیان مەخلوقی قورئان بوو بەڵام ناوێکی تریان لەم کوفرە نا ووتیان لەفزمان بە قورئان مەخلوقە تا کوفرەکەیان شاراوە بێت لە خەڵک، سەیرکە بزانە باسی ئەوە ئەکات لەفزیەکان پێیان وابوو فعلی عەبد مەخلوقە کاتێک قورئان ئەخوێنێتەوە، لە بەرامبەردا ئەهلی سوننە ووتیان ئەمە کوفرە نابێ لەکاتی قورئان خوێندنەوە بووترێ فعلی عەبد مەخلوقە ؟! ئایا شتێکی لەم جۆرەی باسکرد ؟ یان باسی مەخلوقی قورئان و حیکایەتی قورئانی کرد ؟ ئایا ووتی لەفزیەکان مەبەستیان ئەوە بوو فعلی عەبد مەخلوقە بەڵام نەیانزانی گەر ئەمە بڵێن ئەوا قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق ؟! شتی لەم جۆرەی باسکرد کە ئێوە باسی ئەکەن ؟ باشە ابن بطة خۆی ریوایەتەکەی (الصوري) هێناوە کە ئێوە دڵتان پێی خۆشە، ئەی بۆ وەکو ئێوە باسی لەفزیەکانی نەکرد ؟!

ئینجا الآجري کە مامۆستای ابن بطة یە ئەویش لە کتێبی شەریعە بەشێکی تایبەت کردووە بە لەفزیەکان بە هەمان جۆر باسیان ئەکات

ئیمام احمد بە ووتەکەی ابو بکر الصدیق ڕەددی لەفزییەکانی ئەدایەوە، ئەیووت بەڵگە لە دژیان ووتەکەی ابو بکرە کاتێک ئایەتی (غلبت الروم)ی بۆ کافرانی قورەیش خوێندەوە، ووتیان: ئەمە کەلامی هاوڕێکەتە (واتا محمد صلى الله عليه وسلم) ابو بکر لە وەڵامدا ووتی: نەخێر، نە کەلامی منە و نە کەلامی هاوڕێکەمە، بەڵکو کەلامی اللە یە.

وەرە پێم بڵێ گەر لەفزییەکان نەڵێن قورئان لەسەر زمانی عەبد وەک کەلامی عەبد وایە ئەبێتە مەخلوق، ئەم ووتەیەی ابو بکر چۆن ئەبێتە ڕەددیان بۆیان ؟ یان ووتەکەی ئەوان و کافرانی قورەیش گەر هەمان شت نەبن ئیمام احمد چۆن استدلالی پێ ئەکات ؟!

ئینجا وەرە سەر بوخاری، بوخاری لە سەردەمی لەفزییەکان ژیاوە ١١ ساڵ دوای کەرابیسی مرد، وە ١٥ ساڵ دوای ئیمام احمد مرد، مەحاڵە بوخاری تێنەگەیشتبێ مەزهەبی لەفزییەکان چی بووە کە خۆی لە سەردەمی ئەوان ژیاوە، لە کتێبەکەی باسی لەفزییە مەخلوقیەکان و لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان ئەکات، ئەڵێ هەردووکیان خۆیان ئەدەنە پاڵ ئیمام احمد و لە مەزهەبی احمد تێنەگەیشتوون، ئینجا خۆی ئەڵێ ئەوەی بڵێ من وتوومە لەفزم بە قورئان مەخلوقە درۆی کردووە، من وتوومە فعلی عەبد مەخلوقە، ئاخر گەر مەزهەبی لەفزییەکان ئەوە بێت کە ئێوە باسی ئەکەن گوایە تەنها مەبەستیان مەخلوقی فعلی عەبد بووە ئەی بوخاری چۆن قسەیەکی لەم جۆرە ئەکات ؟!!! یەعنی لە یەک کاتدا ئەڵێ من لەفزی نیمە و لەفزیشم ؟ چونکە لەلای ئێوە ئەوەی بڵێ فعلی عەبد مەخلوقە لەفزییە، ئێ بوخاری ئەڵێ من نەم ووتوە لەفزم

بە قورئان مەخلوقە، وتوومە فعلی عەبد مەخلوقە، قسەکەی وەک حەسەن کەچەڵ و کەچەڵ حەسەن وایە بە گوێرەی فەهمی ئێوە! ئەچێتە عەقڵەوە خۆی باسی هەردووک فرقەکە بکات و خۆیان لێ بەری بکات و لە کتێبەکەی ڕەددی هەردووکیان بداتەوە کەچی نەشزانێت مەزهەبیان چی بووە ؟! وەک ئەوەی دوو جەزائیریە ئەحمەقەکە باسی ئەکەن ئەڵێن بوخاری نەیئەزانی مەزهەبی لەفزیەکان چیە!!! سبحان الله لە کتێبەکەی بە هەمان ئەم ئایەت و فەرموودانە ڕەددی لەفزیەکان ئەداتەوە کە ئیمام احمد استدلالی پێ ئەکرد، کەچی تێنەگەیشتووە مەزهەبیان چیە ؟!!! نەخێر دوو جەزائیریە ئەحمەقەکە و کلکەکانیان لە مەزهەبی لەفزیەکان تێنەگەیشتوون.

اللالكائي لە کتێبی (شرح اصول اعتقاد اهل السنة والجماعة) بەشێکی تایبەت کردووە بە لەفزیەکان، لە زۆر زانا ڕیوایەت ئەهێنێ و ووتەکانیان نەقل ئەکات و ئەداتە پاڵیان کە ئەوەی بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە جەهمیە وەک ئەوە وایە بڵێ قورئان مەخلوقە، مەحاڵە بووترێ اللالكائي نەیزانیوە مەزهەبی لەفزیەکان چیە، ئێ دەی هەر اللالكائي بۆ ئیسبات کردنی ئەوەی کە بوخاری بەری بووە لە لەفزیەکان ئەم ڕیوایەتە ئەهێنێ:

**ابو عمرو الخفاف** ئەڵێ:

ڕۆژێکیان ئێمە لەلای ابو اسحاق القرشي بووین، محمد بن نصر المروزي-ش لەگەڵمان بوو، جا باسی بوخاری کرا، محمد بن نصر ووتی: بیستم بوخاری ئەیووت: هەر کەسێک پێی وابێت من وتوومە لەفزم بە قورئان مەخلوقە ئەوا درۆزنە، من ئەم قسەیەم نەکردووە.

ابو عمرو الخفاف ئەڵێ ووتم: باوکی عبدالله (باوکی عبدالله کونیەی محمد بن نصر المروزي-ە) خەڵک قسە و باسی زۆر لەسەر ئەکەن لەم بابەتە

محمد بن نصر  ووتی: هیچ شتێک نیە جگە لەوەی کە ئەیڵێم و بۆتی ئەگێڕمەوە لە بوخاریەوە.

ابو عمرو الخفاف ئەڵێ: جا چوومە لای بوخاری مونازەرەی هەندێک فەرموودەم لەگەڵ کرد تاکو دڵی خۆش بوو، ئینجا پێم ووت: ئەی باوکی عبدالله (باوکی عبدالله کونیەی بوخاریە) لێرەدا پیاوێک هەیە لە تۆوە ئەیگێڕێتەوە کە ئەم قسەیەت کردووە (واتا وتووتە لەفزم بە قورئان مەخلوقە)

بوخاری ووتی: ئەی ابو عمرو حفزی بکە ئەوەی پێتی ئەڵێم، هەر کەسێک لە خەڵکی نیسابور وقومس والري وهمذان وحلوان وبغداد والكوفة والمدينة ومكة والبصرة پێی وابێت من وتوومە لەفزم بە قورئان مەخلوقە، ئەوا درۆزنە، من ئەم قسەیەم نەکردووە، تەنها وتوومە فعلی بەندەکان مەخلوقە.

**(شرح أصول اعتقاد : ٦١١)**

سەیرکە مەوزوع مەوزوعی ئەوەیە کە بوخاری وتوویەتی لەفزم بە قورئان مەخلوقە، محمد بن نصر المروزي بە ابو عمرو ئەڵێ بوخاری پێمی ووتوە من شتی ئاوام نەووتوە درۆیە بۆم دروست کراوە، ابو عمرو بۆ ئەوەی تەئکید بێتەوە ئەچێت خۆی لە بوخاری ئەپرسێ کە ئایا ڕاستە تۆ وتووتە لەفزم بە قورئان مەخلوقە، بوخاری ئەڵێ درۆیە من وام نەووتوە، تەنها وتوومە فعلی عەبد مەخلوقە.

ئێ خۆ حەتمەن بوخاری و المروزي و ابو عمرو و خەڵکی ئەوکاتیش و اللالكائي-ش ئەبێ بزانن مەزهەبی لەفزییەکان چی بووە، گەر مەزهەبی لەفزییەکان ئەوە بێت وەک ئەوەی ئێوە باسی ئەکەن گوایە تەنها وتوویانە فعلی عەبد مەخلوقە قورئانەکە مەخلوقە نیە، ئێ بوخاری لێرەدا ئەڵێ من نەم ووتوە لەفزم بە قورئان مەخلوقە، تەنها وتوومە فعلی عەبد مەخلوقە، گەر مەزهەبی لەفزییەکان بەم جۆرە بێت کە ئێوە باسی ئەکەن ئەوا ابو عمرو الخفاف بە بوخاری ئەووت: تۆ تەواوی ؟! ئەم قسە قۆڕە چیە ئەیکەی ؟! ئەڵێی من لەفزی نیم تەنها وتوومە فعلی عەبد مەخلوقە، ئێ لەفزییەکانیش هەر ئەمەیان ئەووت، کەواتە ئەم قسە قۆڕە چیە تۆش هەر لەوانی و جیاوازیت نیە بەڵێ ئەبوایە وابڵێ گەر مەزهەبی لەفزییەکان بەپێی فەهمی ئێوە حاڵی بوایە.

ئینجا اللالكائي ئەم ریوایەتەی هێناوە بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە بوخاری بەرییە لە لەفزییەکان، بۆچی اللالكائي نەیووت ئەم قسەیە دەری ئەخات بوخاریش لەفزی بووە ؟ بۆ نەی ووت ئەمە هەمان قسەی لەفزییەکانە ؟!!!

ئینجا هەر ئەمەش نا، ریوایەتی تر هەیە روونی ئەکاتەوە کە خەڵکی واحاڵی بوونە کە بوخاری هەمان عەقیدەی ابن کلاب و لەفزییەکانی هەیە، بۆیە دژایەتیان کردووە، نەک تەنها لەسەر ئەوەی بڵێ فعلی عەبد مەخلوقە

ابراهيم بن محمد ئەڵێ:

من هەڵسام بە ناشتنی تەرمی بوخاری کاتێک لە (خرتنك) مرد، جا کاتێک تەواو بووم لە ناشتنی گەڕامەوە بۆ ئەو ماڵەی کە تێیدا بووم، خاوەنی کۆشکەکە پێی ووتم: دوێنێ پرسیارم لە بوخاری کرد ووتم: باوکی عبدالله چی ئەڵێی دەربارەی قورئان ؟

ووتی: کەلامی الله یە و مەخلوق نیە

پێم ووت: خەڵکی وائەزانن کە تۆ ئەڵێی: لە موصحەفدا قورئان بوونی نیە، وە لە سینەی خەڵکیدا قورئان بوونی نیە

ووتی: استغفر الله لەوەی کە شایەتیم لەسەر بدەیت بە شتێک کە لە منت نەبیستووە، من ئەوە ئەڵێم هەروەک الله تعالى فەرموویەتی: (والطور وكتاب مسطور)، ئەڵێم: لە موصحەفەکاندا قورئان هەیە، وە لە سینەی خەڵکیدا قورئان هەیە، هەر کەسێک جگە لەمە بڵێ ئیستیتابە ئەکرێ، گەر تەوبە بکات باشە ئەگینا هەمان حوکمی کافرانی هەیە (واتا ئەکوژرێ).

**(شرح أصول اعتقاد : ٦١٠)**

سەیرکە نالێ خەڵکی وائەزانن تۆ وتووتە فعلی عەبد مەخلوقە کە قورئان ئەخوێنێتەوە، ئەڵێ خەڵکی وائەزانن تۆ پێت وایە قورئان لە موصحەف و سینەی خەڵکدا نیە، ئەمە ڕوونی ئەکاتەوە کە مەزهەبی لەفزیەکان چی بووە، وە ئەمە ڕەددێکە بۆ ئەوانەی کە هێشتا مەزهەبی کوللابیەکان و بوخاری لە یەکتر جیا ناکەنەوە، ئەڵێن بوخاری وتوویەتی تیلاوە مەخلوقە و مەتلو غەیر مەخلوقە، سەلەف وتوویانە ئەوەی وابڵێ زندیقە، نازانن کە سەلەف مەبەستیان لەم حوکمە کوللابیەکان بوو شوێنکەوتووانی ابن کلاب کە ساڵێک پێش ئیمام احمد مردووە، ئەیووت قیرائە و تیلاوە مەخلوقن، وە مەقروء و مەتلو غەیر مەخلوقن، مەبەستی لە قیرائە و تیلاوە قورئانەکەی سەر زەوی بوو، وە مەبەستی لە مەقروء و مەتلو کەلامی نەفسی الله بوو کە بێ دەنگ و بێ پیتە لەلای کوللابیەکان، لەلای ئەوان قورئان لەسەر زەوی بوونی نیە تەنها تیلاوە و قیرائە بوونی هەیە ئەویش فعلی عەبدە حیکایەتە لە کەلامی نەفسی الله، هەروەک لە پۆستەکانی پێشوو لە ڕوونکردنەوەی عەقیدەی ابن کلاب بە درێژی باسمان کرد بە بەڵگەوە، ئێمە مانگێک زیاترە ئەمەمان ڕوونکردۆتەوە کەچی عمومیەکان تازە هاتوون ووتەی ابن حامد ئەهێنن کە ئەڵێ (ئیمام احمد ئەوانەی بە زندیق ئەزانی کە جیاوازی ئەکەن لە نێوان تیلاوە و مەتلو، وە لەفز و مەلفوز، وە ئەوانەی کە باسی حیکایەت و حیکایەت کراو ئەکەن)، ئێمە مانگێک ئەبێت ئەمەمان پۆست کردووە و باسمان کردووە کە مەبەستی کوللابیەکانە لەم ووتەیە.

## ابن القيم ئەڵێ:

مەزهەبی کوللابیەکان کە شوێنکەوتەی عبدالله بن سعید بن کلاب-ن، قورئان مانایەکە لە زاتی الله دا پەیوست نیە بە قودرەت و مەشیئەتی الله، لازمی زاتی پەروەردگارە وەک سیفەتی حەیات و عیلم کە لازمی زاتی الله-ن (واتا کەلامیش سیفەتێکی زاتیە فعلی نیە، الله هەرکات بیەوێ قسە ناکات)، وە نابیسترێ بە حەقیقی، وە پیتەکان و دەنگەکان بریتین لە حیکایەتی ئەم کەلامە نەفسیە و دەلالەتی لێئەکەن کە ئەویش مەخلوقە، وە ئەو مانا قەدیمەی کە لە زاتی الله دا هەیە نابیسترێ، وە ئەو مانایە بریتیە لە المتلو و المقروء کە ئەویش مەخلوق نیە، وە دەنگەکان و پیتەکان تیلاوەی بەندەکانن کە ئەویش مەخلوقە.

**(مختصر الصواعق المرسلة : ١٣٠٩-١٣١٠)**

سەیرکە ابن کلاب ئەڵێ: المتلو و المقروء مەخلوق نین، بەڵام تیلاوە و قیرائە مەخلوقن، کە سەیری زاهیری ووتەکەی ئەکەی هەمان ووتەی بوخاریە، بەڵام لە مانا و مەبەستدا تەواو جیاوازن، بگرە بوخاری ئەڵێ ئەوەی ئەم عەقیدەیەی هەبێت کافرە، بەڵام ئەمانەی کە لە مەزهەبی کوللابیەکان حاڵی نەبوونە ووتەکەی ابن حامد تەنزیل ئەکەنە سەر بوخاری، بوخاری کە ئەیووت مەتلو و مەقروء مەخلوقن نین مەبەستی قورئان بوو، کە ئەیووت تیلاوە و قیرائە مەخلوقن مەبەستی فعلی عەبد بوو، عومومیەک هاتووە دڵی بەم ووتەیەی ابن حامد خۆشکردووە گوایە مەبەستی بوخاریە ئەسلەن ناوەکەشی نەزانیوە بنوسێ نوسیویەتی ابو حامد! سەرەتا ووتم ڕەنگە لە

دەستی دەرچوو بێت بەڵام بینیم دوو جار نوسیویەتی ابو حامد! بڕۆ سەرەتا ناوەکەی فێربە و عەقیدەی بزانە ئینجا وەرە استدلال بە ووتەکەی بکە، ئینجا پاشان ئەزانی کە ابن حامد خۆی لە اللفظية المثبتة بوو ئەیووت لەفزم بە قورئان غەیر مەخلوقە ؟! ئاخر بۆ دڵ بە فەهمی کەسێک خۆش ئەکەی بۆ ووتەی ئیمام احمد کە خودی ئەم کەسە لە مەزهەبی ئیمام احمد حاڵی نەبووە ؟! ابن حامد و ابو یعلی کە قوتابی ابن حامد بووە هەردووکیان لەوانەن کە ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە، تیلاوە و مەتلو هەردووکیان یەک شتن و غەیر مەخلوقن، وەکو ابو حاتم الرازي و ابن مندە و السجزي و غەیری ئەوانیش، لەگەڵ ئەوەشدا کەسیان بەهۆی ئەم ووتانە تەبدیع ناکەین چونکە ئەزانین هەموویان کە ئەمەیان ئەووت مەبەستیان خودی قورئانەکە بوو نەک فعلی عەبدەکەش بکەن بە غەیر مەخلوق، ئێوە بەم هەموو جەهلەتانەوە جورئەت ناکەن بڵێن فعلی عەبد غەیر مەخلوقە، جا چۆن ئەمانە جورئەتی ئەمەیان هەیە، وە لێرەدا تەنها باسی ئەم بابەتە ئەکەم باسی ئەوە ناکەم هەڵەی تریان هەبێت لە بابەتی تر، ئینجا پاشان سەیرکە اللفظية المثبتة لە بەرامبەر کێ دروست بوون ؟ بەرامبەر اللفظية المنفية دروست بوون کە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، ئەوانیش هاتن ووتیان تیلاوە و مەتلو، قیرائە و مەقروء، لەفز و مەلفوز یەک شتن و غەیر مەخلوقە، تۆ گەر لە مەزهەبی لەفزییە مەخلوقیەکان تێگەیشتی ئەزانی ڕەددی لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان بۆ کێیە و مەبەستیان چیە لە ووتەکەیان، ئینجا ئیمام احمد لە هەردووکیان بەرییە نە ئەڵێ تیلاوە مەخلوقە و مەتلو غەیر مەخلوقە بەو مانایەی کە لەفزییە مەخلوقیەکان ئەیان ووت، وە نە ئەڵێ تیلاوە و مەتلو هەردووکیان یەک شتن و غەیر مەخلوقە، گەر ئیمام احمد بڵێ تیلاوە و مەتلو،

قیرائە و مەقروء، لەفز و مەلفوز یەک شتن و غەیر مەخلوقە، ئەوا زۆر بە ئاسانی ئەیووت لەفزم بە قورئان غەیر مەخلوقە، وە کەسی تەبدیع نەئەکرد لەسەر ئەم ووتەیە.

ابو الحسن الاشعري ئەڵێ:

عبدالله بن کلاب بروای وایە ئەوەی ئێمە کە لە قورئان خوێنانی ئەبیستین کە ئەیخوێننەوە عیبارەتە لە کەلامی الله عز وجل، وە مانای فەرمایشتی الله: ﴿فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٦]، ماناکەی ئەمەیە: (حتى يفهم كلام الله) تاکو لە کەلامی الله تێئەگات.

ابو الحسن ئەڵێ: وە دەکرێ بە گوێرەی مەزهەبەکەی ئەو ماناکەی ئەمە بێت: (حتى يسمع التالين يتلونه) تاکو ئەبیستێ خوێنەران ئەیخوێننەوە.

**بڕوانە (مقالات الإسلاميين : ٢/٤٢٢)**

ئیمام احمد کە باسی لەفزییەکان ئەکرا لەلای زۆربەی جار بەم ئایەتەی سورەتی التوبة ڕەددی ئەدانەوە (حتى يسمع كلام الله) واتا ئەو قورئانەی لەسەر زەوییە کەلامی الله یە کە مرۆڤەکان ئەیخوێننەوە و ئەینوسن و حفزی ئەکەن و گوێ بیستی ئەبن، نەک حیکایەت و عیبارەت بێ لە کەلامی الله یان بە لەفزی عەبد ببێتە مەخلوق، جا بڕوانە ابو الحسن ووتی کە ابن کلاب ئەم ئایەتەی تەئویل کرد، ووتی: مانای کەلامی الله ئەبیستێ نەک کەلامی الله ببیستێ، چونکە لای ئەو کەلامی الله دەنگ و پیت نیە تا

بیستراو بێت، تەنانەت ابو الحسن ووتی: ئەکرێ بە گوێرەی مەزهەبەکەی ابن کلاب ماناکەی ئەمە بێت: تاکو ئەبیستێ خوێنەران ئەیخوێننەوە، واتا ئەمە کەلامی الله نیە بەڵکو لەفزی خوێنەرانە کە کەلامی نەفسی الله دەرئەبڕن، یان مانای کەلامی نەفسی الله یە کە خوێنەران دەری ئەبڕن.

سعد الزنجاني دەربارەی (ابن کلاب) ئەڵێ:

بڕوای وایە کە الله هیچ کەلامێکی نیە ببیسترێ لێیەوە، وە جبریل هیچی نەبیستووە لە الله لەو شتانەی کە گەیاندوویەتی بە پێغەمبەرانی، وە ئەوەی کە دابەزیوە بەسەر پێغەمبەران حیکایەتی کەلامی الله بووە، کەلامی الله نە فرمانە نە نەهیە نە خەبەرە نە پرسیارە، وە ئەم شتانە لە الله-وە ئەزانرێ بە ڕێگای تر، وە الله ووشەی نیە و هیچ زمانێکی نیە، جا ئەم ئایەتانەی قورئانی بە درۆ دانا ﴿قُل لَّوۡ كَانَ ٱلۡبَحۡرُ مِدَادًا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّي لَنَفِدَ ٱلۡبَحۡرُ قَبۡلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّي وَلَوۡ جِئۡنَا بِمِثۡلِهِۦ مَدَدًا﴾، وە فەرمایشتی: ﴿وَلَوۡ أَنَّمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن شَجَرَةٍ أَقۡلَٰمٌ وَٱلۡبَحۡرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦ سَبۡعَةُ أَبۡحُرٍ مَّا نَفِدَتۡ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾، وە تەحەددا کردن و ئیعجازی بەتاڵ کردەوە لە فەرمایشتی الله: ﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّثۡلِهِۦ﴾، ﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِعَشۡرِ سُوَرٖ مِّثۡلِهِۦ مُفۡتَرَيَٰتٖ﴾، موخالەفەی هەموو ئوممەتی کرد بەوەی کەلامی الله و کتێبی الله بوونی نیە لە زەویدا، وە ئەو و الأشعري و جگە لەوانیش لە لەفزییەکان بڕوایان وایە کەلامی الله لە حەقیقەتدا نە عەرەبیە و نە نەصرانیە و نە عیبرانیە و نە سریانیە، وە بە هیچ زمانێک لە زمانەکان نیە، وە ناکرێ سورەت و ئایەت بێت و جوزء و ژماردنی

هەبێت، وە ناکرێ دابەزێ بۆ هیچ کام لە پێغەمبەران لە حەقیقەتدا، وە بوونی نیە لە هیچ شوێنێک، نە لە دڵدا نە لە زماندا و نە لە موصحەفدا.

**(شرح المنظومة الرائية في السنة : ١١١-١١٣)**

سەیرکە ابن کلاب و ابو الحسن الاشعري لە پاڵ لەفزیەکان باسکرد.

---

ماویەتی

# اللفظية (٢٣)



لە پۆستی پێشوو باسمان کرد گەر بێتو لە جەماعەتی دوو جەزائیریەکە بپرسیت بەڵگەتان چیە کە لەفزیەکان تەنها مەبەستیان ئەوە بوو فعلی عەبد مەخلوقە قورئانیان بە مەخلوق نەئەزانی کاتێک عەبد دەری ئەبڕێ ؟

ئەوا ڕێک ریوایەتەکەی پێشووی ابن بطة ئەهێنن دەربارەی (الصوري) کە ئیمام احمد ووتی ئەمە وەک ووتەکەی کەرابیسیە پێی وابوو حەرەکات مەخلوقە، سبحان الله لەم هەموو ووتەیەی ئیمام احمد دەربارەی لەفزیەکان هیچت دەست نەکەوێ بیکەیت بە بەڵگە تەنها لە ڕیوایەتێکدا ڕستەیەک دەربهێنێت و عەقیدەتی لەسەر دابمەزرێنێت بۆ تێگەیشتن لە مەزهەبی لەفزیەکان! ئاخر گەر ئەمە مەزهەبی لەفزیەکان بوایە تەنها پێیان وابوایە فعلی عەبد مەخلوقە هیچی تر نا، ئەوە زۆرێک لە زاناکان ئەمەیان باس ئەکرد هەروەک چۆن عەقیدەی هەموو فرقەیەکی تر باسکراوە کە چیان ووتوە، مەحاڵە تۆ لە تێگەیشتن لە مەزهەبی لەفزیەکان تەنها بەهۆی ڕستەیەک تێبگەیت لە ڕیوایەتێکدا، یەک زاناش نەبێت بە صەریحی بڵێت لەفزیەکان ئەوانە بوون کە ئەیان ووت فعلی عەبد مەخلوقە، ئینجا ئێمە ڕوونمان کردەوە ئیمام احمد کە مەبەستی چیە لەم ووتەیە کە ئەڵێ ووتەی الصوري وەک ووتەی کەرابیسی وایە، کەرابیسی

ئەیووت مادام کەلام و فعلی عەبد مەخلوقە کە قورئانەکەش عەبد بە لەفزی خۆی دەری ئەبڕێت ئەویش ئەبێتە مەخلوق چونکە ئێمە لە عەبدی ئەبیستین، ئەوەی لە عەبدیش داهەیە هەمووی مەخلوقە، بەڵام بە نسبەت الله کە قسەی کردووە بەم قورئانە ئەوا قورئان کەلامی الله یە و غەیر مەخلوقە، کەواتە مادام فعلی عەبد مەخلوقە ئەڵێم لەفزم بە قورئان مەخلوقە، الصوري هات ووتی منیش ئەڵێم مادام ئیمان قەول و فعلە، فعلی عەبدیش مەخلوقە، ئەوا ئەڵێم ئیمان مەخلوقە، ئەمە لێکچوونەکەیانە کە لەبەر لقێکی مەخلوق هاتن بنەڕەتەکەیان کرد بە مەخلوق

ئیمان بنەڕەتە

دوو لقی هەیە: قەول و فعل

قەول لە ئیماندا شایەتمانی لا اله الا الله یە کە غەیر مەخلوقە

فعلەکانی عەبد کە ئەنجامی ئەدات ئەویش لە ئیمانە، ئەهلی سوننە ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوقە بەبێ استثناء

لەفز بە قورئان بنەڕەتە

دوو لقی هەیە: قورئان و فعلی عەبد

قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە

فعلی عەبدیش مەخلوقە

تۆ نابێت لەبەر ئەوەی یەکێک لەم دوو لقە مەخلوقە بنەڕەتەکەش بە مەخلوق وەسف بکەیت، وە نابێت لەبەر ئەوەی یەکێک لەم دوو لقە غەیر مەخلوقە بنەڕەتەکەش بە غەیر مەخلوق وەسف بکەیت

هەر بۆیە ئیمام احمد نە ئەیووت ئیمان مەخلوقە و نە غەیر مەخلوقە، وە نە ئەیووت لەفزم بە قورئان مەخلوقە و غەیر مەخلوقە، چونکە ئەمانە ووشەیەکی تێکەڵن شتی مەخلوق و غەیر مەخلوق لەخۆ ئەگرن

هەروەک ابن بطة ووتی: ناووترێ ئیمان مەخلوقە چونکە ئەسلی ئیمان و لووتکەکەی بریتیە لە شایەتمانی لا اله الا الله، وە ناووترێ ئیمان غەیر مەخلوقە چونکە قەدەرییەکان ئەڵێن فعلی عەبد غەیر مەخلوقە.

بۆیە ئیمان هیچ کام لەم دوو وەسفە وەرناگرێت چونکە ئیمان شتی مەخلوق و شتی غەیر مەخلوق لەخۆ ئەگرێت.

بەڵام الصوري لەبەر مەخلوقی یەکێک لە لقەکان بنەڕەتەکەشی ئەکرد بە مەخلوق، وە کەرابیسی لەبەر مەخلوقی لقێکیان لقەکەی تریش کە غەیر مەخلوق بوو لەگەڵ بنەڕەتەکەش هەردووکیانی ئەکرد بە مەخلوق

وە سەلەف بە ڕەهایی ئەیان ووت فعلی عەبد مەخلوقە، گەر بزانن ئەم ووتەیە بە ڕەهایی کێشەی تێئەکەوێ حەتمەن استثنائی تێئەکەن بەڵام تێیان نەکردووە بە ڕەهایی ئەڵێن فعلی عەبد هەمووی مەخلوقە، بەڵام گەمژەکان پێیان وایە لە سەلەف زیرەکترن ئەبێ ئەم استثنائە زیاد بکەن بڵێن لەکاتی قورئان خوێندن ناووترێ فعلی عەبد مەخلوقە! کوا سەلەفتان لەم استثنائە ؟ سەلەف ئەمەیان نەئەزانی ئێوە زانیتان ؟!

پاشان ئێمە کە باسی دوو لقەکەمان کرد کە یەکێکیان مەخلوقە و ئەوی تریان غەیر مەخلوقە، ئێوە بۆچی بەوپەڕی دڵنیایی ئەڵێن قورئان مەخلوق نیە و لا الە الا اللە مەخلوق نیە هیچیش ناترسن بەم ووتەیە لەفزمان بە قورئان ببێتە غەیر مەخلوق یان ئیمان ببێتە غەیر مەخلوق یان فعلی عەبد ببێتە غەیر مەخلوق ؟ بەڵام بۆچی کەسێک لقەکەی تر کە مەخلوقە بە مەخلوقی وەسف بکات تەکفیری ئەکەن ئەڵێن بەم ووتەیە لقەکەی تریش ئەکەیت بە مەخلوق و بنەڕەتەکەش ئەکەیت بە مەخلوق ؟! بەڕاستی ئەمە زۆر سەیرە!

هەموو ئەمانەی لە بابەتی لەفز و ئیمان قسە ئەکەن سەرەڕای جیاوازی عەقیدەیان هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کە ناووترێ ئیمان مەخلوقە یان غەیر مەخلوقە، چونکە ئیمان لا الە الا اللە ئەگرێتەوە کە مەخلوق نیە و فعلی عەبدیش ئەگرێتەوە کە مەخلوقە، بۆ لەفزیش هەمان شت ئەکرێ ووشەی لەفز وەکو فعل بێت و ئەکرێ وەکو مەفعول بێت، بۆیە ئیمان و لەفز بە قورئان نە بە مەخلوق و نە بە غەیر مەخلوق وەسف ناکرێن

**عبدالغني المقدسي** ئەڵێ:

ریوایەت کراوە لە ئیمامەکەمان احمد کە وتوویەتی: هەر کەسێک بڵێ ئیمان مەخلوقە ئەوا کافرە، وە هەر کەسێک بڵێ ئیمان قەدیمە (واتا غەیر مەخلوقە) ئەوا مبتدعە.

**عبدالغني المقدسي** ئەڵێ: ئیمام احمد ئەو کەسەی تەکفیر کرد کە ئەڵێ ئیمان مەخلوقە، چونکە نوێژ لە ئیمانە، وە نوێژ خوێندنی قورئان و تەسبیح و زیکری الله عز وجل لەخۆ ئەگرێت، هەر کەسێکیش بڵێ ئەمە مەخلوقە ئەوا کافرە، وە نوێژ هەڵسان و دانیشتن و جوڵە و سکون لەخۆ ئەگرێت، هەر کەسێک بڵێ ئەمە قەدیمە (واتا غەیر مەخلوقە) ئەوا بیدعەی کردووە.

**(ذيل طبقات الحنابلة لابن رجب : ٥٥/٣)**

بڕوانە بە صەریحی باسی ئەوەی کرد کە ئیمان شتی مەخلوق و غەیر مەخلوق لەخۆ ئەگرێت بۆیە بە هیچ کامیان وەسف ناکرێت.

**ابن بطة** ئەڵێ:

قسە لەم بابەتە ئەوەیە کە ئەهلی عیلم لەسەری بوونە و تەسلیم ئەبین بەوەی کە ئەوان وتوویانە، هەر کەسێک بڵێ: ئیمان مەخلوقە ئەوا کافرە بە الله العظیم، چونکە ئەسلی ئیمان و لووتکەکەی بریتیە لە شایەتیدانی لا اله الا الله، وە هەر کەسێک بڵێ:

ئیمان مەخلوق نیە ئەوا مبتدعە، چونکە قەدەرییەکان ئەڵێن: فعل و جوڵەی بەندەکان مەخلوق نین.

**(الإبانة الكبرى : ٢/٣٤٦)**

سەیرکە ئەڵێ نابێ بووترێ ئیمان مەخلوقە چونکە ئەسلی ئیمان لا اله الا الله یە کە مەعلومە غەیر مەخلوقە، وە نابێ بووترێ ئیمان غەیر مەخلوقە چونکە فعلی عەبدەکان مەعلومە الله خەلقی کردووە بە خیلافی قەدەرییەکان کە پێیان وایە الله فعلی عەبدەکانی خەلق نەکردووە.

ئێ ئەوەتا ابن بطة لە باسی ئیماندا کە هاوشێوەی باسی لەفزە بە ڕاشکاوی باسیکرد لەبەر ئەوەی لا اله الا الله مەخلوق نیە نابێ بووترێ ئیمان مەخلوقە، لەبەر ئەوەش کە فعلی عەبد مەخلوقە نابێ بووترێ ئیمان غەیر مەخلوقە، باشە بۆ ابن بطة لە بابەتی ئیمان باسی مەخلوقی فعلی عەبد بکات نەچۆتە ناو تەفسیل و جەهمی نیە، بەڵام بوخاری لە بابەتی لەفز باسی مەخلوقی فعلی عەبد بکات ئەوا بۆتە جەهمی ؟!!!

جەماعەتی دوو جەزائیریەکە و کلکەکانیان ئەڵێن ئەمە ڕاستە ئیمان ئەم دوو شتە لەخۆ ئەگرێت کە یەکێکیان مەخلوقە و ئەوی تریان غەیر مەخلوقە، کە من وەکو نزیک کردنەوەی بابەتەکە و ئاسانکردنی تێگەیشتن ئیمانم بە بنەڕەت ناوبرد، شتە مەخلوق و غەیر مەخلوقەکەم بە دوو لقی ئەم بنەڕەتە ناوبرد

جەماعەتی دوو جەزائیریەکە ئەڵێن:

ئاساییە لقە غەیر مەخلوقەکە کە کەلامی الله یە بە غەیر مەخلوق وەسف بکەیت، چونکە مەعلومە کەلامی الله مەخلوق نیە

گەر پێی بڵێی: ئەم ووتەیەت نابێتە هۆی ئەوەی لقەکەی تریش ببێتە غەیر مەخلوق کە فعلی عەبدە ؟ ئەڵێ نەخێر دوو شتی جیاوازن

گەر پێی بڵێی: ئەم ووتەیەت نابێتە هۆی ئەوەی بنەڕەتەکەش ببێتە غەیر مەخلوق کە ئیمانە ؟ ئەڵێ نەخێر، خۆ من لقە غەیر مەخلوقەکەم بە غەیر مەخلوق وەسف کردووە، نەهاتووم بنەڕەتەکە بە غەیر مەخلوق وەسف بکەم کە ئیمانە

منیش ئەڵێم زۆر باشە قسەکەتان تەواوە

ئێمەش ئەڵێین: گەر کەسانێکیش هاتن لقە مەخلوقەکەیان بە مەخلوق وەسف کرد کە فعلی عەبدە، بەم ووتەیە لقە غەیر مەخلوقەکە ناکەن بە مەخلوق کە کەلامی الله یە، چونکە دوو لقی جیاوازن، وە بنەڕەتەکەش ناکەن بە مەخلوق کە ئیمانە، تەنها باسی لقە مەخلوقەکە ئەکەن بەبێ باسکردنی شتێکی تێکەڵ و ئاوێتە

جەماعەتی دوو جەزائیریەکە ئەڵێن: نەخێر، گەر لقە غەیر مەخلوقەکە بە غەیر مەخلوق وەسف بکەیت نە لقە مەخلوقەکە ئەبێتە غەیر مەخلوق، نە بنەڕەتەکەش ئەبێتە غەیر مەخلوق، بەڵام گەر لقە مەخلوقە بە مەخلوق وەسف بکەیت ئەوا لقەکەی تریش ئەبێتە مەخلوق و بنەڕەتەکەش ئەبێتە مەخلوق!!!

منیش ئەڵێم الله هیدایەتیان بدات ئەگینا لەناوتان ببات.

---

ماویەتی

# اللفظية (٢٤)



**ابو احمد الاسدي** ئەڵێ:

ووتم بە باوکی عبدالله: لەفزم بە قورئان مەخلوقە یان غەیر مەخلوقە ؟

ووتی: قورئان لە پێنج لایەنەوە بوونی هەیە: حیفز کردن بە دڵ و خوێندن بە زمان و بیستن بە گوێ و بینین بە چاو و نوسین بە دەست.

ابو احمد الاسدي ئەڵێ: لە ووتەکەی حاڵی نەبووم، بە سەرگەردانی مامەوە تێیدا.

باوکی عبدالله پێی ووتم: دڵ مەخلوقە و ئەوەی بە دڵ حفز ئەکرێ غەیر مەخلوقە، زمان مەخلوقە و ئەوەی بە زمان ئەخوێندرێ غەیر مەخلوقە، گوێ مەخلوقە و ئەوەی بە گوێ ئەبیسترێ غەیر مەخلوقە، چاو مەخلوقە و ئەوەی بە چاو سەیر ئەکرێ غەیر مەخلوقە.

ابو احمد الاسدي ئەڵێ ووتم: باوکی عبدالله چاو سەیری ڕەشی حیبر ئەکات لە کاغەزدا ؟

باوکی عبدالله پێی ووتم: بێدەنگ بە ئەوە چی ئەڵێی! صەحیحترین شت لەم بابەتەدا فەرموودەکەی نافع عن ابن ابن عمر-ە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سەفەر مەکەن بە قورئانەوە بۆ خاکی دوژمن)، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم باسی حیبر و کاغەزی نەکرد.

ابو احمد الاسدي ئەڵێ: پاشان باوکی عبدالله لەگەڵم گەڕایەوە بۆ بەردەرگای ماڵەکەی و قسەی لەگەڵ ئەکردم دەربارەی ئەمە، لەو کاتەدا ئافرەتێک هات بۆلای کە پیاوێکی لەگەڵ بوو، پیاوەکە ووتی: ئەی باوکی عبدالله ئەم ئافرەتە چووە بۆلای عبدالوهاب وەڵامی پرسیارەکەی نەداوەتەوە، حەز ئەکات لە تۆی بپرسێ

باوکی عبدالله بە ئافرەتەکەی ووت: پرسیارەکەت چیە ؟

ووتی: مێردەکەم سوێندی خوارد بە تەڵاق کە قسە لەگەڵ دراوسێیەکی نەکات بۆ ماوەی ساڵێک، دوای چەند رۆژێک بەلای دراوسێکەی تێپەڕی ئەویش قورئانی ئەخوێند و هەڵەی تێدا کرد، ئەویش هەڵەکەی بۆ ڕاست کردەوە، ئایا ئافرەتەکەی لێی حەڕام بووە ؟

ووتی: نەخێر، بڕۆ سوێندەکەت نەکەوتووە، چونکە تۆ بە کەلامی خالق قسەت لەگەڵی کردووە نەک بە کەلامی مەخلوقەکان.

**(الإبانة الكبرى لابن بطة : ٢٢٥٣)**

لەم ریوایەتەدا ئیمام احمد تەفسیل ئەدات ئەڵێ: دڵ مەخلوقە و ئەوەی لە دڵدا حیفز کراوە غەیر مەخلوقە، زمان مەخلوقە و ئەوەی زمان ئەیخوێنێ غەیر مەخلوقە، دەست مەخلوقە و ئەوەی دەست ئەینوسێ غەیر مەخلوقە.

دوو جەزائیریەکە و کلکەکانیان ئەم تەفسیلە بە کوفر ئەزانن کە لەم ریوایەتەدا هاتووە، ئەی ئەبێ چی بکەن بەرامبەر ئەم ریوایەتە ؟

جارێک ئەڵێن زەعیفە راوی مەجهولی تێدایە

جارێک ئەڵێن مەتنەکەی مونکەرە ئیمام احمد لە هیچ ریوایەتێکی تردا باسی ئەم تەفسیلەی نەکردووە، وە خودی چیرۆکەکە ووتەی مونکەری تێدایە ابو احمد الاسدي ئەڵێ پرسیارم لە ئیمام احمد ووتم لەفزم بە قورئان مەخلوقە یان غەیر مەخلوق ؟ وەڵامی نەدامەوە، پاشان چووم بۆ مەککە، لە مەککە الله عز وجل هاتە خەونم، لێم پرسی: خوێندنەوەم بۆ کەلامی تۆ غەیر مەخلوقە ؟ الله عز وجل فەرمووی: بەڵێ!

چۆن الله عز وجل قیرائە بە قورئان بە غەیر مەخلوق ناو ئەبات، لە کاتێکدا ئەهلی سوننە لەسەر ئەوە عەقیدەیان جێگیر بووە کە نە ئەڵێن قیرائە بە قورئان مەخلوقە و نە ئەڵێن غەیر مەخلوقە!

ئینجا جگە لە ابن بطة کەسی تر ئەم ریوایەتەی نەهێناوە، هەموو ئەمانەش ئەوە دەرئەخەن کە ئەم ریوایەتە مونکەرە و ڕاست نیە ئیمام احمد قسەی لەم جۆرەی کردبێ.

بەڵام جەزائیریەکان هێشتا لەم تەنگژەیە نازانن چۆن دەرچن کە ڕووبەڕوویان ئەبێتەوە، ئەویش ئەمەیە: ابن بطة چۆن ریوایەتێکی کوفری لە ئیمام احمدەوە ئەگێڕێتەوە و لێی بێدەنگ ئەبێت ؟!!!

مەحاڵە ابن بطة ریوایەتێک لە ئیمام احمدەوە بهێنێت کوفر بێت کەچی هیچ قسەی لەسەر نەکات، نەڵێ ئەمە درۆیە دراوەتە پاڵ احمد، احمد بەریە لەم کوفرە، تەنانەت ابن بطة ئەم ریوایەتەی بۆ ڕەددانەوەی لەفزییەکان هێناوە، گەر ابن بطة وەک جەزائیریەکان لە مەزهەبی لەفزییەکان حاڵی ببوایە ئەوا ئەیووت: ئەم ووتەیە خودی مەزهەبی لەفزییەکانە و کوفرە، ئەمە درۆیە دراوەتە پاڵ احمد، منیش بۆیە ریوایەتم کرد تاکو ئەم درۆیە روون بکەمەوە کە دراوەتە پاڵ احمد، بەڵام ابن بطة هیچ قسەیەکی لەم جۆرە ناکات، وە ئەوەی ئاگاداری مەزهەبی زانایانی سەلەف بێت لە کتێبە عەقیدەییەکان هیچ ریوایەتێک ناهێنن ئیللا بڕوایان بە مەتنەکەی هەیە و قبوڵیانە ئەگەرچی سەنەدەکەی زەعیف بێت.

## عبدالله کوڕی ئیمام احمد ئەڵێ:

حدثني وهب بن بقية الواسطي ووتی:

بیستم وكيع بن الجراح دەیووت: قورئان کەلامی الله عز وجل-ە، مەخلوق نیە.

عبدالله ئەڵێ: وهب بن بقية ووتی: ئەمەم بیست لە وكيع و لە کتێبەمدا نوسیمەوە، گەر ئەم ووتەیەی وكيع ڕەئی منیش نەبوایە ئەوا نەم دەگێڕایەوە.

**(السنة لعبدالله : ١٣٤)**

ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە زانایانی سەلەف ئەو ڕیوایەتانەی ئەیهێنن لە کتێبەکانی عەقیدە بڕوایان پێیەتی و مەتنەکەیان قبوڵە، ئەگەرچی سەنەدەکانی کێشەیان هەبێ لە ڕووی سەحیحیەوە .

زانایەکی گەورە بۆ ڕەتدانەوەی کافران و گومڕاکان فەرموودەیەک یان ئەثەرێک ڕیوایەت ناکات کە پێی وابێت مەتنەکەی قبوڵکراو نیە، چ جای ئەوەی مەتنی ڕیوایەتەکە کوفر لەخۆ بگرێت و لێی بێدەنگ بێت! وەک ئەوەی ئەم دوو جەزائیریە و کلکەکانیان پێیان وایە ئەم ریوایەتە کوفرە بەڵام ابن بطة ریوایەتی کردووە و لێی بێدەنگ بووە!!! یەکێک لە جەزائیریەکان ئەڵێ: الله لە ابن بطة خۆش بێت چۆن لەم ریوایەتە بێدەنگ بووە!!!

سەبارەت بەوەش کە سەنەدەکەی زەعیفە کەسانی مەجهولی تێدایە، ئەوا هێندە تشدد ناکرێ لەم جۆرە ریوایەتانە ئیللا ئەو کەسانە تشدد ئەکەن کە بە کوفری ئەزانن، حەتمەن تۆ بتەوێ رەخنە لە ریوایەتێک بگریت کە دژی عەقیدەکەتە ئەوا بیانوو زۆرە بۆ رەخنە لێگرتنی، بۆ نموونە برۆ سەر ریوایەتەکانی تەفسیر گەر بتەوێ بیانوو بگریت هەر ریوایەتێک بە دڵت نەبوو رەتی بکەیتەوە ئەوا بیانوو زۆرە چونکە زۆربەی ریوایەتەکانی تەفسیر راوی زەعیفی تێدایە بەڵام سەلەف هێندە توند نین لە قبوڵ کردنی ئەم ریوایەتانە بەڵام تۆ کە عەقیدەکەت جۆرێکی ترە حەتمەن بە نسبەت تۆ ریوایەتەکە مونکەرە چونکە عەقڵی تۆ لەسەر شتێکی تر بەرمەجە کراوە لەلایەن شێخەکەت، ئەگینا وەرن با بزانین چ زانایەک هەبووە لە ئوممەت بە سەلەف و خەلەفەوە، بە هەموو فرقەکانەوە، یەکێکیان وەک ئێوە بڵێ ئەم ریوایەتە مونکەرە و ئیمام احمد بەرییە لەم کوفرە، ئەم ریوایەتە کوفرە هەمان مەزهەبی لەفزییەکانە ؟ کەس نەبوو لە ئوممەت ئەمە روون بکاتەوە بۆ خەڵک جگە لەم دوو جەزائیریە ؟ خۆ حەتمەن گەر ووتەی یەک زاناتان لە دەست بوایە کە بڵێ ئەم ریوایەتە کوفرە یان بیدعەیە ئەوا نەقلتان ئەکرد ئەگەرچی زاناکە بە کافریش بزانن، چونکە لەکاتی پەلەقاژەدا پەنا بۆ ووتە و ریوایەتی هەموو کەس ئەبەن، بەڵام لەم ریوایەتەدا ووتەی کەستان دەست ناکەوێ کە بڵێ ئەم ریوایەتە کوفرە یان بیدعەیە، یان بڵێ ئەمە هەمان مەزهەبی لەفزییەکانە

الخلال له السنة کتێبی (الرد على الزنادقة والجهمية) کە کتێبی ئیمام احمدە ڕیوایەت ئەکات لە کەسێکەوە کە مەجهولە، کەچی هەموو حەنابیلە ئەم کتێبەیان قبوڵ کردووە سەرەڕای مەجهولی ئەم کەسە، ئەمە لە کاتێکدا ووتەکانی ناو ئەم کتێبە زۆر جیاوازە لە باقی ووتەکانی تری ئیمام احمد، ئیمام احمد بەوە ناسراو بووە کە جگە لە قورئان و سوننەت و ئاساری سەلەف بە هیچ شتێک ڕەددی فرقە و کەسەکان ناداتەوە، کەچی لەم کتێبە بە زۆر بەڵگەی عەقڵی ڕەددی جەهمیەکان ئەداتەوە کە ئسلوبی قسەکانی هیچ لەو ئسلوبەی ئیمام احمد ناچێ کە پێی ناسراوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو حەنابیلە بە متقدمين و متأخرين ئەم کتێبە ئەدەنە پاڵ ئیمام احمد، کە ڕەنگە بە ماناوە ووتەکانی ئیمام احمد نەقل کرا بێت لەم کتێبە نەک ڕێک بە هەمان دەقی خۆی، جا لە ئیسبات کردنی کتێبێک بۆ ئیمام احمد چاوپۆشی لە مەجهولی ڕاوی بکرێت چ جای بۆ ڕیوایەتێک کە هیچ کێشەیەکی تێدا نیە بەڵام لەلای دوو جەزائیریەکە حەتمەن کوفرە و کێشەیە بۆیە ئەبێ ڕەت بکرێتەوە

سەبارەت بەوەش کە خەونەکە ووتەی مونکەری تێدایە الله عز وجل فەرموویەتی قیرائەتی تۆ بە قورئان غەیر مەخلوقە، بەڵێ ئەمە مونکەرە ڕەنگە هەڵەکە لە ابن بطة بێت چونکە ابن بطة سەرەرای ئەوەی ئیمامە لە سوننەت بەڵام هێندە پتەو نیە لە حیفزدا و بە هەڵە ناسراوە لە ڕیوایەت کردن، ئەمەی ئەوەش بەهێز ئەکات کە بەسەرهاتی ئەم خەونە مونکەر بێت ئەوەیە کە جگە لە ابن بطة کەسانی تریش ئەم ڕیوایەتەیان هێناوە کەسیان باسی ئەم خەونە ناکەن تەنها ابن بطة باسی خەونەکەی

کردووە، جگە لەمەش کەسیان ئەم بەسەرهاتە لە ابو احمد الاسدي ڕیوایەت ناکەن بەڵکو لە ابراهیم بن یحیی المقرئ ڕیوایەتی ئەکەن ئەمەش ئەوە بە هێز ئەکات کە ابن بطة یان یەکێک لە راوییەکانی سەنەدەکەی هەڵەیان کردبێ لە گێڕانەوەی چیرۆکەکە وەکو خۆی، بەڵام باقی چیرۆکەکە هەمووی وەک یەکە.

واتا کەسانی تریش جگە لە ابن بطة ڕیوایەتیان کردووە لە ئیمام احمد کە ئەم تەفسیلە بدات ؟ بەڵێ هەیە، نەک تەنها یەک کەس، سێ کەسی تر هەمان ئەم ڕیوایەتەیان کردووە لە ئیمام احمد.

## ابن المحب الصامت الحنبلي:

دوای هێنانی ڕیوایەتەکەی ابن بطة بە سەنەدەوە لە ابو احمد الاسدي، لە کۆتایی ڕیوایەتەکە ئەڵێ:

تابعه ابو بكر الخلال عن احمد بن عبدالرحمن البصري عن ابي علي الحسن بن احمد المروزي سمعه بالبصرة عن ابراهيم بن يحيى المقرئ عن احمد.

**بڕوانە (صفات رب العالمين : ٩٦٢)**

سەیرکە ابن المحب ئەڵێ: (تابعه ابو بكر الخلال) ئینجا سەنەدەکەی الخلال-یش ئەهێنێت، کە الخلال لە ابراهیم بن یحیی المقرئ ئەم چیرۆکە ئەگێڕێتەوە نەک لە ابو احمد الاسدي، مەحاڵیشە هەمان چیرۆک بەسەر هەردووکیان هاتبێ بە نەفسی

ووردەکارییەوە، تەنانەت ابراهیم بن یحیی لەکۆتایی چیرۆکەکە ئەویش باسی ئەوە ئەکات کە ژن و پیاوێک هاتنە لای ئیمام احمد پرسیاری کەوتنی تەڵاقەکەیان لێکرد، وە چیرۆکەکەی ابراهیم باسی خەونەکەی تێدا نیە، ئەمەش ئەوە بەهێز ئەکات کە ابن بطة هەڵەی کردبێ لەناوی خاوەن

چیرۆکەکە و گێڕانەوەی خەونەکەی، هەر بۆیەش کە ابن المحب ریوایەتەکەی ابن بطة ئەهێنێ بەسەرهاتی خەونەکە ناهێنێت

گەر بووترێ کوا الخلال لە کتێبی السنة بۆ ئەم ریوایەتەی نەهێناوە ؟

ئەم کتێبەی السنة کە لەبەر دەست دایە بەشێکە لە سێ بەشی کتێبەکە، دوو بەشی تری ماوە وون بووە، محقق عادل آل حمدان ئەڵێ: ئەوەی تەحقیقم کردووە لە السنة ی الخلال یەک کتێبە دوو کتێبی تری ماوە وون بووە، زۆر زاناش هەیە ریوایەت لە سوننەی الخلال نەقل ئەکەن کە ئێستا لە سوننەی الخلال بوونی نیە، لەو بەشەیە کە بەردەست نەماوە و وون بووە، ئینجا ابن المحب باسی ئەوەش ناکات بڵێ الخلال دوای هێنانی ئەم ریوایەتە باسی کردبێ کە ئەم ریوایەتە مونکەرە و احمد لێی بەرییە، ئەم ریوایەتە تەفسیلی کوفری و بیدعی تێدایە، یان بڵێ هەمان مەزهەبی لەفزییەکانە، ئەوەتا الخلال کە کۆکەرەی عیلمی ئیمام احمدە هەمان ریوایەت ئەهێنێ کە جەزائیریەکان بە کوفری ئەزانن، کەچی الخلال لێی بێدەنگ ئەبێت! ئەویش نەیزانی کوفرە یان زانی کوفرە بەڵام لێی بێدەنگ بوو ؟ کە الخلال وەکو ابن بطة هێناویەتی لێی

بێدەنگ بووە واتا ئەویش ماناکەی لەلا قبوڵە و بە کوفر و بیدعەی نەزانیوە، مەحاڵە کوفر و بیدعە بداتە پاڵ احمد و لێی بێدەنگ بێت

هەروەها البيهقي لە کتێبی مناقب الإمام احمد هەمان ریوایەت ئەهێنێ وەکو الخلال لە ابراهيم بن يحيى المقرئ نەک لە ابو احمد الاسدي، وە ریوایەتەکەی ئەویش باسکردنی خەونەکەی تێدا نیە، گەر ئێستا تەنها البيهقي ئەمەی هێنابوایە ئەیان ووت البيهقي ئەشعەریە لێی قبوڵ ناکەین، ئەی چی لە الخلال ئەکەن ؟

## ابن المحب الصامت الحنبلي:

دوای باسکردنی ریواتەکەی الخلال ئەڵێ:

وقال ابو بكر البيهقي في مناقب احمد: وجدت في كتاب رفيقي محمد بن يوسف القطان رحمه الله بخطه فيما أخبرهم شيخنا ابو سهل احمد بن محمد بن ابراهيم المهراني: أخبرنا ابو الحسين محمد بن احمد بن حامد بن محمود بن غالب العطار قال: سمعت محمد بن جعفر بن محمد بن صالح البغدادي يقول: سمعت معن بن عيسى البجلي حدثنا عبدالله بن عبدالرحمن عن ابراهيم بن يحيى بن ابي اسحاق المقرئ ووتی: چووم بۆلای باوکی عبدالله احمد بن حنبل، پرسیارم لێی کرد دەربارەی لەفز، پێم ووت: ئەم بابەتە لە شارەکەمان دەرکەوتووە و پرسیاریان لێکردووم، تۆ چی ئەڵێی دەربارەی ؟

ووتی: قورئان لە پێنج لایەنەوە بوونی هەیە

ابراهیم بن یحیی ئەڵێ ووتم: لایەنەکان چین ؟

ووتی: حیفز کردن بە دڵ و خوێندن بە زمان و بیستن بە گوێ و بینین بە چاو و نوسین بە دەست.

ابراهیم بن یحیی ئەڵێ: منیش مانای ئەم ووتەیەم لێ پرسی

پێی ووتم: دڵ مەخلوقە و ئەوەی بە دڵ حیفز کراوە غەیر مەخلوقە، زمان مەخلوقە و ئەوەی بە زمان ئەخوێندرێ غەیر مەخلوقە، بیستن مەخلوقە و ئەوەی بە گوێ ئەبیسترێ غەیر مەخلوقە، دەست مەخلوقە و ئەوەی بە دەست ئەنوسرێ غەیر مەخلوقە، چاو مەخلوقە و ئەوەی بە چاو سەیر ئەکرێ غەیر مەخلوقە ... (ئینجا پاشان ابراهیم بن یحیی چیرۆکی ژن و پیاوەکە ئەگێڕێتەوە کە هاتن پرسیاری کەوتنی تەڵاقیان لە ئیمام احمد کرد).

**بڕوانە (صفات رب العالمين : ٩٦٣)**

ئینجا نەک هەر ئەمانەش بەڵکو ابو نصر السجزي کە ئەیووت لەفزم بە قورئان غەیر مەخلوقە و زۆر توند بوو لەم بابەتە، ئەویش ئەم بەسەرهاتە بە سەنەدەوە ریوایەت ئەکات لە ئیمام احمد بەڵام لە ڕێگای ابراهیم الحربي کە قوتابی ئیمام احمد بووە، بەڵام نەک ڕووداوەکە لە نێوان ابراهیم الحربي و ئیمام احمد ڕوو بدات، بەڵکو ابراهیم الحربي ئەڵێ کەسێک هات پرسیاری لە ئیمام احمد کرد دەربارەی لەفز بە قورئان ئەویش بەم جۆرە وەڵامی دایەوە، وا دەرئەکەوێت ئەو کەسەی کە ابراهیم

الحربي باسی ئەکات هەر ابراهيم بن يحيى بێت چونکە ابراهيم بن يحيى لە سەرەتای ریوایەتەکە ئەڵێ بە ئیمام احمدم ووت: لە شارەکەمان بابەتی لەفز دەرکەوتووە تۆ چی ئەڵێی ؟

لە ریوایەتی ابو نصر السجزي ابراهيم الحربي ئەڵێ: پیاوێک پرسیاری لە احمد بن حنبل کرد، ووتی: لەلای ئێمە کەسانێک هەن پێیان وایە لەفزیان بە قورئان مەخلوقە، تۆ چی ئەڵێی ؟

ئەمەش ئەوە دەرئەخات کە ابراهيم الحربي لەلای ئیمام احمد بووە کاتێک ابراهيم بن يحيى هاتووە ئەم پرسیارەی لێکردووە، هەروەها ابراهيم الحربي ئەڵێ لە مەجلیسەکە بووم کە ژن و پیاوەکە هاتن پرسیاری تەڵاقیان کرد لە ئیمام احمد، ئێستاش ریواتەکە ئەهێنین لەلای ابو نصر السجزي کە هەر ابن المحب الصامت الحنبلي نەقلی کردووە.

**ابو نصر السجزي** ئەڵێ:

أخبرنا اسماعيل بن سلمة بن ابي الجوع وهو المالكي -عرضا- وأخبرني بها عنه ابو القاسم عبدالجبار بن احمد المقرئ هو الشافعي -قراءة عليه- قال: قرأت على ابراهيم بن غالب التمار قال: قرأت على جعفر بن ادريس القزويني بمكة ووتی: بیستم ابراهيم الحربي لە بەغداد ئەیووت: پیاوێک پرسیاری لە باوکی عبدالله احمد بن حنبل کرد،

پێی ووت: لەلای ئێمە کەسانێک هەن پێیان وایە لەفزیان بە قورئان مەخلوقە، تۆ چی ئەڵێی ؟

باوکی عبدالله ووتی: قورئان لە عەبدەوە بۆ الله ئەچێت بە پێنج لایەنەوە، وە پێنج شتیش غەیر مەخلوقە: حیفز کردن بە دڵ و خوێندن بە زمان و سەیرکردن بە چاو و نوسین بە دەست و بیستن بە گوێ، دڵ مەخلوقە و ئەوەی بە دڵ حیفز ئەکرێ غەیر مەخلوقە، بینین مەخلوقە و ئەوەی سەیر ئەکرێ غەیر مەخلوقە، زمان مەخلوقە و ئەوەی بە زمان ئەخوێندرێ غەیر مەخلوقە، دەست مەخلوقە و ئەوەی بە دەست ئەنوسرێ غەیر مەخلوقە، بیستن مەخلوقە و ئەوەی بە گوێ ئەبیسترێ غەیر مەخلوقە، دەست مەخلوقە و ئەوەی بە دەست ئەنوسرێ غەیر مەخلوقە.

ابراهیم الحربي ئەڵێ: من لەو مەجلیسەدا دانیشتبووم پیاوێک هات ژنێکی لەگەڵ بوو، پیاوەکە ووتی: ئەی باوکی عبدالله ئەمە ژنەکەمە، سوێندم خواردووە بە تەڵاقی ئەو کە بۆ ماوەی ساڵێک قسە لەگەڵ کەسێک نەکەم، منیش جارێک بیستم ئەم کەسە قورئان ئەخوێنی و هەڵەی تێدا کرد، منیش بۆم ڕاست کردەوە ؟

باوکی عبدالله ووتی: قسەت کردووە بە کەلامی خالق هیچ کەلامێکی مەخلوقی تێدا نیە، هیچت لەسەر نیە.

**بڕوانە (صفات رب العالمين : ٩٦٤)**

هەروەها نامیلکەیەک هەیە بە ناونیشانی (رسالة في أن القرآن غير مخلوق) دراوەتە پاڵ ابراهیم الحربي بە حیساب ئەو نوسیویەتی، لەم نامیلکەیەشدا ابراهیم الحربي

هەمان چیرۆک ریوایەت ئەکات لە ئیمام احمد، بەڵام ئەووترێ نەچەسپاوە کە ئەم نامیلکەیە هی ابراهیم الحربي بێت، هەرچەندە ابن القیم لە (الصواعق) ریوایەتەکەی ابراهیم الحربي هێناوە و پشتی پێ بەستووە و سەری خستووە و هیچ ئینکاری لێ نەکردووە.

بەڵام ئەوەتا ابو نصر السجزي بە سەنەدەوە هەمان چیرۆکی لە ابراهیم الحربي ریوایەت کردووە، لە کاتێکدا السجزي لە لەفزییە غەیر مەخلوقیەکانە بەڵام ئەم ریوایەتەی بەلاوە کێشە نەبووە بڵێ ئەمە کوفرە یان مەزهەبی لەفزییە مەخلوقیەکانە، بەڵکو خودی ئەم ریوایەتە بەڵگەیە لە دژی لەفزییە مەخلوقیەکان بەڵام ئەوەی لە مەزهەبی لەفزییەکان تێنەگەیشتبێ نازانێ چی بکات لەم ریوایەتە و وەکو شەرمەزاری وایە لەنێوچەوانیدا بە تایبەتی کە ئەبینێ هەموو ئەمانە ریوایەتیان کردووە و رەتیان نەکردۆتەوە و نەیان ووتوە ئەمە کوفرە و لێی بێدەنگ بوونە.

گەر لە مەزهەبی لەفزییەکان حاڵی بن ئەزانن ئەم ریوایەتە رەددە بۆیان بۆیە ابن بطة و السجزي لە رەددی لەفزییە مەخلوقیەکان ئەم ریوایەتە ئەهێنن، لەفزییە مەخلوقیەکان ئەڵێن مادام کەلامی عەبد و فعلەکانی مەخلوقە، عەبد هەر شتێک ئەنجام بدات دەربارەی قورئان ئەبێتە مەخلوق، قورئان بخوێنێ عەبد خوێندوویەتی قورئانەکە ئەبێتە مەخلوق، قورئان بنوسێ عەبد نوسیویەتی قورئانەکە ئەبێتە مەخلوق، قورئان حیفز بکات عەبد حیفزی ئەکات قورئانەکە ئەبێتە مەخلوق، بەڵام بە نسبەت الله قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، بەڵام بە نسبەت عەبد چونکە

هەموو شتێکی عەبد مەخلوقە هەرچی بکات بەرامبەر قورئان قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق، جا ئەم ریوایەتە رەددە بۆیان ئیمام احمد ئەڵێ زمان مەخلوقە بەڵام ئەوەی بە زمان ئەخوێندرێ غەیر مەخلوقە، دڵ مەخلوقە ئەوەی بە دڵ حیفز ئەکرێ غەیر مەخلوقە، دەست مەخلوقە ئەوەی بە دەست ئەنوسرێ غەیر مەخلوقە، ئەم شتە مەخلوقانەی عەبد قورئانەکە ناکەن بە مەخلوق.

جگە لەمانەش هەندێک زانای تریش کە ئەڵێن تیلاوە و مەتلو، قیرائە و مەقروء و لەفز و مەلفوز هەردووکیان یەک شتن و غەیر مەخلوقن، کە ئیمام احمد بەرییە لەم ووتانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم زانایانە کە قسەکانیان وەک قسەی لەفزییە غەیر مەخلوقیەکانە کەچی ئەم ریوایەتەی ئیمام احمد ئەهێنن بۆ رەددانەوەی لەفزییە مەخلوقیەکان و هیچ بە مونکەری نازانن، سەیرکە ئەوان ئەم ریوایەتە بە ڕەد ئەزانن بۆ لەفزییە مەخلوقیەکان، ئێوەش ئەم ریوایەتە بە هەمان مەزهەبی لەفزییە مەخلوقیەکان ئەزانن!!! جیاوازییەکی یەکجار زۆر هەیە لە نێوان فەهمەکان

**ابن البناء الحنبلي** ئەڵێ:

ابو احمد الاسدي ووتی: چوومە لای باوکی عبدالله احمد بن حنبل، پرسیارم لێ کرد: لەفزم بە قورئان مەخلوقە یان غەیر مەخلوقە ؟

ووتی: قورئان حیفز ئەکرێ بە دڵ، ئەخوێندرێ بە زمان، ئەبیسترێ بە گوێ، ئەبینرێ بە چاو، ئەنوسرێ بە دەست، دڵ مەخلوقە و ئەوەی بە دڵ حیفز ئەکرێ غەیر

مەخلوقە، زمان مەخلوقە و ئەوەی بە زمان ئەخوێندرێ غەیر مەخلوقە، گوێ مەخلوقە و ئەوەی بە گوێ ئەبیسترێ غەیر مەخلوقە، بینین مەخلوقە و ئەوەی سەیر ئەکرێ بە چاو غەیر مەخلوقە، دەست مەخلوقە و ئەوەی بە دەست ئەنوسرێ غەیر مەخلوقە.

**بڕوانە (الرد على المبتدعة : ١٣٥)**

ابن البناء الحنبلي لەوانەیە کە بڕوای وایە لەفز بە قورئان غەیر مەخلوقە و کیتابە و مەکتوب و قیرائە و مەقروء و لەفز و مەلفوز هەمان شتە و غەیر مەخلوقە، کەچی بەڵگە بەم ریوایەتە ئەهێنێتەوە لە دژی لەفزییە مەخلوقیەکان، کەچی ئێوە پێتان وایە ئەم ریوایەتە کوفرە و هەمان مەزهەبی لەفزییە مەخلوقیەکانە!!!

### قوام السنة الأصبهاني ئەڵێ:

احمد بن حنبل رحمه الله وتوویەتی: قورئان لە پێنج لایەنەوە تەصەروفی پێ ئەکرێ: بە چاوەکانمان ئەیبینین، چاوەکان مەخلوقن و ئەوەی ئەیبینین غەیر مەخلوقە، وە ئەیخوێنین بە زمانەکانمان، زمانەکان مەخلوقن و ئەوەی بە زمانەکان ئەخوێندرێ غەیر مەخلوقە، وە ئەیبیستین بە گوێیەکانمان، گوێیەکان مەخلوقن و ئەوەی بە گوێیەکان ئەبیسترێ غەیر مەخلوقە، وە ئەینوسین بە دەستەکانمان، دەستەکان مەخلوقن و ئەوەی بە دەستەکان ئەینوسین غەیر مەخلوقە، وە حیفزی ئەکەین بە دڵەکانمان، دڵەکان مەخلوقن و ئەوەی بە دڵەکان حیفز ئەکرێ غەیر مەخلوقە.

**(الحجة في بيان المحجة : ٢ / ٤٤٨-٤٤٩)**

قوام السنة الأصبهاني یەکێکە لەوانەی کە چەندین جار لەم کتێبەدا باسی ئەوە ئەکات قیرائە بە قورئان و قورئان هەردووکیان یەک شتن و غەیر مەخلوقە، لەفز بە قورئان و قورئان هەردووکیان یەک شتن و غەیر مەخلوقە، تیلاوە و مەتلوش هەردووکیان یەک شتن و غەیر مەخلوقە، تەنانەت کاتێک ئەم ووتەیە لە ابو حاتم الرازي ریوایەت ئەکات هیچ رەخنەی لێ ناگرێ، وە لەم کتێبەیدا لە زۆر شوێنی جیاواز رەددی لەفزییە مەخلوقیەکان ئەداتەوە بۆ یەکجاریش رەددی لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان ناداتەوە، کەچی لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ریوایەتەکەی ئیمام احمد نەقل ئەکات بۆ رەددانەوەی لەفزییە مەخلوقیەکان، ماناکەی بە باطل نازانێت و احتجاجی پێ ئەکات لەم بابەتەدا لەفزی مەخلوقی و لەفزی غەیر مەخلوقی هەیە، کە لەفزییە مەخلوقیەکان جەهمین، لە بەرامبەردا لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان غلویان کردووە لە رەددانەوەیان، لەم نێوانەشدا ئەهلی سوننە هەن کە ئیمام احمد پێشەوایانە کە ووتەی هیچ کام لەم دوو فرقەیە ناڵێنەوە، کەچی ئەبینین لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان ئەم ریوایەتەی ئیمام احمد نەقل ئەکەن و استدلالی پێ ئەکەن بۆ رەددانەوەی لەفزییە مەخلوقیەکان، کەچی جەماعەتی دوو جەزائیریەکە کە خۆیان بە ئەهلی سوننە ئەزانن و ئەڵێن ئێمە لەنێوانی ئەم دوو فرقەیە داین بەڵام ئەم ریوایەتەی ئیمام احمد بە کوفر ئەزانن و ئەڵێن هەمان مەزهەبی لەفزییە مەخلوقیەکانە!!! سبحان الله

جگە لە هەموو ئەمانەش الذهبي ریوایەتێکی نەقل کردووە لە کتێبی تاريخ نيسابوری الحاكم کە ریوایەتێکی مونکەرە کە بەشێکی ریوایەتەکە پشتڕاستی ئەم ریوایەتە ئەکاتەوە.

**الحاكم** ئەڵێ:

حدثنا الأصم سمعت محمد بن إسحاق الصغاني ووتی: بیستم فوران هاوەڵی ئیمام احمد ئەیووت: الأثرم و أبو عبدالله المطيعي داوایان لێکردم کە داوا لە باوکی عبدالله بکەم کاتێک دیاری بکات بە تەنها قسەی لەگەڵ بکەم، پرسیاری لێ بکەم دەربارەی ئەو هاوەڵانەمان کە جیاوازی ئەکەن لە نێوان اللفظ و المحكي (واتا لەفز و مەلفوز)، منیش پرسیارم لێی کرد

ووتی: قورئان چۆن تەصەروفی پێ بکرێ لە ووتە و لە کردار ئەوا هەر غەیر مەخلوقە، بەڵام فعلی ئێمە مەخلوقە.

فوران ئەڵێ ووتم: باوکی عبدالله لەفزیەکان بە جەهمی دائەنێیت ؟

ووتی: نەخێر، جەهمیەکان ئەوانەن کە ووتیان قورئان مەخلوقە.

**(سير أعلام النبلاء : ٢٩١/١١)**

ئەم ریوایەتە لە ڕووی سەنەدەوە سەحیحە هیچ کێشەی تێدا نیە، لە نێوان الحاكم و ئیمام احمد سێ کەس هەن کە هەر سێکیان سیقەن، وە ئەو بەشەی سەرەتا کە ئیمام احمد ئەڵێ قورئان لە هەموو بارێکدا غەیر مەخلوقە بەڵام فعلی ئێمە مەخلوقە پشتڕاستی ئەم ریوایەتە ئەکاتەوە کە الخلال و ابن بطة و السجزي و البيهقي ریوایەتیان کردووە، بەڵام بەشەکەی کۆتایی بە دڵنیاییەوە مونکەرە و هەڵەیە، ئیمام احمد لەم هەموو ریوایەتە زۆرەی هاوەڵەکانی ئەڵێ لەفزیەکان جەهمین، چۆن لێرەدا ئەڵێ جەهمی نین ؟! بێگومان لەبەر ریوایەتێکی الحاكم واز لەم هەموو ریوایەتە زۆرەی هاوەڵەکانی ناهێنین ئەگەرچی سەنەدەکەشی سەحیح بێت.

---

ماویەتی

# اللفظية (٢٥)



اللالكائي دوای ئەوەی ئەیداتە پاڵ زیاتر لە ٥٠ زانا کە وتوویانە ئەوەی بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە وەک ئەوە وایە بڵێ قورئان مەخلوقە، پاشان ووتەی ١٥ زانا نەقل ئەکات دەربارەی لەفزییەکان، پاشان اللالكائي ئەڵێ:

ووتەی ئەم پێشەوایانە رضي الله عنهم بۆ ئەوە گەڕایەوە کە قورئان بە حەقیقی لە الله بیستراوە، وە کاتێک قورئانخوێن ئەیخوێنێت قورئان لە لەفزی قورئانخوێنەکە وەک کەلامی خەڵکی نیە کاتێک دەری ئەبڕێ تا ببێتە مەخلوق، کەلامی الله لە کەلامی مەخلوقەکان ناچێت چونکە غەیر مەخلوقە.

**(شرح أصول اعتقاد : ٣٥٣-٣٥٤)**

سەیرکە لە ڕەددی لەفزییەکان باسی ئەوە ئەکات کاتێک عەبد قورئان ئەخوێنێت قورئانەکە لەسەر زمانی عەبد وەک کەلامی ئاسایی خەڵک نیە کاتێک قسە ئەکەن تا ببێتە مەخلوق، تێبگە کە لەفزییەکان ئەیان ووت مادام هەموو شتێکی عەبد مەخلوقە کاتێک قورئانیش ئەخوێنێت قورئانەکە لەسەر زمانی عەبد وەک کەلامی

عەبد وایە و مەخلوقە، بەڵام بە نسبەت الله قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، هەر بۆیە ئیمام احمد بەم ئایەتە رەددی لەفزییەکانی ئەدایەوە (حتى يسمع كلام الله) واتا ئەوەی ئەبیسترێ لە قورئان کەلامی الله یە کەلامی ئەو کەسە نیە کە قورئانەکە ئەخوێنێت تاکو بووترێ مەخلوقە.

**اللالكائي** لە محمد بن أسلم الطوسي نەقل ئەکات کە وتوویەتی:

هەر کەسێک بڵێ قورئان ئەبێتە مەخلوق بە لەفز، ئەوا پێی وایە قورئان مەخلوقە.

**(شرح أصول اعتقاد : ٥٨٨)**

محمد بن أسلم الطوسي ئیمامێکی گەورەی ئەهلی سوننەیە، ساڵێک دوای ئیمام احمد وەفاتی کردووە.

سەیرکە ئەڵێ هەر کەسێک پێی وابێت (قورئان ئەبێتە مەخلوق بە لەفز)

لەم ووتەیەی ناو کەوانەکە وورد بەوە تێئەگەیت مەزهەبی لەفزییەکان چی بووە، کە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە مەبەستیان ئەوە بوو قورئان لەسەر لەفزی ئێمە ئەبێتە مەخلوق، هەموو رەددی ئەهلی سوننەش بۆ لەفزییەکان لەو ڕووەدا بوو کە کاتێک ئینسان ووتەی کەسێکی تر ئەگەیەنێت ووتەکە هەر هی خاوەنەکەیەتی هی کەسە گەیەنەرەکە نیە، کەلامی الله-ش غەیر مەخلوقە کاتێک عەبدی مەخلوق کەلامی الله ئەگەیەنێت کەلامەکە نابێتە مەخلوق ئەگەرچی کەلامی عەبد مەخلوق

بێت، چونکە عەبد کەلامی الله ئەگەیەنێت کەلامی خۆی نیە، نەفامی واش هەیە بە حیساب عەرەبی ئەزانم ئەڵێ لەفزییەکان ئەیان ووت تلاوتي للقرآن مخلوقة، تلاوة مؤنث-ە، مخلوقة مؤنث-ە، قورئان صیغەی مذکر-ە، گەر لەفزییەکان مەبەستیان مەخلوقی قورئان بوایە ئەیان ووت مخلوق، بە صیغەی مذکر، نەیان ئەووت مەخلوقة، بە صیغەی مؤنث!!!

ئەمە بە حیساب خۆی فش ئەکاتەوە عەرەبی ئەزانێت، بەڵام سوننەتی الله وابووە هەرکەس بیەوێ خۆی فش بکاتەوە الله بە پێچەوانەی مەبەستەکەی ئەگەیەنێت و ڕیسوای ئەکات، ئەمەش بە حیساب زۆر بلیمەتە لە عەرەبی هاتووە صیغەی مؤنث و مذکر فێری خەڵک ئەکات کە ئەمە منالی سەرەتاییش ئەیزانێت، وائەزانێ هاتووە شتێکی زۆر موهیمی کردووە بەڵام لەم کارەیدا دەرکەوت هێندە جاهیلە نە لە مەزهەبی لەفزییەکان حاڵی بووە، نە لە ووتەی منیش حاڵی بووە کەچی ئەڵێم، لە سەرەتایی ترین شتی ئەم بابەتە کێشەی هەیە و حاڵی نەبووە وەک شێخە گەمژەکەی کە وەک مەڕی لێکردوون هەرجارە و لە دەشت و کێوێک ئەیانلەوەڕێنێ، ئاخر نەفامی جاهیل کەس هەیە نەزانێت لەفزییەکان ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە ؟! جاهیلترین کەس کە هیچ لەم بابەتە نازانێت ئەزانێ لەفزییەکان چیان ئەووت، کەس هاتووە بڵێ لەفزییەکان ئەیان ووت قورئان مەخلوقە نەک لەفزمان ؟ تاکو تۆ بێیت فەلسەفە لێ بدەیت باسی مذکر و مؤنث بکەیت ؟! ئاخر گەر لەفزییەکان بە ئاشکرا و ڕاشکاوی بڵێن قورئان مەخلوقە ئەوکات چ فێڵێک بوونی ئەبوو لە ووتەکەیان ؟ بۆچی جەهمیەکان کران بە سێ فرقە: ١- ئەوانەی ئەیان ووت قورئان مەخلوقە، ٢- ئەوانەی توقف-یان ئەکرد، ٣- ئەوانەی ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە،

ئاخر گەر لەفزییەکانیش وەک فرقەی یەکەم بە ئاشکرا و ڕاشکاوی بڵێن قورئان مەخلوقە بۆ بە فرقەیەکی تری جەهمیەکان دائەنران و جیا ئەکرانەوە لە فرقەی یەکەم ؟ تێبگە کە ئەوان ووتەیەکی فێڵاوییان داهێنا بۆ شاردنەوەی کوفرەکەیان کە مەخلوقی قورئان بوو، تێبگە بۆچی ئیمام احمد ئەیووت لەفزییەکان لە جەهمیەکان خراپترن، بۆ ئەیووت لەفزییەکان فێڵ لە خەڵک ئەکەن ؟ بۆ ئەیووت کاتێک تەنگاویان ئەکەیت ئەڵێن قورئان مەخلوقە ؟ ئاخر گەر بە ئاشکرا بڵێن قورئان مەخلوقە چ فێڵێک بوونی ئەبوو لە ووتەکەیان ؟ بۆ جیائەکرانەوە لەوانەی کە ئەیان ووت قورئان مەخلوقە ؟ سەیرکە ابن بطة لە باسکردنی لەفزییەکان ئەڵێ چی:

بزانن ڕەحمەتی الله-تان لێبێ کە بەشێک لە جەهمیەکان بە فێڵی دڵیان و پیسی ڕەئیەکانیان و ناشرینی ئارەزووەکانیان بڕوایان وابوو کە قورئان مەخلوقە، جا ناوێکی تریان لە مەخلوقی قورئان نا بە بیدعەیەک کە دایان هێنا، بۆ فێڵ کردن و چەواشە کردنی خەڵکی عەوام، بۆ ئەوەی کوفرەکەیان بشارنەوە و ئیلحادەکەیان شاراوە و ناڕوون بێت بۆ ئەو کەسانەی کە عیلمیان کەمە و سروشتیان لاوازە، جا ووتیان: (ئەو قورئانەی کە الله قسەی پێکردووە و فەرموویەتی کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە ئەو قورئانەی کە ئێمە ئەیخوێنینەوە بە زمانەکانمان و ئەینوسین لە پەڕاوەکانمان ئەو قورئانە نیە کە کەلامی الله یە، بەڵکو حیکایەتە بۆ ئەو قورئانە بە لەفزی ئێمە، وە لەفزی ئێمەش بە قورئان مەخلوقە) جا کوفرەکەیان وورد و شاراوە کرد، وە فێڵیان کرد بۆ ئەوەی کوفر بخەنە ناو خەڵکیەوە بە ناڕوونترین ڕێگا و ووردترین مەزهەب و شاراوەترین جۆر. (الإبانة الكبرى)

گەر لەم ووتەیەی ابن بطة تێبگەیت ئەزانی ئەم قسە قۆڕانەی کە کردووتە دەربارەی مؤنث و مذکر هیچ نیە جگە لە خۆ فش کردنەوەیەکی مناڵانە، کە دەری خست نە لە مەزهەبی لەفزیەکان تێگەیشتووی کە مەبەستیان چی بووە لەم ووتەیە، نە لە پۆستەکانی منیش حاڵی بووی کە باسی چی ئەکەم، من هەمیشە لە پۆستەکان وتوومە: لەفزیەکان کە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە مەبەستیان مەخلوقی قورئان بوو، سەیرکە ئەڵێم (مەبەستیان) واتا ئەو قسەیەی کە ئەیکەن مەبەستێکی تری لە پشتە کە مەخلوقی قورئان بووە، کە ئەمەی منیش وتوومە هەمان ووتەی ابن بطة یە لەفزیەکان هاتن بە فێڵ ناوێکی تریان لە مەخلوقی قورئان نا، ووتیان لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، کە مەبەستیان مەخلوقی قورئانەکە بوو تاکو کوفرەکەیان شاراوە بێت، ئێوەش پێتان وایە لەفزیەکان تەنها ئەیان ووت فعلی عەبد مەخلوقە قورئانەکە غەیر مەخلوقە! جا وەرن ووتەی خۆتان و ووتەی من بەراورد بکەن لەگەڵ ووتەی ابن بطة کە باسی لەفزیەکانی کرد، بزانن ووتەی کاممان لەگەڵ ووتەکەی ابن بطة یەک ئەگرێتەوە، حەقەکە ڕوونە بۆ کەسێک کە بخوێنێتەوە و شوێنی سەلەف بکەوێ نەک شوێنی ئەم و ئەو بکەوێ بۆ تێگەیشتن لە مەنهەجی سەلەف

ئینجا ئەم دوو جەزائیریە و کلکەکانیان بە حیسابی خۆیان لە کوفری لەفزیەکان ڕائەکەن و لێی بەرین و بە توندی دژایەتی ئەکەن، کەچی ئاگایان لەخۆیان نیە تەسدیقی مەزهەبی لەفزیەکان ئەکەن بەهۆی جەهل و تێنەگەیشتنیان لە باسەکە

لەفزیەکان ئەیان ووت مادام فعلی عەبد و کەلامی عەبد مەخلوقە ئەوا عەبد قورئانیش بخوێنێت و بنوسێت هەر مەخلوقە چونکە عەبد خوێندوویەتی و نوسیویەتی، کەواتە خوێنراو و نوسراوەکەش مەخلوقە کە قورئانە.

دوو جەزائیریەکە و کلکەکانیان هاتن بە لەفزییەکانیان ووت: ئێوە ڕاست ئەکەن قسەکەتان تەواوە، گەر بڵێین فعلی عەبد مەخلوقە قورئانیش ئەبێتە مەخلوق، قسەکەتان هیچ هەڵەیەکی تێدا نیە لەو ڕووەی کە ئەڵێن مادام فعلی عەبد مەخلوقە کەواتە قورئانیش ئەبێتە مەخلوق

ئەی چی بکەین تاکو ئێمەش نەبین بە لەفزی؟

یەک حەل هەیە، ئەویش ئەوەیە نەڵێین فعلی عەبد مەخلوقە، بەم توقف کردنە لە فعلی عەبد خۆمان ئەپارێزین لە مەزهەبی لەفزییەکان، ئەگینا بڵێین فعلی عەبد مەخلوقە ڕێک ئێمەش ئەبین بە لەفزی، چونکە هەر بڵێی فعلی عەبد مەخلوقە ڕاستەوخۆ قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق!

ئەمەیە تێگەیشتنیان بۆ باسەکە بەهۆی سەقەتی فەهمەکەیان بە حیساب هاتن خۆیان لە لەفزییەکان بە دوور بگرن کەچی هاتن لە لایەنێکی ترەوە تەسدیقی مەزهەبی لەفزییەکانیان کرد بەبێ ئەوەی تێبگەن

لە پۆستی پێشوو ریوایەتی ئیمام احمد-مان هێنا کە باسی ئەوە ئەکات ئەوەی لە عەبد دایە قورئانی پێ ئەخوێنێ و ئەنوسێ و ئەبیستێ و حیفز ئەکات و ئەبینێ هەمووی مەخلوقە، بەڵام قورئانەکە لە هەموو ئەم بارانەدا غەیر مەخلوقە، کە الخلال و ابن بطة و السجزي و ابن البناء الحنبلي و قوام السنة الأصبهاني هەموویان ئەم ریوایەتەیان هێنابوو بۆ ڕەددانەوەی لەفزییەکان، کەچی ئێوە هێندە گەمژەن پێتان وایە ئەم ریوایەتە کوفرە و خودی مەزهەبی لەفزییەکانە، ئاخر واللە مرۆڤ نازانێ چی بکات بەرامبەر کەسانێک کە ریوایەتێک بە کوفر ئەزانن و ئەڵێن مەزهەبی لەفزییەکانە کەچی زانایان استدلال بەم ریوایەتە ئەکەن بۆ ڕەددانەوەی لەفزییەکان!

لە یەکێک لە پۆستەکانی پێشوو باسم کرد کە ئیمان شتی مەخلوق و غەیر مەخلوق لەخۆ ئەگرێت، بۆیە ئیمان نە بە مەخلوق نە بە غەیر مەخلوق وەسف ئەکرێ، ووتەی ابن بطة و عبدالغني المقدسي هێنا دەربارەی ئەمە، ابن بطة ووتی: ناووترێ ئیمان مەخلوقە چونکە ئەسلی ئیمان شایەتمانی لا الە الا اللە یە، وە ناووترێ ئیمان غەیر مەخلوقە چونکە قەدەرییەکان ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوق نیە، واتا لەبەر ئەوەی لا الە الا اللە کەلامی اللە یە و مەخلوق نیە ناووترێ ئیمان مەخلوقە، لەبەر ئەوەش فعلی عەبد مەخلوقە ناووترێ ئیمان غەیر مەخلوقە، سەیرکە لێرەدا ابن بطة باسی مەخلوقی فعلی عەبد ئەکات کە لەبەر ئەمەیە ناووترێ ئیمان غەیر مەخلوقە، باشە بۆ گەر بڵێین: (قەولەکە کە لا الە الا اللە یە غەیر مەخلوقە) بەم ووتەیە ئیمان نابێتە غەیر مەخلوق، وە فعلی عەبدیش نابێتە غەیر مەخلوق، بەڵام گەر ووتمان

(فعلى عەبد مەخلوقە) بەم ووتەیە ئیمان ئەبێتە مەخلوق و قەولەکەش ئەبێتە مەخلوق ؟! ئاخر ئێوە بەم مەزهەبەتان ئەبێ ابن بطة بە جەهمی بزانن چونکە ئەو باسی ئەوە ئەکات

لەبەر ئەوەی فعلی عەبد مەخلوقە نابێ بووترێ ئیمان غەیر مەخلوقە، ئێ ئەوەتا ئەویش باسی فعلی عەبدی کرد، بەم ووتەیەی نە لا اله الا الله ئەکاتە مەخلوق و نە ئیمانیش ئەکاتە مەخلوق، هەروەک چۆن کە ئەڵێ لا اله الا الله غەیر مەخلوقە نە ئیمان ئەبێتە غەیر مەخلوق و نە فعلی عەبد ئەبێتە غەیر مەخلوق، ئەم بابەتەی ئیمانیش وەک بابەتی لەفزە کە دوو شت لەخۆ ئەگرێت یەکێکیان مەخلوقە و ئەوی تریان غەیر مەخلوقە، بەڵام داخەکەم چی بکەم لەگەڵ ئەم فەهمەی ئێوە

**احمد بن الحسن الترمذي** ئەڵێ:

پرسیارم لە احمد کرد، ووتم: ئەی باوکی عبدالله ئەوەی ڕوویدا دەربارەی قورئان ڕوویدا، گەر پرسیارم لێکرا دەربارەی قورئان چی بڵێم ؟

پێی ووتم: ئایا تۆ مەخلوق نیت ؟

ووتم: بەڵێ

ووتی: ئایا هەموو شتێک لە تۆدا مەخلوق نیە ؟

ووتم: بەڵێ

ووتی: ئەی قسە کردنت ئەویش لە تۆ نیە و مەخلوق نیە ؟

ووتم: بەڵێ

ووتی: ئەی کەلامی الله عز وجل ئایا لە الله نیە ؟

ووتم: بەڵێ

ووتی: ئایا شتێک هەیە لە الله دا مەخلوق بێت ؟!

**(السنة للخلال : ١٨٣٧)**

بە گوێرەی فەهمی دوو جەزائیریەکە و کلکەکانیان بێت ئیمام احمد ڕێک هەمان قسەی لەفزییەکانی کردووە لەم ریوایەتەدا، ئەوان پێیان وایە لەفزییەکان تەنها ئەیان ووت فعلی عەبد مەخلوقە، ئەگینا قورئانەکە غەیر مەخلوقە، ئێ ئەوەتا ئیمام احمدیش بەم پیاوە ئەڵێ: هەموو شتێک لە تۆدا مەخلوقە، واتا تۆ هەرچی بکەیت هەمووی مەخلوقە، بەڵام قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، پێم بڵێن بە پێی فەهمی ئێوە بۆ بابەتەکە ووتەی ئیمام احمد و لەفزییەکان جیاوازی چیە ؟

پاشان بە پێی فەهمی ئێوە بێت ئەم وەڵامەی ئیمام احمد فیتنەیە بۆ ئەم پیاوە، جۆرێکە لە گومڕا کردنی پیاوەکە، کە حاشا لە ئیمام احمد کاری لەم جۆرە بکات بەڵام بە پێی فەهمی ئێوە ئاوای لێدێت، ئەزانن چۆن ؟

چونکە پیاوەکە پرسیاری قورئان ئەکات لە ئیمام احمد، ئیمام احمد ئەبێ وەڵامێکی بداتەوە دوور بێت لە ووتەی هەموو فرقە کافرەکان، نابێ وەڵامێکی گوماناوی بداتەوە

نزیک بێت لە ووتەی هیچ فرقەیەکی کافر، یان وەڵامەکە بە جۆرێک بێت کەسەکە بە هەڵە لێی حاڵی بێت و توشی کوفری بکات، گەر مەزهەبی لەفزییەکان ئەوە بێت کە ئێوە باسی ئەکەن گوایە تەنها ئەیان ووت فعلی عەبد مەخلوقە قورئان غەیر مەخلوقە، ئەوا نەئەبوایە ئیمام احمد بەم جۆرە وەڵامی پیاوەکە بداتەوە، چونکە وەڵامەکەی مەزهەبی لەفزییەکان بەهێز ئەکات، بەڵکو هەر هەمان وەڵامی ئەوانە بە گوێرەی فەهمی ئێوە! چۆن ئیمام احمد وەڵامێکی لەم جۆرەی ئەداتەوە لە کاتێکدا پیاوەکە پرسیاری لێ ئەکات دەربارەی قورئان، ئەی ئێوە ناڵێن کە باسەکە هاتە سەر قورئان نابێ باسی فعلی عەبد بکرێ ؟ ئەی ئەوەتا ئیمام احمد لە باسی قورئاندا بە پیاوەکە ئەڵێ تۆ مەخلوقی و هەموو شتێک لە تۆدا مەخلوقە، خۆ ئەبوایە لەبەر مەزهەبی لەفزییەکان بڵێ ئاگاداربە لە کاتی قورئان خوێندن و قورئان نوسین ناووترێ هەموو شتێکی عەبد مەخلوقە، گەر ئەمە مەزهەبی لەفزییەکان بوایە ئەبوایە ئیمام احمد ئەم قەیدەی تێبخات بە ڕەهایی نەڵێ هەموو شتێک لە تۆدا مەخلوقە، هەر واز لەم ریوایەتەش بهێنن گەر ئێستا کەسێک بێت ئەم پرسیارە لە ئێوە بکات، کەستان جورئەت ئەکەن بڵێن: هەموو شتێک لە تۆدا مەخلوقە، وە قورئانیش کەلامی الله یە و مەخلوق نیە ؟ نەخێر جورئەت ناکەن، چونکە پێتان وایە خودی ئەم وەڵامە هەمان مەزهەبی لەفزییەکانە، کەچی ئیمام احمد کە پرسیاری لێ ئەکەن دەربارەی قورئان بەم وەڵامە گوماناوییە وەڵام ئەداتەوە، کە ڕەنگە کابرا توشی گومڕایی بکات!!! بە گوێرەی فەهمی ئێوە بۆ مەزهەبی لەفزییەکان، ئینجا وەک ووتمان ئەهلی سوننە بە ڕەهایی ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوقە بەبێ استثناء، گەر بزانن ئەم ووتەیە بە ڕەهایی کوفر لەخۆ ئەگرێت ئەوا قەیدیان تێئەکرد، ئەیان ووت فعلی عەبد هەمووی

مەخلوقە تەنها لە کاتی قورئاندا نابێ بووترێ فعلی عەبد مەخلوقە، ئەسلەن هەر نەئەبوو بڵێن فعلی عەبد مەخلوقە چونکە لە کاتی قورئان خوێندن و قورئان نوسینیش فعلی عەبد بوونی هەیە واتا ئەویش ئەبێتە مەخلوق، لە نەتیجە ئەبێتە هەمان مەزهەبی لەفزییەکان! بۆیە نابێ هەر بووترێ فعلی عەبد مەخلوقە لە هیچ کاتێکدا بە گوێرەی تێگەیشتنی ئێوە بۆ مەزهەبی لەفزییەکان.

جا کەسانێک ئەمە فەهمیان بێت بۆ بابەتەکە نازانیت چیان لەگەڵ بکەیت، لەگەڵ ئەم جەهلەشیان هێشتا ئەوان بە زندیق و جەهمی ناوت ئەبەن، نەخوێندەوارەکانیش کە هیچ لە باسەکە نازانن بەم حوکمانە چەواشە ئەبن ئەڵێن ئەها سەیرکە چەند بە ئازایی و بێ دوو دڵی پێی ئەڵێن زندیق جەهمی، وادیارە کوفرێکی گەورەیان لە ووتەکانی بینیوە بەڵام ئێمە تێناگەین، سەیر ئەکەن منیش بە کەسیان ناڵێم زندیق و جەهمی ئیتر ئەڵێن دیارە ئەوان هیچ کێشەیان نیە بۆیە تەکفیریان ناکات، خۆ ئێمە شەڕە جنێو ناکەین تاکو ئەوان چیان ووت منیش هەمان وەڵامم هەبێت بۆیان، ئاخر قەبر و قیامەت هەیە چۆن لەخۆمەوە بە کەسێک بڵێم جەهمی کە جەهمی نیە، ئەوانەشی کە بە من ئەڵێن جەهمی

ئەزانم لە چ ئاستێکدان بۆیە قسەی هەموویانم خستۆتە ژێر پێم، الحمدلله لە عەقیدەی خۆم دڵنیام ئەوەی نوسیومە لەسەر ئەم بابەتە ٩٥% ووتەی ئیمام احمد بووە، نەهاتوومە لەخۆمەوە شتێک بهێنم، نەبوومەتە کلکی کەسیش بە فەهمی ئەم و ئەو لە کتێبەکانی سەلەف تێبگەم، ئەمڕۆ زۆرینەی خەڵک کەسێکیان کردووە بە

شێخی خۆیان بە فەهمی ئەوان لە کتێبەکانی سەلەف تێئەگەن و ناویان لێناوە مەنهەجی سەلەف، وە ئەوانەی لەم بابەتە بە کافرم ئەزانن هەموویان کلکی دوو جەزائیریەکەن کە ئێستا هەردووکیان عومومین، وە هیچ کەس لەم ئوممەتدا بەم جۆرە باسی مەزهەبی لەفزییەکانی نەکردووە جگە لەم دوو جەزائیریە نەبێت کە گومڕا و مبتدعن هیچ قیمەتێکیان نیە لەلام چ جای کلکەکانیان کە هەمان ووتەی ئەوان دووبارە ئەکەنەوە وەکو ڕۆبۆت.

------------------------------

ماویەتی

## بەشێک

هاتووە پێنج پۆستی لەسەر کردووم

لەم پێنج پۆستەدا بە هەمووی ١٩ ووتە و ڕیوایەتی داناوە کە بەشێکیان پەیوەستن بە کرۆکی بابەتەکە، ئەوانی تری هامشن

بەڵام ئەزانن لەم پێنج پۆستەدا ١٤٢ جار قسەی پێم ووتوە ؟

جا یان وتوویەتی کافر، یان جەهمی، یان زندیق، زندیق وەک لمی بیابانە پرپەتی، یان وتوویەتی ئەولیای شەیتان، یان زەڕناقوت، یان گێل، یان گەمژە، یان پیس و چەپەڵ، یان کوڕی ماکەر (کە ئەمە شاعیرەکانی کۆن کە هەجوی یەکتریان ئەکرد بەکاریان ئەهێنا)، زۆر قسەی تری ناشرین، کە هیچ بەسەر من نایەت بەم قسانەی ئەو تەنها ئەوەیە ئەخلاقی خۆی نیشانمان ئەدات، وە واللّٰه هیچ بەلامەوە سەیر نیە ئەم جۆرە قسانە ببیستم لە عومیەکان چونکە عومیەکان بەبێ ئەدەبی و زمان پیسی ناسراون ئەوەی تۆزێک شارەزایان بێت ئەمە باش ئەزانێت، وە من پێم وایە ئەم ووتانە هیچ نین لە چاو ئەو ووتانەی کە لێمان دیون لە چات و کۆمێنتدا کاتێک کە دەفع ئەبن و

جەویان ئەگیرێ چۆن بە دایک و خوشکی خەڵک هاتوونەتە خوارەوە، وە من ناڵێم ئەوەی یەکێک لەوان ئەمە بکات ئەوا هەموویان ئەگرێتەوە بەڵام بە عام ئەم گروپە بە دوو شت ناسراون: ١- کەم تەمەنی، زۆرینەیان خوار ٢٠ساڵن، بە دەگمەنیان هەیە گەیشتوون بە سەرووی بیست، بەڕاستی زۆر قورسە کەسێک بدۆزیتەوە لەم تۆڕە کۆمەڵایەتیانە پیاوێکی کامل و تەواو بێت و عومومیش بێت، ئەوەی دیومانە لێیان زۆرینەیان هەرزە بوونە، ٢- زمان پیسی و بێ ئەدەبی، بەڕاستی لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان لەگەڵ هەبوونی ئەم هەموو گروپە جیاوازە نەبینراوە وەک ئەوان زمان پیس و بێ ئەدەب، کە ئەمەش نموونەیەکی بچووکە بۆم باسکردن، ئەمانە هێندە زمانیان بە جنێو ڕاهاتووە گەر پێیان شەرم بێت جنێو بدەن ووشەی زندیق و کافر و جەهمی وەک جنێو بەکارئەهێنن، بەجۆرێک پێت ئەڵێن جەهمی هەست ناکەیت حوکمێکی شەرعیە ئەیدات بەسەرت بەڵکو هەست ئەکەی جنێوت پێ ئەدات، ئینجا جار جار ئەچنەوە سەر ڕێچکەی خۆیان و تەحەمولیان نامێنێ لە پاڵ زندیق و جەهمیەکە هەندێک جنێویشی تێئەخەن.

جا ئەم خەڵکەش هێندە داماو و نەخوێندەوارە زۆرینەی بەم هاش و هوشە هەڵئەخەڵەتێ، ئەڵێ سەیرکە دوو دێر جارێک پێی ئەڵێ زندیق، ئەم زندیقە وەکو کۆرسی لێهاتووە دوو دێر جارێک ئەبێ بووترێتەوە، ئەڵێ دیارە ئەمە کافرێکی زۆر پیسە بۆیە ئاوا پێیدا هاتۆتە خوارەوە، لە ترسی ئەم ووشانە بیری لای بەڵگەکان نامێنێت ئێمە چیمان ووتوە و بەڵگەمان چی بووە، ئەوانیش باسی چیان کردووە، ئینجا ئێستا

پێیان بڵێ بۆ وائەکەن ؟ ئەڵێن ئێوە جاهیلن بە کتێبەکانی سەلەف، بڕۆن سەیرکەن بزانن سەلەف چیان بە جەهمیەکان ووتوە!

ئاخر هیچ زانایەکی سەلەف هەبووە لە یەکێک لە کتێبەکانیدا ١٤٢ قسەی جۆراوجۆر بە کەسێک بڵێ، چ جای لە پێنج پۆستدا ؟

# اللفظية (٢٦)



عثمان بن سعيد الدارمي لە ڕەددانەوەی واقفەکان کە توقف ئەکەن لە قورئان ئەڵێ: بینیمان هەموو شتەکان دوو جۆرن: خالق بە هەموو سیفەتەکانیەوە، وە مەخلوقەکان بە هەموو سیفەتەکانیانەوە، خالق بە هەموو سیفەتەکانیەوە غەیر مەخلوقە، وە مەخلوق بە هەموو سیفەتەکانیەوە مەخلوقە، جا سەیری قورئان بکەن گەر لەلای ئێوە قورئان سیفەتی مەخلوقەکانە ئەوا پێویست ناکات گومان بکەن لە مەخلوقەکان و لە کەلامیان و لە سیفاتیان کە هەمووی مەخلوقە هیچ گومانی تێدا نیە.

**(الرد على الجهمية : ١٧٥-١٧٦)**

سەیرکە الدارمي ئەڵێ هیچ گومان نیە لەوەی کە مەخلوقات هەموو شتێکیان مەخلوقە، هەموو شتێک بەبێ استثناء کردن، ئەم ووتەیە لە ڕەددی فرقەیەکی جەهمی باس ئەکات، گەر مەزهەبی لەفزیەکان ئەوە بێت فعلی عەبد مەخلوقە ئەوا الدارمي بەم ووتەیەی مەزهەبی ئەوانی پشتڕاست ئەکردەوە، گەر ئەمە مەزهەبی لەفزیەکان بوایە ئەوا الدارمي هێندە بێ ئاگا نەئەبوو ئاوا بە ڕەهایی ئەم قسەیە بکات

و هیچ قەیدێکی تێنەخات، چونکە سەلەف زۆر وورد بوونە لە دەربڕینی ووتەکان، قسەیەک ناکەن ئەهلی بیدعە و کوفر دەستی پێوە بگرن یان مەزهەبی ئەوان بەهێز بکات .

عثمان بن سعيد الدارمي لە ڕەددانەوەی قوتابیەکەی بشر المريسي کە سیفەتی (وجه = ڕوخسار)ی الله تەئویل ئەکات ئەڵێ (وجه ربك) واتا ئەو کردەوە چاکانەی کە بەندە ئەنجامی ئەدات بەهۆیەوە بەرەو پەروەردگار ئەچێت، ئینجا الدارمي لە ڕەددی ئەم تەئویلەی جەهمیەکە ئەڵێ:

بانگەشەی ئەوەت کرد (وجه الله) کە الله ڕوخساری خۆی بە الجلال و بە الإكرام وەسف کردووە مەخلوقە، چونکە بانگەشەی ئەوەت کرد (وجه الله) کردەوەی مەخلوقە بەندە پێی بەرەو پەروەردگار ئەچێت، وە نیعمەت و ئیحسانە، وە کردەوەکان هەمووی مەخلوقن هیچ گومانی تێدا نیە، جا ڕوخساری پەروەردگارت بە پێی بانگەشەکەی تۆ مەخلوقە.

**بڕوانە (النقض : ٢٧١)**

## اللالكائي :

بابێکی داناوە بە ناونیشانی: (سياق ما فسر من الآيات في كتاب الله عز وجل وما روي من سنة رسول الله صلى الله عليه وسلم في إثبات القدر، وما نقل من إجماع الصحابة

والتابعين والخالفين لهم من علماء الأمة: أن أفعال العباد كلها مخلوقة لله عز وجل طاعاتها ومعاصيها).

**(شرح أصول اعتقاد : ٥٣٤)**

سەیرکە بە ڕەهایی فعلی عەبدەکان بە مەخلوق ناو ئەبات بەبێ استثناء

هەر ئەم اللالكائي-ە لە ڕەددی لەفزییەکان و کوللابیەکان ئەڵێ:

قورئان لە میحرابەکان خوێنراوە، لە موصحەفەکان نوسراوە، لە سینەی پیاوان حیفز کراوە، نە حیکایەت و نە عیبارەتی قورئانە، یەک قورئانە مەخلوق نیە مەجعول نیە مەربوب نیە، بەڵکو سیفەتێکە لە سیفەتەکانی زاتی اللە، اللە لە ئەزەلەوە قسەی کردووە، وە هەر کەسێک جگە لەمە بڵێ ئەوا کافرە گومڕایە گومڕاکەرە مبتدعە موخالفی مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعەیە.

(ئینجا اللالكائي بە ژمارەیەک ئایەت ڕەددیان ئەداتەوە، یەکێک لە ئایەتەکان ئەمەیە: ﴿وَإِنۡ أَحَدٌ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ کە ئیمام احمد زۆربەی کات بەم ئایەتە ڕەددی لەفزییەکانی ئەدایەوە).

**بڕوانە (شرح أصول اعتقاد : ٣٣٠)**

## قوام السنة الأصبهاني:

فەصلێکی داناوە بە ناونیشانی: (في بيان أن أفعال العباد كلها مخلوقة، والله تعالى خلقها بقدرته، وليس للعباد فيها خلق).

**(الحجة في بيان المحجة : ٤١٤/٢)**

الطبري کە باسی لەفزی بەندەکان بە قورئان ئەکات ئەڵێ: نازانین هیچ ئەثەرێک هەبێت لە هاوەڵان و تابعین باسی ئەمەیان کردبێ تەنها ووتەی کەسێکمان لایە دەربارەی ئەم باسە ووتەی ئەویش وەک ووتەی پێشەوایانی سەرەتای ئوممەت وایە، لە شوێنکەوتنی ئەو هیدایەت هەیە ئەویش ئیمام احمدە کە ووتەی ئەومان هەبێت بێ پێویست ئەبین لە کەسانی تر، لە زۆرێک لە هاوەڵەکانم بیستووە کە لە احمد بن حنبل ریوایەت ئەکەن وتوویەتی: ئەوەی بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە جەهمیە، وە ئەوەی بڵی لەفزم بە قورئان غەیر مەخلوقە مبتدعە، وە بەم ئایەتە ڕەددی لەفزیەکانی داوەتەوە (حتى يسمع كلام الله)، وە دروست نیە هیچ قسەیەک بکەین لەم باسە جگە لە قسەکەی ئەو نەبێت چونکە هیچ ئیمامێکمان نیە شوێنی بکەوین لەم بابەتە جگە لە احمد بن حنبل نەبێت، وە ووتەی ئەو بەسە بۆمان.

**(صريح السنة : ٥٠) بتصرف**

سەیرکەن لێرەدا الطبري احمد بن حنبل ئەکات بە ئیمامی خۆی لەم بابەتەدا، ئەڵێ ئێمەش هیچ قسەیەک ناکەین جگە لە قسەی ئەو، چونکە ئەو ئیمامی ئێمەیە و

قسەی ئەو بەسە بۆ ئێمە، وە تەنانەت لە ڕەددەکەی ئیمام احمد تێگەیشتووە کە بە ئایەتی (حتى يسمع كلام الله) ڕەددی داونەتەوە، واتا ئەوەی ئەبیسترێ لە عەبد کەلامی الله یە نەک ببێتە کەلامی عەبد مادام عەبد لەسەر زمانی خۆی دەری ئەبڕێ.

ئینجا الطبري خۆشی ڕەددی لەفزییەکان ئەداتەوە بە هەمان ڕەددی زانایانی تری ئەهلی سوننە، بڕوانە ئەم ووتەیەی خوارەوە

**الطبري** ئەڵێ:

قورئان کەلامی الله یە غەیر مەخلوقە، چۆن بنوسرێ و لەهەر کاتێک بخوێنرێ، وە لەهەر جێگایەک بخوێنرێ، لە ئاسماندا بێت لە زەویدا حیفز بکرێ، لە لەوحی مەحفوز نوسرا بێت، لە لەوحی تەختەی مناڵان نوسرا بێت، لە بەردا نەخش کرا بێ، لە کاغەزدا نوسرا بێت، یان لە دڵدا حیفز کرا بێت، وە بە زمان دەربڕا بێت، هەر کەسێک جگە لەمە بڵێت یان بانگەشەی ئەوە بکات قورئانێک لە زەوی هەیە یان لە ئاسمان هەیە جگە لەم قورئانە کە بە زمانەکانمان ئەیخوێنینەوە و لە پەڕاوەکانماندا ئەینوسین، یان ئەم بیروباوەڕەی هەبێت لە دڵدا یان لە ناخی خۆیدا حەشاری بدات یان بە زمانی خۆی ئەم بیروباوەڕە دەربڕێت و بڕوای پێ بێت، ئەوا ئەم کەسە کافرە بە الله و خوێنی حەلالە، بەرییە لە الله، الله-ش لەو بەرییە بەم ووتەیەی الله عز وجل: ﴿بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ - فِى لَوْحٍ مَّحْفُوظٍۭ﴾ [البروج: ٢١-٢٢]، وە الله عز وجل

فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٦]، الله جل ثناؤه هەواڵیدا کە قورئان لە لەوحی مەحفوزدا نوسراوە، وە لە زمانی محمد صلى الله عليه وسلم بیستراوە، هەر یەک قورئانە لە محمد صلى الله عليه وسلم بیستراوە، لە لەوحی مەحفوز نوسراوە، وە بە هەمان شێوە لە سینەدا حیفز کراوە، بە زمانی پیر و گەنجەکان خوێنراوە، جا هەر کەسێک لە ئێمە ڕیوایەت بکات یان لە ئێمە بگێڕێتەوە یان درۆ بە دەممانەوە بکات و بڵێ ئێمە شتێکی ترمان ووتوە جگە لەمە، ئەوا لەعنەت و غەزەبی الله ی لەسەر بێت، وە لەعنەتی لەعنەت کەران و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەر بێت.

**(صريح السنة : ٢٩-٣١)**

سەیرکە لێرەدا ڕەددی الطبري بۆ لەفزییەکان هەمان ڕەددی زانایانی تری ئەهلی سوننەیە، باسی ئەوە ئەکات قورئانەکە لە هەموو بارێکدا هەر غەیر مەخلوقە بنوسرێ بخوێنرێ و حیفز بکرێ ببیسترێ، تەنانەت بە هەمان ئایەت ڕەددیان ئەداتەوە کە ئیمام احمد ڕەددی پێ ئەدانەوە (حتى يسمع كلام الله) وە تەکفیری لەفزییەکان ئەکات و خوێنیان حەلال ئەکات، مەحاڵە بووترێ: الطبري نەیزانیوە مەزهەبی لەفزییەکان چیە، لێیان تێنەگەیشتووە لەخۆیەوە تەکفیریان ئەکات هەر نازانێ لەفزییەکان کێن و چیان ووتوە، مەحاڵە ئەمە چونکە بە هەمان شێوەی ئیمام احمد ڕەددیان ئەداتەوە، دەی سەیرکەن هەر الطبري بزانن چی ئەڵێ لە خوارەوە

**الطبري** ئەڵێ:

هیچ گومان نیە لەوەی ئەو کەسەی پێی وابێت کەلامی الله بە تیلاوەی ئەو کاتێک ئەیخوێنێتەوە، وە بە حیفزی ئەو کاتێک حیفزی ئەکات، یان بە نوسینی ئەو کاتێک ئەینوسێت، ئەگۆڕێت بۆ شتێکی تازە و مەخلوق، ئەوا ئەم کەسە کافرە بە الله -تعالی ذکرە-.

(لێرەدا باسی ئەوە ئەکات قورئان بە خوێندنەوەی لەلایەن خەڵکی یان بە حیفز کردنی لەلایەن خەڵکی یان بە نوسینی لەلایەن خەڵکی نابێتە مەخلوق، ئەوەی پێی وابێت لەم کاتانەدا قورئان ئەبێتە مەخلوق ئەوا کافرە)

پاشان ئەڵێ:

وە بە هەمان شێوە گەر گومانی هەبێت کە کەلامی الله غەیر مەخلوقە، بە خوێندراوی بێت یان بە حیفزکراوی بێت یان بە نوسراوی بێت، هەروەک چۆن گەر کەسێک بڵێ: بەدیهێنەری شتەکان بە باسکردنی من، یان بە ناسینی من، یان بە نوسینی من، ئەگۆڕێت بۆ دروستکراو نەک دروستکەر بێت، ئەوا گومان نیە لە کوفرەکەی.

(لێرەدا باسی ئەوە ئەکات هەر کەسێک گومانی هەبێت لە غەیر مەخلوقی کەلامی الله کاتێک ئەخوێنرێ یان حیفز ئەکرێ یان ئەنوسرێ ئەوا کافرە، بە هەمان شێوە ئەو کەسەش کافرە کە پێی وایە خالق بە باسکردنی لەلایەن مەخلوق ئەبێتە مەخلوق)

پاشان ئەڵێ:

وە بە هەمان شێوە گەر گومان بکات لەوەی کە الله ئەگۆڕێت لەو سیفەتانەی کە هەیەتی بە باسکردنی الله لەلایەن کەسێک، یان بە عیلم هەبوونی کەسێک پێی، یان بە نوسینی ناوی الله لەلایەن نوسەرێک، ئەوا کافرە.

(لێرەدا باسی ئەوە ئەکات هەر کەسێک گومان بکات لەوەی کە الله سیفەتەکانی ئەگۆڕێت بە باسکردنی یان بە نوسینی یان بە عیلم هەبوون پێی ئەوا کافرە، واتا گەر بڵێی نازانم کاتێک من باسی ئەکەم یان ناوی ئەنوسم سیفەتەکانی ئەگۆڕێن یان نا، گومانت هەبێ لێی ئەوا کافری، بەڵکو ئەبێ یەقینت هەبێ کە الله بە خۆیی و سیفەتەکانی هەرگیز ناگۆڕێن ئەگەرچی کەسێکی مەخلوق ناوی الله ببات یان بینوسێت یان ئاشنا بێت بە الله و بە سیفەتەکانی)

پاشان ئەڵێ:

وە بە هەمان شێوە گەر پێی وابێت سیفەتێک لە سیفەتەکانی الله ئەگۆڕێت بە باسکردنی لەلایەن کەسێکەوە، یان بە زانینی لەلایەن کەسێکەوە، یان بە نوسینی نوسەرێک، یان گومانی هەبێت لەوەی کە نابێت گۆڕان بەسەر سیفەتەکەدا بێت کە الله -تعالى ذكره- لە ئەزەلەوە پێی وەسف کراوە.

(لێرەدا باسی ئەوە ئەکات هەر کەسێک پێی وابێ سیفەتێک لە سیفەتەکانی اللہ ئەگۆڕێت کاتێک سیفەتەکە لەلایەن کەسێکەوە باس ئەکرێت یان کەسێک سیفەتەکە ئەناسێت یان سیفەتەکە ئەنوسێت، یان گومانی هەیە نازانێت سیفەتەکانی اللہ ئەگۆڕێن یان نا، ئەوا ئەویش بە هەمان شێوە کافرە، چونکە ئەبێ بە یەقینەوە بزانرێ کە اللہ بەخۆی و سیفەتەکانی هەرگیز ناگۆڕێن لە هیچ بارێکدا نابن بە مەخلوق)

پاشان ئەڵێ

هەروەک چۆن نابێت کەلامی اللہ عز وجل بگۆڕێت بۆ مەخلوق بە خوێندنەوەی قورئانخوێنێک، یان بە نوسینی نوسەرێک، یان بە حیفز کردنی حافزێک، یان دروستکەر بگۆڕێت بۆ دروستکراو، یان غەیر مەخلوق ببێتە مەخلوق بەهۆی باسکردنی لەلایەن مەخلوقێکی دروستکراو، بە هەمان شێوەش ناکرێ قیرائەی قورئانخوێن یان تیلاوەی یان حیفزکردنی قورئان ببێتە قورئان یان ببێتە کەلامی اللہ -تعالی ذکرە- بەڵکو قورئانەکە ئەخوێنرێ و ئەنوسرێ و حیفز ئەکرێ، هەروەک چۆن الرب جل جلالە ئەپەرسترێ و یاد ئەکرێ، وە شوکر کردنی بەندە بۆ پەروەردگاری بریتیە لە عیبادەت کردنی بۆی، وە زیکر کردنی بەندە بۆ اللہ جیایە لە اللہ، وە ئەوەی گومانی لەمە هەبێت گومان نیە لە کوفرەکەی.

(لێرەدا باسی ئەوە ئەکات هەروەک چۆن قورئان نابێتە مەخلوق کاتێک عەبدێکی مەخلوق ئەیخوێنێت و حیفزی ئەکات و ئەینوسێت، بە هەمان شێوە فعلی عەبدەکەش نابێتە قورئان و جیایە لە قورئانەکە)

پاشان ئەڵێ:

جا هەروەک چۆن ئەمە ئاوا بوو، بە هەمان شێوە ئەو کەسەی کە پێی وایە شتێک لە فعلی بەندەکان یان جگە لەویش لە شتە مەخلوقەکان غەیر مەخلوقن، یان دروست نەبوونە بە دروستکردنیان لەلایەن الله جل ثناؤە، ئەوا ئەم کەسە کافرە.

(لێرەدا بە ڕوونی باسی مەخلوقی فعلی عەبد ئەکات، ئەم ووتانەی الطبري هەمووی لە پاڵ یەکتردا هاتووە بابەتی جیاواز نین، هەمووی یەک بابەتە لە دوو لاپەڕدا باسی کردووە بەیەکەوە، بەڵام بۆیە بەش بەشم کرد تاکو لە ووتەکانی تێبگەن، ئەگینا ووتەکانی هەمووی بەیەکەوە هاتووە بە دوای یەکتر)

**(التبصير في معالم الدين : ١٥٠-١٥١)**

مەحاڵە قەناعەت بەخۆت بکەیت کە الطبري هاتووە تەکفیری لەفزییەکان ئەکات و خوێنیان حەلال ئەکات، کەچی خۆشی هاتووە هەمان قسەی ئەوان دووبارە ئەکاتەوە! ئەمە وەکو ئەوە وایە مەدخەلیەکان لەسەر شتێک تەکفیر بکەیت و خوێنیان حەلال بکەیت کەچی خۆشت هەمان ئەو شتە بکەیت کە مەدخەلیەکانت لەسەر تەکفیر کردووە!!!

گەر مەزهەبی لەفزییەکان بەم جۆرە بێت کە من باسم کردووە لە پۆستەکان، ئەوا ئەم ووتەیەی الطبري هیچ کێشەیەک و دژبەیەک بوونی تێدا نیە، لەفزییەکان تەکفیر ئەکات و پێشی وایە فعلی عەبد مەخلوقە لە هەموو کاتێک، بەڵام گەر مەزهەبی لەفزییەکان بەو جۆرە بێت کە دوو جەزائیریەکە باسی ئەکەن ئەوا ئەبێ بڵێین: الطبري خوێنی لەفزییەکانی حەلال کرد پاشان خۆی هەمان قسەی لەفزییەکانی کرد!!! چونکە دوو جەزائیریەکە پێیان وایە لەفزییەکان تەنها ئەیان ووت فعلی عەبدەکە مەخلوقە کاتێک قورئان ئەخوێنێ قورئانەکە غەیر مەخلوقە کە عەبد ئەدای ئەکات! ئێ کەواتە الطبري هات تەکفیری کردن لەسەر ئەمە، پاشان هەر خۆی هەمان قسەی ئەوانی کردووە!!! ئەمە ئەچێتە عەقڵەوە ؟! الطبري و اللالكائي و قوام السنة و ابن البناء الحنبلي و السجزي و ابن بطة و الخلال و غەیری ئەوانیش تەکفیری لەفزییەکان بکەن کەچی هەر خۆیان هەمان کوفری لەفزییەکان دووبارە بکەنەوە یان بیدەنە پاڵ ئیمام احمد؟!!! یان باسەکە بەم جۆرە نیە کە ئێوە تێیگەیشتوون بەڵکو مەبەستی لەفزییەکان مەخلوقی قورئان بوو کوفرەکەیان لە پەنای ئەم ووتەیە حەشار ئەدا وەک ابن بطة باسیکرد، بۆیە ولله الحمد ئەوەی من باسم کردووە دەربارەی مەزهەبی لەفزییەکان ڕێک دەقاو دەق هەمان باسکردنی ابن بطة یە بۆ مەزهەبی لەفزییەکان، بەڵام دوو جەزائیریەکە جورئەت ناکەن ووتەکەی ابن بطة بهێنن کە چۆن باسی لەفزییەکان ئەکات چونکە فەهمی ابن بطة بۆ مەزهەبی لەفزییەکان تەواو جیاوازە لە فەهمی دوو جەزائیریەکە

### عثمان بن سعيد الدارمي ئەڵێ:

الله عز وجل فەرموویەتی: ﴿قُل لَّوْ كَانَ ٱلْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّى لَنَفِدَ ٱلْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّى وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِۦ مَدَدًا﴾ [الكهف: ١٠٩]، وە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ﴾ [لقمان: ٢٧]، الله ڕاستی کرد، وە رسول الله صلى الله عليه وسلم گەیاندی، گەر ئاوی دەریاکانی ئاسمانەکان و زەوی و کانیاوەکانی کۆ بکرێنەوە، وە دارەکانی زەوی ببڕدرێن و بکرێن بە قەلەم، ئەوا ئاوەکان تەواو ئەبوون و قەلەمەکان ئەشکان پێش ئەوەی ووتەکانی الله تەواو بێت، چونکە ئاوەکان و دارەکان مەخلوقن، الله لەناو چوونی لەسەر نوسیوە لە کاتی تەواو بوونی کاتەکەی، وە الله حي-ە نامرێت، وە ووتەکانی تەواو نابن، وە بەردەوام قسە ئەکات دوای دروستکردنی مەخلوقات هەروەک چۆن

لە ئەزەلیشەوە قسەی کردووە پێش دروستکردنی مەخلوقات، جا مەخلوقێکی لەناو چوو کەلامی خالقی باقی تەواو ناکات کە پچڕانی بۆ نیە لە دونیا و ئاخیرەتدا.

**(الرد على الجهمية : ١٤٢)**

الله تعالى لەم دوو ئایەتەدا باسی ئەوە ئەکات گەر هەرچی ئاوی زەوی هەیە بکرێت بە حیبر، وە هەرچی دار هەیە لە زەوی بکرێت بە قەلەم، پاشان بەم حیبرانە و قەلەمانە کەلامی الله تعالى بنوسنەوە ئەوا حیبرەکان و قەلەمەکان تەواو ئەبن بەڵام کەلامی الله هەرگیز تەواو نابێت، جا لێرەدا الدارمي کە باسی ئەم دوو ئایەتە ئەکات ئەڵێ بۆیە ئاوەکان کە کراون بە حیبر، وە دارەکان کە کراون بە قەلەم تەواو ئەبن چونکە

مەخلوقن الله لەسەری نوسیون کە لەناو ئەچن، پاشان ئەڵێ: شتێکی مەخلوقی لەناو چوو کەلامی خالق تەواو ناکات کە باقیە، کە مەبەستی لە مەخلوقە لەناو چووەکە حیبرەکان و قەلەمەکانە، سەیرکە دوای نوسینی کەلامی الله بەم حیبر و قەلەمانە بە مەخلوق وەسفیان ئەکات، چونکە حەتمەن تاکو نوسینیان پێ نەکرێ تەواو نابن، ئەگەر ئەم ووتەیە کوفر بێت کە حیبر و قەلەمێک کەلامی الله ی پێ بنوسرێ بڵێی ئەم حیبر و قەلەمە مەخلوقە، ئەوا نابێت لە کاتی ئەگەریشدا ئەم کوفرە بکەیت، ئەگەرچی ئایەتەکە ئەگەرە بە حەقیقی ئەمە ڕووی نەداوە بەڵام گەر ڕوودات بەو جۆرە دەرئەچێ کە الله باسیکردووە، جا الدارمي وا باسی ئەکات کە ئەگەرەکە ڕوویداوە کەچی بە مەخلوق وەسفی ئەکات دوای ئەوەی کەلامی الله ی پێ نوسراوە، بە پێی عەقیدەی دوو جەزائیریەکە بێت الدارمي لە کتێبی (الرد على الجهمية) خۆی بووەتەوە جەهمی و کوفر ئەکات ئەمە بە حیساب ڕەددی جەهمیەکان ئەداتەوە!

**اللالكائي** ئەڵێ:

فەرمایشتی الله: ﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِي ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ﴾ مەخلوقات هەموویان تەواو ئەبن و لەناو ئەچن، وە ووتەکانی الله لەناو ناچن.

الله ئەفەرمووێ: گەر دارەکانی زەوی قەلەم بوونایە، وە لەگەڵ دەریاکانی زەوی حەوت ئەوەندەی تریش دەریا ببوان بە حیبر، ئەوا قەلەمەکان ئەشکان و دەریاکان تەواو

ئەبوون پێش ئەوەی شتە سەیرەکانی پەروەردگار و حیکمەتی و ووتەکانی و عیلمی تەواو بێت.

**بڕوانە (شرح أصول اعتقاد : ٢٢٠)**

**قوام السنة الأصبهاني** ئەڵێ:

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هاوەڵەکانم وەک ئەستێرە وان، هەر کامێکیان بکەن بە پێشەنگ و شوێنی بکەون هیدایەت وەرئەگرن)، کەسانێک وازیان هێنا لە شوێنکەوتن و سیفەتەکانی الله-یان قیاس کردە سەر شتی تر بە عەقڵی خۆیان، جا گومڕا بوون و خەڵکیشیان گومڕا کرد، یەکێک لە ووتەکانیان کە بە کەم عەقڵی خۆیان و قیاسە باطلەکانیان وتوویانە ئەمەیە: (هەروەک چۆن الله تعالى لە دونیادا نیە، بە هەمان شێوە سیفەتەکانی لە دونیادا نیە)، مەبەستیان ئەوەیە موصحەفەکان قورئانیان تێدا نیە، وە ئەو قورئانەی کە ئەینوسین تەنها حیبرێکە کاغەزی سپی پێ ڕەش ئەکەین.

وە ووتیان: (هەروەک چۆن الله تعالى لە دڵماندا نیە، بە هەمان شێوە سیفەتی الله لە دڵماندا نیە)، مەبەستیان ئەوەیە قورئان لە سینەدا نیە، وە ئەوەی کە ئەیخوێنین قورئان نیە بەڵکو عیبارەت و حیکایەتی قورئانە، وە هەر کەسێک ئەمە بڵێ ئەوا بە ڕاشکاوی وتوویەتی قورئان دانەبەزیوە.

وە مەزهەبی ئەهلی سوننە ئەمەیە: اللّٰه تعالی کەلامێکی غەیر مەخلوقی بۆ گوێگران دەرخستووە لە زمانی مەخلوقەوە و فعلی مەخلوقەوە کە بریتیە لە جوڵەی زمانەکان، وە بە هەمان شێوە لە حیبرێکی مەخلوق و کاغەزێکی مەخلوق و قەلەمی مەخلوقەوە کەلامێکی غەیر مەخلوق دەرئەخات بەبێ چۆنیەتی.

وە ووتیان: ئێمە هەندێک جار دەنگێکی خۆش ئەبیستین، وە هەندێک جار دەنگێکی ناخۆش ئەبیستین، وە هەندێک جار دەنگێکی بەرز ئەبیستین، وە هەندێک جار دەنگێکی نزم ئەبیستین، پێیان ئەووترێ: اللّٰه لە زمانی مەخلوق و جوڵەی مەخلوقەوە قورئانی غەیر مەخلوقی دەرخستووە، وە بە هەمان شێوە لە حیبری مەخلوق و فعلی مەخلوقەوە کەلامی غەیر مەخلوقی دەرخستووە بەبێ چۆنیەتی، اللّٰه تعالی صیفەتەکانی دەرئەخات لەهەر شوێنێک بیەوێت، چۆنی بوێت، بەو جۆرەی کە بیەوێت.

**(الحجة في بيان المحجة : ٢ / ٤٤٦-٤٤٧)**

قوام السنة لەم کتێبەیدا لە چەندین شوێنی جیاواز ڕەددی لەفزییە مەخلوقیەکان ئەداتەوە و تەکفیریان ئەکات، وە لە هیچ شوێنێک باسی لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان ناکات چونکە خۆشی لەوانە وەک پێشتر باسم کرد، ئەم کەسە لە ١٤ شوێنی کتێبەکەی ڕەددی لەفزییەکان ئەداتەوە بەڵام بە پێی فەهمی دوو جەزائیریەکە و کلکەکانیان، (نا چیتر ناڵێم کلکەکانیان چونکە ئەوان فەهمیان نیە تەنها فەهمی شێخەکانیان وەک توتی دووبارە ئەکەنەوە بۆیە چیتر باسی کلکەکانیان ناکەم) جا بە گوێرەی فەهمی دوو جەزائیریەکە بۆ مەزهەبی لەفزییەکان ئەم قوام السنة یە خۆی

شین و مۆر کردۆتەوە هاتووە ڕەددیان ئەداتەوە و کتێبەکەی پڕ کردووە لە ڕەددانەوەی لەفزییەکان، کەچی فرێ بەسەر مەوزوعەکەوە نیە نازانێ لەفزییەکان کێ بوونە و چیان ووتوە، ئەوەتا هاتووە هەمان ووتەی لەفزییەکانی دووبارە کردۆتەوە، یەعنی ١٤ جار هاتووە ڕەددیان ئەداتەوە کەچی ناشزانێ مەزهەبیان چی بووە لەخۆیەوە قسە ئەکات لەسەریان!!! بە بەڵگەی ئەوەی هاتووە هەمان قسەی ئەوانی دووبارە کردۆتەوە! ئێ بە گوێرەی فەهمی دوو جەزائیریەکە بێت وای لێدێت، چونکە لەلای ئەوان مەزهەبی لەفزییەکان ئەوە نیە کە ابن بطة و غەیری ئەویش باسیان کردووە، بەڵکو مەزهەبی لەفزییەکان ئەوە بوو ئەیان ووت فعلی عەبد مەخلوقە کاتێک قورئان ئەخوێنێ، وە قورئانەکە غەیر مەخلوقە، ئەی کەواتە گەر ئەمە مەزهەبیان بووە چۆن قوام السنة تەکفیریان ئەکات و کەچی هەمان قسەی ئەوانیش دووبارە ئەکاتەوە ؟!!! یەعنی کەس تێنەگەیشت لە مەزهەبی لەفزییەکان جگە لەم دوو جەزائیریە نەبێت ؟ پاشان ئەوان ئەڵێن گەر ووتت حیبر و کاغەز مەخلوقە ئەوا وەکو ئەشعەریەکان کافریت قورئانت کردووە بە مەخلوق، سبحان الله قوام السنة لەم کتێبەدا خۆی ڕەددی ئەم کوفرەی ئەشعەریەکان ئەداتەوە کە باسی حیکایەت و عیبارەتی قورئان ئەکەن، ئەڵێ بە قسەکەی ئێوە بێت موسحەف هیچی تێدا نیە جگە لە حیبر و کاغەز، بە ڕاستی سەیرە خۆی ڕەددی ئەشعەریەکان ئەداتەوە و تەکفیریان ئەکات کەچی هەر خۆی هەمان قسەی ئەوان ئەکاتەوە ؟!!! ئایا یەک زانا وتوویەتی ئەشعەریەکان لەبەر ئەوە کافر بوون چونکە ئەیان ووت کاغەز و حیبرەکە مەخلوقە ؟ یان لەبەر ئەوە تەکفیر کران چونکە ئەیان ووت ئەم قورئانەی زەوی عیبارەتە لە کەلامی نەفسی الله ؟ لە نەتیجە قسەکەیان وای لێدێت ئەوەی لە موسحەف دایە

کاغەز و حیبر و کەلامی ئینسانە کە عیبارەتە لە کەلامی نەفسی الله، کەواتە قورئان مەخلوقە، ئایا کێشەی ئەهلی سوننە لەگەڵ ئەشاعیرە لەسەر مەخلوقی کاغەز و حیبرەکە بوو یان لەسەر ئەوە بوو ئەیان ووت ئەوەی لە موسحەف دایە کەلامی الله نیە بەڵکو عیبارەتە لە کەلامی نەفسی الله ؟ والله گەر بە مەخلوقی کاغەز و حیبر کافر بیت ئەوا زانایانی ئەم ئوممەتە خیانەتیان کردووە چونکە دوو سێ زانا هەڵنەکەوتووە بە ڕاشکاوی بڵێن: هەر کەس بڵێ کاغەز و حیبر و فعلی عەبد مەخلوقە لەکاتی قورئانخوێندن و نوسین ئەوا کافرە، ئاخر خەڵکی بە دەستی خۆیان کاغەز و حیبر دروست ئەکەن یەعنی هەر بیدائی لە مێشکیان چەسپاوە کە ئەمە دروستکراوی دەستی خۆیانە، گەر دوای نوسینی قورئان بەم حیبرە لەم کاغەزەدا کوفر بێت بڵێی حیبر و کاغەزەکە مەخلوقن ئەوا زانایان دونیایان پڕ ئەکرد لە بڵاوکردنەوەی ئەمە و ئاگادارکردنەوەی خەڵک لێی، کەچی نابینین دوو زانا لە هەموو سەلەف و خەلەف هەبن کە بڵێن دوای نوسینی کەلامی الله کوفرە بووترێ حیبرەکە مەخلوقە یان کاغەزەکە مەخلوقە، یان لەبەر ئەوەی هەموو خەڵکی عەوام وەک ناوی خۆیان باش ئەزانن کاغەز و حیبرەکە پێیان ناووترێ مەخلوق بۆیە یەک زانا باسی ئەمەی نەکردووە، تەنها دوو جەزائیریە نەفامەکە نەبێت کە ڕەنگە جەماعەتەکەیان بە مجددی ئەم سەدەیەی بزانن، تەنها ووتەی الذهلي-ان بە دەستەوەیە کە ئەڵێ ئەوەی باسی حیبر و کاغەز و دەنگی عەبد بکات بیدعەیە، ئەوەشی بڵێ قورئانەکە مەخلوقە جەهمیە، خۆ الذهلي ئەڵێ ئەوەی باسی ئەم تەفسیلانە بکات بیدعەیە، وە هەرکات ووتی قورئان مەخلوقە ئەوا جەهمیە، واتا بەم تەفسیلە تەکفیر ناکات بەڵکو تەبدیع ئەکات بەڵام کە ووتی قورئانەکە مەخلوقە ئەوکات جەهمیە و کافرە، بەڵام ئەمانە

هێندە حەزی تەکفیر بەسەریاندا زاڵە گەڕان و سوڕان ووتەی یەک زانایان نەدۆزیەوە خزمەت بە بیدعەکەیان بکات کە بڵێن بەم ووتانە تەکفیری خەڵک ئەکەین هاتن دەستیان گرت بەم ووتەیەی الذهلي کە باسی تەبدیع ئەکات نەک تەکفیر، ئینجا ئێستا لەخۆیانەوە ئەڵێن ئەم بیدعەیە موکەفیرەیە کە الذهلي باسی کردووە، ئاخر لە ووتەکەیدا دیارە ئەم دووانە دوو شتی جیاوازن لازمی یەکتر نین، ئەوان ئەڵێن کە ووتت کاغەز و حیبر مەخلوقە ئەوا قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق، کەچی الذهلي ئەڵێ ئەوەی باسی حیبر و کاغەز بکات بیدعەیە، وە هەر کەس بڵێ قورئان مەخلوقە ئەوا جەهمیە، گەر مەخلوقی حیبر و کاغەز یەکسان بێت بە مەخلوقی قورئان ئەوا الذهلي ئەیووت هەر کەسێک بڵێ کاغەز و حیبر مەخلوقە ئەوا وتوویەتی قورئان مەخلوقە، بەڵام الذهلي بە جیا باسیان ئەکات بۆ ئەوەی یەکەم تەبدیع بەکاردێنێ بۆ هی دووەم تەکفیر، ئەمە لە کاتێکدایە کە ووتەکەی الذهلي خۆی کێشەی تێدایە، وە الذهلي یەکێک بووە لەوانەی کە دراوەتە پاڵ لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان، کە لە پۆستەکانی دواتر ان شاء الله ئەچمە سەر ووتەکەی الذهلي ئیشکالی ووتەکەی و سەقەتی تێگەیشتنی ئەم جاهیلانە ئەخەمە ڕوو کە استدلال بەم ووتەیە ئەکەن.

-------------------------------

ماویەتی

# بەشێک

گەر تۆ قورئان بخوێنێت

کەسێک پێت بڵێ: دەنگت ناخۆشە

منیش لێت بپرسم: ئەم کەسە مەبەستی قورئانەکە بوو کە ووتی ناخۆشە، یان مەبەستی دەنگی تۆ بوو ؟

ئەوا بێگومان ئەڵێی: مەبەستی دەنگی من بوو نەک قورئانەکە

دەی لێرەدا قورئانەکە هەر بە دەنگی تۆ بیستراوە، چۆن دەنگی خۆت و قورئانەکەت لە یەکتر جیاکردەوە لە وەڵامی پرسیارەکەم، ئاواش لە یەکتری جیا بکەوە کاتێک ئەووترێ عەبد بە دەنگە مەخلوقەکەی خۆی کەلامی اللّٰە ئەگەیەنێت کە غەیر مەخلوقە

یەعنی کە ئەووترێ دەنگی عەبد مەخلوقە و کەلامی اللّٰە غەیر مەخلوقە عەبد بە دەنگی خۆی ئەدای ئەکات، چاوەڕێ مەکە دەنگەکە و کەلامەکە وەکو دوو شتی مەلموس بخەمە ناو دەستی ڕاست و چەپم، بڵێم ئەوەی ناو دەستی ڕاستم کەلامی اللّٰە یە و مەخلوق نیە، ئەوەی ناو دەستی چەپم دەنگی عەبدە و مەخلوقە! پەنا بە اللّٰە،

نەفامی وا هەیە تاکو ئێستا لە حەقیقەتی سیفەتی کەلام تێنەگەیشتووە کە وجودی کەلام چۆنە، ئەڵێ کوا نیشانم بدە کامەی دەنگی عەبدەکەیە و مەخلوقە، وە کامەی کەلامی الله یە و غەیر مەخلوقە!!! ئێ ئەمە قسەی کەسێکە هەر لە حەقیقەتی کەلام تێنەگەیشتووە بۆیە ئەم قسەیە ئەکات، ئەیەوێ کەلام وەکو دار و بەرد بخەیتە ناو دەستت نیشانی بدەیت بڵێی ئەمە کەلامەکەیە!

گەر ئێستا من ووتەی شاعیرێک بخوێنمەوە بە دەنگی خۆم، خەڵکی بڵێن بەڕاستی دەنگت زۆر ناخۆشە، ئەم وەسفەی خەڵک تەنها دەنگی من ئەگرێتەوە نەک کەلامی شاعیرەکە کە بە دەنگی من بیستراوە

وە ئەگەر من ووتەی کەسێکتان پێ بگەیەنم بە دەنگی خۆم، ئێوەش ڕقتان لە ووتەکە بێت و بە هەڵەی بزانن، بڵێن: ئەمە ووتەیەکی زۆر هیچ و بێ مانایە، ئەوا ئەم وەسفەی ئێوە تەنها کەلامی کەسەکە ئەگرێتەوە نەک دەنگی من

وە ئەوەی من باسم کرد ڕوونە لای هەموو کەسێکی عاقڵ، یەعنی تەنها عەقڵی سەلیم بێت بەسە بۆی کە لەمە تێبگات

جا کاتێک لەم نموونانە تێگەیشتی توانیت کەلامی کەسەکە و دەنگی گەیەنەرەکە لە یەکتر جیا بکەیتەوە بەبێ ئەوەی لە واقعدا دوو شتی مەلموسی جیاواز لەناو دەستت بێت و بڵێی ئەمەیان کەلامی کەسەکەیە و ئەمەشیان دەنگی گەیەنەرەکەیە، گەیاندنی کەلامی الله-ش بە دەنگی عەبد هەر هەمان شتە، دەنگەکەی تۆ مەخلوقە کەلامی الله-ی پێ ئەگەیەنیت کە غەیر مەخلوقە، هەروەک چۆن گوێت مەخلوقە و کەلامی غەیر مەخلوقی الله ئەبیستێ، وە دڵت مەخلوقە و کەلامی غەیر مەخلوقی الله حیفز

ئەکات، وە دەستت مەخلوقە و کەلامی غەیر مەخلوقی الله ئەنوسێ، وە چاوت مەخلوقە و کەلامی غەیر مەخلوقی الله ئەبینێ، ئاواش دەنگت مەخلوقە و کەلامی غەیر مەخلوقی الله ئەگەیەنێت، کە هەر ئەمەش تەفسیلەکەی ئیمام احمدە کە لە پۆستی ژمارە (٢٤) باسم کرد، کە الخلال و ابن بطة و جگە لەوانیش ریوایەتیان کردووە و لێی بێدەنگ بوونە، تەنانەت لە ڕەددانەوەی لەفزییەکان ریوایەتیان کردووە چ جای ئەم تەفسیلە بە کوفر بزانن و بە مەزهەبی لەفزییەکانیانی بزانن!!!

بەڵام کەسانێک هەبن پێیان وابێت الخلال و ابن بطة کوفر ریوایەت ئەکەن لە ئیمام احمد پاشان لێی بێدەنگ ئەبن و هیچ ناڵێن بەڵکو استدلالی پێ ئەکەن بۆ رەددانەوەی لەفزییەکان! ئەوا بە ڕاستی هیچ ناووترێ لەگەڵیان.

تەنانەت ئەو زانایانەش کە باسی مەخلوقی فعلی عەبد و دەنگی عەبد و حیبر و کاغەز ئەکەن، ئەڵێن: ئەوەی پێی وابێت کەلامی الله کە ئەبیسترێ لە بەندەکان مەخلوقە، وە کەلامی الله کە ئەنوسرێ لە موسحەف مەخلوقە، وە کەلامی الله کە حیفز ئەکرێ لە دڵ مەخلوقە، وە کەلامی الله کە ئەخوێنرێ مەخلوقە، ئەوا ئەم کەسە کافرە.

بە قسەی ئەم نەفامانە بێت ئەم زانایانە ئاگایان لەخۆیان نەبووە چیان ووتوە، قسەیەکی بێ مانا و دژبەیەکیان کردووە! تەنانەت خودی ریوایەتەکەی ئیمام احمد لەلای ئەوان ووتەیەکی قۆڕ و بێ مانا و دژبەیەکە! بەڵام نازانم بۆ الخلال و ابن بطة لەم قسە قۆڕ و بێ مانایە بێدەنگ بوون کە پرپەتی لە زەندەقە وەک خۆیان باسی ئەکەن!!!

بۆ مەعلوماتیش یەک ووتە نەهاتووە لە سەلەف کە بڵێن: هەر کەسێک بڵێ دەنگم بە قورئان مەخلوقە ئەوا جەهمیە، باسی لەفز و قیرائە و تیلاوە کراوە بەڵام باسی دەنگ نەکراوە.

# بەشێک

لە حەقێک ڕائەکەن کە بە کوفری ئەزانن، کەچی بەرەو کوفرێکی تر ئەڕۆن و نازانن، هەروەک الله تعالى فەرموویەتی: ﴿فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ﴾ [يونس: ٣٢]، لە دوای حەق چ شتێکی تر هەیە جگە لە گومڕایی ؟

ئەڵێن گەر بڵێی: من بە دەنگی مەخلوقی خۆم کەلامی الله ئەگەیەنم کە غەیر مەخلوقە، ئەوا ئەم ووتەیە کوفرە، چونکە کەلامەکە بە دەنگەکە ئەگات و هەردووکیان تێکەڵن، ئەو کەسەی کەلامی الله ئەبیستێ بە دەنگی تۆ ئەیبیستێ، گەر ووتت دەنگم مەخلوقە کەلامەکەش ئەبێتە مەخلوق!

ئەی حەل چیە ؟

حەل ئەوەیە ئەڵێین: کەلامی الله غەیر مەخلوقە، وە دەنگی عەبد کە کەلامی الله ئەگەیەنێت نە ئەڵێین مەخلوقە و نە ئەڵێین غەیر مەخلوقە!

سەیرکەن چۆن لە کوفر ڕایکرد بە زەعمی خۆی، کەچی بەرەو کوفر ڕۆیشت، ئەڵێ دەنگەکە و کەلامەکە تێکەڵن لەیەکتر جیا ناکرێنەوە، بڵێی دەنگەکە مەخلوقە کەلامەکەش ئەبێتە مەخلوق! ئاخر نەفام ئەم قسەیەت کە دانراوی خۆتە توشی گێژاوت ئەکات و بە پێی مەزهەبی خۆت ئەتگەیەنێ بە کوفر، تۆ ناڵێی دەنگ و کەلام

تێکەڵن لەیەکتر جیا ناکرێنەوە بۆیە نابێ بووترێ دەنگ مەخلوقە، ئێ کەواتە هەر بە پێی مەزهەبی خۆت مەڵێ کەلامی الله غەیر مەخلوقە چونکە ئەم کەلامە لە دەنگ جیا ناکرێتەوە و تێکەڵن بەیەکەوە ئەبیسترێن، گەر ووتت کەلامەکە غەیر مەخلوقە ئەوا دەنگەکەش ئەکەیتە غەیر مەخلوق ئەوکات کوفرت کردووە، لە نەتیجە بە پێی مەزهەبی خۆت تاکو لەم کوفرە دەرباز بیت ئەبێ توقف بکەیت لە کەلامی الله نە بڵێی مەخلوقە و نە بڵێی غەیر مەخلوقە، چونکە کە ووتت غەیر مەخلوقە دەنگەکەش ئەبێتە غەیر مەخلوق کە دەنگی عەبدە ئەوکات کوفرت کردووە هەروەک خۆت ئەڵێی دەنگ و کەلام تێکەڵن و بەیەکەوە بەستراون لەیەکتر جیا ناکرێنەوە، گەر بڵێی کە ووتم کەلامەکە غەیر مەخلوقە و دەنگەکەش توقف-ی لێئەکەم هیچ ناڵێم، ئەوا پێت ئەڵێین: تۆ خۆت ووتت دەنگەکە و کەلامەکە لەیەکتر جیا ناکرێنەوە و بەیەکەوەن، ئیتر چۆن لەیەکترت جیا کردنەوە ووتت کەلامەکە غەیر مەخلوقە و دەنگەکەش توقف ئەکەم لێی نە مەخلوقە نە غەیر مەخلوق ؟!

ئەمەی تۆ ئەیکەی عەنتەریاتە نە دین نە عەقڵ قبوڵی ناکات، ئەڵێ گەر ووتت دەنگ مەخلوقە کەلامەکەش ئەبێتە مەخلوق چونکە ئەم دووانە بەیەکەوەن و جیا ناکرێنەوە، بەڵام گەر بڵێی کەلامەکە غەیر مەخلوقە دەنگەکە نابێتە غەیر مەخلوق ئەوکات ئەتوانرێ کەلام و دەنگ لەیەکتر جیا بکرێنەوە!!!

ئەمە عەنتەریاتە، بۆ تۆ نابێت بەڵام بۆ من ئەبێت، دوو شتی تێکەڵ هەیە من ناتوانم جیای بکەمەوە، گەر جیام کردنەوە لەیەکتر ئەوا کوفرم کردووە، بەڵام هەر هەمان ئەم دوو شتە ئەو ئەتوانێ جیایان بکاتەوە بەبێ ئەوەی توشی کوفر بێت!!!

والله هیچ حەلێکت نیە لەم گێژاوە دەرچیت کە خۆت بۆخۆت دروست کردووە ئیللا بە دوو ڕێگا نەبێت.

١/ ئەبێ بڵێی توقف ئەکەم لە کەلامی الله کاتێک بە دەنگی عەبد ئەیبیستم، چونکە گەر ووتم کەلامی الله غەیر مەخلوقە ئەوا دەنگی عەبدەکەش ئەبێتە غەیر مەخلوق چونکە کەلامەکە بە دەنگی عەبد ئەبیستم، وە پێشتر وتوومە مەحاڵە دەنگەکە و کەلامەکە لەیەکتر جیا بکرێنەوە، ئێستاش ئەبێ لەسەر قسەی خۆم بم لەیەکتریان جیا نەکەمەوە، ئینجا مەزهەبی ئەهلی سوننە ئەوەیە لە شتە تێکەڵەکان نە ئەڵێن مەخلوق نە ئەڵێن غەیر مەخلوق، وەک ئیمان مادام شتی مەخلوق و غەیر مەخلوق لەخۆ ئەگرێت نە ئەووترێ ئیمان مەخلوقە و نە غەیر مەخلوقە، ئێستاش ئەبێ وابکەیت بەپێی مەزهەبی خۆت مادام ئەڵێی دەنگ و کەلام تێکەڵن کەلامەکە بە دەنگ ئەبیسترێ لەیەکتر جیا ناکرێنەوە، کەواتە توقف بکە لە کەلامی الله مەڵێ غەیر مەخلوقە نەوەک دەنگی عەبدەکەش ببێتە غەیر مەخلوق! توقف کردنیش لە کەلامی الله کوفرە

٢/ ئەبێ بڵێی دەنگی عەبدەکەش غەیر مەخلوقە، هەروەک چۆن ووتم کەلامەکە غەیر مەخلوقە دەنگی عەبدەکەش لە کەلامەکە جیا ناکرێتەوە ئەویش ئەبێتە غەیر مەخلوق، وە پێشتر خۆت ووتت بڵێی دەنگەکە مەخلوقە کەلامەکەش ئەبێتە مەخلوق چونکە جیا ناکرێنەوە لەیەکتر، ئێ دە کەواتە کە ووتت کەلامەکە غەیر مەخلوقە ئەوا دەنگەکەشت کردووە بە غەیر مەخلوق چونکە جیا ناکرێنەوە، وە پێم وایە ئەمە عەقیدەی زۆرینەیانە لە ناخەوە بەڵام بە دەم دەری نابڕن نەوەک کەشف بن، ئەگینا بینیومە لە تەفسیری ئەم ئایەتە (حتى يسمع كلام الله) وتوویەتی: (الله دەنگی عەبدەکەی بە کەلامی خۆی ناوبرد!) ئێ کە دەنگی عەبدەکە کەلامی الله یە، سوێند بە الله هیچ چارێکی ترت نیە جگە لەوەی کە بڵێی دەنگی عەبدەکەش غەیر مەخلوقە، چونکە گومان لەوەدا نیە کەلامی الله غەیر مەخلوقە، ئەوکاتیش کە ووتت دەنگی عەبد غەیر مەخلوقە ئەوا کوفرت کردووە هەروەک خاڵی یەکەم

بۆ دەرچوون لەم دوو کوفرەش کە هیچ چارت نیە بە پێی مەزهەبەکەت ئەبێ یەکێکیان هەڵبژێری، ئەبێ بڵێی تەوبە ئەکەم لەم مەزهەبەم کە دامهێناوە یەک سەلەفم نیە کە بڵێن (هەر کەسێک بڵێ دەنگم مەخلوقە کە قورئان ئەخوێنم ئەوا کافرە) دان بەوە ئەنێم کە دەنگی عەبد جیایە لە کەلامی الله، عەبد بە دەنگە مەخلوقەکەی خۆی کەلامی الله ئەگەیەنێت کە غەیر مەخلوقە، ئەوکات دێیتە سەر هەمان مەزهەبی من کە بە کوفر و زەندەقەی ئەزانی

هەروەک چۆن کە قورئان ئەخوێنی کەسێک پێت ئەڵێ: دەنگت ناخۆشە، ئەم وەسفە ← (ناخۆشە) تەنها ئەکەوێتە سەر دەنگی تۆ، ناکەوێتە سەر قورئانەکە، بە هەمان شێوە کە ئەڵێی: دەنگم مەخلوقە کە قورئان ئەخوێنم بەڵام قورئان کەلامی اللّٰه یە مەخلوق نیە، ئەوا وەسفی ← (مەخلوقە) تەنها ئەکەوێتە سەر دەنگی تۆ، ناکەوێتە سەر قورئانەکە.

# بەشێک

## بوچەلکردنەوەی چەند درۆیەکی بەند بێژە دەم شڕە جنێو فرۆشەکە

ئەڵێ تۆ بەڵگە ئەهێنیتەوە بە خەونێکی درۆ!

مەبەستی ریوایەتەکەی ابو احمد الاسدي-ە کە لە پۆستی ژمارە (٢٤) هێنام، من لە پۆستەکەدا کە ریوایەتی ابن بطة-م هێنا خەونەکەم باسنەکرد، هەروەک ابن المحب الصامت الحنبلي ئەویش کە ریوایەتەکەی ابن بطة نەقل ئەکات ئەویش باسی خەونەکە ناکات، وە باسم کرد ئەم خەونە ووتەی مونکەری تێدایە خیلافی عەقیدەی ئەهلی سوننەیە، وە ووتم غەیری ابن بطة سێ کەسی تر هەمان چیرۆکیان ریوایەت کردووە بەڵام کەسیان خەونەکەیان نەهێناوە ئەمەش نیشانەی ئەوەیە ابن بطة هەڵەی کردووە لەم ریوایەتە، وە ابن بطة حیفزی زۆر باش نیە و هەڵەی هەیە، خاڵێکی تریشم باسکرد کە ئەوەبوو الخلال و السجزي و البیهقي هەر سێکیان ئەم

چیرۆکەیان لە ابراهیم بن یحیی المقرئ ریوایەت کردووە، تەنها ابن بطة ئەم چیرۆکەی لە ابو احمد الاسدي ریوایەت کردووە، مەحاڵە هەمان چیرۆک بە هەمان تەفاسیلەوە بۆ ابراهیم بن یحیی و ابو احمد روو بدات، کەواتە ئەمە ئەوە بەهێز ئەکات ابن بطة هەڵەی کردووە تەنانەت لە ناوی خاوەن چیرۆکەکەش، بەڵام تەفاسیلی چیرۆکەکە کە ئیمام احمد تێیدا تەفسیلی داوە لە نێوان شتە مەخلوقەکانی عەبد و کەلامی الله ئەم تەفسیلە لە هەر چوار ریوایەتەکە وەکو یەک هاتووە، کە ئەمە کرۆکی باسەکەمانە نەک خەونەکەی ابو احمد، وە ئەم تەفسیلەی ئیمام احمد لەم چیرۆکەدا هیچ دژی ووتەکانی تری ئیمام احمد نیە وەک ئەوەی جەماعەتی دوو جەزائیریەکە باسی ئەکەن، چونکە ئەوەی مەشهورە لە ئیمام احمد هەمیشە ئەیووت: قورئان لە هەموو حاڵێکدا هەر غەیر مەخلوقە هەرگیز نابێتە مەخلوق، ئێ لەم ریوایەتەشدا ئیمام احمد باسی پێنج شتی مەخلوقی عەبدی کرد لە هەر پێنج حاڵەکەدا قورئانی هەر بە غەیر مەخلوق وەسف کرد و لە هیچ حاڵێکدا نەیکرد بە مەخلوق، کەواتە ئەمە بۆ دژی ریوایەتەکانی تریەتی ؟!

پاشان ریوایەت کردنی ئەم تەفسیلەی ئیمام احمد لەلایەن الخلال لە کتێبی السنة، وە ریوایەت کردنی لەلایەن ابن بطة لە کتێبی الإبانة الکبری ئەمە دڕکێکە لە قورگی دوو جەزائیریەکە و جەماعەتەکانیان نازانن چۆن قبوڵی ئەوە بکەن کە چۆن الخلال و ابن بطة ریوایەتی کوفری ئەدەنە پاڵ ئیمام احمد و لێی بێدەنگ ئەبن، تەنانەت لە رەددی لەفزیەکان ئەم ریوایەتە ئەهێنن ؟ ئایا نەیانزانیوە مەزهەبی لەفزیەکان چی بووە ؟ یان زانیویانە و بێدەنگ بوونە لە کوفرەکە ؟ ئەمە بۆتە دڕکێک لە قورگیان کە بۆیان قوت نادرێ، مەعلومیشە زانایانی سەلەف لە کتێبە عەقیدەییەکان ئەم

ریوایەتانە ئەهێنن کە بروایان بە دەقەکەی هەیە و قبوڵیانە، مەحاڵە کوفر لە ئیمامێک نەقل بکەن و لێی بێدەنگ بن، بۆیە ئەمە گەورەترین بەڵگەیە کە فەهمی الخلال و ابن بطة بۆ مەزهەبی لەفزییەکان زۆر جیایە لە فەهمی دوو جەزائیریەکە، پاشان السجزي-ش ریوایەتی کردووە کە السجزي خۆی لە لەفزییە غەیر مەخلوقیەکانە، ئینجا جەماعەتی دوو جەزائیریەکە ئەڵێن: السجزي لەسەر مەزهەبی ئەهلی سوننە نیە لەم بابەتە خۆی لە لەفزییە غەیر مەخلوقیەکانە چۆن استدلال بە السجزي ئەکەیت!!! بەڕاستی ئەم قسەیە زۆر سەیرە، ئەوەی تۆزێک عەقڵی هەبێت ئەم قسەیە ناکات، من کە هاتووم استدلال بە السجزي و ابن البناء الحنبلي و قوام السنة الأصبهاني ئەکەم لە ئێوە باشتر ئەزانم ئەمانە لەم بابەتە هەڵەیان هەیە ڕەنگە ئێوە وەک من عەقیدەشیان نەزانن، بەڵام کە ئەمانە لەفزی غەیر مەخلوقین ئەم تەفسیلەی ئیمام احمد بە کوفر و بیدعە نازانن بەڵکو استدلالی پێئەکەن لە دژی لەفزییە مەخلوقیەکان، ئیتر چۆن ئێوە ئەم ریوایەتە بە کوفر ئەزانن!!! خۆ ئەمانە بە غلو کردن ناسراون لەم بابەتە بەوەی کە ووتیان لەفز و مەلفوز و قیرائە و مەقروء و تیلاوە و مەتلو هەر سێکیان هەمان شتن و غەیر مەخلوقن، سەرەرای غلو کردنیان لەم بابەتە ئەم ریوایەتە بە کوفر نازانن و استدلالی پێئەکەن، کەچی ئێوە بە حیساب خۆتان بە فرقەی ناوەند ئەزانن و ئەڵێن ئێمە ئەهلی سوننەین کەچی ئەم ریوایەتە بە کوفر ئەزانن، تکایە تۆزێک ئاستی تێگەیشتنتان بەرز بکەنەوە بەڕاستی قورسە بۆ من هێندە شتی سادە و ساکار روون بکەمەوە، هەر چەندە لە پۆستی ژمارە (٢٤) باسم کرد لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان سەرەڕای غلو کردنیان لەم بابەتە استدلال بەم

ریوایەتە ئەکەن کەچی ئێوە بە کوفری ئەزانن، گەر هەر تێناگەن استدلال کردنی من بەوان بۆ چیە با روونتری بکەمەوە.

لە بابەتی ئیمان مورجیئە و خەواریج هەن، هەر یەکێکیان سەرێکی باسەکەی گرتووە، بەڵام ئەهلی سوننە لە ناوەڕاستدان، نە شلی مورجیئەیان هەیە نە غلوی خەواریج، گەر بابەتێک هەبێت خەواریج بە کوفری نەزانن، جەنابیشت کە خۆت بە ئەهلی سوننە ئەزانیت بابەتەکە بە کوفر ئەزانی! من دێم پێت ئەڵێم: تۆ چی تۆ چ بەشەرێکی ؟ خەواریج سەرەرای غلو کردنیان لە تەکفیر ئەم بابەتە بە کوفر نازانن، کەچی تۆ خۆت بە ئەهلی سوننە ئەزانیت هاتووی ئەمەت کردووە بە کوفر!

بۆ بابەتی لەفزیش هەمان شت، لەفزییە مەخلوقیەکان جەهمی بوون، لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان هاتن غلویان کرد لە رەددانەوەیان بە ووتەی داهێنراو ڕەددیان داناوە، لەم نێوانەدا ئەهلی سوننە هەیە کە بەرییە لە هەردووکیان، لەم بابەتە توندترین فرقە لەفزییە غەیر مەخلوقیەکانن، گەر ئەوان ریوایەتەکە بە کوفر نەزانن و استدلالی پێبکەن، ئەی ئێوە چۆن بە کوفری ئەزانن ؟

لەم ڕووە دایە بەڵگە هێنانەوەی من بە ووتەی لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان، بۆیە کەس فەلسەفە لێنەدات بڵێ ئەمانە لەفزی غەیر مەخلوقین، هود ئەهلی سوننەی دەست ناکەوێ استدلال بە لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان ئەکات! نموونە

هێنانەوەکەش بە خەواریج و مورجیئە تەنها بۆ تێگەیشتن بوو نەک ئەم بابەتە ڕێک قیاس بکرێتە سەر ئەو لە هەموو ڕووێکەوە.

سەبارەت بەوەش کە ئەڵێ: تۆ درۆ بە دەممان ئەکەیت، ئەڵێی: ئەمانە ناڵێن فعلی عەبد مەخلوقە!

ئەمە درۆیە من قسەی ئاوام بۆ دروست نەکردوون، ئەزانم ئێوە ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوقە بەڵام کە باسەکە هاتە سەر قورئان و کەلامی الله فعلی عەبد بە مەخلوق و غەیر مەخلوق وەسف ناکەن، ئەمەم دەیان جار لە پۆستەکان باسکردووە، دەیان جار نەک یەک جار و دووجار، وە هەمیشە خەریکی ڕەددانەوەی بوومە، چەندین جار وتوومە سەیرکەن فلان زانا ئەڵێ فعلی عەبد هەمووی مەخلوقە بەبێ استثناء، وتوومە ئەی بۆ استثنائي تێنەکرد گەر لەکاتی قورئان خوێندن فعلی عەبد بە مەخلوق وەسف نەکرێ! ئەمە دەری ئەخات کە لە ووتەی ئێوە تێگەیشتووم و ئەزانم ڕەددی کێ ئەدەمەوە، ئەگینا گەر پێم وابوایە ئێوە بە موتلەقی فعلی عەبد بە مەخلوق وەسف ناکەن ئەوا بۆ یەک ساتیش نەئەوەستام لە تەکفیر کردنتان، بەڵام من دوو مانگە باسی ئەم بابەتە ئەکەم، خەڵک ئەزانن چی ئەڵێم و باسی چی ئەکەم، هەموو ئەزانن باسەکە باسی لەفز و قورئانە، گەر لە شوێنێک ئەڵێم: ئێوە ناڵێن فعلی عەبد مەخلوقە، من ئەڵێم فعلی عەبد مەخلوقە، هەموو خەڵک ئەبێ تێبگات کە مەبەستم لە فعلی عەبد کاتی قورئان خوێندنە نەک فعلی عەبد بە موتلەقی، چونکە خیلافی ئێمە

لەسەر ئەوە نیە تاکو باسی بکەین، بۆیە من درۆم بە دەمتانەوە نەکردووە ئەمە سەقەتی فەهمی خۆتە کە ئاوا حاڵی بوویتە لێم، وە ئەوەی دەری خست بۆم کە ئاستی تێگەیشتنت زۆر نزمە ئەوە بوو کاتێک ووتم: جەزائیریەکان تەسدیقی مەزهەبی لەفزییە مەخلوقیەکانیان کرد ووتیان ئێوە قسەکەتان ڕاستە گەر بڵێین فعلی عەبد مەخلوقە قورئانیش ئەبێتە مەخلوق

هاتبوو ئەیووت: ئەمە درۆیە، بۆ درۆ بە دەممان ئەکەیت ئێمە قسەی ئاوامان نەکردووە!!!

یەعنی کەسێک کتێبی دوو زانای خوێندبێتەوە لە بابەتی ڕەددانەوە ئەبێ زۆر بە ڕوونی تێبگات لەم ووتەیە کە ئەمە ئیلزام کردنی بەرامبەرە بە پێی مەزهەبی خۆیان، کەچی ئەیووت کوا ئێمە قسەی ئاوامان نەکردووە بۆ درۆ ئەکەیت بە دەممان!!!

درۆیەکەی تری کە لە زۆربەی پۆستەکانی دووبارە ئەبێتەوە ئەوەیە کە ئەڵێ: ئەمە مەزهەبی سەلەفە، ئەمە ئیجماعی زانایانە، هەموو زانایان لەسەر ئەمە کۆکن، کەچی نابینیت یەک بەڵگەش دابنێت بۆ ووتەکەی، پۆستەکەی پڕیەتی لە جنێو و زندیق زندیق زندیق، کەچی عەقیدە گومڕاکەی خۆی کە لە شێخە جەزائیریەکەی وەرگرتووە بە ئیجماعی سەلەف ناو ئەبات بەبێ ئەوەی یەک بەڵگەش دابنێت لەسەر ئەم خەیاڵاتانەی

سەلەف بەوە خەڵکیان تەکفیر ئەکرد کە بڵێن: لەفزمان بە قورئان مەخلوقە.

بەڵام لای دوو جەزائیریەکە و جەماعەتەکەیان گەر بڵێی: حیبر مەخلوقە، کاغەز مەخلوقە، لەوحی مەحفوز مەخلوقە، فعلی عەبد لەکاتی قورئان خوێندن و قورئان نوسین مەخلوقە، دەنگی عەبد مەخلوقە کە قورئان ئەخوێنێ، بەڵام قورئان لە هەموو ئەم بارانە غەیر مەخلوقە چ بە خوێندراوی یان بیستراوی یان حیفز کراوی یان نوسراوی بێت هەمیشە غەیر مەخلوقە، ئەوا بەم ووتانە تەکفیرت ئەکەن

گەر پێیان بڵێی: ئیجماعم ناوێ تەنها ووتەی یەک زانای سەلەفم بۆ بهێنن کە بڵێ: ئەوەی ئەم قسانەی سەرەوە بکات کافرە

ناتوانن بیهێنن و دەستە وەستان ئەبن

درۆیەکی تری کە لەم پۆستەی کۆتاییم ئیلزامم کرد بە دوو کوفر یان تەوبە کردن، ئەیووت من باوەڕم بە عەقیدەی تۆ نیە تاکو مولزەمم بکەیت پێی!!!

ئەوەی پۆستەکە بخوێنێتەوە ئەزانێ کە بە پێی عەقیدەکەی خۆت مولزەمم کردووی بە کوفر نەک بە پێی عەقیدەی خۆم

درۆیەکی تری کاتێک باسی مەخلوقی لەوحم کرد، ووتم لە ئەثەر هاتووە کە لەوح مەخلوقە و الله لەچی دروستی کردووە، وە چەند زانایەک لەوحیان بە مەخلوق وەسف کردووە دوای نوسینی کەلامی الله تێیدا، گەر وەسف کردنی لەوح بە مەخلوق کوفر بێت ئەوا زانایەک هەر ئەبوو کە بڵێ: ئەوەی بڵێ لەوح مەخلوقە کافرە، زۆربەی خەڵکی کە ئاسارەکانی دروستکردنی لەوح ئەبیستن لە مێشکیان ئەوە دروست ئەبێ کە لەوح مەخلوقە، ئەبوو زانایان زۆر گرنگی بەم خاڵە بدەن چونکە جێگای شوبهەیەکی بەهێزە بۆ چوون بەرەو کوفر، بەڵام یەک زاناش نیە بڵێ ئەوەی ووتی لەوح مەخلوقە کافرە، ئایا ئەم کوفرە ووردەی کە ئێوە باسی ئەکەن بە درێژایی ١٥ سەدە یەک زانا نەبوو لە ئوممەت ئەم کوفرە روون بکاتەوە بۆ خەڵک تاکو شێخەکەی ئێوە هات بۆ خەڵکی ڕوون کردەوە کە ووتنی: لەوح مەخلوقە کوفرە ؟!

سەیرکەن من باسی چی ئەکەم

ئەویش هاتبوو ئەیووت: هود عەقیدەکەی ئێمە کە لە سەلەفمان وەرگرتووە بە کوفری ئەزانێت!!!

من ئەڵێم گەر مەخلوقی لەوح کوفر بێت بۆ یەک زانا ئەم کوفرە ووردەی بۆ خەڵک روون نەکردەوە تاکو لێی پارێزراو بن ؟

ئەویش ئەڵێ سەیرکەن عەقیدەکەی ئێمە بە کوفر ناو ئەبات کە لە سەلەفمان وەرگرتووە!!! حەتمەن سەلەفەکەشت شێخە جەزائیریەکەتە.

ئەمە ئەوە دەرئەخات کە لە من تێناگات باسی چی ئەکەم بەڵام ڕەددیشم ئەداتەوە!

ئینجا هاتبوو بەهۆی جەهلەکەیەوە منی ئیلزام ئەکرد بەوەی کە بڵێم موسحەف مەخلوقە مادام ئەڵێم لەوح مەخلوقە!!! ئینجا هات لەوحی قیاس کردە سەر موسحەف ئەیووت دروستە سوێند بە لەوح بخورێ هەروەک چۆن سوێند بە موسحەف ئەخورێ چونکە هەردووکیان کەلامی الله ی تێدا نوسراوە! من زانام دیوە سوێندی خواردووە بە (رب اللوح) بە پەروەردگاری لەوح، کە ئەم سوێندە مانای مەخلوقی لەوحە لەوحی کردووە بە مربوب، ئینجا پێی وابوو ئەم ئیلزامەی زۆر بەهێزە هیچ چارم نیە ئیللا ئەبێ بڵێم موسحەفیش مەخلوقە وەک لەوح ئەوکات کوفرەکەم بۆ هەمووتان روون ئەبوو!!!

والله چاک بزانە دەمێکە وەڵامی ئەمەم حازر کردووە بۆت، بەڵام هەڵم گرتووە بۆ کاتی خۆی نامەوێ تێکەڵی بکەم لەگەڵ ئەم زنجیرە باسەی لەفز ئەوکات الله تەمەن بدات خۆت ئەبینیتەوە کە چیت بەسەردێ، وەک ئەم پۆستەی کۆتاییت کە هاتووی رەددی ئیلزامەکانی من ئەدەیتەوە بەڵام خاڵیە لە بەڵگە تەنها گاڵتە کردن و خۆ دزینەوە و

سیناریۆ(*) دروستکردن و بانگەشەکردنی درۆ و خۆ هەڵواسینە بە سەلەفەوە بەبێ بوونی بەڵگە، ئەڵێ مەزهەبی من هەمان مەزهەبی سەلەفە، کەواتە سەلەفیش مولزەم بکە بە کوفر، ئاخر کوا کام سەلەف هەمان قسەی تۆیان کردووە، واللہ گەر یەک سەلەفت هەبوایە مێشکت کون ئەکردین هێندە ووتەکەیت دووبارە ئەکردەوە.

------------------------------

(*) سیناریۆ دروستکردن

مەبەستم لەم ووتەیە ئەمەیە، ئەبو حەنیفە قوتابیەکانی فێر کردبوو کاتێک لە مونازەرە کەسی بەرامبەر زاڵ ئەبێ بەسەریان بە بەڵگە، زەردەخەنە بکەن و پێبکەنن، واخۆتان نیشان بدەن کەسی بەرامبەر قسەکانی زۆر پوچە و گاڵتەتان پێی دێیت، واتا واخۆتان دەرخەن ئێوە زاڵ بوونە بەسەریان

واللہ ئەم کەسەش ڕێک هەمان شت ئەکات لە پۆستەکانی، لە چەندین لاوە داغم کردووە بە بەڵگەوە، کەچی بە دروستکردنی هەرا و پێکەنین و گاڵتە کردن و جنێودان و زندیق زندیق خۆی ئەپەڕێنێتەوە، سیناریۆیەکت بۆ دروست ئەکات کە کەسی خوێنەر واهەست بکات من لە کوفردا غەرق بوومە هێندە کوفرم زۆرە ئەو نازانێت ڕەددی کامە کوفرم بداتەوە، بۆ نموونەش سەیری ئەو پۆستەم بکەن کە ئیلزامم کرد بە دوو کوفر، ئینجا سەیری پۆستەکەی ئەویش بکەن کە ڕەددی دوو ئیلزام کردنەی منی داوەتە.

دوو درۆی تریشی کە بیرم چوو بینوسم

ئەڵێ تۆ دینت لە مجلەی بەیان وەرگرتووە!

هەر نازانم مجلەی بەیان چیە و باسی چی تێدا ئەکرێ، ئاگاداری ئەم مجلەیە نیم نازانم چ لایەنێک و وولاتێک دەری ئەکات

بۆ ئەبێ درۆ بکەیت ؟ ئەتوانی ڕەددم بدەیتەوە بە بەڵگەوە بەبێ جنێودان و گاڵتە کردن و درۆ کردن بە دەمم

درۆیەکی تری ئەڵێ: تۆ سەرگەرم ئەکەیت بە دیار نەشیدەوە، ئینجا ناوی چەند نەشیدێکی نوسیوە!

ئاخر چ پێویست ئەکات ئەم درۆیانە؟

من دوورترین کەسم لە نەشید، واللە گەر بە بەڵگە ڕەددم بدەیتەوە هیچ ناچار نیت پەنا بۆ ئەم درۆیانە بەریت

ئامۆژگاریت ئەکەم بۆ بەرژەوەندی خۆتە کە ڕەددی هەر کەسێک ئەدەیتەوە با زۆرترینی ووتەکانت بەڵگە بێت، دوور کەرەوە لە جنێودان و گاڵتە کردن و قسەی پڕو پوچ کە هیچ ناکات جگە لە سوک کردنی خۆت، با ئەو کەسەی کە پۆستەکانت ئەخوێنێتەوە بڵێ بەڕاستی کەسێکی زیرەک و خاوەن بەڵگە بوو، هەموو ئەو قسانەی ئەیکات بەڵگەی بۆ هەبوو، نەک بڵێ قسەکانی پڕ بوون لە جنێو و گاڵتە و زندیق زندیق، ئاخر مانای چیە لە ٦ پۆستدا زیاتر لە ١٠٠ جار بە من ئەڵێی زندیق ؟ واللە خۆشت و هەموو ئەوانەی تیلیگرام حیسابی پوشێک بۆ حوکمەکانتان ناکەم کە پۆستم لەسەر ئەکەن، ئەبێ لە قیامەتیش سزای ئەم تاوانە گەورەیە بدەنەوە کە تەکفیری ناحەقە، بەڵام هەر بۆ خۆت واجوانترە واز بێنە لەم هەرا دروست کردنە، بە ئارامی شت بنوسە، دوو دێڕ جارێک مەڵێ زندیق تەواو هەموو خەڵک زانیان من زندیقم بە زەعمی تۆ، لە بابەتی تەکفیر عامیش هەر ئەمە ئەخلاقتانە کەسێک ناتوانێ دوو قسەتان لەگەڵ بکات ڕێک پێیدا دێنە خوارەوە جەهمی جەهمی زندیق زندیق لەعنەتت لێبێ کافری زندیق جەهمی لە جەهمی کوری سەفوان کافرتر ... هتد

واللە ئەم هەرا دروستکردنە هەموو کەس پێی ئەکرێ، تۆزێک بزانن چۆن قسە لەگەڵ خەڵک ئەکەن ئێوە بە حیسابی خۆتان ئەتانەوێ حەق بە خەڵک بگەیەنن و لێتانی وەربگرن بۆ ئەبێ هەمیشە زندیق و جەهمی و جنێو لەسەر زمانتان بێ ؟

ئینجا حەزی جنێوەکانیان لە پەنای سەلەف ئەشارنەوە ئەگەڕێن و ئەسوڕێن بزانن سەلەف چ قسەیەکیان بە کەسێک ووتوە هەمان قسە ئەکەنەوە، تاکو پاشان بڵێن

ئەوەتا ئەو جنێوەی ئێمە سەلەف بەکاری هێناوە، ماشاء الله هێندە شوێنکەوتەی سەلەفن هێندە ئەڤەرین تەنانەت لە جنێویش شوێنی سەلەف ئەکەون!

ئاخر تۆ سەیری الدارمي بکە لە کتێبی النقض کە ڕەددی کەسێکی دیاریکراو ئەداتەوە بزانە چەند جار پێی ئەڵێ زندیق و کافر، وە چەند جاریش بەڵگە لە دژی ئەهێنێتەوە، سەدان بەڵگە ئەهێنێتەوە لە ئایەت و فەرموودە و ئاسار، کەچی تۆش لە ٦ پۆستدا تاکو ئێستا ١٠ بەڵگەت دانەناوە بۆ بابەتی لەفز، لە بەرامبەردا زیاتر لە ١٠٠ جار پێت وتووم زندیق!

# بەشێک

پێشنیارێکی برایانە بۆ ئەو کەسانەی کە عمومی نین بەڵام بەهۆی بابەتی لەفز تەکفیر یان تەبدیعی منیان کردووە.

هەروەک ڕوونە بەشێکتان سەرەڕای برایەتی نێوانمان و هەبوونی بۆتی کەناڵەکە کە ئەتان توانی لە ڕێگای بۆتی کەناڵەکە نامەم بۆ بنێرن و ئاگادارم بکەنەوە لە کوفر یان بیدعە کە پێتان وایە من توشی بوومە، بەڵام بە داخەوە کەستان نامەی نەنارد بۆم، هەمووی لە جێگای خۆیەوە بەبێ ئاگادار کردنەوە پۆستی لەسەر کردم، خۆ ئێوە منتان بە برا و بە ئەهلی سوننە ئەزانی چی تێئەچوو نامەیەک بنێرن بڵێن برا ئەمەی تۆ باسی ئەکەیت ئێمە لەگەڵی نین سەیرکە بەڵگەمان لایە ئەمە ئاوا و ئاوایە، یان پرسیارتان کردبوایە ئەرێ برا تۆ ئەم بابەتە باس ئەکەیت بەڵگەت چیە، موناقەشەیەکی عیلمی برایانەمان ئەکرد، وە دڵنیاشم ئەگەر ١٠٠% نەگەیشبواین بە ئەنجام ئەوا بەشێکی زۆری خیلافەکانی نێوانمان بوونی نەئەما و باسەکە ڕوون ئەبوویەوە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش کە کەستان نامەیەکی دڵسۆزانەتان بۆم نەنارد، من خۆم هاتم نامەم بۆ بەشێک لەو کەسانە نارد کە پۆستیان لەسەر کردووم، الحمدلله کە قسە کردنمان بەیەکەوە ئەنجامی زۆر باشی هەبوو، ئێستاش هەر برایەک لەم بابەتە کە من بە کافر یان مبتدع ئەزانێ ئامادەم قسەی لەگەڵ بکەم،

ئەو گوێم بۆ بگرێ و من گوێی بۆ بگرم دوور لە جدال، بەڵام بەو مەرجەی عمومی نەبێت چونکە قسە کردن لەگەڵ عمومی بەبێ سودی ئەزانم، جا گەر خۆتان ئامادەییتان تێدایە نامە بنێرن بۆم با قسە بکەین، گەر ناتانەوێ خۆتان نامە بنێرن تەنها ئامادەیی نیشان بدەن لە ڕێگای کەسانی ترەوە ئەوکات خۆم نامەتان بۆ ئەنێرم، والله ئەمەش بۆیە باس ئەکەم چونکە حەز ناکەم پۆست لەسەر هیچ کامتان بکەم، من لێرە بەدواوە سێ ڕۆژ مۆڵەت ئەدەم بە هەمووتان گەر هەر بێدەنگ بوون ئیتر من لەمەودوا هەروەک چۆن ڕەددی عمومیەکان ئەدەمەوە ناچارم ڕەددی ئێوەش بدەمەوە، جا ئەوکات نەڵێن هود هات فیتنەی دروست کرد و دووبەرەکی دروست کرد بەم بابەتە، چونکە هەروەک چۆن ئەوان بەوپەڕی دڵنیاییەوە تەکفیر و تەبدیعم ئەکەن، منیش بەوپەڕی دڵنیاییەوە ئەزانم لە مەزهەبی لەفزیەکان تێنەگەیشتوون.




وەڵامدانەوەی کەسی درۆزن و چەواشەکار بە ڕاستی زۆر زەحمەتە

هەم بە درۆ خەڵک هەڵئەخەڵەتێنێ

هەم چەواشەی ڕاستیەکان ئەکات

بەهۆی ووردی ئەم بابەتە و جەهلی زۆربەی خەڵک بەم بابەتە، ئەم دووانە هۆکارن کە بتوانرێ زۆرترین درۆ و چەواشە کردن بە ئاسانی ئەنجام بدرێ لەم بابەتە.

# اللفظية (٢٧)



**الكرجي القصاب** ئەڵێ:

فەرمایشتی اللە: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦ﴾ [القيامة: ١٦]، ڕوونترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو قورئانەی بیستراوە لە زمانی بەندەکان کەلامی اللە یە مەخلوق نیە، وە نەبۆتە لەفز و حیکایەت، بە ساف و پاراوی قورئانە کە اللە قسەی پێکردووە، بەندەکان هیچ لەفزێکیان تێیدا نیە، بەڵکو تەنها حەملی قورئانەکەیان کردووە و ئەدایان کردووە، هەروەک چۆن نوسەر حەملی ئەکات بە نوسینەکەی بێ ئەوەی لەفزی خۆی تێکەڵی بکات، وە ئەم شتە ڕوونە پێویست ناکات تێگەیشتنی ئەمە وورد و ناڕوون بێت لەلای کەسێک کە دان بەوە ئەنێت کەلامی اللە مەخلوق نیە، جا پێویست ناکات گومان بکات لە لەفز و حیکایەت، چونکە قورئانخوێن و نوسەری قورئان و حافزی قورئان و گوێگری قورئان هیچ کردەوەیەکیان نیە لە لەفز و لە حیکایەت، وە هەر کەسێک گومان بکات لە لەفز و حیکایەت وادابنێ کە ئەویش لەفزی تێدا هەیە کاتێک قورئان ئەدا ئەکات، وە بە ئەدا کردنی ئەو قورئانەکە ئەبێتە حیکایەت، ئەوا ئەم کەسە لەم ووتەیەی هەڵگەڕاپەوە کە ئەیووت کەلامی اللە

مەخلوق نیە، وە یەکسان بووە لەگەڵ ئەو کەسەی کە ئەڵێ قورئان مەخلوقە، وە کوفری کردووە کوفرێکی ڕوون و ئاشکرا، چونکە لەفز ناکرێ لە یەک کاتدا لەلایەن دوو کەسەوە دەربڕێ، وە ناکرێ کەلام لە یەک کاتدا لەلایەن یەک کەسەوە حیکایەت و حیکایەتکراو بێت، چونکە بێگومان ئەبێ یەکێکیان بوونی نەبێت بە بوونی ئەوی تریان، جا کاتێک قسەکەر ناتوانێ دەست بکات بە ووتنی کەلامێک کە پێش ئەو قسەی پێکراوە ئەویش ببێتە قسەکەری یەکەم پێی هەروەک چۆن کەسی یەکەم یەکەمجار قسەی پێکردووە، جا کە قورئانی خوێند کە الله سەرەتا قسەی پێکردووە ئەوا کەلامەکە تەنها هی الله یە، وە ئەو کەلامە بوونی هەبووە، وە کەلامی قورئانخوێنەکە کە لەفزیەکان پێیان وایە کەلامی قورئانخوێنەکەیە بە یەقینەوە هیچ بوونێکی نیە، چونکە ناکرێ کەلامی الله بوونی نەبێت کاتێک مەخلوق ئەدای ئەکات بە ئالەتی خۆی، وە ئالەت کەلام نیە، وە الله هەموو خەڵکی بێ هیوا کردووە لەوەی کە بتوانن کەلامێک بهێنن وەکو ئەم قورئانە بێت، الله فەرموویەتی: ﴿قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا﴾ ئایا ئەو کەسەی کە پێی وایە ئەتوانێ لەفزی قورئان بهێنێت ئەوا پێی وانیە بە تەنها خۆی هەمان قورئانی هێناوە بەبێ ئەوەی کەسیش یارمەتی بدات ؟ وە ووتەکەی الله جل جلالە بە درۆ داناوە، وە شایەنی کوشتنە.

**(نكت القرآن : ٤ / ٤٥٢-٤٥٤)**

رحمك الله وورد بە لە ووتەکانی الكرجي القصاب کە تێیدا ڕەددی لەفزیەکان ئەداتەوە، ئایا بزانە ئەڵێ: نابێ فعلی عەبد بە مەخلوق وەسف بکرێ لەکاتی قورئان

خوێندن چونکە گەر ووتمان فعلی عەبد مەخلوقە قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق ؟ یان ئەڵێ: کاتێک عەبد قورئان ئەخوێنێ قورئانەکە کەلامی اللّٰە یە هیچی کەلامی عەبد نیە، وە عەبد هیچ لەفزێکی نیە لەم کەلامەدا تەنها ئەدای کەلامەکەی کردووە بە ئالەتی خۆی ؟

کامەیانی باسکرد لە ڕەددی لەفزیەکان ؟

ئێوە ئەڵێن لەفزیەکان ئەیان ووت فعلی عەبدەکە مەخلوقە کاتێک قورئان ئەخوێنێ، بەڵام قورئانەکە غەیر مەخلوق کە عەبد ئەیخوێنێ

منیش ئەڵێم: لەفزیەکان ئەیان ووت هەروەک چۆن فعل و کەلامی عەبد مەخلوقە، کاتێک عەبد قورئانیش ئەخوێنێت قورئانەکە ئەبێتە مەخلوق لەسەر زمانی عەبدەکە، وەکو کەلامی عەبدەکە وایە، بەڵام بە نسبەت اللّٰە قورئان کەلامی اللّٰە یە کاتێک قسەی پێکردووە غەیر مەخلوقە، بەڵام عەبد کە دەری ئەبڕێ ئەبێتە مەخلوق، هەر بۆیە سەلەف لە ڕەددی لەفزیەکان ئەیان ووت قورئان لە هیچ بارێکدا نابێتە مەخلوق.

پێشتریش بەڵگەی زۆرم داناوە بۆ ئەوەی کە ئەمە مەزهەبی لەفزیەکان بووە قورئانەکەیان ئەکرد بە مەخلوق لەسەر زمانی عەبد، لەم پۆستەشدا باسی ووتەکەی الكرجي القصاب ئەکەین، لە ڕەددی زاناکان بۆ لەفزیەکان تێئەگەین کە

مەزهەبیان چی بووە، با بزانین ڕەددی الكرجي القصاب بۆ لەفزییەکان لەگەڵ فەهمی من یەک ئەگرێتەوە یان فەهمی ئێوە ؟

**الكرجي القصاب** ووتی:

(فەرمایشتی الله: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ﴾ [القيامة: ١٦]، ڕوونترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو قورئانەی بیستراوە لە زمانی بەندەکان کەلامی الله یە مەخلوق نیە، وە نەبۆتە لەفز و حیکایەت، بە ساف و پاراوی قورئانە کە الله قسەی پێکردووە، بەندەکان هیچ لەفزێکیان تێیدا نیە، بەڵکو تەنها حەملی قورئانەکەیان کردووە و ئەدایان کردووە، هەروەک چۆن نوسەر حەملی ئەکات بە نوسینەکەی بێ ئەوەی لەفزی خۆی تێکەڵی بکات).

باسی ئەوە ئەکات قورئان لەسەر زمانی بەندەکان تەنها کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە بەندەکان هیچ لەفزێکیان نیە لەم کەلامەدا بەڵکو تەنها ئەدایان کردووە بە خوێندن و بە نوسین، بەبێ ئەوەی قسەی خۆیانی تێکەڵ بکەن

**الكرجي القصاب** ووتی:

(هەر کەسێک گومان بکات لە لەفز و حیکایەت وادابنێ کە ئەویش لەفزی تێدا هەیە کاتێک قورئان ئەدا ئەکات، وە بە ئەدا کردنی ئەو قورئانەکە ئەبێتە حیکایەت، ئەوا ئەم کەسە لەم ووتەیەی هەڵگەڕایەوە کە ئەیووت کەلامی الله مەخلوق نیە، وە

یەکسان بووە لەگەڵ ئەو کەسەی کە ئەڵێ قورئان مەخلوقە، وە کوفری کردووە کوفرێکی ڕوون و ئاشکرا، چونکە لەفز ناکرێ لە یەک کاتدا لەلایەن دوو کەسەوە دەربڕێ).

سەیرکە ئەڵێ پێی وابێت ئەویش لەفزی هەیە لە قورئانەکە، وە بە ئەدا کردنی ئەو قورئانەکە ئەبێتە حیکایەت، وە پاشان ئەڵێ ناکرێ لەفز لە یەک کاتدا لەلایەن دوو کەسەوە دەربڕێ، قورئان یان کەلامی الله یە تۆ ئەدای ئەکەیت، یان ئەڵێی قورئان کەلامی منە پەنا بە الله، ناکرێ لە یەک کاتدا قورئان کەلامی الله بێت و کەلامی تۆشی لەگەڵ بێت! تۆ هیچ کەلامێکت نیە کاتێک قورئان ئەخوێنێ، قورئانەکە کەلامی الله یە تۆ تەنها ئەدای ئەکەیت بە ئالەتەکانی خۆت، وە الكرجي القصاب کە ئەڵێ لەفز هیچ بوونی نیە مەبەستی کەلامە نەک فعل چونکە هیچ کەسێکی عاقڵ ناڵێ کاتێک عەبد قورئان ئەخوێنێ فعلی عەبد هیچ بوونی نیە، بە بەڵگەی ئەوەی الكرجي القصاب خۆی ئەڵێ عەبد تەنها ئەدای ئەکات واتا ئیسباتی فعلی عەبدەکە ئەکات، بەڵام نەفی ئەوە ئەکات کەلامی عەبد بوونی هەبێت کاتێک قورئان ئەخوێنێ، لە ووتەی دواتری ئەمە بە ڕوونی دەرئەکەوێ

**الكرجي القصاب** ووتی:

(كاتێک قسەكەر ناتوانێ دەست بكات بە ووتنی كەلامێک كە پێش ئەو قسەی پێكراوە ئەویش ببێتە قسەكەری یەكەم پێی هەروەک چۆن كەسی یەكەم یەكەمجار قسەی پێكردووە، جا كە قورئانی خوێند كە الله سەرەتا قسەی پێكردووە ئەوا كەلامەكە تەنها هی الله یە، وە ئەو كەلامە بوونی هەبووە، وە كەلامی قورئانخوێنەكە كە لەفزییەكان پێیان وایە كەلامی قورئانخوێنەكەیە بە یەقینەوە هیچ بوونێكی نیە، چونكە ناكرێ كەلامی الله بوونی نەبێت كاتێک مەخلوق ئەدای ئەكات بە ئالەتی خۆی "واتا ئالەتی قسە كردن كە زمان و لێو و دەمە" وە ئالەت كەلام نیە).

سەیركەن باسی ئەوە ئەكات قورئان كەلامی الله یە كاتێک مەخلوق ئەدای ئەكات، مەخلوق نابێتە خاوەنی كەلامەكە، وە ناتوانرێ ببێتە قسەكەری یەكەم بە كەلامەكە، الله قسەكەری یەكەم بووە بەم كەلامە، وە كەلام تەنها ئەدرێتەوە پاڵ كەسی یەكەم ناكرێ لە یەک كاتدا كەلامی كەسی یەكەم و كەسی گەیەنەریش بێت، یان ببێتە كەلامی كەسی گەیەنەر كاتێک ئەدای ئەكات جا كەلامەكە ببێتە مەخلوق، وە مەخلوق بە ئالەتی خۆی قورئانەكە ئەدا ئەكات ئالەتیش كەلام نیە تا قورئان ببێتە مەخلوق لەسەر زمانی مەخلوقەكان

الكرجي القصاب ووتی:

(الله هەموو خەڵکی بێ هیوا کردووە لەوەی کە بتوانن کەلامێک بهێنن وەکو ئەم قورئانە بێت، الله فەرموویەتی: ﴿قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا﴾ ئایا ئەو کەسەی کە پێی وایە ئەتوانێ لەفزی قورئان بهێنێت ئەوا پێی وانیە بە تەنها خۆی هەمان قورئانی هێناوە بەبێ ئەوەی کەسیش یارمەتی بدات ؟ وە ووتەکەی الله جل جلالە بە درۆ داناوە، وە شایەنی کوشتنە).

سەیرکەن لە ڕەددی لەفزییەکان ئەڵێ الله خەڵکی بێ هیوا کردووە بتوانن کەلامێکی وەکو ئەم قورئانە بهێنن، ئایا کەسێک پێی وابێ ئەتوانێ هەمان لەفزی قورئان بهێنێت ئەوا پێی وانیە کە بە تەنها خۆی قورئانی هێناوە و ئەو تەحەددایەی شکاندووە کە الله تەحەددای کافرانی پێکردووە، وە ئایەتەکەی بە درۆ داناوە کە تەحەددایان ئەکات

ئەم ووتانە لە ڕەددی لەفزییەکان چ مانایەکی هەیە ؟ ئایا ئەمە هەمان ئەو ووتانە نیە کە من باسی ئەکەم دەربارەی مەزهەبی لەفزییەکان ؟ کە ئەڵێم پێیان وابوو مادام فعل و کەلامی عەبد مەخلوقە ئەوا قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق لەسەر زمانیان وەک کەلامی عەبد وایە، سەیرکە الكرجي لەفزییەکان مولزەم ئەکات بەوەی کە ئێوە بەم عەقیدەیەتان پێتان وایە هەمان قورئانتان هێناوە بە لەفزی خۆتان و ڕەددی ئایەتەکەتان داوەتەوە، ئەڵێ کەلامی قورئانخوێنەکە هیچ بوونی نیە کە ئەوان پێیان وایە بوونی هەیە لە کاتی قورئان خوێندن، مەحاڵە قورئان ببێتە مەخلوق کاتێک مەخلوق ئەدای ئەکات بە ئالەتی خۆی

ئەم ووتانەی الكرجي بۆ ڕەددی لەفزییەکان لەگەڵ ئەوە یەک ئەگرێتەوە کە لەفزییەکان بڵێن تەنها فعلی عەبدەکە مەخلوقە ئەگینا قورئانەکە غەیر مەخلوقە کە عەبد دەری ئەبڕێت ؟ ئەسلەن الكرجي هەر باسی فعلی عەبدی کرد بە هیچ جۆرێک ؟ چ جای ئەوەی بڵێ فعلی عەبد مەخلوقە بەڵام لە کاتی قورئان خوێندن باسی فعلی عەبد ناکەین وەکو لەفزییەکان!!!.

--------------------------

ماویەتی

# بەشێک

## چەند ئامۆژگارییەک

١/ مەرج نیە لە هەموو باسێک تێبگەیت، هەندێک باس هەیە لە ئاستی تۆدا نیە، کە ئەیخوێنیتەوە ئەزانی لێی تێناگەیت ئەوا لێیگەڕێ، ئەوەندە بەس بێت بۆت کە قورئان بە کەلامی الله ئەزانیت و ئەڵێی غەیر مەخلوقە لە هەموو بارێکدا و هەرگیز نابێتە مەخلوق.

٢/ کە لە بابەتێک تێگەیشتی مانای ئەوە نیە کە تۆ توانات هەبێ لەم بابەتە مونازەرە بکەیت یان ڕەددی شوبهەکان بدەیتەوە، ئاساییە عەقیدەت دروست بێت لە بابەتێکدا بەڵام نەتوانی ڕەددی شوبهەکان بدەیتەوە دەربارەی ئەم بابەتە، هەیە ئەڵێ تا نەتوانم ڕەددی هەموو شوبهەیەک بدەمەوە قسە ناکەم، ئایا زاناکانی سەلەف هەموویان ڕەددی هەموو شوبهەکانیان داوەتەوە ؟ ئایا هەموویان لە یەک ئاستدا بوون لە ڕەددانەوە ؟ کە زانایەک نەیتوانیوە ڕەددی شوبهە بداتەوە ئەمە بۆتە ڕێگر لە بەردەمی کە حەقەکە نەڵێت و باسی نەکات ؟ سەیرکەن کاتێک الصوري ووتی: ئیمان

مەخلوقە، نوێژ مەخلوقە، زەکات مەخلوقە، پرسیاریان لە عبدالوهاب الوراق و چەند شێخێک کرد دەربارەی ئەم ووتانە، کەسیان نەیانزانی وەڵام بدەنەوە، عبدالوهاب ووتی بڕۆن لە ئیمام احمد بپرسن ئەو شارەزای ئەو بابەتانەیە، جا گەر عبدالوهاب لەم باسەدا وەڵامی پێ نەبێت ئێمە زۆر ئەولاترە لە کۆمەڵێک باسدا نەتوانین قسەی تێدا بکەین یان نەزانین وەڵامی شوبهەکان بدەینەوە، بۆیە وامەزانە گەر نەتتوانی ڕەددی شوبهەکان بدەیتەوە ئەوا تۆ لەسەر باطلی، چونکە لەسەر حەق بوون و وەڵامدانەوەی شوبهە ئەم دوو شتە لازمی یەکتر نین، وە مەرج نیە هەر بابەتێک فێربوویت ڕێک بچیت موناقەشە و جیدالی پێ بکەیت لەگەڵ خەڵکی.

٣/ کە عەقیدەت دامەزراند لەسەر شتێک و دڵنیایی حەقەکە بەتۆیە ئەوا با تەکفیری هیچ کەسێک ترس و دڵەڕاوکێ نەخاتە دڵتەوە، خەواریج هەر وابوونە بیدعەیەک دائەهێنن ئەوەی لەسەر ئەم بیدعەیە هاوڕایان نەبێت تەکفیری ئەکەن، خۆ ئەمە یەکەم جاریان نیە، لەسەر تەکفیر ئەسلی دینە یان نا تەکفیری موخالف ئەکەن، لەسەر تەکفیری عام تەکفیری موخالف ئەکەن، لەم بابەتەش لە فەهمی شێخەکەیان دەرچیت تەکفیرت ئەکەن، کەسی واهەیە بابەتەکەی بۆ باس ئەکەم ئەڵێ تەواوە حەقە، ئەڕوا پۆستی ئەکات لە کۆمێنت یان لە چات عمومیەک بۆی ئەنوسێ هەی زندیقی جەهمی، ئەویش ڕێک لە ترسان پۆستەکە ئەسڕێتەوە ئەڵێ نەوەک ببم بە جەهمی! گەر لە باسەکە بە تەواوی تێنەگەیشتووی پۆستی مەکە با لە دڵی خۆتدا بێت، گەر بە تەواوی تێگەیشتووی هەر کەس پێی ووتی جەهمی قسەکەی

بخە ژێر پێت، وە خۆشت بپارێزە لە جیدال کردن، من یەقینم هەیە لەوەی کە باسی ئەکەم بۆیە ئەوانەی پۆستم لەسەر ئەکەن و کردوویانە تەکفیرم ئەکەن یان تەبدیع هەموو حوکمەکانیان ئەخەمە ژێر پێم و گاڵتەم پێی دێت، وە ئەوانەی تاکو ئێستا بێدەنگن و پۆستیان لەسەر نەکردووم لەمەودوا ئەوانیش پۆستم لەسەر بکەن و تەکفیرم بکەن هەر گاڵتەم پێی دێت و بەردەوام ئەبم (واللە ئەمە بە تەکەبورە ناڵێم بەڵکو دڵنیام لە عەقیدەکەی خۆم و دروستی تێگەیشتنم لە بابەتەکە بۆیە وائەڵێم).

# اللفظية (٢٨)



**الكرجي القصاب** ئەڵێ:

فەرمایشتی الله: ﴿ثُمَّ أَدۡبَرَ وَٱسۡتَكۡبَرَ (٢٣) فَقَالَ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ يُؤۡثَرُ (٢٤) إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا قَوۡلُ ٱلۡبَشَرِ (٢٥)﴾ [المدثر: ٢٣-٢٥]

هەموو شوبهە و ناڕوونیەكی لابرد لەسەر ئەوەی كە قورئان كەلامی الله یە مەخلوق نیە، وە لەفز بە قورئانیش مەخلوق نیە، چونكە الله هەڕەشەی لە الوليد بن المغيرة كرد كاتێك قورئانی دایە پاڵ ووتەی مرۆڤ، جا كە قورئان ووتەی مرۆڤ نەبێت ئەوا بێگومان ووتەی خالقە، ئەگەرچی مرۆڤیش بیخوێنێتەوە هەر نابێتە ووتەی مرۆڤ، بەڵكو ووتەی ئەو كەسەیە كە سەرەتا قسەی پێكردووە كە ئەویش الله-یە جل جلاله، قورئان بە خوێندنەوەی جبريل لەسەر پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەبووە مەخلوق، وە جبريل مەخلوقە، وە بە خوێندەوەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەسەر هاوەڵەكانی نەبووە مەخلوق، وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم مەخلوقە، وە بە خوێندنەوەی قورئانخوێنان تاكو ڕۆژی قیامەت قورئان هەر نابێتە مەخلوق ئەگەرچی قورئانخوێنەكان مەخلوق بن، وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم

فەرموویەتی: (دەمەکانتان ڕێگان بۆ قورئان، جا دەمەکانتان پاک بکەنەوە بە سیواک)، دەمەکان مەخلوقن، وە دەمەکان ئەدای قورئان ئەکەن، جا قورئانەکە نابێتە مەخلوق، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ڕێگان بۆ قورئان) هەروەک ئەیبینی، نەیفەرموو: (ڕێگان بۆ حیکایەتی قورئان)، جا قورئان نابێتە لەفزی بەندەکان، وە نابێتە حیکایەت کردنی بەندە بۆ کەلامی غەیری خۆی هەرگیز، چونکە ئەم قورئانە خودی ئەو کەلامەیە کە الله جل جلالە قسەی پێکردووە هەر چۆنێک حەمل بکرێت و هەر چۆنێک ئەدا بکرێت، وە نازانم چۆن ئەم بابەتە تێکەڵ و ناڕوون بووە بۆ لەفزییەکان و ئەوانەی ئەڵێن قورئان حیکایەتی ئێمەیە ؟!

**(نكت القرآن : ٤ / ٤٣٧-٤٣٩)**

بڕوانە رحمك الله الكرجي القصاب ووتی: لەفز بە قورئان غەیر مەخلوقە، واتا الكرجي القصاب لە لەفزییە غەیر مەخلوقیەکانە، ئەگەرچی زۆربەی لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان کە ئەیان ووت لەفز و قیرائە و تیلاوە غەیر مەخلوقە یان ئەیان ووت کیتابە و مەکتوب یەک شتن، لە هەموو ئەمانەدا تەنها مەبەستیان خودی قورئانەکە بوو نەک بڵێن فعلی عەبدەکە هەمان فعلی الله یە و غەیر مەخلوقە پەنا بە الله، مەحاڵە کەسێکی وەکو ابو حاتم الرازي و محمد بن داود المصيصي و ابن منده و السجزي و ابن حامد و بەشێکی تر لە موتەئەخیرینی حەنابیلە و بەشێک لە خوراسانیەکان ئەمە عەقیدەیان بووبێت کە بڵێن فعلی عەبدەکەش هەر هەمان فعلی الله یە و غەیر مەخلوقە بۆیە ئەڵێین لەفزمان بە قورئان غەیر مەخلوقە! بەڵکو لەم ووتەیەدا تەنها مەبەستیان قورئانەکە بوو، وە ئەوەی بزانێ لەفزییە غەیر

مەخلوقیەکان لە ڕەددی کێ ئەم قسەیان کردووە تێئەگات مەبەستیان چی بووە لەم ووتەیە، لەفزییە مەخلوقیەکان ئەیان ووت قورئان بە نسبەت الله کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، بەڵام کاتێک ئێمە دەری ئەبڕین بە زمانی خۆمان ئەبێتە مەخلوق، بۆیە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە واتا قورئان لەسەر زمانی ئێمە ئەبێتە مەخلوق، لە بەرامبەردا لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان ووتیان لەفزمان بە قورئان غەیر مەخلوقە، واتا کاتێک ئێمەش قورئان ئەخوێنین قورئانەکە هەر غەیر مەخلوقە بە لەفزی ئێمە نابێتە مەخلوق، ئەمە مەبەستەکەیان بوو نەک مەبەستیان ئەوە بێت فعلی عەبدەکە غەیر مەخلوقە و هەمان فعلی الله یە، گەر ئەمە عەقیدەیان بوایە ئەوا ئیمام احمد و غەیری ئەویش نەئەوەستان لە تەکفیر کردنیان، بەڵام ووتەکەیان بیدعە بوو بۆیە تەبدیع کران، ئەمەش ئەوە دەرئەخات کە ئیمام احمد حیسابی بۆ مەبەستی کەسەکان کردووە لەم ووتانەی کە دەری ئەبڕن ئەگینا هەر کەسێک بڵێ فعلی عەبد مەخلوق نیە هەروەک چۆن فعلی الله-ش مەخلوق نیە ئەوا بێگومان کافرە، جا هەروەک چۆن لەفزییە مەخلوقیەکان کە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە مەبەستیان مەخلوقی قورئانەکە بوو، بە هەمان شێوە لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان کە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە مەبەستیان غەیر مەخلوقی قورئان بوو، سەبارەت بەوەش کە ئەڵێم لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان مەبەستیان هەر قورئانەکە بووە ئەمە شتێک نیە لەخۆمەوە بیڵێم یان بۆ موجامەلە کردنی ئەم زانایانە وابڵێم کە لەم باسە تێکەوتوون، بەڵکو هەر کەسێک ووتەی لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان بخوێنێتەوە بە ڕوونی لەوە تێئەگات کە مەبەستیان غەیر مەخلوقی قورئان بووە لە ووتەکەیان نەک غەیر مەخلوقی فعلی عەبد، دیارترین

نموونەش قوام السنة کە لەفزییەکی غەیر مەخلوقیە بەڵام بە ڕوونی ئەڵێ فعلی عەبد و جوڵەی زمانی و دەنگی لەکاتی قورئان خوێندن مەخلوقە، ئێ گەر ئەمە هەمان عەقیدەی لەفزییە مەخلوقیەکان بێت کە قوام السنة باسی ئەکات ئەی چۆن هەر خۆی لەفزییە مەخلوقیەکان تەکفیر ئەکات ؟ لەسەرچی تەکفیریان ئەکات گەر خۆشی هەمان عەقیدەی ئەوانی هەبوو بێت ؟!

جا ئەم پێشەکیەم بۆ ئەوە باسکرد دوای ئەوەی عمومیەکم مولزەم بە دوو کوفر ئەیووت بەم قسەیەی تۆ بێت ئەبێ لەفزییە غەیر مەخلوقیەکانیش تەکفیر بکەیت! بەم قسەیەی دەری خست هەروەک چۆن لە مەزهەبی ئەهلی سوننە حاڵی نەبووە لەم بابەتە، وە هەروەک چۆن لە مەزهەبی لەفزییە مەخلوقیەکان حاڵی نەبووە، ئاواش لە مەزهەبی لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان حاڵی نەبووە، چونکە لەفزییە مەخلوقیەکان ئەم قسەیەی تۆ ناکەن تا مولزەم بکرێن پێی، وە من دڵنیام لەوەی کە عەقیدەی دوو جەزائیریەکە و جەماعەتەکەیان زۆر پیسترە لە عەقیدەی لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان بە جۆرێک کە ئەتوانین لە چەندین لاوە دوو جەزائیریەکە و شوێنکەوتوانیان مولزەم بکەین بە کوفر

ئێستاش ئەچینە سەر ووتەکەی الکرجي القصاب، الکرجي ئەڵێ لەفز بە قورئان غەیر مەخلوقە کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کە باسی لەفزیەکان ئەکات بەو ئایەتە ڕەددیان ئەداتەوە کە دەربارەی ووتەکەی الولید بن المغیرة دابەزی، پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم قورئانی بۆ کافرانی قورەیش ئەخوێندەوە الولید ئەیووت ئەم قورئانە کەلامی

مرۆڤە (إن هذا إلا قول البشر) تێبگە بۆچی ئەبێت الكرجي ئەم ئایەتە بەرامبەر لەفزییەکان بەکاربهێنێت گەر مەزهەبی لەفزییەکان وەک ئەوە نەبێت کە من باسم کردووە لە پۆستەکان ؟ لەفزییەکان ئەیان ووت قورئان لەسەر زمانی مرۆڤ وەکو کەلامی مرۆڤ وایە و مەخلوقە بەڵام بە نسبەت الله کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، ئایا الولید ئەیووت فعلی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم مەخلوقە کە قورئان ئەخوێنێ بەڵام قورئانەکە غەیر مەخلوقە ؟! یان ئەیووت قورئانە مەخلوقە و ووتەی مرۆڤە ؟

ئینجا سەیری ووتەکانی تری الكرجي بکە تا باشتر تێبگەیت لەفزییەکان عەقیدەیان چۆن بووە، ئایا ئەیان ووت قورئان لەسەر زمانی عەبد ئەبێتە مەخلوق یان ئەیان ووت فعلی عەبدەکە مەخلوقە قورئانەکە غەیر مەخلوقە ؟

الكرجي ئەم شتانەی باسکرد:

- مرۆڤ کاتێک قورئان ئەخوێنێ قورئان نابێتە ووتەی مرۆڤ

- جبریل مەخلوقە بەڵام کە جبریل قورئانی خوێند بەسەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم قورئانەکە نەبووە مەخلوق

- پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم مەخلوقە بەڵام کە قورئانی خوێند بەسەر هاوەڵانیدا قورئانەکە نەبووە مەخلوق

- قورئانخوێنان مەخلوقن بەڵام تا قیامەتیش قورئان بخوێنن قورئان هەر نابێتە مەخلوق

- دەمەکان مەخلوقن ڕێگای دەرچوونی قورئانن، وە قورئانەکە غەیر مەخلوقە کە دەم ئەدای ئەکات

- قورئان کەلامی الله یە، الله قسەی پێکردووە یەکەم جار، قورئان نابێتە کەلامی عەبد هەر چۆنێک ئەدای بکات و حەملی بکات، وە نابێتە حیکایەت

دوای هەموو ئەمانەش الكرجي ووتی: نازانم چۆن ئەم شتانە ناڕوون و تێکەڵ بوونە بۆ لەفزییەکان و ئەوانەی باسی حیکایەت ئەکەن ؟!

ئەم ووتانەی الكرجي بخوێنەوە دەربارەی لەفزییەکان، ئینجا بەراوردی بکە لەگەڵ ووتەکانی من دەربارەی لەفزییەکان کە ئەڵێم: لەفزییەکان ئەیان ووت قورئان لەسەر زمانی عەبد ئەبێتە مەخلوق وەک کەلامی عەبد وایە، وە بەراوردی بکە لەگەڵ ووتەی دوو جەزائیریەکە و جەماعەتەکەیان کە ئەڵێن: لەفزییەکان ئەیان ووت فعلی عەبدەکە مەخلوقە کە قورئان ئەخوێنێ بەڵام قورئانەکە غەیر مەخلوقە، بزانە ووتەکەی الكرجي لەگەڵ تێگەیشتنی کاممان یەک ئەگرێتەوە، لە کاتێکدا الكرجي لە لەفزییە غەیر مەخلوقیەکانە واتا غلوی هەیە لەم بابەتە نەک شل بێت و بەلای جەهمیەکاندا بچێت.

---------------------------

ماویەتی

# بەشێک

## ئیمان ئەکەن بە کوفر بۆ دەرچوون لەو تەنگژەیەی بۆ خۆیان دروست کردووە!

دوای ئەوەی ریوایەتی ئیمام احمدم هێنا لەلای ابن بطة لە الإبانة الكبرى كە الخلال-یش هەمان ریوایەتی هێناوە لە السنة، وە ووتم گەر ئەم ریوایەتە كوفر بێت و مەزهەبی لەفزیەكان بێت ابن بطة و الخلال چۆن ریوایەتی ئەكەن و لێی بێدەنگ ئەبن ؟ ئایا ئەكرێ ئەم دوو زانا گەورەیە لە كتێبی عەقیدەیی كوفر لە ئیمام احمد ریوایەت بكەن و لێی بێدەنگ بن ؟ بێگومان مەحاڵە، ئەمەش ئەوە دەرئەخات كە ووتەكانی ئیمام احمد كوفر نیە و مەزهەبی لەفزیەكان كە لەم ریوایەتەدا هاتووە، وە ابن بطة و الخلال ئەم ریوایەتەیان قبوڵە و ماناكەی بە دروست ئەزانن.

جا كابرای عمومی هاتووە بۆ بەتاڵ كردنەوەی ئەم ریوایەتە ئەڵێ: ابن بطة مەنهەجی وایە لە كتێبی الإبانة الكبرى كە ریوایەتی كوفریش بهێنێت لێی بێدەنگ ئەبێت، بۆیە ریوایەتەكە ئەهێنێ تاكو بۆ خەڵكی ڕوون بكاتەوە كە ئەم ریوایەتە مونكەرە و باطلە، بەڵام هیچ قسەی لەسەر ناكات خەڵك ئەبێ خۆیان بزانن كە ریوایەتەكە باطلە!!! لە

کتێبی عەقیدەیی ریوایەتی کوفری ئەهێنێت و لێی بێدەنگ ئەبێت، خەڵکیش ئەبێ خۆیان بزانن ریوایەتەکە باطله و کوفره بەبێ ئەوەی ابن بطة هیچ قسەیەک بکات!!!

زانایانی فەرموودە بە تایبەتی بوخاری و مسلم مەنهەجیان وایە کە ژمارەیەک ریوایەت ئەهێنن دواتر ریوایەتێکی تر بە دوایدا دەهێنن کە بەشێک لە مەتنەکەی جیایە یان سەنەدەکەی جیایە مرفوع کراوە بە موقوف یان موقوف کراوە بە وقف، جا ریوایەتەکە جیایەکە ئەهێنم تاکو دەری بخەن کە ئەم ریوایەتە مەحفوز نیە ئەوانی تر مەحفوزن، ئەمەش دەرنابڕن بەڵکو ئەبێ خۆت تێی بگەیت، ئەمە لە هەندێک کتێبەکانی فەرموودو هەندێک زانا ئەم مەنهەجە پەیڕەو ئەکەن کە دیارترینیان بوخاری و مسلم-ە، بەڵام زانایان لە کتێبە عەقیدەییەکان ریوایەتی کوفری بهێنن و لێی بێدەنگ بن بڵێن با خەڵک بۆخۆی بزانێ کە ئەمە کوفرە ئێمە باسی ناکەین! ئەمە بوونی نیە لە کتێبە عەقیدەییەکان، بەڵکو ئەوەی مەشهورە لەلای زانایانی عەقیدە لە سەلەف ئەوەیە کە هەر ریوایەتێک بهێنن مەتنەکەیان قبوڵە بۆیە ئەیهێنن،

جا کابرای عمومی بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت مەنهەجی ابن بطة ئاوایە کە کوفر ریوایەت ئەکات و لێی بێدەنگ ئەبێت، هات دوو ریوایەتی دەرهێناوە لە کتێبی الإبانة الکبری بە حیسابی خۆی ئەم دوو ریوایەتە کوفریان تێدایە کەچی ابن بطة لێی بێدەنگ بووە، ئەمەش ئەوە دەرئەخات کە ئاساییە ابن بطة بە هەمان شێوە ریوایەتەکەی ئیمام احمد دەربارەی تەفسیلەکە بە کوفر بزانێت بەڵام لێی بێدەنگ بێت هەروەک ئەم دوو ریوایەتە!

باشە با بزانین دوو ریوایەتەکە کامەن کە کابرای عمومی بە کوفری ئەزانێت و ابن بطة لێی بێدەنگ بووە ؟

## ریوایەتی یەکەم :

ابو عمران الصاصي ئەڵێ:

بیستم پیاوێک لە ئەهلی شام پرسیاری لە باوکی عبدالله احمد بن حنبل ئەکرد، پێی ووت: ئەی باوکی عبدالله کەسانێک لەلای ئێمە ئەڵێن: کەلام و ناو و صیفاتی الله مەخلوقن.

احمد بن حنبل ووتی(١) : الله تبارك وتعالى هیچ شتێک لە سیفەتەکانی و کەلامی و ناوەکانی مەخلوق نین.

ووتی(٢) : لەسەر زمانی مەخلوقەکانیش مەخلوقن نین.

ووتی(٣): ئەی چ شتێک مەخلوقە ؟

ووتی(٤): هەموو شتێک لەسەر زمانی مەخلوقەکان مەخلوقە.

**(الإبانة الكبرى : ٢٣٠٢)**

لە هەردوو چاپی الإبانة الكبرى بە تەحقیقی عادل و بە تەحقیقە کۆنەکە کە چەند کەسێک بەشدار بوونە تێیدا ئەم ریوایەتە بەم جۆرە هاتووە، چوار جار (ووتی)

هاتووه، بەڵام لە جاری دووەم و سێیەم و چوارەم دیاری نەکردووە کە کێ خاوەنی ووتەکەیە، احمد یان خاوەنی پرسیارەکە ؟ بەڵام لە سیاقی ریوایەتەکە بە ڕوونی دیارە کە ووتی یەکەم و ووتی چوارەم ووتەی ئیمام احمدە، وە ووتی سێیەم ووتەی خاوەنی پرسیارەکەیە، ئەوەی ئەمێنێتەوە ووتی دووەمە ئایا ووتەی ئیمام احمدە یان ووتەی خاوەن پرسیارەکە ؟ لە تەحقیقی عادل آل حمدان ووتی دووەمیش بە ووتەی ئیمام احمد دانراوە، بەڵام لە تەحقیقەکەی تر ووتی دووەم بە ووتەی خاوەن پرسیارەکە دانراوە، چونکە دوای ووتەکە هێنای پرسیاریان داناوە (؟) واتا ووتەی خاوەن پرسیارە، وە دانەرانی کتێبی (الجامع لعلوم الإمام أحمد : ٣/٥٦٩) ئەوانیش ووتەی دووەمیان بە ووتەی ئیمام احمد داناوە، وە مەعلومە دانانی نیشانەی پرسیار و یان هێمای سەرسوڕمان و دانانی خاڵ لەکۆتایی و ژمارە دانان بۆ ریوایەتەکان هەموو ئەمانە کاری محققەکانە نەک خاوەنی کتێبەکە، چونکە لە سەردەمی ابن بطة ئەم شتانە نەبووە، جا محقق بەپێی فەهمی خۆی بۆ دەقەکان فاریزە و خاڵ و هێمای پرسیار و سەرسوڕمان دائەنێت.

با ئێستا بێینە سەر ریوایەتەکە ئایا سیاقەکەی وائەخوازێ ووتەی دووەم هی کامیان بێت ؟

ووتەی یەكەم ڕوونە هی ئیمام احمدە كە ئەڵێ: هیچ شتێك لە كەلام و ناو و سیفەتەكانی الله مەخلوقن نین

ووتەی سێیەم ڕوونە هی پرسیاركەرە كە ئەڵێ: ئەی چ شتێك مەخلوقە ؟

بۆ تێگەیشتن لە سیاق ئەبێ بگەڕێینەوە بۆ سابق و لاحق تاكو لە سیاقەكە تێبگەین، واتا ئەبێ ووتەی پێش و پاشتری وەربگرین تاكو بزانین ووتەكەی ناوەڕاست باسی چی ئەكات یان ووتەی كێیە

لە ووتەی یەكەم ئیمام احمد ئەڵێ هیچ شتێك لە كەلام و ناو و سیفەتەكانی الله مەخلوق نین

ووتەی دووەم ئەڵێ لەسەر زمانی مەخلوقەكانیش مەخلوق نیە

ووتەی سێیەم ئەڵێ ئەی چ شتێك مەخلوقە ؟

ناكرێ كابرا لە ووتەی دووەم پرسیار لە ئیمام احمد بكات بڵێ: لەسەر زمانی مەخلوقەكانیش مەخلوق نیە ؟ ئینجا هێشتا ئیمام احمد وەڵامی پرسیارەكەی نەداوەتەوە ڕێك پرسیارێكی تری لێ بكات بە ووتەی سێیەم!

گەر ووتەی دووەم ووتەی كابرا بێت و پرسیار بكات لە ئیمام احمد ئەوا ئەبێ چاوەڕێی وەڵامی ئەو بكات ئینجا پرسیارێكی تر بكات، نەك دوو پرسیار لە دوای یەكتر بكات بەبێ ئەوەی وەڵامی پرسیاری یەكەم وەربگرێ

جا بە پێی عەقیدەی ئیمام احمد و تێگەیشتنی ابن بطة و سیاقی ریوایەتەكە هەموو ئەوانە وائەخوازێ كە ووتەی دووەم ووتەی ئیمام احمدە نەك پرسیاری كابرا بێت،

ئەمە لە کاتێکدا پرسیاری پیاوەکە پەیوەندی هەیە بە وەڵامەکەی ئیمام احمد، ئیمام احمد ئەڵێ هیچ شتێک لە کەلام و ناو و سیفەتەکانی الله مەخلوق نین، وە لەسەر زمانی مەخلوقەکانیش مەخلوق نین، ئینجا کابرا ئەڵێ: ئەی چ شتێک مەخلوقە ؟ ئەمە ئەگونجێ لەگەڵ سیاقەکە، نەک کابرا بڵێ: لەسەر زمانی مەخلوقەکانیش مەخلوق نین ؟ ئەی چ شتێک مەخلوقە ؟ هێشتا وەڵامی پرسیاری یەکەمی وەرنەگرت چۆن پرسیاری دووەم ئەکات لە کاتێکدا پرسیاری دووەم پەیوەندی بە وەڵامەکەی ئیمام احمد هەیە کە ووتی لەسەر زمانی مەخلوقەکانیش کەلام و ناو و سیفەتەکانی الله مەخلوق نین، کابراش ئەڵێ: ئەی چ شتێک مەخلوقە ؟ ئینجا ئیمام احمد لە ووتەی چوارەم و کۆتایی وەڵامی ئەداتەوە ئەڵێ هەموو شتێک لەسەر زمانی مەخلوقەکان مەخلوقە، کە پێشتر پێی وتووە کەلامی الله و ناو و سیفەتەکانی لەسەر زمانی مەخلوقات نابن بە مەخلوق، بەڵام شتەکانی تر لە کەلامی خۆیان هەمووی مەخلوقە لەسەر زمانیان.

ئەم ڕیوایەتەش هاوشێوەی ڕیوایەتی احمد بن الحسن الترمذي وایە کە پێشتر پۆستم الخلال لە السنة هێناویەتی

ئیمام احمد بە احمد بن الحسن الترمذي ئەڵێ: ئایا تۆ مەخلوق نیت ؟

ئەڵێ: بەڵێ

پێی ئەڵێ: ئایا هەموو شتێک لە تۆدا مەخلوق نیە ؟

ئەڵێ: بەڵێ

پێی ئەڵێ: ئەی قسە کردنت ئەویش لە تۆ نیە و مەخلوق نیە ؟

ئەڵێ: بەڵێ

پێی ئەڵێ: ئەی کەلامی الله عز وجل ئایا لە الله نیە ؟

ئەڵێ: بەڵێ

پێی ئەڵێ: ئایا شتێک هەیە لە الله دا مەخلوق بێت ؟!

**(السنة للخلال : ١٨٣٧)**

موتەئەخیرینی حەنابیلە خیلافیان تێکەوت کە ئایا پیتەکان مەخلوقن یان غەیر مەخلوقن، هەندێکیان ووتیان غەیر مەخلوقن، وە ئەوانی تر ووتیان: دوو جۆر پیت هەیە پیتێکیان مەخلوقە و پیتێکیان غەیر مەخلوقە.

ابن تیمیة ئەڵێ: ئەوانەی کە ئەیان ووت پیتەکان مەخلوق نین دەستیان گرتبوو بەم ریوایەتەی احمد کە کاتێک السري السقطي ئەڵێ: الله پیتەکانی دروستکرد، احمد ووتی ئەمە کوفرە، وە ئەوانی تر کە ئەیان ووت پیت دوو جۆرە یەکێکیان مەخلوقە و ئەوی تریان غەیر مەخلوقە دەستیان بەو ووتەیەی احمد گرتبوو کە ئەڵێ: هەموو شتێک لە مەخلوقەکان لەسەر زمانی مەخلوقەکان مەخلوقە، وە دەستیان گرتبوو بەو ووتەیەی احمد کە ئەڵێ: گەر بابەتەکە بەو جۆرە بێت کە لەفزیەکان باسی ئەکەن ئەوا نوێژ دروست و تەواو نەئەبوو بە قورئان هەروەک چۆن دروست و تەواو نابێت بە غەیری قورئان لە کەلامی خەڵک، وە دەستیان گرتبوو بە ووتەکەی احمد

کە بە احمد بن الحسن الترمذي ئەڵێ: ئایا تۆ مەخلوق نیت ؟ ئەویش ئەڵێ بەڵێ، احمد ئەڵێ: ئایا هەموو شتێک لە تۆدا مەخلوق نیە ؟ ئەڵێ بەڵێ، احمد ووتی: کەلامی تۆش هەر لە تۆیە و مەخلوقە.

ئینجا ابن تیمیة ئەڵێ: ئەوەی احمد وتوویەتی لەم بابەتەدا سەوابە، هەندێکیان پشتڕاستی ئەوی تریان ئەکەنەوە، لە ووتەکانیدا دژبەیەکی بوونی نیە، احمد ئینکاری لەسەر ئەو کەسە کرد کە ئەڵێ: الله پیتەکانی دروستکرد، چونکە هەر کەسێک بڵێ پیتەکان مەخلوقن ئەوا ووتەکەی ئەوە ئەگرێتەوە کە الله قسەی نەکردووە بە قورئانی عەرەبی، وە قورئانی عەرەبی مەخلوقە، وە احمد ووتی کە کەلامی ئادەمیزاد مەخلوقە هیچ شتێکی لە کەلامی ئادەمیزاد نەکردە غەیر مەخلوق، وە هەموو ئەمانە دروستن.

**بڕوانە (مجموع الفتاوى : ١٢ / ٨٣-٨٥)**

ئینجا ابن تیمیة باسی ئەوانە ئەکات کە ئەیان ووت پیت دوو جۆرە یەکێکیان مەخلوقە و ئەوی تریان غەیر مەخلوقە، ئەڵێ ئەمە عەقیدەی ابن حامد و ابو یعلی و ابن عقیل بووە، کە دواتر ابو یعلی لە کۆتایی تەمەنی لەم عەقیدەیە پەشیمان بۆتەوە و باسی کردووە کە ووتەکانی احمد هەردووک ووتەکە لەخۆ ئەگرێت، ابن حامد و ابو یعلی هەردووکیان لە لەفزییە غەیر مەخلوقیەکانن کە وتوویانە پیت دوو جۆرە یەکێکیان مەخلوقە و ئەوی تریان غەیر مەخلوقە پشتیان بەو ریوایەتە بەستووە کە

احمد ئەڵێ کەلامی اللە هەمووی غەیر مەخلوقە لەسەر زمانی مەخلوقەکانیش هەر غەیر مەخلوقە، وە

کەلامی مەخلوقات هەمووی مەخلوقە لەسەر زمانیان، گەر ئەم ڕیوایەتە کوفر بێت وەک تۆ باسی ئەکەیت هەمان مەزهەبی لەفزییەکان بێت، چۆن بەشێک لە لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان دەستی پێوە ئەگرن و ئەیکەن بە بەڵگە بۆ مەزهەبەکەیان ؟ کەسێکی وەکو ابن حامد چۆن ناڵێ ئەمە کوفرە و مەزهەبی لەفزییەکانە ؟ ئەی ابن تیمیة چۆن ووتەکەی احمد بە حەق ئەزانێت و بە کوفری نازانێت ؟ خۆ گەر ڕیوایەتەکە بەو جۆرە بێت کە تۆ باسی ئەکەیت ئەوا منیش و ابن تیمیة-ش بە کوفری ئەزانین، هەر کەسێک بڵێ هەموو شتێک لەسەر زمانی مەخلوقات ئەبێتە مەخلوق تەنانەت قورئانیش ئەوا گومانمان نیە ئەم کەسە کافرە و لەفزییە، ابن تیمیة-ش پێی کافرە وەک لە عەقیدەکەی دیارە، ئەوەندەش بەس بێت بۆت کە لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان استدلال ئەکەن بەم ڕیوایەتە بۆ مەزهەبی خۆیان دەربارەی پیتەکان، تاکو بزانیت ئەمە لای حەنابیلە کوفر نەبووە لە سیاقەکە تێگەیشتوون بەڵام چونکە تۆ ئیشت بەوەیە کوفر بخەیتە ناو کتێبەکەی ابن بطة بە زۆریش بێت ڕیوایەتەکە ئەکەیت بە کوفر، وە دڵنیام گەر بێتو پێشتر من ئەم ڕیوایەتەم هێنابوایە ئەوا پۆستت ئەکرد لەسەرم ئەت ووت ئەمە جاهیلە لە عەرەبی تێناگات ئەمە درۆ ئەکات بەناوی سەلەفەوە، ئیمام احمد مەبەستی ووتەی مەخلوقەکانە کە لەسەر زمانیان مەخلوقن نەک کەلامی اللە، ئیتر لەم جۆرە قسانەت ئەکرد، بەڵام ئێستا ئیشت

بەوەیە کوفر بخەیتە ناو کتێبەی ابن بطة بۆیە بە زۆر ڕیوایەتەکە ئەکەیت بە کوفر ئەگەرچی ئەو مانایەشی نەبێت، لە کاتێکدا ابن بطة ئەم ڕیوایەتەی لە ژێر بابێکدا هێناوە کە باسی ئەوە ئەکات قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، هەموو ڕیوایەتەکانی تری بابەکە دەربارەی ئەمەن، بۆچی لەناو ئەم ڕیوایەتانەدا ڕیوایەتێکی کوفری ئەهێنێت ؟ گەر ڕیوایەتەکە کوفر بوایە یان نەی ئەهێنا، یان ئەیهێنا تاکو ڕەتیی بکاتەوە و باطلی ڕیوایەتەکە بخاتە ڕوو.

ئێستاش ئەچینە سەر ڕیوایەتی دووەم کە ئەم عمومیە بە کوفری ئەزانێت، ئەڵێ ابن بطة ڕیوایەتی کردووە و لێی بێدەنگ بووە، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت لە مەنهەجی ابن بطة ئاساییە کوفر ڕیوایەت بکەیت و لێی بێدەنگ بیت!

## ڕیوایەتی دووەم :

ابن بطة ئەڵێ:

حدثنا إسماعيل بن محمد الصفار، وأبو محمد الحسن بن علي بن زيد بن حميد العسكري، قالا: حدثنا الحسن بن عرفة، قال: حدثنا خلف بن خليفة، عن حميد الأعرج عن عبدالله بن الحارث عن ابن مسعود قال: قال النبي صلى الله عليه وسلم: (كلم الله موسى يوم كلمه عليه جبة صوف وكساء صوف، وبرنس صوف، ونعلان من جلد حمار غير ذكي، فقال: من ذا العبراني الذي يكلمني من الشجرة ؟ قال: أنا الله).

لەم ریوایەتەدا هاتووە پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی: (ئەو ڕۆژەی کە اللە قسەی لەگەڵ موسی کرد، موسی جلێکی صوفی لەبەر بوو، وە دوو نەعلی لە پێدا بوو کە لە پێستی گوێدرێژی مردارەوە بوو دروست کرابوون، جا موسی ووتی: ئەم عیبرانیە کێیە کە لەلای ئەم دارەوە قسەم لەگەڵ ئەکات ؟ اللە فەرمووی: من اللە-م).

کابرای عمومی قسەیەکی کرد بە ڕاستی کارەساتێکی زۆر گەورەیە، هات ووتی: ئەم ریوایەتە کوفرە، بەتاڵ کردنەوەی سیفەتی کەلامە بۆ اللە، هەروەها ئیسبات نەکردنی ئەو فەزیلەتەیە کە بە موسی علیە السلام دراوە اللە ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ کردووە بەبێ وەحی!!!

بۆچی کوفرە ؟ بۆ ئیسباتی سیفەتی کەلام و فەزیلەتەکەی موسای تێدا نیە ؟

چونکە لەم ریوایەتەدا هاتووە کە اللە لە ڕێگای دارەکەوە قسەی لەگەڵ موسی کردووە! واتا اللە خۆی قسەی لەگەڵ نەکردووە بەڵکو دارەکەی بە قسە هێناوە، ووتەکە ووتەی دارەکەیە بە پێی ئەم ریوایەتە، کەواتە ریوایەتەکە سیفەتی کەلام بۆ اللە بەتاڵ ئەکاتەوە و فەزیلەتەکەی موساش بوونی نامێنێت!!!

چەند هەڵوەستەیەک ئەکەین لەسەر هەڵەکانی دەربارەی ئەم ریوایەتە، کە نە لە ڕووی زانستی فەرموودەوە لە باسەکە تێگەیشتووە، نە لەڕووی عەقیدەییەوە کە مانای ریوایەتەکە چیە

کابرای عمومی ئەڵێ:

ئەم سەنەدە حمید الأعرج ی تێدایە کە ریوایەتەکانی مونکەرن، وە ئەم ریوایەتەش مونکەرە و کوفری تێدایە تێیدا هاتووە کە الله خۆی قسەی لەگەڵ موسی نەکردووە بەڵکو لە ڕێگای دارەکەوە قسەی لەگەڵ کردووە! ابن بطة بۆیە هێناویەتی تا روونی بکاتەوە ئەم ریوایەتە مونکەرە، کە لێی بێدەنگ بووە مانای ئەوە نیە مەتنەکەی لەلا قبوڵە!

منیش ئەڵێم:

بەڵێ حمید الأعرج کەسێکی لاوازە و فەرموودەکانی مونکەرە، حمید بن عطاء الأعرج یان حمید بن علي الأعرج خیلاف هەیە لە ناوی باوکی، جیایە لە حمید بن قیس الأعرج کە سیقەیە

**مهنا** ئەڵێ:

پرسیارم لە احمد کرد دەربارەی فەرموودەی: خلف بن خليفة عن حميد الأعرج عن عبدالله بن الحارث عن عبدالله بن مسعود عن النبي صلى الله عليه وسلم: (كلم الله موسى وعليه جبة من صوف) ؟

احمد ووتی: مونکەرە سەحیح نیە، فەرموودەکانی حمید عن عبدالله بن الحارث مونکەرن.

**(المنتخب من علل الخلال : ١٦٥)**

سەیرکەن مهنا الشامي پرسیاری ئەم فەرموودەیە لە ئیمام احمد ئەکات ئەویش ئەڵێ مونکەرە و سەحیح نیە، وە ڕیوایەتەکانی حمید الأعرج لە عبدالله بن الحارث هەمووی مونکەرە، ئەم فەرموودەیەش وەک ئەیبینن حمید الأعرج لە عبدالله بن الحارث ڕیوایەتی کردووە، وە لە هەموو دونیادا ئەم فەرموودەیە ڕیوایەت نەکراوە تەنها بەم ڕێگایە نەبێت (حمید الأعرج عن عبدالله الحارث عن ابن مسعود عن النبي صلى الله عليه وسلم) هەموو دونیا بگەڕێ جگە لەم ڕێگایە هیچ ڕێگایەکی تری نیە ئەم فەرموودەیە، کەواتە بێگومان فەرموودەکە مونکەرە و سەحیح نیە، چونکە سەلەف زۆر تشدد ئەکەن لە فەرموودەی مەرفوع، لەگەڵ ئەوەشدا کە فەرموودەکە مونکەرە و سەحیح نیە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم بەڵام زۆرێک لە زانایانی سەلەف لە کتێبە عەقیدەییەکان ڕیوایەتیان کردووە، وەک: حرب لە مسائلەکانی، عبدالله لە السنة، ابو بکر النجاد لە الرد على من يقول القرآن مخلوق، النجاد قوتابی عبدالله یە، الآجري لە الشريعة، ابن بطة لە الإبانة الكبرى، وە زۆرێکی تر ڕیوایەتیان کردووە بەڵام من تەنها باسی کتێبە عەقیدەییەکان ئەکەم.

بەڵام هەر هەموویان کە ڕیوایەتیان کردووە لە ڕێگای حمید الأعرج عن عبدالله بن الحارث عن ابن مسعود عن النبي صلى الله عليه وسلم تەنها ئەمەندەیان ڕیوایەت کردووە: (كلم الله موسى يوم كلمه عليه جبة صوف وكساء صوف، وبرنس صوف،

ونعلان من جلد حمار غير ذكي). بەبێ ئەو زیادەیەی کۆتایی کە موسی ئەڵێ: (ئەو عیبرانیە کێیە لەلای ئەم دارەوە قسەم لەگەڵ ئەکات ؟ اللە-ش ئەفەرمووێ: من اللە-م).

ئەو زیادەیەی کۆتایی کە ئەم عومیە بە کوفری ئەزانێت بە فەهمی خۆی، ئەم زیادەیە لە دونیادا کەس ریوایەتی نەکردووە جگە لە ابن بطة، واتا هەموو زانایان کە ئەم ریوایەتە ئەهێنن تاکو ئەم بەشە ریوایەتیان کردووە (من جلد حمار غير ذكي) تەنها ابن بطة بەشەکەی کۆتایی زیاد کردووە کە ئەم عومیە بە کوفری ئەزانێت، جا عومیەکە ئەڵێ ابن بطة بۆیە ریوایەتی کردووە تاکو روونی بکاتەوە ریوایەتەکە مونکەرە! بەڵام بەهۆی جەهلیەوە بە زانستی فەرموودە بێ ئاگایە لەوەی کە ئەو زیادەیەی کە ئەو بە کوفری ئەزانێت ابن بطة خۆی زیادی کردووە نەک حميد الأعرج

الترمذي

ابو يعلى الموصلي

سعيد بن منصور

حرب الكرماني

عبدالله بن الإمام أحمد

ابو بكر النجاد

الآجري

ابن بطة

البزار

ابن شاهين

الحسن بن عرفة

الطبري

ابن حبان

العقيلي

ابن عدي

البيهقي

الحاكم

الخطيب البغدادي

ابن عبدالبر

هەموو ئەمانە فەرموودەکەیان ریوایەت کردووە لە ڕێگای (خلف بن خليفة عن حميد الأعرج عن عبدالله بن الحارث عن ابن مسعود عن النبي صلى الله عليه وسلم) بەبێ

هێنانی ئەم زیادەیەی کۆتایی کە ابن بطة هێناویەتی، گەر بووترێ ئەی ناکرێ هەڵەکە لە شێخی ابن بطة بێت واتا اسماعيل بن محمد الصفار، یان لە شێخی شێخەکەی بێت واتا الحسن بن عرفة ؟ ئەڵێین نەخێر، چونکە هەر یەکە لە الخطيب البغدادي و ابن حجر العسقلاني ئەم فەرموودەیان ڕیوایەت کردووە لە ڕێگای اسماعيل بن محمد الصفار عن الحسن بن عرفة، بەبێ هێنانی ئەم زیادەیە، تەنانەت الحسن بن عرفة جوزئێکی حەدیثی هەیە اسماعيل بن محمد الصفار هەمان فەرموودەی لێ ڕیوایەت ئەکات بەبێ ئەم زیادەیە، بۆیە بێ شک و گومان ئەم زیادەیە هەڵەی ابن بطة یە لەلای ئەو زیاد کراوە نەک هەڵەی حميد الأعرج بێ زیادکراوەکە، واتا سەرەرای مونکەری فەرموودەکە بەهۆی حميد الأعرج ابن بطة ئەم بەشەی کۆتاییشی زیاد کردووە کە وەهمی خۆیەتی و تەنها خۆی ئەم بەشەی ڕیوایەت کردووە لە دونیادا، ئەمەش لەلای زانایان روونە تەنها ابن الجوزي جەهمی نەبێت ئەڵێ: ئەم زیادەیەی کۆتایی سەحیح نیە، کەلامی الله لە کەلامی مەخلوقات ناچێ، وە حميد الأعرج تۆمەتبارە بەم هەڵەیە، بەڵام الذهبي و ابن حجر وەڵامیان داوەتەوە کە خەڵکانی تر ئەمەیان ڕیوایەت کردووە لە حميد الأعرج کەس ئەم زیادەیەی کۆتایی نەهێناوە جگە لە ابن بطة تەنانەت شێخی ابن بطة لەم سەنەدە ئەویش ڕیوایەتی کردووە هەر نەیهێناوە، واتا هەموو تەبەقەکانی سەنەد لە ابن بطة تاکو ئەگات بە مەداری فەرموودەکە کە خلف بن خليفة-یە کەسیان ئەم زیادەی نەهێناوە جگە لە ابن بطة

جا لێرەدا بەهۆی جەهلی کابرای عمومی بە زانستی فەرمووده دەرکەوت کە ئەو زیادەیەی ئەو بە کوفری ئەزانێ ابن بطة ریوایەتی نەکردووە تاکو مونکەری ریوایەتەکە دەربخات بەڵکو خۆی هەڵەی کردووە و ئەم بەشەی زیاد کردووە، نەک بزانێ هەڵەیە بە ئەنقەست ریوایەتی بکات بۆ دەرخستنی مونکەریەکەی، وە مەعلومیشە ابن بطة حیفزی زۆر باش نیە لە فەرمووده بە تایبەتی مەرفوعەکان هەموو ئەوانەشی کە ریوایەتیان کردووە هەموویان لەو باشترن لە حیفزدا کە کەسیان ئەم زیادەیەی نەهێناوە.

جەهلێکی تری ئەم عمومیە بە زانستی فەرمووده هاتووە تەزعیف کردنی زانایان بۆ فەرموودەکە نەقل ئەکات، بەڵام بێ ئاگایە زاناکان کە ئەڵێن ئەمە مونکەرە و حميد الأعرج ی تێدایە مەبەستیان فەرموودەکەیە بەبێ زیادەکەی ابن بطة، واتا ئەوان کێشەیان لەگەڵ ئەسلی فەرموودەکە هەیە بەبێ زیادەکەی ابن بطة، مەعلومە ئیمام احمد پێش لە دایکبوونی ابن بطة و هێنانی زیادەکە ئەم فەرموودەیەی تەزعیف کردووە، الترمذي و غەیری ئەویش بە هەمان شێوە، بەڵام تۆی عمومی کێشەت لەگەڵ زیادەکەیە کە بە کوفری ئەزانیت واش ئەزانی زانایان وەکو تۆ ئەم زیادەیە بە کوفر ئەزانن بۆیە تەزعیفیان کردووە، نازانی کە زانایان هەر ئەسلی فەرموودەکە بە زەعیف ئەزانن پێش ئەوەی ابن بطة بەشەکەی کۆتایی زیاد بکات .

بەڵام المعلمي پێی وایە ئەم زیادەیەی کۆتایی مدرج-ە نەک بەشێک بێت لە فەرموودەکە، واتا ابن بطة کە فەرموودەکەی ریوایەت کردووە وەکو خۆی ریوایەتی

کردووە، دوای تەواو بوونی ریوایەتەکە هاتووە ئەم قسەیەی کردووە وەکو شەرحێک بۆ فەرموودەکە و زیادەیەکی روونکردنەوە، نەک وەک بەشێک لە فەرموودەکە هێنابێتی، واتا المعلمي پێی وایە ئەم بەشە (فقال: من ذا العبراني الذي يكلمني من الشجرة ؟ قال: أنا الله) قسەی ابن بطة یە، نەک وەک بەشێک لە فەرموودەکە ریوایەتی کردبێ، ئەمەش پێی ئەووترێ (مدرج) کاتێک قسەی راوییەکە داخیلی ناو فەرموودەکە ئەکرێ وەک بەشێک لە فەرموودەکە حیساب ئەکرێ، هەر چەندە ئەم رەئیەی المعلمي لاوازە چونکە خودی ووتەکە لەوە ناچێت قسەی ابن بطة بێت وەک تەعلیقدان لەسەر ریوایەتەکە بەڵکو هەر لە چوارچێوەی ریوایەتەکە زیادی کردووە ابن بطة، بەڵام المعلمي ئەمەی لە رەددی الكوثري جەهمی ووتوە، چونکە الكوثري ئەڵێ: ابن بطة موشەبیهەیەکی درۆزنە، ئەم درۆیەی زیادکردووە تاکو مەزهەبی خۆی پێ سەربخات، وە ابن الجوزي جەهمی ئەویش ئەم زیادەیە بە تەشبیه ئەزانێت، سەیرەکە لەوەدایە جەهمیەکان ئەم زیادەیەی ابن بطة بە کوفر و تەشبیه ئەزانن، کەچی کابرای عمومی ئەم زیادەیە بە جەهمیەت و نەفیکردنی سیفەتی کەلام ئەزانێت!!!

گەر بووترێ کە ریوایەتەکە مونکەرە ئەی بۆچی حرب الكرماني و عبدالله و ابو بكر النجاد و الآجري و ابن بطة ریوایەتیان کردووە لە کتێبە عەقیدەییەکان ؟

لەبەر ئەوەیە سەرەتای فەرموودەکە ئیسبات کردنی ئەوەی تێدایە کە الله قسەی لەگەڵ موسی کردووە، هەروەک لە سەرەتای مەتنەکەدا هاتووە، مەنهەجی زانایانی سەلەفیش وابووە کە فەرموودەی زەعیف ڕیوایەت ئەکەن لە کتێبەکانیان لەبەر ئەوەی مەتنەکەی دروستە و پشتڕاست کەرەوەی عەقیدەی ئەهلی سوننەیە، نەک وەک ئەم عومیە جاهیلە کە ئەڵێ زاناکانی سەلەف هەندێکیان لە کتێبە عەقیدەییەکان هەموو جۆرە ڕیوایەتێک ئەهێنن تەنانەت ڕیوایەتی موخالفی ئەهلی سوننەش ئەهێنن و لێی بێدەنگ ئەبن، کاتێکیش هات نموونەی هێنایەوە دوو نمونەی هێنایەوە کە سەقەتی فەهمی خۆی دەرخست بە تایبەت ڕیوایەتی دووەم هەر کارەساتە کە ئێستا باسی ئەکەم.

کابرای عومی ئەڵێ: ئەم بەشەی ڕیوایەتەکە کە موسی ئەڵێ (ئەم عیبرانیە کێیە لەلای دارەکە قسەم لەگەڵ ئەکات ؟ پاشان الله ئەفەرمووێ: من اللە-م) ئەم بەشە کوفرە نەفیکردنی سیفەتی کەلامە بۆ اللە، واتا الله قسەی لەگەڵ موسی نەکردووە، هەروەها نەفیکردنی فەزیلەتەکەی موسایە کە الله ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ کردووە، چونکە ئەم ڕیوایەتە ئەڵێ الله لە ڕێگای دارەکەوە قسەی لەگەڵ موسی کردووە نەک خۆی قسە لەگەڵ موسی بکات!!!

بەم فەهمە سەقەتەی خۆی و بەهۆی جەهلی خۆی بە قورئان و تەفسیری سەلەف هاتووە ئیمان ئەکات بە کوفر، جاهیل ئەم بەشە زیادە کە ابن بطة زیادی کردووە ئەگەرچی لە ڕووی سەحیحیەوە ئیسبات نەبووە لەم ڕیوایەتەدا بەڵام هەمان مانا لە

قورئان و تەفسیری سەلەف هەیە، ئەم زیادەیە پشتڕاست کەرەوەی هەیە لە قورئان و تەفسیری سەلەف، نەک کوفر بێت وەک ئەوەی تۆی جاهیل بەهۆی نەزانی و تێنەگەیشتنت باسی ئەکەی.

سەیری قورئان بکە کاتێک الله یەکەم جاری قسەکردنی خۆی لەگەڵ موسی باس ئەکات کاتێک موسی ئەڕوات ئاگر بهێنێت بۆ ژن و منداڵەکەی

عن قَتادة قوله: ﴿فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِيَ مِنْ شَاطِئِ الْوَادِي الأيْمَنِ فِي الْبُقْعَةِ الْمُبَارَكَةِ مِنَ الشَّجَرَةِ﴾ قال: نودي من عند الشجرة ﴿أَنْ يَامُوسَى إِنِّي أَنَا اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾.

**(تفسير الطبري)**

***قتادة*** ئەڵێ: لەلای دارەکەوە الله موسای بانگ کرد.

واتا موسی دەنگەکەی لەلای دارەکەوە بیست، نەک دارەکە قسە بکات بەناوی الله-وە، یان الله کەلامێک دروست بکات لە دارەکەدا، بێگومان کاتێک تۆ دەنگێک ئەبیستی هەر لەلایەکێک یان لە چەند لایەک دەنگەکە ئەبیستی، موساش دەنگی الله ی بیست لەلای دارەکە، نەک دارەکە قسە بکات و الله قسە نەکات

عن عبد الله قال: رأيت الشجرة التي نودي منها موسى عليه السلام.

**(تفسير الطبري)**

**ابن مسعود** ئەڵێ: دارەکەم بینی کە لەلایەوە موسى عليه السلام بانگ کرا.

عَنْ أَبِي بَكْرٍ الثَّقَفِيِّ قالَ: فَنُودِيَ مِن شاطِئِ الوادِي الأيْمَنِ -قالَ: عَنْ يَمِينِ الشَّجَرَةِ-: يا مُوسى. فاسْتَأْنَسَ بِالصَّوْتِ، فَقالَ: أيْنَ أنْتَ، أيْنَ أنْتَ؟ قِبَلَ الصَّوْتِ، أنا فَوْقَكَ. قالَ: رَبِّي؟ قالَ: نَعَمْ.

**(تفسير ابن أبي حاتم)**

**ابو بكر الثقفي** ئەڵێ: لە لای ڕاستی دۆڵەکە لەلای ڕاستی دارەکەوە بانگ کرا: ئەی موسى، موساش دڵی کرایەوە بە دەنگەکە، جا موسى ووتی: تۆ لە کوێی ؟ تۆ لە کوێی ؟ ڕووی لە شوێنی دەنگەکە ئەکرد و ئەمەی ئەووت، ووتی: من لە سەرووی تۆم، موسى ووتی: تۆ پەروەردگارمی ؟ الله فەرمووی: بەڵێ.

عَنْ نُوفِ البِكالِيِّ: أنَّ مُوسى لَمّا نُودِيَ مِن شاطِئِ الوادِي الأيْمَنِ قالَ: ومَن أنْتَ الَّذِي تُنادِي؟ قالَ: أنا رَبُّكَ الأعْلى.

**(تفسير ابن أبي حاتم)**

**نوف البكالي** ئەڵێ: کاتێک موسی بانگ کرا لەلای راستی دۆڵەکەوە، موسی ووتی: تۆ کێی بانگم ئەکەی ؟ فەرمووی: من پەروەردگاری بەرزتم.

موسی لەلای دارەکەوە دەنگەکەی بیستووە، ئەمە یەکەم جارە الله قسەی لەگەڵ ئەکات، کاتێک بۆ یەکەم جار دەنگی الله ئەبیستێ نازانێ دەنگەکە هی کێیە، وە دەنگەکە لەلای دارەکەوە دێت، نەک دارەکە قسە بکات یان الله کەلامی خۆی لە دارەکە دروست بکات و دارەکە دەری ببڕێت، ئەمە چ کوفرێکی تێدایە هەی جاهیل کە تۆ باسی ئەکەیت ؟ لە قورئانیش باسی دارەکە کراوە کە لەلای دارەکە موسی بانگ کراوە، ئینجا کە موسی نازانێ ئەم دەنگە هی کێیە زۆر ئاساییە، چونکە ئەمە جاری یەکەمینە کە الله قسەی لەگەڵ بکات، کێ بیری بۆ ئەوە ئەچێت کە یەکەم جار لە ژیانی دەنگێک ببیستی بڵێ ئەم دەنگە دەنگی الله یە ؟ موساش یەکەم جارە ئەم دەنگە ئەبیستێ ئەڵێ تۆ کێی ؟ ئەمە کوفرە ؟

وأخْرَجَ عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، وابْنُ المُنْذِرِ، وابْنُ أبِي حاتِمٍ

عَنْ أبِي صالِحٍ قالَ: كانَ النِّداءُ مِن أيْمَنِ الشَّجَرَةِ، والنِّداءُ مِنَ السَّماءِ.

**(تفسير ابن أبي حاتم و عبد بن حميد و ابن المنذر)**

**أبو صالح** ئەڵێ: بانگ کردنەکە لەلای ڕاستی دارەکە بوو، وە بانگ کردنەکە لە ئاسمان بوو.

واتا اللّه لە ئاسمان موسای بانگ کرد، بەڵام موسی لە زەویدا لەلای ڕاستی دارەکەوە دەنگەکەی بیست

وأَخْرَجَ عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، وابْنُ المُنْذِرِ

عَنْ قَتادَةَ قالَ: نُودِيَ عَنْ يَمِينِ الشَّجَرَةِ.

**(تفسير عبد بن حميد و ابن المنذر)**

**قتادة** ئەڵێ: موسی لەلای ڕاستی دارەکەوە بانگ کرا.

قال البغوي: ﴿مِنَ الشَّجَرَةِ﴾ مِنْ نَاحِيَةِ الشَّجَرَةِ.

**(تفسير البغوي)**

**البغوي** ئەڵێ: (من الشجرة) واتا لەلای دارەکەوە بانگ کرا.

قال يحي بن سلام: وقال قتادة: نودي عن يمين الشجرة، أي: الأيمن من الشجرة.
**(تفسير يحيى بن سلام)**

**يحيى بن سلام** ئەڵێ:

قتادة وتوویەتی: موسى لەلای راستی دارەکەوە بانگ کرا.

وهب بن منبه چیرۆکی موسی لەو کاتەدا بە درێژی باسکردووە، بەڵام من تەنها ئەو بەشەی ئەهێنم کە کارمان پێیەتی لەم بابەتەدا، وە ریوایەتەکەش ئیمام احمد هێناویەتی لە کتێبی (الزهد)

قال وهب من منبه:

فلما بلغ موسى الكرب، واشتد عليه الهول، وكاد أن يخالط في عقله في شدة الخوف لما يسمع ويرى، نودي من الشجرة، فقيل: يا موسى، فأجاب سريعا، وما يدري من دعاه؟ وما كان سرعة إجابته إلا استئناسا بالأنس، فقال: لبيك، مرارا إني أسمع صوتك، وأوجس وجسك، ولا أرى مكأنك، فأين أنت؟ فقال: أنا فوقك ومعك وأمامك وأقرب إليك منك، فلما سمع هذا موسى علم أنه لا ينبغي ذلك إلا لربه جل وعز، فأيقن به، فقال: كذلك أنت يا إلهي، فكلامك أسمع أم رسولك؟ قال عز وجل: بل أنا الذي أكلمك.

**(الزهد للإمام أحمد : ٣٤٢)**

وهب بن منبه ئەڵێ:

دوای ئەوەی موسی شتی سەیرو سەمەرەی زۆر بینی لە دارەکە، زۆر ترسا خەریک بوو عەقڵی تێک بچێت بەهۆی ئەو دیمەنانەی ئەیبینی و ئەیبیست، جا لەلای دارەکە بانگ کرا ووترا: ئەی موسی.

موساش بە خێرایی وەڵامی دایەوە، وە نەیزانی کێیە بانگی ئەکات، وە لەبەر ئەوە بە خێرایی وەڵامی دایەوە چونکە بە دەنگەکە دڵی کرایەوە و ترسی لەسەر لاچوو، موسی چەند جارێک ووتی: لبيك، من دەنگت ئەبیستم و هەست بە دەنگت ئەکەم، بەڵام شوێنت نابینم تۆ لە کوێی ؟

ووتی: من لە سەرووی تۆم و لەگەڵتم و بەرامبەرتم و نزیکترم لە تۆ وەک لەخۆت، جا کاتێک موسی ئەمەی بیست زانی کە ئەم وەسفانە بۆ هیچ کەسێک نابێت جگە لە پەروەردگاری جل وعز، جا دڵنیا بوو کە ئەمە پەروەردگاریەتی، موسی ووتی: ئیلاهم تۆ ئاوای کە باست کرد، بەڵام ئەمە دەنگی تۆیە ئەیبیستم یان دەنگی فریشتەیەکی نێردراوتە ؟ الله عز وجل فەرمووی: بەڵکو خۆمم قسەت لەگەڵ ئەکەم.

ابن بطة لە زیادکراوە زەعیفەکەیدا ئەڵێ: موسی ووتی ئەو عیبرانیە کێیە لەلای دارەکە بانگم ئەکات ؟ الله فەرمووی: من الله-م.

ئەم ووتەیە چ کوفرێکی تێدایە ؟ ماناکەی لە قورئان و تەفسیری سەلەفدا هەیە بۆ کوفرە ؟ هەموو ئەو زانایانە تەفسیریان کرد کەسیان نەیانزانی کوفرە ؟ ئەی چی لە ئایەتەکە ئەکەی کە باسی دارەکە ئەکات ؟

﴿فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِیَ مِن شَـٰطِیِٕ ٱلۡوَادِ ٱلۡأَیۡمَنِ فِی ٱلۡبُقۡعَةِ ٱلۡمُبَـٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن یَـٰمُوسَىٰۤ إِنِّیۤ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَـٰلَمِینَ﴾ [القصص: ٣٠]

لە ئایەتەکەدا هاتووە کە موسی علیه السلام بانگ کرا لەلایەن الله، موسی دەنگەکەی بیست لەلای ڕاستی دارەکەوە لە دۆڵەکە، وە یەکەم جار بوو الله قسەی لەگەڵ بکات موسی نازانێت کێیە قسەی لەگەڵ ئەکات، وە دەنگەکە لەلای دارەکەوە ئەبیستێ، وە الله بە زمانی موسی قسەی لەگەڵ موسی کردووە کە زمانی عیبریە.

هەر ئەمەشە کە ابن بطة باسی کرد کە سەلەفیش لە تەفسیری ئایەتەکە باسیان کردووە موسی نەیزانی کێیە بانگی ئەکات، وە دەنگەکەی لەلای دارەکەوە بیستووە، نەک دارەکە بێتە قسە کردن و قسە بکات، یان الله کەلامێک لە دارەکە دروست بکات و قسەی پێ بکات لەگەڵ موسی

ئەمە فەهمەکەتە ریوایەتێک بە کوفر ئەزانی کە قورئان و تەفسیری سەلەف پشتراستی ئەکەنەوە، تۆش بەهۆی جەهل و تێنەگەیشتنت و بێ ئاگاییت لە قورئان و تەفسیری سەلەف هاتووی ریوایەتەکە بە کوفر ئەزانیت!!! لە کاتێکدا ابن بطة ئەم

ریوایەتەی هێناوە لە ژێر بابێک کە ئەڵێ: هەر کەس ئینکاری ئەوە بکات الله قسەی لەگەڵ موسی کردووە ئەوا کافرە، بەڵام تۆ چونکە ئیفلاست کردووە لە بەڵگە ئەتەوێ بە زۆر بیسەلمێنێ کە ابن بطة کوفر ڕیوایەت ئەکات و لێی بێدەنگ ئەبێت!!! تاکو بەم هۆیەوە ریوایەتی تەفسیلەکەش بە کوفر ناو ببەیت بڵێی ئاساییە ابن بطة لە کوفر بێدەنگ ئەبێت، وە ئەم کارەت دەرگایەکی فراوان ئەکاتەوە بۆ کوفر و زەندەقە وای لێدێت لەمەودوا رەددی هەر فرقەیەک بدەینەوە بە ڕیوایەتێکی کتێبی الإبانة الكبرى، ڕێک فرقەکە وەک تۆ ئەڵێن: مەنهەجی ابن بطة وایە کە کوفر ریوایەت ئەکات و لێی بێدەنگ ئەبێ، ئەم ریوایەتەش کوفرە بەڵام ابن بطة لێی بێدەنگ بووە، ئیتر دەرگایەک ئەکرێتەوە بۆ کوفر هەر مەپرسە!

ئەمەش ووتەی عمومیەکەیە لە خوارەوە هێناومە کە هاتووە زاهیری ئایەتەکە و تەفسیری سەلەف بە کوفر ناو ئەبات بەهۆی تێنەگەیشتنی لە ریوایەتەکە و سەقەتی فەهمەکەی و جاهیلی بە قورئان و تەفسیر و زمانی عەرەبی

ووتەی عمومیەکە:

ئەم ئەسەرە دەڵێت الله عز وجل کاتێک قسەی لەگەڵ موسادا کردوە موسی علیه السلام نەی زانیوە کێیە قسەی لەگەڵ ئەکات چونکە لەڕێگەی دارێکەوە قسەی

لەگەڵ کردوە و موسا فەرمویەتی: [ئەوە ئەو عیبرانیە کێیە کە لە دارەکەوە قسەم لەگەڵ دەکات ئەوجا الله فەرمویەتی منم الله].

کەوایە الله عز وجل لەڕێگەی دارێکەوە قسەی لەگەڵ موسادا کردوە کە ئەمە کوفرە و درۆیە بەناوی رسول الله علیە الصلاة والسلام، وە کوفرە و باوەڕ نەبونە بە سیفەتێکی الله و فەزیلەتێک بۆ موسی علیە السلام.

ببورن ئەم پۆستەی کۆتایی زۆر درێژە بۆتە حەوت پۆست، بەڵام جەهلی عمومیەکە زۆر گەورە بوو، هاتبوو ئیمانی کردبوو بە کوفر بۆ سەرخستنی مەزهەبەکەی، بۆیە درێژەم دا بە روونکردنەوەی بابەتەکە، کە تێیدا دوو ریوایەتی کتێبی الإبانة الکبری بە کوفر ناو ئەبات، روونم کردۆتەوە کە کوفر نیە بەڵام بەهۆی جەهلەوە لای ئەو بووەتە کوفر.

# بەشێک

هەڵوەستەیەک لەسەر ئەم ریوایەتە:

ئیمامی بوخاری دەفەرموێت: وتم بە باوکی عبداللّٰه ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، من کەسێکم توشی تاقیکردنەوە بووم ، وە تاقیکراومەوە کە بە تۆ نەڵێم بەڵام دەیڵێم گەر شتێک وانەبوو و بەدڵت نەبوو پێم بڵێ:

قورئان لە سەرەتاوە تا کۆتایی وتەی خوای گەورەیە هیچ شتێکی قورئان دروستکراو نییە، وە هەرکەسێک بڵێت: قورئان دروستکراوە یا شتێک لە قورئان دروستکراوە ئەوا کافرە، وە هەرکەسێک پێی وابێ لەفزەکەی بە قورئان - وتنی قورئان - دروستکراوە ئەوا جەهمییە کافرە.

ئیمامی ئەحمەد فەرمووی: بەڵێ تەواوە.

قال محمد بن إسماعيل البخاري قلت: لأبي عبد الله أحمد بن حنبل:

أنا رجل مبتلى قد أبتليت أن لا أقول لك ولكن أقول فإن أنكرت شيئا فردني عنه:

القرآن من أوله إلى آخره كلام الله ليس شيء منه مخلوق ، ومن قال: إنه مخلوق أو شيء منه مخلوق فهو كافر ، ومن زعم أن لفظه بالقرآن مخلوق فهو جهمي كافر .

قال: نعم.

طبقات الحنابلة | ١/٢٧٨ _ ٢٧٩ |

---------------------------

لەم ڕۆژانە کەسێک ئەمەی پۆست کردووە بۆ ئەوەی ئیسباتی بکات کە بوخاری لەفزی نەبووە و حاڵی خۆی بۆ ئیمام احمد باسکردووە، ئەویش ئیقراری کردووە لەسەر عەقیدەکەی بوخاری وەک لە ریوایەتەکە دیارە،

جا هەندێک وایانزانیوە کە من ئەم پۆستەم کردووە! سبحان الله نەخوێندەواری و ئاست نزمی کەسانێک گەیشتۆتە حەددێک کە من پۆستێکم نەکردووە وائەزانن من کردوومە، ئێ بڕۆن سەیری کەناڵەکەم بکەن بزانن پۆستەکەی تێدایە یان نا، ئەم پۆستە کەسێکی تر کردوویەتی و لە کەناڵەکەی مەوجودە، وە من دەمێکە ئەزانم کە ئەم ریوایەتە دروست نیە و نەچەسپاوە، ابن أبي يعلى بەبێ سەنەد هێناویەتی بە معلقی لە بوخاریەوە، تەنانەت هاوینی ڕابردوو کەسێک ئەمەی پۆست کرد پێم ووت بیسڕەوە سەحیح نیە.

بەڵام با بڵێین هەڵوەستەیەک لەسەر ئەو کەسە بکەین کە ئەم ریوایەتە بێ سەنەدەی هێناوە کە ئەویش ابن أبي يعلى یە کە وەک ابو يعلى ی باوکی هەردووکیان لە لەفزییە غەیر مەخلوقیەکانن، بێگومان ابن أبي يعلى کتێبی (خلق أفعال العباد)ی بوخاری بینیوە و ئاگاداریەتی، بوخاری لەم کتێبەدا دەیان جار باسی مەزهەبی خۆی ئەکات کە

فعلی عەبد و دەنگی و نوسین و حیفز کردنی هەمووی مەخلوقە بەڵام قورئانەکە غەیر مەخلوقە، کە دوو جەزائیریەکە لەسەر ئەمە بوخاری تەکفیر ئەکەن و بە لەفزی ئەزانن، باشە گەر ئەوەی بوخاری لە کتێبەکەی باسی کردووە کە فعلی عەبد مەخلوقە ئەمە هەمان مەزهەبی لەفزیەکان بێت و کوفر بێت، ئەی چۆن ابن أبي يعلى کە خۆی لەفزیەکی غەیر مەخلوقیە واز لەم کتێبەی بوخاری ئەهێنێت و بەهۆی ئەم کتێبەوە تەکفیری ناکات، کەچی دەست ئەگرێ بە ریوایەتێکی بێ سەنەد ؟!

ئایا بۆ نەیووت بوخاری لە کتێبەکەی بە ڕوونی بۆی سەلماندین کە لەفزییە و جەهمیە ؟!

جگە لەمەش ابن أبي يعلى بە سەنەدەوە لە بوخاری ریوایەت ئەکات کە ئەڵێ: هەر کەسێک بڵێ من وتوومە لەفزم بە قورئان مەخلوقە ئەوا درۆ ئەکات، من تەنها وتوومە فعلی عەبد مەخلوقە.

**بڕوانە (طبقات الحنابلة : ١ / ٢٧٧-٢٧٨)**

کە ئەمە اللالكائي-ش ریوایەتی کردووە لە شرح أصول اعتقاد

باشە ئێوە ئەڵێن لەفزیەکانیش تەنها ئەمەیان ووتوە، وتوویانە فعلی عەبد مەخلوقە کە قورئانەکە ئەخوێنێ ئەگینا قورئانەکە غەیر مەخلوقە، ئێ باشە گەر ئەمە مەزهەبی لەفزیەکان بێت کەواتە بوخاریش لەفزی بووە بە پێی فەهمی ئێوە، کەچی

ابن أبي يعلى كە خۆی لەفزيەكی غەير مەخلوقيە ئەم ريوايەتەی هێناوە بۆ ئەوەی بيسەلمێنێ بوخاری بەری بووە لە لەفزيەكان، ئايا ئەويش نەيزانيوە لەفزيەكان كێ بوون و چيان ووتوە و مەزهەبيان چی بووە ؟!

جا ئێمە پشت بەم ريوايەتە بێ سەنەدەی ابن أبي يعلى نابەستين كە ئەم كەسە پۆستی كردووە، وە پێمان وايە باطلە و ئەسلی نيە، بەڵام هێنانی ئەم ريوايەتە و ئەوەی تر لەلايەن ابن أبي يعلى مانای ئەوە ئەدات ئێوەی جەماعەتی دوو جەزائيريەكە بە پێچەوانەی هەموو خەڵكی لە مەزهەبی لەفزيەكان تێگەيشتوون.

# اللفظية (٢٩)



## کڕین و فرۆشتنی موسحەف

ژمارەیەک لە زانایانی سەلەف کڕین و فرۆشتنی موسحەفیان پێ باش نەبووە و ئیزنیان نەداوە، هۆکاری ئەمەشیان بۆ ئەوە گەڕاندۆتەوە کە کەلامی الله نابێت کڕین و فرۆشتنی پێ بکرێت و بازرگانی پێ بکرێت، وە هەندێک لە سەلەف ڕێگەیان داوە موسحەف بکڕیت بەڵام نەیفرۆشیت چونکە ئەوەی ئەیکڕێ پارەی داوە بۆ کەلامی الله، بەڵام ئەوەی ئەیفرۆشێ کەلامی الله ی فرۆشتووە بەرامبەر پارە، وە هەندێکیش لە سەلەف ڕێگەیان داوە کە موسحەف بکڕیت و بیفرۆشیت هەردووکیان بەلاوە ئاسایی بووە.

پێش ئەوەی ووتەکان بهێنم ئەمەوێ بزانن کە هەر ووتەیەک دامناوە تەنها ژمارەی لەگەڵە بەبێ ناوهێنانی کتێبەکە، ئەوە لە کتێبی (المصاحف لابن أبي داود) بوونی هەیە

## ئەوانەی کڕین و فرۆشتنی موسحەف بە جائیز نازانن، یان پێیان مەکروهە (جا کەراهەتی تەحریم بێ یان تەنزیهـ)

**ئیمامی عمر:** نەهیکردووە لە کڕین و فرۆشتنی موسحەف. (٥٣٣ ، ٥٣٥)

**ابن مسعود:** بەلایەوە کەراهەتی هەیە موسحەف بکڕیت و بیفرۆشیت. (٥٣٧)

**جابر بن عبدالله:** بەلایەوە مەکروهـ بووە فرۆشتن و کڕینی موسحەف. (٥٥٢)

**أبو الضحى ئەڵێ:** مسروق و عبيدة و شريح و عبدالله بن يزيد الأنصاري پێیان مەکروهـ بوو کڕین و فرۆشتن بە موسحەف بکرێ، وە ووتیان: پارە وەرناگرین لەسەر کتێبی الله. (٥٦٤)

**عاصم الأحول ئەڵێ:** أبو العالية ووتی: حەز ئەکەم ئەوانەی موسحەف ئەکڕن لێیان بدرێ.

**عاصم** ئەڵێ ووتم: لەسەر فرۆشتنی حەقترە لێیان بدرێ.

**أبو العالية** ووتی: گەر ئەوان نەیکڕن ئەوانیش نایفرۆشن. (٥٩٦)

**علقمة:** نەهی کردووە لە کڕینی موسحەف. (٥٧١ تا ٥٧٣)

کە کڕینی بە جائیز نەزانی، فرۆشتنیشی بە جائیز نازانێ بە پێچەوانەی ئەوەی کە هەندێکیان کڕینی بە جائیز ئەزانن بەڵام فرۆشتنی بە جائیز نازانن، هەروەها الحكم بن عتيبة ڕیوایەتی کردووە لە علقمة کە پێی مەکروهـ بووە موسحەف بکڕدرێ و بفرۆشرێ. (٥٧٥ تا ٥٧٨)

**ابن سيرين**: کڕین و فرۆشتنی موسحەفی پێ مەکروهـ بووە. (٥٧٩)

**ابراهيم النخعي** لە هاوەڵەکانی ڕیوایەت ئەکات کە کڕین و فرۆشتنی موسحەفیان پێ مەکروهـ بووە. (٥٨٣)

هاوەڵەکانی ابراهيم النخعي قوتابی ابن مسعود بوون

**ابراهيم النخعي**: کڕین و فرۆشتنی موسحەفی بەلاوە مەکروهـ بووە. (٥٣١ ، ٥٩٣)

## ئەوانەی فرۆشتنی موسحەف بە جائیز نازانن، یان بە مەکروهی ئەزانن:

**سعيد بن المسيب** و **الحسن البصري**: فرۆشتنی موسحەف بە مەکروهـ ئەزانن. (٥٣٠)

**ابن عمر**: کە بەلای ئەوانەی تێئەپەڕی کە موسحەف ئەفرۆشن، ئەیووت: خراپترین بازرگانیە. (٥٣٢ ، ٥٤١)

**ابن عمر** ئەڵێ: خۆزگە ئەخوازم دەستەکان ببڕن لەسەر فرۆشتنی موسحەف. (٥٤٢ تا ٥٤٩)

**سالم کوڕی ابن عمر** ئەڵێ: خراپترین بازرگانی فرۆشتنی موسحەفە. (٥٥٠)

**سالم کوڕی ابن عمر** ئەڵێ: خراپترین فرۆشتن فرۆشتنی موسحەفە. (٥٥١)

**عبدالله بن شقیق** تابعی: فرۆشتنی موسحەف بە مەکروھ ئەزانێ، وە ئەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فرۆشتنی موسحەفیان بە شتێکی گەورە ئەزانی. (٥٥٣)

**الزهري**: پێی مەکروھ بووە موسحەف بفرۆشرێ. (٦٠١)

**ابو مجلز**: ڕێگای نەداوە بە فرۆشتنی موسحەف. (٦٤٧)

## ئەوانەی کڕینی موسحەف بە جائیز ئەزانن و فرۆشتنی بە جائیز نازانن:

**ابن عباس** ئەڵێ: موسحەف بکڕە و مەیفرۆشە. (٦٢١ تا ٦٣٦)

**جابر بن عبدالله** ئەڵێ: موسحەف بکڕە و مەیفرۆشە. (٦٣٧)

**سعید بن المسیب** ئەڵێ: موسحەف بکڕە و مەیفرۆشە. (٦٣٨ تا ٦٤٠)

**سعید بن جبیر** ئەڵێ: موسحەف بکڕە و مەیفرۆشە. (٦٤١ تا ٦٤٤)

**أبو شهاب** ئەڵێ: ووتم بە سعید بن جبیر موسحەف بکڕم ؟

ووتی: بەڵێ. (٦٤٥)

ئیمام احمدیش لەوانەیە کە ڕێگای داوە بەکڕینی موسحەف بەڵام ڕێگای نەداوە بە فرۆشتنی

**عبدالله کوڕی ئیمام احمد** ئەڵێ: پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی فرۆشتنی موسحەف ؟

ووتی: حەز ئەکەم نەیفرۆشێت، ابن عمر و ابن عباس پێیان مەکروه بووه بفرۆشرێ.

عبدالله ئەڵێ: پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی فرۆشتنی موسحەف ؟

ووتی: بکڕە و مەیفرۆشە، وە ووتی: بۆ فەرموودەی ابن عباس و جابر ئەڕۆم.

**(مسائل الإمام أحمد رواية عبدالله : ١٠٥٩-١٠٦٠)**

هەریەک لە جابر بن عبدالله و ابن عباس دوو ریوایەتی جیاوازیان لێوە هاتووە، ریوایەتێک لە جابر هاتووە کە کڕین و فرۆشتن هەردووکیان بە جائیز نازانێت، وە ریوایەتێکی تری لێوە هاتووە کە کڕین بە جائیز ئەزانێت و فرۆشتن بە جائیز نازانێت، کە ئیمام احمد لەسەر ریوایەتی دووەمی ڕۆشتووە، ابن عباس-یش دوو ریوایەتی لێوە هاتووە لە یەکێکیان کڕین بە جائیز ئەزانێت و فرۆشتن بە جائیز نازانێت، لە ریوایەتێکی تر کە دواتر ئەیهێنم کڕین و فرۆشتن هەردووکیان بە جائیز ئەزانێت، کە ئیمام احمد لەسەر ریوایەتی یەکەمی ڕۆشتووە

ئیمام احمد ئەڵێ: پێم مەکروهە فرۆشتنی موسحەف، وە کڕینی ئاسانترە لەلام وەک لە فرۆشتنی.

**(مسائل الإمام أحمد رواية عبدالله : ١٠٨٣)**

**الكوسج** ئەڵێ: پرسیم لە احمد دەربارەی فرۆشتنی موسحەف ؟

ووتی: نازانم هیچ یەکێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ڕێگەیان دابێت، وە کڕینی ئاسانترە.

الكوسج ئەڵێ: اسحاق بن راهويه ووتی: سوننەت وایە بیکڕێت و نەیفرۆشێت.

**(مسائل أحمد و إسحاق : ١٨٢٥)**

## سێ ڕیوایەت هاتووە لە ئیمام احمد دەربارەی فرۆشتنی موسحەف:

١/ جائیز نیە فرۆشتنی، کە ئەمە قەولی مەزهەبە

٢/ جائیزە فرۆشتنی بەڵام کەراهەتی هەیە

٣/ بە ڕەهایی جائیزە فرۆشتنی، ئەم ریوایەتە تەنها ابو الخطاب الكلواذاني هێناویەتی

## ئەوانەی فرۆشتنی موسحەف بە جائیز ئەزانن هەروەک کڕینی بە جائیز ئەزانن:

**سعید بن جبیر:** پێشتر ریوایەتم هێنا کە ڕێگای داوە بە کڕینی موسحەف بەڵام ڕێگای نەداوە بە فرۆشتنی، بەڵام ریوایەتی لێوە هاتووە کە ڕێگای داوە بە فرۆشتنیشی، ڕەنگە پێی مەکروهـ بوو بێت فرۆشتنی بەڵام لە کاتی پێویستی ڕێگای دابێت.

**ابو شهاب** ئەڵێ: چوومە لای سعید بن جبیر کە لە ماڵەکەیدا بوو لە مەککە، وە موسحەفێکی لە تەنیشتەوە بوو، جا ووتی: گەر ئەتەوێ موسحەف بکڕیت ئەوا خاوەنانی ئەم موسحەفە پێویستیان بە فرۆشتنی ئەم موسحەفە هەیە، وە هەرچی سەقط هەیە لە موسحەفەکە چاکم کردۆتەوە. (٦٤٩ ، ٦٥٠)

**شعبة** ئەڵێ: الحكم بن عتيبة کڕین و فرۆشتنی موسحەفی بەلاوە ئاسایی بوو. (٦٧٦)

**مالك بن دينار** ئەڵێ: عكرمة موسحەفێکی خۆی فرۆشت، وە الحسن البصري فرۆشتنی موسحەفی بەلاوە ئاسایی بوو. (٦٥٢)

**خالد الحذاء** ئەڵێ: الحسن البصري موسحەفێکی فرۆشت. (٦٦٠)

**الحسن البصري** ئەڵێ: ئاساییە فرۆشتن و کڕینی موسحەف. (٦٥٣ تا ٦٦٥)

الحسن البصري سەرەتا ڕێگای نەئەدا بە فرۆشتنی موسحەف بەڵام دواتر ڕێگای دا

**عوف** ئەڵێ: الحسن البصري بەلایەوە ئاسایی بوو موسحەف بفرۆشرێ، وە ابن سيرين ئەیووت: کتێبی الله لەوە بە نرخترە کە بفرۆشرێ.

وە عوف لەسەر ووتەی ابن سيرين ئەڕۆیشت. (٦٥٩)

**مطر الوراق** ئەڵێ: گوێی پێنادەم چی ئەڵێن دەربارەی فرۆشتنی موسحەف، دوای ووتەی دوو فەقیهەکەی عیراق: الحسن و الشعبي، ئەم دووانە لەلایان ئاسایی بوو موسحەف بفرۆشرێ و بکڕدرێ. (٦٦٢)

وەک دیارە ئەوانەی کە فرۆشتنی موسحەف بە جائیز نازانن یان بەلایانەوە مەکروهە هۆکارەکەی بۆ ئەوە ئەگەڕێننەوە کە کتێبی الله نابێ فرۆشتنی پێوە بکرێ و بازرگانی پێ بکرێ، هەروەک تابعیەکانی کوفە کە قوتابی ابن مسعود بوونە وتوویانە نابێ پارە وەربگیرێت لەسەر کتێبی الله، هەروەک ابن سيرين-یش باسی کرد.

وە ئەوانەی کە فرۆشتنی موسحەف بە جائیز ئەزانن بۆ موخالیفەکانیان ڕوون ئەکەنەوە کە بۆچی جائیزە و کێشەی تێدا نیە، بە موخالیفەکانیان ئەڵێن: ئێوە ئەڵێن نابێ کتێبی الله بفرۆشرێ! ئێمەش ئەڵێین ئەمە فرۆشتنی کتێبی الله نیە، بەڵکو فرۆشتنی کاغەز و حیبر و کاری دەستی خۆیەتی کە ئەم قورئانەی بە دەستی خۆی نوسیوە لە بەرامبەردا دەست حەقی کارەکەی وەرئەگرێ

**الشعبي** ئەڵێ: والله ئەوان کتێبی الله نافرۆشن، بەڵکو تەنها کاغەز و کاری دەستیان ئەفرۆشن. (٦٦٦)

**الشعبي** ئەڵێ: کتێبی الله نافرۆشن، بەڵکو تەنها کاغەز و حیبر ئەفرۆشن. (٦٦٧)

**الشعبي** ئەڵێ: ئاساییە فرۆشتنی موسحەف، کاغەز و کاری دەستی ئەفرۆشێ. (٦٦٨)

**داود بن أبي هند** ئەڵێ: الشعبي بەلایەوە ئاسایی بوو فرۆشتنی موسحەف، وە ئەیووت: کاغەز و کاری دەستی ئەفرۆشێ. (٦٦٩)

## صالح کوڕی ئیمام احمد ئەڵێ:

حدثني أبي قال حدثنا عبد المؤمن عن داود ووتی: پرسیارم لە أبو العالية کرد دەربارەی فرۆشتی موسحەف ؟

ووتی: گەر ئەوان پێتی نەفرۆشن ئەوا تۆ نایکڕی.

بەڵام الشعبي ووتی: دەست حەقی کارەکەیان و کاغەزەکەت پێ ئەفرۆشن، کتێبی اللە نافرۆشن.

**(مسائل الإمام إحمد رواية صالح : ١٠٨١)**

**اسماعیل بن وردان** ئەڵێ: پرسیار کرا لە ابن الحنفية دەربارەی فرۆشتنی موسحەف ؟

ووتی: ئاساییە، تەنها کاغەزەکە ئەفرۆشێ. (٦٤٨)

ابن الحنفية کوڕی ئیمام علي-ە

**سعيد بن جبير** ئەڵێ: پرسیار کرا لە ابن عباس دەربارەی فرۆشتنی موسحەف ؟

ووتی: ئاساییە، پارەی دەست حەقیان وەرئەگرن. (٦٤٦)

**سعيد بن جبير** ئەڵێ: ابن عباس دەربارەی فرۆشتنی موسحەف ووتی: ئەوان وێنەکێشن کاری دەستیان ئەفرۆشن.

**(خلق أفعال العباد : ٢٥١)**

وێنەکێشن: واتا ئایەتەکان ئەنوسن و شێوەیان دەرئەهێنن

**زياد مولى سعد** ئەڵێ: پرسیارم لە ابن عباس کرد دەربارەی فرۆشتنی موسحەف ؟

ووتی: پێمان دروست نیە بیکەیت بە بازرگانی، بەڵام ئەوەی بە دەستی خۆت ئەنجامت داوە ئاسایی بیفرۆشیت.

**(خلق أفعال العباد : ٢٤٧)**

ئەمە ئەوە دەرئەخات کە ابن عباس گەر ڕێگاشی دابێت بۆ فرۆشتن ئەوا بۆ کاتی پێویست ڕێگای داوە، نەک بکرێت بە پیشە و بازرگانی پێ بکرێ، وە زیاد لەو کەسانە بوو کە موسحەفی ئەنوسی و ئەیفرۆشت

مجاهد ئەڵێ: ابن عباس پێی ئاسایی بوو موسحەفێک بفرۆشیت و موسحەفێکی تر بکڕیت بە نرخەکەی کە باشتر بێت لە موسحەفەکەی تر.

**(خلق أفعال العباد : ٢٤٨)**

سحنون ئەڵێ:

عن أنس بن عياض عن بكير بن مسمار عن زياد مولى سعد ووتی: پرسیارم لە ابن عباس و مروان بن الحكم كرد دەربارەی فرۆشتنی موسحەف و بازرگانی كردن تێيدا؟

هەردووكيان ووتيان: بە دروستی نازانين بيكەيت بە بازرگانی، بەڵام ئەوەی بە دەستی خۆت ئەنجامت داوە ئاساييە فرۆشتنی.

سحنون ئەڵێ: وە مالك دەربارەی فرۆشتن و كڕينی موسحەف وتوويەتی: ئاساييە.

**(المدونة الكبرى : ٤٣٠/٣)**

سحنون ئەڵێ:

بە ابن القاسم-م ووت: ئايا دروستە موسحەف بە كرێ بگيرێت و تێيدا بخوێندرێتەوە؟

ووتی: ئاساييە ئەمە.

سحنون ئەڵێ ووتم: بۆچی مالك بە جائيزی زانيوە ؟

ووتی: چونکە مالك وتوویەتی: فرۆشتنی موسحەف ئاساییە، جا کاتێک مالك فرۆشتنی موسحەفی بە جائیز زانی ئەوا بە کرێدانیشی جائیزە.

**(المدونة الكبرى : ٤٢٩/٣)**

سحنون ئەڵێ:

ابن وهب عن ابن لهيعة و يحيى بن أيوب عن عمارة بن غزية عن ربيعة وتوویەتی: فرۆشتنی موسحەف ئاساییە، تەنها کاغەز و حیبر و کاری دەستی ئەفرۆشێ.

**(المدونة الكبرى : ٤٢٩/٣)**

ربيعة بن فروخ تابعیە و مامۆستای ئیمام مالك بووە، ئیمام مالك ئەڵێ کە ربيعة مرد ئیتر چێژی فقه بوونی نەما

ابن وهب ئەڵێ:

پیاوانێک لە ئەهلی عیلم پێیان ڕاگەیاندم لە یحیی بن سعید و مکحول و جگە لەوانیش لە تابعین کە پێیان ئاسایی بووە موسحەف بفرۆشرێ.

**(المدونة الكبرى : ٤٢٩/٣)**

## عبدالملك بن حبيب ئەڵێ:

بە کرێ گرتنی کەسێک بە پارە بۆ فێرکردنی قورئان بریتیە لە بە کرێ گرتنی لاشەکە کە خەریک ئەبێت بەم کارە، نەک نرخ بێت بۆ قورئانەکە، هەروەک چۆن فرۆشتنی موسحەف تەنها بریتیە لە فرۆشتنی کاغەزەکان و نوسینەکە و پیشەکە، فرۆشتنی ئەو شتە نیە کە لەناو موسحەف دایە (واتا قورئانەکە).

**(الرسالة المفصلة لأحوال المتعلمين للقابسي : ١٠٧)**

عبدالملك بن حبيب قوتابی قوتابیەکانی ئیمام مالك بووە، لەگەڵ اسحاق بن راهويه لە هەمان ساڵدا وەفاتیان کردووە، زانای ئەندەلوس بووە

جا ئەوەی مەبەستمە لێرەدا ئەوە نیە کە فەتوای کامەیان سەوابە و بەهێزترە دەربارەی کڕین و فرۆشتنی موسحەف، ئەوەی لێرەدا مەبەستمە ئەوەیە کە ئەوانەی نەهیان کردووە لە سەلەف وتوویانە نابێ کتێبی الله بفرۆشرێ، وە ئەوانەی کە بە جائیزیان زانیوە لە سەلەف وتوویانە کتێبی الله نافرۆشن بەڵکو تەنها کاغەز و حیبر و کاری دەستیان ئەفرۆشن و دەست حەقی کارەکەیان وەرئەگرن، کە کارەکەشیان بریتیە لە نوسینی قورئانەکە، ئەمەش ووتەی ابن عباس و الشعبي بوو کە سفيان بن عيينة ئەڵێ: ابن عباس زاناترینی سەردەمی خۆی بووە، وە الشعبي زاناترینی سەردەمی خۆی بووە، ابن عباس ووتی ئەوان وێنەکێشن کاری دەستیان ئەفرۆشن و دەست حەقی خۆیان وەرئەگرن، الشعبي بە هەمان شێوە ووتی کاغەز و حیبر و کاری دەستیان

ئەفرۆشن نەک قورئانەکە کە ئیمام احمدیش ئەمەی ریوایەت کردووە لە الشعبي وەک هێنامان لە مسائلی صالح واتا ئاگاداری ووتەکەیەتی و ئەم جیاکارییە بە مەحاڵ نازانێت، کوڕی ئیمامی عەلی جیاکاری کرد، عبدالملك بن حبيب بە هەمان شێوە جیاکاری کرد لەنێوان نوسینەکە و کاغەزەکە و قورئانەکە، ووتی ئەوان نوسینەکە و پیشەکەیان ئەفرۆشن لەگەڵ کاغەزەکە نەک قورئانەکە.

بەڵام لای دوو جەزائیریەکە و کلکەکانیان ناکرێ کاغەز و حیبر و فعلی عەبدەکە جیا بکرێنەوە لە قورئانەکە، هەروەک کابرای عمومی بە منی ئەووت: وەرە زندیق پێمان بڵێ کە کاغەز و حیبر و فعلی عەبدەکە کە نوسینە مەخلوق بن، ئەی کوا قورئانەکە کە غەیر مەخلوقە ؟ کە ووتت ئەمانە مەخلوقن قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق!!! کە ئەمە عەقیدەی حلولیەکانە کە پێیان وایە خودی دروستکراوەکان زاتی الله-ن، الله تێکەڵ بووە بە مەخلوقات، ئەمانەش پێیان وایە خودی کاغەز و حیبر و فعلی عەبدەکە کەلامی الله یە!!! بۆیە ئەڵێن: گەر ووتت کاغەز و حیبر و فعلی عەبدەکە مەخلوقن ئیتر کوا قورئانە غەیر مەخلوقەکە ؟

دە فەرموون بە ابن عباس و الشعبي و کوڕی ئیمامی عەلی و عبدالملك بن حبيب بڵێن: هەی زندیقی جەهمی ئەم قسە بێ مانایە چیە ئەیکەن کە ئەڵێن: کتێبی الله نافرۆشێ، تەنها کاغەز و حیبر و کاری دەستی ئەفرۆشێ!!!

ابن عباس و الشعبي و کوڕی ئیمامی عەلی و عبدالملك وەرن پێمان بڵێن: گەر حیبر و کاغەز و کاری مرۆڤەکە لابەرین کە نوسینە، چ شتێک ئەمێنێتەوە کە بووترێ ئەمە

کەلامی اللە یە ؟ چۆن کاری مرۆڤەکە و کاغەز و حیبرەکە جیا ئەکەنەوە لە کەلامی اللە؟

هیوادارم چۆن بە فکری خۆتان وائەزانن منتان مولزەم کردووە بە کوفرێکی زۆر گەورە کە دەرچوون لێی مەحاڵە بە عەقڵی خۆتان، ئاواش ابن عباس و الشعبي و کوڕی ئیمامی عەلی و عبدالملك و غەیری ئەوانیش مولزەم بکەن بەم کوفرە کە دانراوی کەم عەقڵی و جاهیلی خۆتانە، کە بەهۆی تێنەگەیشتن لە حەقیقەتی کەلام و چۆنیەتی وجودی توشی ئەم جەهلە گەورەیە بوونە.

------------------------------

ماویەتی

# بەشێک

درۆی ئاوا ئەکەن بە دەمی منەوە، هێندە بە متمانەوە درۆکە دروست ئەکەن، واللە جاری واهەیە ئەکەومە گومانەوە ئەڵێم تۆ بڵێی من قسەیەکی ئاوام کردبێ و ئاگام لەخۆم نەبوو بێت ؟! ئەچم دووبارە سەیری پۆستەکانم ئەکەمەوە ئەبینم شتی ئاوای تێدا نیە.

## بەشێک

# بۆ تێگەیشتن لە پۆستی ژمارە (٢٩) و سڕی کردنەوەی هەندێک لە درۆ و چەواشە کارییەکان

كە ئەڵێین: حیبر و كاغەز و فعلی عەبد مەخلوقە كە نوسینە، وە نوسراوەكە كەلامی الله یە و مەخلوق نیە

جەماعەتی دوو جەزائیریەكە ئەڵێن: ئەم جیا كارییە مەحاڵە، كە ووتت حیبر و كاغەز و فعلی عەبدەكە مەخلوقن ئیتر قورئانەكەش ئەبێتە مەخلوق، ناتوانرێ قورئانەكە جیا بكرێتەوە لە حیبر و كاغەز و فعلی عەبدەكە

منیش ئەڵێم: ئەی چۆن كە هەندێک لە سەلەف دەربارەی فرۆشتنی موسحەف ووتیان: نابێ كەلامی الله بفرۆشرێ، لە بەرامبەردا ابن عباس و الشعبي و ابن الحنفية و عبدالملك بن حبيب و غەیری ئەوانیش كە پێیان جائیزە موسحەف بفرۆشرێ ئەڵێن: فرۆشتنی موسحەف فرۆشتنی كەلامی الله نیە، بەڵكو فرۆشتنی حیبر و كاغەز و فعلی عەبدەكەیە كە نوسینە ؟!

هەردووک بابەت هاوشێوەن ئیللا مەگەر خۆتان گێل بکەن یان بەهۆی قوڵی جەهلەوە تێی نەگەن

ئێوە ئەڵێن مەڵێ حیبر و کاغەز و فعلی عەبد مەخلوقە، چونکە ئەم وەسفە قورئانەکەش ئەگرێتەوە، ئێ دەفەرموون بە سەلەفیش بڵێن: نابێ موسحەف بفرۆشرێ، چونکە کاغەز و حیبر و فعلی عەبدەکە لە قورئانەکە جیا ناکرێنەوە، کە ئەمانەت فرۆشت ئیتر کەلامی الله-شت فرۆشتووە، هەروەک چۆن بە من ئەڵێن گەر ووتت ئەمانە مەخلوقن کەلامی الله-ش ئەکەیتە مەخلوق، بە سەلەفیش بڵێن کە ئەمانەت فرۆشت ئەوا کەلامی الله-ش فرۆشراوە

کاغەزی فرۆشتووە

حیبری فرۆشتووە

فعلی خۆی فرۆشتووە

کەلامی الله ی نەفرۆشتووە

بەلاتانەوە ئاساییە ئەم جیاکارییە بکرێ لەکاتی فرۆشتن، ئەڵێن کێشەمان نیە لەمەدا

ئەی گەر بڵێین:

کاغەز مەخلوقە

حیبر مەخلوقە

فعلی عەبد مەخلوقە

کەلامی الله غەیر مەخلوقە

جەماعەتی دوو جەزائیریەکە ئەڵێن: نا، ئەمە نابێت، کە ووتت ئەمانە مەخلوقن ئیتر کامەیە قورئانە غەیر مەخلوقەکە ؟ حەتمەن ئەویشت کردووە بە مەخلوق.

بەڵام کە سەلەف ئەڵێن: کاغەز و حیبر و فعلی خۆی فرۆشتووە کە نوسینە، کەلامی الله ی نەفرۆشتووە، جەماعەتی دوو جەزائیریەکە جورئەت ناکەن بە سەلەف بڵێن: کە ووتتان ئەمانەی فرۆشتووە ئیتر کوا کەلامی الله کامەیە کە نەیفرۆشتووە ؟

جا هەروەک چۆن جیاکاری سەلەف لەنێوان فعلی عەبدەکە و کاغەز و حیبرەکە لەگەڵ قورئانەکە بە ئاسایی ئەزانن و کێشەتان لێ نیە، ئەڵێن: فرۆشتنەکە کاغەز و حیبر و فعلەکە ئەگرێتەوە نەک قورئانەکە، ئاواش بڵێن: ئاساییە بووترێ کاغەز و حیبر و فعلەکە مەخلوقن، ئەم مەخلوقە قورئانەکە ناگرێتەوە هەروەک چۆن فرۆشتنەکە قورئانەکەی نەگرتەوە

گەر بڵێن: کە ووتت ئەم سێیانە مەخلوقن بێگومان قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق، ئەوا درۆتان لەگەڵ خۆتان کردووە کە ئەڵێن ئەم سێیانە بفرۆشێت قورئانەکەی نەفرۆشتووە، بۆ لەکاتی فرۆشتن ئەتوانن سێ شتەکە جیا بکەنەوە لە قورئانەکە بەڵام لەکاتێک کە ئەووترێ ئەم سێیانە مەخلوقن ناتوانن قورئانەکە جیا بکەنەوە ؟!

ئەمەش هەروەک بابەتی دەنگ وایە

کە کەسێک قورئان ئەخوێنێ، پێی ئەڵێی دەنگت ناخۆشە، وەسفی (ناخۆشە) تەنها دەنگی کەسەکە ئەگرێتەوە قورئانەکە ناگرێتەوە کە بە دەنگی ئەم کەسە بیستراوە.

بە هەمان شێوە کە کەسێک قورئان بخوێنێ پێی بڵێی: دەنگت مەخلوقە، وەسفی (مەخلوقە) تەنها دەنگی کەسەکە ئەگرێتەوە نەک قورئانەکە

گەر کێشەت لەگەڵ نموونەی یەکەم نەبێت بەڵام لەگەڵ نموونەی دووەم کێشەت هەبێت ئەوا لە دژبەیەک بوون دایت، جیاوازیت لەنێوان دوو شتی هاوشێوە کردووە

کە کەسێک بە دەست و خەتی خۆی ئایەتێکی قورئان ئەنوسێ، تۆش سەیری ئایەتەکە ئەکەیت ئەڵێی: دەست و خەتت ناشرینە، هەموو ئینسانێکی عاقڵ ئەزانێت کە وەسفی (ناشرینە) تەنها دەست و خەتی کەسەکە ئەگرێتەوە کە فعلی خۆیەتی نەک ئایەتەکە، لە کاتێکدا دەست و خەتی کەسەکە هەر لەگەڵ ئایەتەکەدا ئەبینیت، جا لەم حاڵەدا چۆن ئەتوانن فعلی نوسەرەکە جیا بکەنەوە لە ئایەتەکە،

بڵێن دەست و خەتی نوسەرەکە ناشرینە بەڵام نوسراوەکە کەلامی اللہ یە و بەرز و پیرۆزە، بە هەمان شێوە لە هەموو بارەکانیدا تردا فعلی عەبدەکە جیا بکەنەوە لە قورئانەکە

ئەوانەشی ئەڵێن ئایا سەلەف جاهیل بوون ئەم شتانەیان نەئەزانی بۆ قسەی لەم جۆرەیان نەکردووە ؟

ئەڵێم سەلەف کێشەیان هەرگیز لەسەر ئەم شتانە نەبووە ئەسلەن تاکو باسی بکەن، ئەمە براوەتەوە مەخلوقات هەر مەخلوقن و فعلی عەبد هەمووی مەخلوقە بەبێ استثناء، ئەمانە ڤایرۆسی دوو جەزائیریەکە لێی داون وائەزانن کێشەی سەلەف لەگەڵ جەهمیەکان ئەوە بووە ئایا لەکاتی خوێندن و نوسینی قورئان فعلی عەبدەکە بە مەخلوق وەسف ئەکرێ یان نا!

بە ڕاستی سەیرم پێتان دێت کە قەناعەتتان بەخۆتان هێناوە کەلامی اللہ لە خودی خۆیدا ناکرێ غەیر مەخلوق بێت ئیللا بە توقف کردن لە فعلی عەبد ئەبێتە غەیر مەخلوق، کێ فێری کردوون گەر توقف نەکەن لە فعلی عەبد ئەوا کەلامی اللہ ئەبێتە مەخلوق ؟

باشە گەر کەلامی اللہ بەندە بە فعلی عەبدەوە دەفەرموون بڵێن فعلی عەبد غەیر مەخلوقە تا کەلامی اللہ-ش ببێتە غەیر مەخلوق، ئەم مەزهەبە گونجاوترە بۆتان لە

توقف کردنەکە، تاکو ئێستاش نازانم بۆ گەر بڵێی فعلی عەبد مەخلوقە قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق بەڵام گەر توقف لە فعلی عەبد بکەیت ئەوا توقف-ت نەکردووە لە قورئان؟!

ئەی ئێوە ناڵێن فعلی عەبدەکە و قورئانەکە لەیەکتر جیا ناکرێنەوە بۆیە نابێ بووترێ فعلی عەبد مەخلوقە چونکە قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق ؟ ئێ دە کەواتە توقف مەکەن لە فعلی عەبد نەوەک ئەمە ببێتە هۆی توقف کردن لە قورئانەکەش، خێرە لەکاتی توقف کردن فعلی عەبدەکە و قورئانەکە جیا ئەکەنەوە لە یەکتر ئەڵێن بۆ فعلەکە ناڵێین مەخلوقە یان غەیر مەخلوقە، قورئانەکەش غەیر مەخلوقە، بەڵام کاتێک ئەووترێ فعلی عەبد مەخلوقە، ئەڵێن بەم ووتەیە قورئانەکەش بووە مەخلوق چونکە ئەم دووانە جیا ناکرێنەوە، تۆ بۆ حوکم لەسەر قورئانەکە بدەیت بە غەیر مەخلوقی فعلی عەبدەکە نابێتە غەیر مەخلوق ؟ تۆ بۆ حوکم لەسەر فعلی عەبدەکە نەدەیت و توقف بکەیت ئەوا توقف-ت نەکردووە لە قورئانەکە ؟ بەڵام گەر من بڵێم فعلی عەبد مەخلوقە و قورئانەکە غەیر مەخلوقە ئەوا قورئانەکەم کردۆتەوە مەخلوق ؟! خێرە تۆ فعلی عەبدەکە و قورئانەکە لەیەکتر جیا ئەکەیتەوە و دوو حوکمی جیاواز ئەدەیت لەسەریان، بەڵام من بۆم نەبێت جیایان بکەمەوە و دوو حوکمی جیاواز بدەم لەسەریان ؟!!!

ئینجا خەڵکیان باش گەوجاندووە بە ووشەی (تەفسیل) تەفسیل مەدە، تەفسیل مەدە، دەست بەوە بگرە کە سەلەف وتوویانە، تەفسیل مەدە، ئینجا لەلای ئەوان تەفسیل تەنها ئەوەیە بڵێی فعلی عەبدەکە مەخلوقە و قورئانەکە غەیر مەخلوقە، بەڵام گەر ووتت توقف ئەکەم لە فعلی عەبدەکە و قورئانەکەش غەیر مەخلوقە، ئەوا تەفسیلت نەداوە !!!

ئەمە گەوجاندنی خەڵکە وایان حاڵی کردوون تەنها ووشەی (مەخلوق) بەکار بهێنێ تەفسیلت داوە ووشەی تر تەفسیل نیە، ئەی ئێوەش ئەوە نیە تەفسیل ئەدەن و دوو حوکمی جیا بۆ فعلەکە و قورئانەکە دائەنێن، ئەمەی ئێوە تەفسیل نیە کە فعلەکە و قورئانەکە جیا ئەکەنەوە و دوو حوکمی جیاواز ئەدەن لەسەریان، بەڵام ئەوەی من تەفسیلە کە هەمان شتی ئێوە ئەکەم بەڵام لەبەر ئەوەی وتوومە فعلەکە مەخلوقە بۆیە تەفسیلە، ئەمە چ عەقڵیەتێکە دوو شتی جیاواز لەیەکتر جیا بکەیتەوە و دوو حوکمی جیاواز بدەیت لەسەریان نەبێتە تەفسیل، بەڵام کە ووتت یەکێکیان مەخلوقە ئەبێتە تەفسیل!!!

ئینجا ئەو کوفرەی کە منی پێ مولزەم ئەکەن بەهۆیەوە خۆیان بە دوو کوفر مولزەم ئەکەن کە پێشتر باسم کرد

مادام ئەڵێن ووتت فعلی عەبد مەخلوقە قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق چونکە ئەم دووانە جیا ناکرێنەوە، کەواتە گەر بڵێین قورئانەکە غەیر مەخلوقە ئەوکات فعلی عەبدەکەش ئەبێتە غەیر مەخلوق چونکە خۆتان ئەڵێن ئەم دووانە جیا ناکرێنەوە، ئینجا سەلەف فێری کردووین کە شتێک دوو شتی جیاوازی لەخۆ گرتبوو وەک ئیمان ئەوا نە حوکم ئەدرێ بە مەخلوقی و نە بە غەیر مەخلوقی، گەر ئیمان قیاس ئەکەنە سەر ئەم بابەتە ئەوا مولزەم ئەبن کە بڵێن: نە ئەڵێین قورئانەکە غەیر مەخلوقە، وە نە ئەڵێین فعلی عەبدەکە مەخلوقە، چونکە ئەم دووانە جیا ناکرێنەوە، کە ئەمەش کوفرە و توقف کردنە لە قورئان

ئەگەریش ئەڵێن: ئەم دووانە جیا ناکرێنەوە هەر حوکمێک بدرێ لەسەر یەکێکیان ئەوی تریشیان ئەگرێتەوە، ئەوا کاتێک کە ئەڵێن قورئانەکە غەیر مەخلوقە فعلی عەبدیشتان کردۆتە غەیر مەخلوق، چونکە خۆتان ئەڵێن جیا ناکرێنەوە.

گەر ئەڵێن ئێمە ئەتوانین دوو حوکمی جیاواز بدەین لەسەر فعلی عەبدەکە و قورئانەکە، ئەوا منیش هەر ئەمەم کردووە دوو حوکمی جیاوازم داوە لەسەر هەردووکیان، بەڵام هی من بۆیە تەفسیلە چونکە ئەڵێم فعلی عەبد مەخلوقە، هی ئێوە تەفسیل نیە چونکە ووشەی مەخلوق بەکار ناهێنن!!!

موسڵمانان هێندە هەستیار مەبن لەگەڵ ووشەی تەفسیل، ئەو تەفسیلەی ئەوان باسی ئەکەن و خەڵکی لەسەر تەکفیر ئەکەن خۆشیان باسی تەفسیلەکە ئەکەن بەڵام بەوە چاوبەستی ئێوە ئەکەن ئەڵێن هود ئەڵێ فعلی عەبد مەخلوقە، تۆش بڵێ توقف ئەکەم لە فعلی عەبد و قورئانەکەش غەیر مەخلوقە، ئەمەش هەر تەفسیلە دوو شتت لەیەکتر جیا کردۆتەوە دوو حوکمی جیاوازت لەسەر داون، بۆیە هێندە هەستیار مەبن بە تەفسیل، بەوە هەستیار بن کە شتێک بووترێ سەلەف لێی بەری بن و باسیان نەکردبێ، گەر ئەڵێن ئەی کوا سەلەف باسی ئەمانەی کردووە ؟ ئەسلەن سەلەف هیچ کێشەیان نەبووە لەم باسانە تاکو باسی بکەن، یەکێک لە سەلەف نەهاتووە بڵێ جەهمیەکان ئەیان ووت حیبر و کاغەز و لەوح مەخلوقە، ئینجا سەلەف بێن ڕەددیان بدەنەوە، هەموومان ئەزانین عەبد بەخۆی و فعلەکانی مەخلوقە، کە ئەڵێم فعلی عەبد مەخلوقە ئەوا سەلەف وتوویانە فعلی عەبد هەمووی مەخلوقە بەبێ استثناء، مەڵێ کوا سەلەف وتوویانە ئەمە و ئەوە مەخلوقە، مەڵێ ئەمە تەفسیلە، سەلەف وتوویانە فعلی عەبد هەمووی مەخلوقە گەر بڵێم ئەمەش فعلی عەبدە و مەخلوقە ئەمە چ تەفسیلێکە ؟

ئێوە لەسەرتانە بیهێنن کە سەلەف استثناء ئەکەن وتوویانە لەکاتی قورئان خوێندن و نوسین نابێ بووترێ فعلی عەبد مەخلوقە، نەک من بۆتانی بسەلمێنم فعلی عەبد مەخلوقە، ئێوە بانگەشەی شتێکی تر ئەکەن و لە ووتە ڕەهاکانی سەلەف دەرئەچن ئێوە لەسەرتانە بیسەلمێنن کە لەم کاتانە ناووترێ فعلی عەبد مەخلوقە، ئەگینا سەلەف وتوویانە فعلی عەبد هەمووی مەخلوقە، پاشان بۆ حیبر و کاغەز و لەوح هەموومان ئەزانین ئەمانە مەخلوقن، ئەسل وایە مەخلوق هەر مەخلوقە، ئێوە ئەڵێن

دوای نوسینی کەلامی اللە کوفرە بووترێ حیبر و کاغەز و قەلەم و لەوح مەخلوقن، کەواتە ئێوە لەسەرتانە بەڵگە بهێنن ئەم ووتانە کوفرن، ئەسل وایە هەر بە مەخلوقی بمێنن تاکو ئێوە بەڵگە ئەهێنن کە دوای نوسینی کەلامی اللە کوفرە بووترێ ئەمانە مەخلوقن، کەواتە ئێوە بانگەشەی شتێکی زیاد ئەکەن کە لەسەرتانە بیسەلمێنن، نەک من بێم لەخۆمەوە شتی زیاد دروست بکەم و دایبهێنم، کە بەڵگەم لە چەند زانایەکەوە هێناوە حیبر و کاغەز و قەلەم و لەوح بە مەخلوق ناو ئەبەن دوای ئەوەی کەلامی اللە نوسراوە، سەبارەت بەو ریوایەتەش کە الخلال هێناویەتی گوایە ابن نوح لەلای ئیمام احمد وتوویەتی: حیبر و کاغەز و کتاب مەخلوقن، ئیمام احمدیش ئینکاری لێ نەکردووە! ئیمام احمد ووتی: درۆیە تازە ئەمە ببیستم

دەقەکە ئاوایە: (الورق والحبر والكتاب مخلوق)

کابرای عمومی بۆ چەواشە کردن ئاوا وەری گێڕاوە بۆ کوردی: (وەرەقەو حیبر و کتێبەکە کە قورئانی تیا نوسراوە مەخلوقە)

سەیرکەن الکتاب بەوە تەرجەمە ئەکات مانای کتێبەکەیە کە قورئانی تێدا نوسراوە! بە پێی تەرجەمەکەی ئەو الکتاب هەر کاغەزەکان ئەگرێتەوە کە قورئانی تێدا نوسراوە!

چەواشەکاریەکەی روونە، چونکە کابرا خۆی ئەڵێ وەرەقە و حیبر و کیتاب مەخلوقن، سەرەتا باسی وەرەقەی کرد بۆ دیسان باسی بکاتەوە ؟ وەرەقەکە قورئانی تێدا نوسراوە، ئەی ئەم کتێبە چیە کە تۆ باسی ئەکەیت قورئانی تێدا نوسراوە ؟

یەعنی کابرا وتوویەتی کاغەز و حیبر و کاغەز مەخلوقن ؟! دوو جار کاغەزەکەی دووبارە کردۆتەوە ؟

الكتاب واتا خودی قورئانەکە نەک کاغەزەکە کە قورئانی تێدا نوسراوە، الله تعالى هێندە زۆر لە قورئاندا قورئانی بە الکتاب ناوبردووە ناتوانم بیژمێرم، هەروەها ئینجیل و تەورات و باقی کتێبەکانی تری هەر بە الکتاب ناوبردووە، تەنانەت لە زمانی عەرەبی هێندەی ئەووترێ کتاب الله هێندە ناووترێ قورئان، زۆربەی کات ناوی قورئان کە لە پاڵ سوننەتدا ئەهێنرێ ئەووترێ: الکتاب والسنة، بەر لەوەی کتێبی الله بنوسرێتەوە لەلایەن خەڵکەوە الله قورئانی هەر بە کتێب ناوبردووە، تەنانەت لە زمانی عەرەبی الکتاب بە مانای المکتوب-یش دێت واتا نوسراوەکە کە قورئانە، بۆیە کابرا ئەڵێ کاغەز و حیبر و نوسراوەکەش مەخلوقن، کە ئەمە ووتەی لەفزیەکان و کوللابیەکان بوو نوسراوەکەیان بە مەخلوق ئەزانی، بۆیە سەلەف لە ڕەددی ئەوان ئەیان ووت ئەوەی لە موسحەفدا نوسراوە کەلامی الله یە و مەخلوق نیە

ئینجا ئەڵێ تۆ بەلاتەوە ئاساییە بووترێ موسحەف مەخلوقە!

ئەمە درۆیە، من هەرگیز قسەی لەم جۆرەم نەکردووە و نایکەم، موسحەف لە زمانی عەرەبیدا واتا کۆمەڵێک پەڕاو لەپاڵ یەکترن نوسراویان تێدایە، بەڵام لەناو موسڵمانان وا ڕۆیشتووە موسحەف بۆ قورئان بەکارئەهێنن، کە بە ڕەهایی ووترا

موسحەف واتا قورئان، ئەگینا لەرووی زمانەوە دروستە بە هەموو کۆمەڵە پەڕاوێکی نوسراو کە لەپاڵ یەکتر دانراون بووترێ موسحەف، ئەپرسم: ئایا گەر ٦٠٤ لاپەری سپی بهێنم هیچی تێدا نەنوسرا بێت، کەس پێی ئەڵێ موسحەف ؟ بێگومان نەخێر، ئەوکاتە ناوی لێ ئەنرێ موسحەف کە کەلامی اللە ی تێدا ئەنوسرێ، بە نوسراوەکەوە ئەبێتە موسحەف، جا کاتێک لە عورفی موسڵمانان ووشەی موسحەف بۆ قورئان بەکار هێنرا، هەروەک لە فەرموودەش پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم موسحەفی بە قورئان ناو بردووە کە فەرموویەتی: (بە قورئانەوە سەفەر مەکەن بۆ خاکی دوژمن) کە مەبەستی موسحەفە قورئانی تێدایە، بۆیە موسڵمانان بە شتێک ناڵێن موسحەف گەر قورئانی تێدا نەبێت، هەر بۆیەش بەشێک لە فوقەهاء ڕێگەیان داوە سوێند بخورێ بە موسحەف چونکە ئەزانن خەڵکەکە مەبەستیان قورئانەکەی ناویەتی نەک سوێند خواردن بە کاغەز و حیبرەکە، پەنا بە اللە زانایانی ئیسلام بە دروستی بزانن سوێند بە شتێک بخورێ کە مەخلوقە، یان نە مەخلوقە و نە غەیر مەخلوقە (بە پێی مەزهەبی ئێوە دەربارەی حیبر و کاغەز)

جا گەر پێم ئەڵێن ئایا کاغەز و حیبر مەخلوقە ؟ ئەڵێم بەڵێ

گەر ئەڵێن موسحەف مەخلوقە ؟

ئاوا ناڵێم بەڵێ، چونکە بە پەڕاوێک ئەووترێ موسحەف کە کەلامی اللە ی تێدا نوسراوە، بەبێ کەلامی اللە ئەم ناوەی لێ نانرێ لەلای موسڵمانان، بە خیلافی لەوح پێش نوسینی کەلامی اللە و دوای نوسینی کەلامی اللە هەر لەوحە، واتا بابەتەکە تەنها پەیوەستە بە زمان و ووشەکەوە، هەروەک چۆن ئەڵێم لەوح مەخلوقە ئەوەی تێیدا

نوسراوە غەیر مەخلوقە، ئاواش ئەڵێم کاغەز مەخلوقە ئەوەی تێیدا نوسراوە غەیر مەخلوقە، بەڵام ووشەی

موسحەف لە عورفی موسڵمانان بۆ قورئان بەکاردێت هەر بۆیەش هەندێک سوێند بە موسحەف ئەخۆن، ئەمەش وەڵامێکی کورتە بۆ ئەوانەی کە مولزەمیان کردبووم بڵێم موسحەف مەخلوقە مادام ئەڵێم لەوح مەخلوقە! وە سەبارەت بە لەوح و موسحەف پۆستێکی درێژم ئامادە کردووە هەڵم گرتووە بۆ کاتی خۆی، بەڵام لێرەدا بە کورتی باسم کرد.

# اللفظية (٣٠)



هەروەک لە پۆستەکانی پێشتر باسمان کرد کە بابەتی ئیمان هاوشێوەی بابەتی لەفز بە قورئانە، ناووترێ ئیمان مەخلوقە و ناووترێ ئیمان غەیر مەخلوقە، لەبەر هەمان هۆکار، چونکە ئیمانیش دوو شتی مەخلوق و غەیر مەخلوق لەخۆ ئەگرێت بۆیە بە هیچ کامیان وەسف ناکرێت.

**ابو يعلى** دوای هێنانی ریوایەتەکەی الصوري و ئینکار کردنی ئیمام احمد لێ کە الصوري ووتی: ئیمان مەخلوقە، نوێژ مەخلوقە، وە مەبەستم ئەوەیە فعلەکە مەخلوقە نەک ووتە، پاشان ابو يعلى ئەڵێ:

دەست و خەتی ابن شاقلا-م بینی لەسەر کتێبی السنة ی الخلال نوسیبووی: دروست نیە بووترێ ئیمان مەخلوقە چونکە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئیمان بریتیە لە شایەتمانی لا اله الا الله)، وە نوێژیش لە ئیمانە و قورئانی تێدا ئەخوێنرێ، جا ئەو کەسەی بڵێ ئیمان مەخلوقە کافر دەبێت، وە دروست نیە بووترێ ئیمان غەیر مەخلوقە، چونکە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (نزمترین

بەشی ئیمان لابردنی کۆسپە لەسەر ڕێگا)، جا هەر کەسێک بڵێ لابردنی کۆسپ لەسەر ڕێگا غەیر مەخلوقە، ئەوا پێی وایە کە فعلی عەبدەکان غەیر مەخلوقە، هەر کەسێکیش ئەمە بڵێ ئەوا کافرە، جا دروست نیە بووترێ ئیمان مەخلوقە، وە دروست نیە بووترێ ئیمان غەیر مەخلوقە، چونکە زانایانی پێش خۆمان ئەمەیان نەووتوە.

**ابو يعلى** ئەڵێ: ابن شاقلا بە ڕاشکاوی ووتی کە فعلەکان مەخلوقن، وە نەفی ئەوەی کرد کە ووتەکان مەخلوق بن، بەڵام توقف-ی کرد کە بە ڕەهایی بووترێ ئیمان مەخلوقە نە بە موجمەلی و نە بە تەفصیلی.

**بڕوانە (المسائل العقدية من كتاب الروايتين والوجهين : ٨٦-٨٧)**

ابن شاقلا (٣٦٩ هـ) قوتابی غلام الخلال بووە

بڕوانە بە ڕوونی باسی ئەوە ئەکات کە فعلی عەبد مەخلوقە بەبێ استثناء، هەر لەبەر مەخلوقی فعلی عەبدە کە ناووترێ ئیمان غەیر مەخلوقە، گەر فعلەکەش بە مەخلوق وەسف نەکرێت ئیتر چی ئەمێنێتەوە ؟! کە ابن بطة و عبدالغني المقدسي و غەیری ئەوانیش باسی ئەوەیان کردووە لا اله الا الله غەیر مەخلوقە بۆیە ناووترێ ئیمان مەخلوقە، وە فعلی عەبدیش مەخلوقە بۆیە ناووترێ ئیمان غەیر مەخلوقە، گەر ئەووترێ ئەی الصوري ووتی: ئیمان مەخلوقە و نوێژ مەخلوقە، وە مەبەستم مەخلوقی فعلە نەک ووتە، ئیمام احمد هەر ئینکاری لێکرد، بۆچی ؟

ئەمە کرۆکی باسەکەیە کە هەمیشە باسمان کردووە و باسی ئەکەین، نابێ لەبەر مەخلوقی فعلی عەبد بڵێی ئیمان مەخلوقە، هەروەک چۆن نابێ لەبەر مەخلوقی فعلی عەبد بڵێی لەفزم بە قورئان مەخلوقە، جا الصوري لەبەر مەخلوقی فعلی عەبد ئیمان و نوێژی بە مەخلوق ناوبرد بە ڕەهایی، بۆیە ئیمام احمد ئینکاری لێکرد، هەروەک ابن شاقلا-ش ڕێگای نەداوە نە بە تەفسیل نە بە موجمەلی بووترێ ئیمان مەخلوقە، بە تەفسیل ئەمەیە کە بڵێی: ئیمان مەخلوقە بەڵام مەبەستم فعلی عەبدە نەک ووتەکان کە کەلامی الله یە، لەم بارەدا ئەگەرچی تەفسیلیشت دا بەڵام ئیمانت هەر بە مەخلوق ناوبرد، کە ئیمان ووشەیەکی جامعە شتی مەخلوق و غەیر مەخلوق لەخۆ ئەگرێت کە ووتت ئیمان مەخلوقە بە ڕەهایی ئەوا شتە غەیر مەخلوقەکەش ئەکەیت بە مەخلوق، وە بە موجمەلی ئەوەیە بڵێی: ئیمان مەخلوقە بەبێ روونکردنەوە، کە ئەمە زۆر خراپترە لەوەی یەکەم، ئێستاش با سەیر بکەین بزانین ئیمام احمد ئینکاری چ شتێکی لە الصوري کرد ؟ ئینکاری ئەوەی لێکرد کە ئەڵێ فعل و جوڵەی عەبد مەخلوقە ؟ یان ئینکاری ئەوەی لێکرد کە ئەڵێ ئیمان مەخلوقە ؟

ئیمام احمد دەربارەی الصوري ئەڵێ: هاوار بە حاڵی کە ووتی ئیمان مەخلوقە ئیتر چ شتێک ئەمێنێتەوە ؟! پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئیمان شایەتیدانی لا إله إلا الله یە) ئایا لا إله إلا الله مەخلوقە ؟!

سەیرکەن ئینکاری ئەوەی لێئەکات کە وتوویەتی ئیمان مەخلوقە، نەک ئینکاری ئەوەی لێبکات کە تەنها بڵێ فعلی عەبد مەخلوقە، جا گەر هەر کەسێک بڵێ فعلی

عەبد مەخلوقە و ئیمام احمد ئینکاری لێبکات ئیتر کام فعلی عەبد مەخلوقە کە ئەهلی سوننە باسی ئەکەن لە عەقیدەیاندا ؟ کە ئیمام احمد خۆی ئەڵێ فعلی عەبد هەمووی مەخلوقە بە طاعات و مەعاصی، ئایا گەر الصوري نەی ووتبا ئیمان مەخلوقە تەنها ووتبای فعلی عەبد مەخلوقە، ئیمام احمد ئەوکات ئینکاری لێئەکرد ؟ لە کاتێکدا خۆی و هەموو ئەهلی سوننە ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوقە بە ڕەهایی بەبێ استثناء، بەڵام دوو جەزائیریەکە و جەماعەتەکەی ئەمە ناچێتە مێشکیان ئەڵێن الصوري ووتی فعلی عەبد مەخلوقە بۆیە ئیمام احمد ئینکاری لێکرد! ئێ باشە الصوري خۆ وەک ئێوە ووتی فعل و جوڵەی عەبد مەخلوقە کە ئێوەش وائەڵێن کێشەتان لەوە نیە بووترێ فعلی عەبد مەخلوقە بەڵام کاتێک عەبد کەلامی الله ئەدا بکات نابێ بووترێ فعلی عەبدەکە مەخلوقە، ئەمە قسەی ئێوەیە کە هەمیشە باسی ئەکەن، ئێ الصوري هەر ئەمەی ووت، ووتی فعلی عەبد لە ڕووی جوڵە و فعلەوە مەخلوقە نەک لە ڕووی ووتە، هەمان قسەی ئێوەی کرد کردار و جوڵەکانی عەبدی بە مەخلوق ناوبرد، ئەی بۆ ئیمام احمد لێی قبوڵ نەکرد ؟

دیارە ئیمام احمد هەر قبوڵ ناکات کەس بڵێ فعلی عەبد مەخلوقە ؟!!! خۆ الصوري باسی ئەو شتەی نەکرد کە ئێوە بە کوفری ئەزانن، خۆ نەیووت کە قورئان ئەخوێنین فعلمان مەخلوقە، خۆ نەیووت کە قورئان ئەخوێنین زمان جوڵاندنی عەبد لەناو نوێژدا مەخلوقە، کە ئێوە ئەم شتانە بە کوفر ئەزانن، الصوري ئەمانەی نەووت بە ڕەهایی ووتی جوڵە و فعلی عەبد مەخلوقە، هەروەک چۆن ئێوەش بە رەهایی وائەڵێن، ئەی کەواتە بۆچی ئیمام احمد ئینکاری لێکرد ؟ یان ئەبێ بڵێن ئیمام احمد هەر قبوڵ ناکات بووترێ فعل و جوڵەی عەبد مەخلوقە، یان ئەبێ بڵێن لەبەر ئەوە ئینکاری لێکرد

چونکە ئەو ئیمانی بە مەخلوق ناوبرد، کە ئەمە بە روونی لە ریوایەتەکە دەرئەکەوێ ئیمام احمد ئەڵێ کە ووتی ئیمان مەخلوقە ئیتر چی ئەمێنێتەوە ؟ ناڵێ کە ووتی جوڵە و فعلی عەبد مەخلوقە ئیتر چی ئەمێنێتەوە

سبحان الله لە جەهلی ئەمانە ئەوەی بەڵگەیە لە دژی خۆیان ئەیکەن بە بەڵگە بۆخۆیان، کابرا ئەڵێ مادام فعلی عەبد مەخلوقە کەواتە ئەڵێم ئیمانیش مەخلوقە، ئیمام احمد ئینکاری لێ ئەکات ناڵێ چۆن ئەڵێی فعلی عەبد مەخلوقە، بەڵکو ئەڵێ چۆن ئەڵێی ئیمان مەخلوقە ؟ کە ئەمە مەزهەبی ئێمەیە و هەمیشە باسمان کردووە ئیمان و لەفز بە قورئان دوو ووشەی موجمەلن نابێ بووترێ مەخلوقن یان غەیر مەخلوق، لەبەر ئەوەی ووتەکان کەلامی الله-ن غەیر مەخلوقن، وە فعلەکە فعلی عەبدە مەخلوقە، لە نەبوونی بەڵگە و تەنگ بوونی ڕێگا لێیان هاتوون درۆ ئەدەنە پاڵم گوایە وتوومە مادام فعلی عەبد مەخلوقە ئاساییە بڵێی لەفزم بە قورئان مەخلوقە، وە ئاساییە بڵێی ئیمان مەخلوقە، گەر تێناگەن الله شارەزاتان بکات، گەر تێئەگەن بەڵام درۆ ئەکەن الله سوک و ریسواتان بکات

ابن بطة ئەڵێ:

قسە لەم بابەتە ئەوەیە کە ئەهلی عیلم لەسەری بوونە و تەسلیم ئەبین بەوەی کە ئەوان وتوویانە، هەر کەسێک بڵێ: ئیمان مەخلوقە ئەوا کافرە بە الله العظیم، چونکە ئەسلی ئیمان و لووتکەکەی بریتیە لە شایەتیدانی لا اله الا الله، وە هەر کەسێک بڵێ:

ئیمان مەخلوق نیە ئەوا مبتدعە، چونکە قەدەریەکان ئەڵێن: فعل و جوڵەی بەندەکان مەخلوق نین.

**(الإبانة الكبرى : ٢/٣٤٦)**

سەیرکە ئەڵێ لەبەر ئەوەی فعلی عەبد مەخلوقە ئەهلی سوننە ناڵێن ئیمان مەخلوقە، ئێمەش تەنها وتوومانە فعلی عەبدەکە مەخلوقە لەوە زیاتر نا، کەچی لەسەر ئەمە تەکفیرمان ئەکەن! گەر ئەڵێن ئاساییە بە رەهایی بووترێ فعلی عەبد مەخلوقە بەڵام کە هاتە سەر قورئان و زیکر و کەلامی الله نابێ بووترێ فعلی عەبد مەخلوقە، ئەڵێین خۆ ابن بطة لە هەمان ئەم بابەتە ئەم قسەیە ئەکات کە ئایا ئیمان مەخلوقە یان نا، گەر کێشەکە ئەوە بێت ئەی بۆ ابن بطة باسی ناکات ؟ بۆ ناڵێ ئەهلی سوننە ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوقە بەڵام لەم کاتانەدا فعلەکە بە مەخلوق وەسف ناکرێ کە ئێوە باسی ئەکەن ؟ بۆ تەنها باسی ئەوەی کرد ناووترێ ئیمان مەخلوقە و ناووترێ غەیر مەخلوقە ؟ بۆ نەیووت هەندێک فعل هەن نابێ بووترێ مەخلوقن یان غەیر مەخلوقن ؟ سبحان الله باسەکە ئەوەیە ئیمان بە مەخلوق و غەیر مەخلوق وەسف ناکرێ، ئێوە وازتان لە ئیمان هێناوە هاتوون ئەڵێن هەندێک فعلی عەبد هەیە بە مەخلوق و غەیر مەخلوق وەسف ناکرێن!!! کە هیچ سەلەف و خەلەفێکتان نیە لەم باسەدا و بیدعەی خۆتانە داتان هێناوە، هەرچی زانا هەیە بە رەهایی ئەڵێ فعلی عەبد مەخلوقە باسی هیچ قەید و شەرتێک ناکات

**عبدالغني المقدسي ئەڵێ:**

ریوایەت کراوە لە ئیمامەکەمان احمد کە وتوویەتی: هەر کەسێک بڵێ ئیمان مەخلوقە ئەوا کافرە، وە هەر کەسێک بڵێ ئیمان قەدیمە (واتا غەیر مەخلوقە) ئەوا مبتدعە.

عبدالغني المقدسي ئەڵێ: ئیمام احمد ئەو کەسەی تەکفیر کرد کە ئەڵێ ئیمان مەخلوقە، چونکە نوێژ لە ئیمانە، وە نوێژ خوێندنی قورئان و تەسبیح و زیکری الله عز وجل لەخۆ ئەگرێت، هەر کەسێکیش بڵێ ئەمە مەخلوقە ئەوا کافرە، وە نوێژ هەڵسان و دانیشتن و جوڵە و سکون لەخۆ ئەگرێت، هەر کەسێک بڵێ ئەمە قەدیمە (واتا غەیر مەخلوقە) ئەوا بیدعەی کردووە.

**(ذيل طبقات الحنابلة لابن رجب : ٣/٥٥)**

سەیرکەن بە روونی باس ئەکات کە فعلی عەبد مەخلوقە بۆیە ئیمان بە غەیر مەخلوق وەسف ناکرێ، باشە گەر جۆرە فعلێک هەبێت وەسف کردنی بە مەخلوق کوفر بێت بۆ هیچ زانایەک لەم بابەتە باسی ناکەن ؟ بۆ کاتێک باسی فعلی عەبد ئەکەن کەس ئەم قەیدەی تێناخات و استثناء دانانێت بە رەهایی ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوقە ؟ ئایا بێئاگا بوون لەوەی ئەم ووتانە سەر لە خەڵک ئەشێوێنێ ؟ یان بەری بوون لەم بیدعەیەی ئێوە بۆیە باسی ناکەن ؟

جا عمومیەک تەنها بۆ ئەوەی خەڵک چەواشە بکات و بیانترسێنێ هاتبوو ئەیووت گەر ووتت سوجدە بردنی عەبد مەخلوقە و رکوع بردنی مەخلوقە و جوڵەی لێوی مەخلوقە، ئەی چیتر مایەوە ؟

ئەم ئەکتەرە ئەم سیناریۆیە ترسناکەت بۆ دروست ئەکات تەنها بۆ ئەوەی بترسن ئەگینا ئەم ووتەیە هیچ کێشەیەکی تێدا نیە، بەڵێ بە کوێرایی چاوی تۆ و شێخە گومراکەت جوڵەی عەبد لە چەمانەوە و دانیشتن و هەڵسانەوە هەمووی مەخلوقە لەناو نوێژدا وەک عبدالغني المقدسي باسی کرد، ووتی نوێژ قورئان و زیکری تێدایە هەر کەسێک بڵێ ئەمانە مەخلوقن کافرە، نەیووت هەر کەسێک بڵێ فعلی عەبدەکە لەم کاتانە مەخلوقە کافرە

## ابن هانئ ئەڵێ:

پیاوێک هاتە لای باوکی عبدالله پرسیاری لێئەکرد، جا پیاوەکە ووتی: وە کەس تەکفیر ناکەین بە تاوان.

باوکی عبدالله ووتی: بێدەنگە، ئەوەی نوێژ تەرک بکات کافرە.

**بڕوانە (مسائل الإمام أحمد رواية ابن هانئ : ١٨٧٣-١٨٧٦)**

سەیرکەن ئیمام احمد لە دەربڕینی ووشەکان چەندە وورد بووە، رازی نەبووە قسەیەک بکرێ کە روون نەبێت و خەڵک بە جۆرێکی تر تێیبگەن، قبوڵ ناکات

بووترێ بە تاوان کەس تەکفیر ناکەین، چونکە تەرک کردنی نوێژیش تاوانە و کوفریشە، نەوەک کەسانێک وا لەم ووتەیە تێبگەن کە تەرک کردنی نوێژیش تاوانە و ئەهلی سوننە کەسی لەسەر تەکفیر ناکەن

حنبل ئەڵێ:

بیستم باوکی عبدالله ئەیووت: فعلی عەبدەکان مەخلوقە، وە فعلی بەندەکان ڕووئەدەن و بڕاونەتەوە بە قەزا و قەدەر.

**(السنة للخلال : ٨٨٩)**

سەیرکە چۆن بە رەهایی ئەڵێ فعلی عەبد مەخلوقە بەبێ ئەوەی استثناء بکات بڵێ تەنها ئەم فعلانە نەبێت کە دوو جەزائیریەکە باسی ئەکەن ناووترێ مەخلوقن، گەر جۆرە فعلێک هەبوایە وەسف کردنی بە مەخلوق کوفر بوایە ئەوا ئیمام احمد و ئەهلی سوننە بە رەهایی نەیان ئەووت فعلی عەبد مەخلوقە، بە تایبەتی لەکاتێکدا فرقەیەک دروست بووە کە لەفزیەکانن کە بە پێی فەهمی ئێوە ئەم لەفزیانە تەنها ئەیان ووت فعلی عەبد مەخلوقە لەکاتی قورئان خوێندن، جا گەر ئەمە کوفری لەفزیەکان بوایە بێگومان ئەهلی سوننە بە رەهایی نەیان ئەووت فعلی عەبد مەخلوقە، چونکە ئەم ووتەیە مەزهەبی لەفزیەکان بەهێز ئەکات و خەڵک توشی کوفر ئەکات بە پێی فەهمی ئێوە، بۆیە ئەبوو لەبەر لەفزیەکان بڵێن فعلی عەبدە مەخلوقە بەڵام لەکاتی قورئان خوێندن کوفرە بووترێ فعلی عەبد مەخلوقە، بەڵام یەک زاناش باسی ئەمەی

نەکردووە، ئەسلەن هەموو دونیا بگەڕێن یەک سەلەف ئەدۆزنەوە کە بڵێ: لەفزییەکان ئەوانە بوون کە ئەیان ووت فعلی عەبد لەکاتی قورئان خوێندن مەخلوقە بەڵام قورئانەکە غەیر مەخلوقە، ئەهلی سوننەش لە بەرامبەردا ووتیان: ئەمە کوفرە لەکاتی قورئان خوێندن فعلی عەبد بە مەخلوق وەسف بکرێ ئەبێتە کوفر! بۆچی زانایەک ئەمەی باس نەکرد لە وەسفی لەفزییەکان ؟ لە کاتێکدا ابن بطة بە ڕوونی لە وەسفی لەفزییەکان ئەڵێ فرقەیەکی جەهمی بوون بروایان وابوو قورئان مەخلوقە بەڵام هاتن فێڵیان کرد و ووتەیەکی فێڵاویان داهێنا تاکو کوفرەکەیان بشارنەوە کە مەخلوقی قورئانە هاتن ووتیان لەفز بە قورئان مەخلوقە، کە چەندین جار ئەم ووتەیەی ابن بطة-م داناوە بەڵام خۆتان لە ئاستی گێل ئەکەن وەک ئەوەی هەر بوونی نەبێت بە هیچ جۆرێکیش جورئەت ناکەن قسەی لەسەر بکەن چونکە ئەزانن ووتەکەی هێندە ڕوونە مەجالی هیچ چەواشە و تەئویلێکی بۆ نەهێشتوونەتەوە، تەنانەت ابن بطة ئەوەش باس ئەکات کە لەفزییەکان ئەیان ووت قورئان کەلامی الله یە و غەیر مەخلوقە، کە جەماعەتی دوو جەزائیریەکە تاکو ئێستاش لەوەدا گیریان خواردووە ئەڵێن مادام وایان ووتوە ئەی چۆن قورئانیان بە مەخلوق زانیوە ؟! تاکو ئێستا تێنەگەیشتوون لە مەزهەبی لەفزییەکان بەس ئەزانن بڵێن جەهمی و زندیق، ئامۆژگاریتان ئەکەم بڕۆن ووتەکەی ابن بطة بخوێننەوە دەربارەی لەفزییەکان بزانن لەگەڵ ووتەی من یەک ئەگرێتەوە یان ووتەی ئێوە ؟ ئەمە لە کاتێکدا ابن بطة خۆی ریوایەتی الصوري هێناوە کە ئیمام احمد ئەڵێ ئەمە وەک کەرابیسی وایە پێی وایە حەرەکات مەخلوقە، ئەی خێرە ابن بطة کە خۆی ریوایەتەکەی هێناوە وەک ئێوە لە مەزهەبی لەفزییەکان حاڵی نەبووە بەجۆرێکی تر باسیان ئەکات ؟!!!

که له پۆستەکانی پێشوو روونم کردەوه لەیەکچوونی الصوري و کەرابیسی له چیدایە، ئەو ئەیووت مادام فعلی عەبد مەخلوقه کەواته ئەڵێم ئیمان مەخلوقه، ئەویش ئەیووت مادام فعلی عەبد مەخلوقه کەواته ئەڵێم لەفزم به قورئان مەخلوقه، قورئانەکەی به نسبەت عەبد وەک فعلی عەبد و کەلامی عەبد سەیر ئەکرد، بەڵام به نسبەت الله به غەیر مەخلوقی ئەزانی، بەراورد کردنی دوو کەسیش بەیەکتر مانای ئەوە نیه که له هەموو رووەکاندا ئەم دوو کەسه هاوبەش بن، لەیەکچوونەکه لەم رووەیه که باسم کرد، چونکه وەک ووتم خودی ابن بطة که ئەم ریوایەتەی هێناوه بەم جۆره له مەزهەبی لەفزییەکان و کەرابیسی تێنەگەیشتووه که ئێوه باسی ئەکەن، بەڵکو رێک بەو جۆره باسی ئەکات که من باسم کردووه له پۆستەکان

حنبل ئەڵێ:

باوکی عبدالله ووتی: خێر و شەڕ به قەدەره، طاعەت و مەعصیەت به قەدەره، وە فعلی عەبدەکان هەمووی به قەدەره.

**بڕوانه (السنة للخلال : ٨٨٩)**

سەیرکه ئیمام احمد ووتی فعلی عەبدەکان هەمووی به قەدەره، هەمووی بەبێ استثناء، که ئەڵێ به قەدەره واتا مەخلوقه الله خەلقی کردووه و عەبدیش ئەنجامی ئەدات، هەروەک چۆن الله تعالی سیفەتی الخلق و الرزق ی هەیە، سیفەتەکانی غەیر

مەخلوقن، الله سیفەتی الخلق ی هەیە مەخلوقات دروست ئەکات، سیفەتەکەی الله غەیر مەخلوقە، بەڵام مەخلوقات کە بە سیفەتی الله دروست بوونە مەخلوقن، الله سیفەتی رزق هەیە سیفەتی الله غەیر مەخلوقە، بەم سیفەتە رزق مەخلوقات ئەدات، بەڵام ئەو رزقەی کە مەخلوقات ئەیخۆن مەخلوقە، واتا جیاوازی هەیە لە نێوان فعل و مفعول، فعلەکە فعل و سیفەتی الله یە و غەیر مەخلوقە، بەڵام مەفعولەکە مەخلوقاتە کە الله خەلقی کردووە، ئێمە مەفعولین، بە هەمان شێوە قەدەری الله کە عیلم و ویستی الله یە غەیر مەخلوقە، بەڵام مەقدورەکان کە رووئەدەن بە قەدەری الله مەخلوقن، هەموو ئەو رووداوانەی کە روو ئەدەن قەدەری الله یە، واتا قەدەرەکە عیلم و ویستی الله یە و مەخلوق نیە، بەڵام مەقدورەکان کە رووئەدەن و عەبد ئەنجامیان ئەدات مەخلوقن، جا کە ئیمام احمد ئەڵێ فعلی عەبدەکان هەمووی بە قەدەرە واتا هەمووی مەخلوقە

**ابن منده ئەڵێ:**

الله عز وجل فەرموویەتی: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَىۡءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقۡدِيرًا﴾ وما قدره فقد خلقه.

ئەوەی الله لە قەدەر دایناوە خەلقی کردووە.

**(التوحيد لابن منده : ١٦٢/٢)**

ئەمەش ووتەی ئیمام احمد روون ئەکاتەوە کە ئەڵێ فعلی عەبدەکان هەمووی بە قەدەرە، واتا هەمووی مەخلوقە الله خەلقی کردووە، وە والله ئەمە شتێکی هێندە روونە بۆ کەسێک کە تۆزێک عیلمی هەبێت بەم باسانە، بەڵام درۆزن و چەواشەکار هێندە زۆر بووە کە جەهلی ئەم خەڵکە ئەقۆزنەوە ئەزانم ئێستا کەسێک بێت پۆستێک بکات بڵێ سەیرکەن ئەم زندیقە ئەڵێ چی ؟ سەیرکەن چۆن ووتەی سەلەف چەواشە ئەکات! خێرا بەشێکتان بڕوا ئەکەن بەهۆی جەهلتانەوە، ئەسلەن ئەزانن خیلافی ئەهلی سوننە لەگەڵ قەدەرییەکان لە فعلی عەبد لەسەر چی بوو ؟ قەدەرییەکان ئەیان ووت فعلی عەبد مەخلوق نیە، کە ئەیان ووت مەخلوق نیە مەبەستیان ئەوە نەبوو کە فعلی الله یە و وەسفی مەخلوق وەرناگرێ، بەڵکو ئەیان ووت فعلی عەبد مەخلوق نیە بۆ الله، واتا الله خەلقی نەکردووە، ئینسان خۆی فعلی خۆی خەلق ئەکات، سەیرکەن ئەهلی سوننە کێشەیان لەگەڵ قەدەرییەکان لەوە نەبووە کە فعلی عەبد بە مەخلوق ئەزانن، بەڵکو کێشەیان لەوە بووە کە ئەڵێن ئینسان خۆی خەلقی فعلەکەی ئەکات نەک الله خەلقی فعلی عەبد بکات، ئەهلی سوننەش لە بەرامبەردا ئەیان ووت الله خەلقی فعلی عەبد ئەکات ئینسان خەلقی فعلی خۆی ناکات بەڵکو ئەنجامی ئەدات

**قوام السنة الأصبهاني** بەسەرهاتەکەی الصوري نەقل ئەکات ئەڵێ:

المروذي ووتی: پرسیارم لە باوکی عبدالله احمد بن محمد بن حنبل کرد رحمه الله دەربارەی کەسێک کە ئەڵێ: ئیمان مەخلوقە ؟

باوکی عبدالله توڕە بوو، وە ووتی: ئەم پیاوە لە کوێیە ؟ لەلای کێ ماوەتەوە ؟ وە لەگەڵ کێ دائەنیشێت ؟

المروذي ئەڵێ ووتم: پیاوێکی غەریبە، ئەووترێ لە (الصور)ەوە هاتووە، وە لە کاغەزێکدا نوسیبووی: گەر باوکی عبدالله ئینکاری ئەم قسانەی لێکردم ئەوا تەوبە ئەکەم

باوکی عبدالله ووتی: سەیرکە دوژمنی الله چۆن تەوبە پێش ئەخات، ئەڵێ گەر ئینکاری لێکردم تەوبە ئەکەم! بۆچی ئەیەوێ قسەیەک بکات کە تەوبەی لێئەکات ؟! ئەمە جەهمیە، ئەمە بابەتی لەفزیەکانە، تەحزیر لەم کەسە بکەن زۆر بە توندی.

**(الحجة في بيان المحجة : ٥٧٧/٢)**

لێرەدا قوام السنة بە ماناوە ریوایەتەکەی نەقل کردووە دەقاو دەق نەیهێناوە، کە ئەڵێ ئەمە بابەتی لەفزیەکانە، ئەم ڕستەیە لەلای الخلال و ابن بطة نەهاتووە، مەبەستی ئەوەیە کە ئیمام احمد ووتی ئەمە هەمان ووتەی کەرابیسیە، کەرابیسیش ئیمامی لەفزیەکان بوو بۆیە ئەڵێ ئەمە بابەتی لەفزیەکانە، جا ئەوەی مەبەستمانە لێرەدا ئەوەیە کە قوام السنة ئاگاداری بابەتی الصوري-ە، کە ئیمام احمد ئەو کەسە بە جەهمی ئەزانێت کە بڵێ ئیمان مەخلوقە، جا با بزانین قوام السنة خۆی چی ئەڵێ لەم بارەیەوە لە کاتێکدا قوام السنة لە لەفزیە غەیر مەخلوقیەکانە وەک پێشتر باسم کردووە.

## قوام السنة الأصبهاني ئەڵێ:

زانایانی سەلەف وتوویانە: عیلم و سیفاتەکانی الله هەمووی غەیر مەخلوقە، وە الله یەکە بە هەموو ناو و سیفەتەکانیەوە، وە قورئانی کەلامی الله یە مەخلوق نیە، وە هەر کەسێک بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە ئەوا جەهمیە، وە هەر کەسێک بڵێ ئیمان مەخلوقە ئەوا مبتدعە، وە صەواب ئەوەیە کە بڵێین: سیفاتی الله و عیلمی الله و کەلامی الله و ناوەکانی الله غەیر مەخلوقن، وە دروستکراوەکان خۆیان و کردەوەکانیان و

جوڵەکانیان مەخلوقن، لەمە زیاتر ناووترێ.

**بڕوانە (الحجة في بيان المحجة : ٢ / ٢٦٢-٢٦٣)**

سەیرکەن قوام السنة خۆی ریوایەتەکەی الصوري نەقل کرد کە ئەڵێ جوڵە و فعلی عەبد مەخلوقە، ئێستا قوام السنة هەر خۆی ئەڵێ جوڵە و فعلی عەبدەکان مەخلوقە، ئایا پێتان وایە قوام السنة بەسەرهاتەکەی الصوري نەقل بکات و ئینکاری ئیمام احمد لێی نەقل بکات، پاشان هەر خۆی هەمان قسەی الصوري بکاتەوە ؟ گەر الصوري کێشەکەی ئەوە بێت کە ووتی جوڵە و فعلی عەبد مەخلوقە ئەوا ئیمام احمد و قوام السنة و هەموو ئەهلی سوننەش ئەمە ئەڵێن، تەنانەت خۆشتان ئەمە ئەڵێن ئینکاری لێ ناکەن، ئەی بۆ ئیمام احمد ئینکاری لێکرد ؟ چونکە الصوري ووتی مادام فعل و جوڵەی عەبد مەخلوقە کەواتە ئەڵێم ئیمان مەخلوقە لەم ڕووەدا، ئینکار کردنەکە لەوە بوو کە ووتی ئیمان مەخلوقە، ئێمەش ئەڵێین فعلی عەبد مەخلوقە

بەڵام ناڵێین ئیمان مەخلوقە، وە ئەڵێین فعلی عەبد مەخلوقە بەڵام ناڵێین لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، چونکە ئیمان و لەفز دوو ووشەی موجمەلن، کەواتە ئەم بەسەرهاتەی الصوري چ بەڵگەیەکی تێدایە لە دژی ئێمە ؟!

--------------------------

ماویەتی

# بەشێک

## ئەوەی بە خەیاڵ بیرم لێی ئەکردەوە بوو بە ڕاستی

پێشتر ئەم ووت بابەتی لەفز بە قورئان و ئیمان وەک یەک وایە کە دوو شتی مەخلوق و غەیر مەخلوق لەخۆ ئەگرن، بۆیە ناووتریٚ مەخلوقە یان غەیر مەخلوقە

ئینجا ئەم ووت جەماعەتی دوو جەزائیریەکە لە بابەتی لەفز تەنها لەسەر ئەوە تەکفیرمان ئەکەن کە بڵێین فعلی عەبدەکە مەخلوقە، ئێ بابەتی ئیمانیش هەروایە ئەوکات مولزەم ئەبن بەوەی کە بڵێن نابێ لە بابەتی ئیمانیش عەمەلە چاکەکانی مرۆڤ بە مەخلوق وەسف بکریٚ، چونکە عەمەلە چاکەکانی مرۆڤ لە ئیمانە، ئەوکات هەرچی کردەوەی لاشە هەیە نابێ بە مەخلوقی وەسف بکەن هەروەک چۆن لە بابەتی لەفز بە قورئان لەسەر مەخلوقی فعلی عەبد بە کافرمان ئەزانن

بەڵام ووتم ئەم ئیلزامە دوورە کەسیان خەیاڵیان بۆ ئەمە ناچێت و ئەو مەبەستەیان نیە ئەگەرچی پێی مولزەم ئەبن بەڵام کاتێک ئیلزام ئەکرێن پێیەوە ڕێک ئەڵێن ئێمە بەرین لەم شتە قسەی وامان بە خەیاڵ نەهاتووە

لە بیری خۆم وا باسی بابەتەکەم ئەکرد بۆیە ئیلزامم نەکردبوون بەوەی کە فعلی عەبد لە بابەتی ئیماندا بە مەخلوق وەسف نەکەن و توقفی لێ بکەن.

کەچی ئەبینم لەم هەفتەیەدا عمومیەکی شوێنکەوتەی کابرای جەزائیری بە من ئەڵێ: کە تۆ ئەڵێی ناڵێم ئیمان مەخلوقە و ناڵێم ئیمان غەیر مەخلوقە، بەڵام خۆ ئەڵێی فعلی عەبد مەخلوقە، ئیمانیش لە قەول و عەمەلە کەواتە بۆچی ناڵێی نیوەی ئیمان مەخلوقە ؟ دیارە بێ ئاگای کە بەشێکی ئیمان عەمەلە، مادام عەمەل بە مەخلوق ئەزانیت کەواتە بڵێ نیوەی ئیمان مەخلوقە!!!

بەڕاستی زۆر لەلام سەیر بوو، ئەوەی من بە خەیاڵ باسم ئەکرد بوو بە ڕاستی

ئەوەتا بە ڕاشکاوی ئەڵێ کە ووتت فعل مەخلوقە ئیمانیش قەول و فعلە کەواتە بڵێ نیوەی ئیمان مەخلوقە !!!

یەعنی لەلای ئەم کابرایە گەر بڵێی: لادانی کۆسپ لەسەر ڕێگا فعلی عەبدە، وە بەشێکە لە ئیمان وەک لە فەرموودە هاتووە، ئەوا تۆ بەشێکی ئیمانت بە مەخلوق ناوبردووە و موخالەفەی ئەهلی سوننەت کردووە !!!

بە ڕاستی نازانم ئەمانە ئەخوێننەوە و ئاگاداری ووتەی ئەهلی سوننەن لەم بابەتە یان نا ؟ ئەهلی سوننە کە باسی بابەتی ئیمان ئەکەن ئەڵێن: بۆیە ناووترێ ئیمان غەیر مەخلوقە چونکە فعلی عەبد مەخلوقە و بەشێکە لە ئیمان، کەچی کابرای عمومی ناوبردنی فعلی عەبدەکەش بە مەخلوق بە کوفر ئەزانێ، پێی وایە بەم ووتەیە بەشێکی ئیمانت بە مەخلوق وەسف کردووە

ابن بطة و ابن شاقلا و عبدالغني المقدسي کە هەرسێکیان حەنبەلین ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوقە بۆیە ئەهلی سوننە ناڵێن ئیمان غەیر مەخلوقە، کەچی کابرای عمومی ئەڵێ ابن بطة بۆ قسەیەکی لەم شێوەی تۆی نەکرد!!! نازانم ئەمانە ئەخوێننەوە ؟ یان ئەخوێننەوە و تێناگەن ؟

بە پێی مەزهەبی ئەمە بێت وەک قەدەریەکان چۆن ئەڵێن الله شەڕی خەلق نەکردووە، ئەبێ بڵێین خێر مەخلوق نیە، چونکە هەموو کردەوەیەکی چاکە لە ئیمانە و ئیمانی پێ بەرز ئەبێتەوە، کەواتە نابێ هیچ کردەوەیەکی چاکەی مرۆڤ بە مەخلوق وەسف بکەین نەوەک بەشێکی ئیمان بکەین بە مەخلوق! تەنها بڵێین تاوانەکان مەخلوقن، نەڵێین چاکەکان مەخلوقن!

هەمان عەقیدەی قەدەریەکانە بەڵام دژەکەیان وەرگرتووە

سەبارەت بەوەش کە ئەڵێ من وتوومە نوێژ مەخلوقە! ئەمە درۆیە هەموو پۆستەکانی من ئەم ووتەیەی تێدا نیە، نازانم ئەم درۆیەت لەکوێ هێنا، پێشتریش ئەت ووت تۆ ئەڵێی ئیمان مەخلوقە، کە درۆکەم روون کردیتەوە ئەمجارە هاتیتە سەر نوێژ، گەر وەسف کردنی حەرەکاتی ناو نوێژ بە مەخلوق ئەمە بە کوفر ئەزانیت سەرەتا برۆ عبدالغني المقدسي تەکفیر بکە، نوێژیش وەک ئیمانە شتی مەخلوق و غەیر مەخلوقی تێدایە بە هیچ کامیان وەسف ناکرێ، بەڵام لە ئیفلاس بوونی بەڵگە دەستت داوەتە درۆ کردن، سەرەتا هەر ووتت زندیق و جەهمی و خەریکی جنێودان بوویت زانیت سودی نیە ئێستا دەستت داوەتە درۆ، بە جۆرێکیش درۆم بۆ هەڵئەبەستی نەک قسەکەم هەر نەکردووە بەڵکو دژی ئەم قسەیەم کردووە

وە بۆم دەرکەوت ئەم کەسە یان پۆستەکانی من ناخوێنێتەوە بەڵکو تەنہا بە خێرایی چاوی پێ ئەخشێنێ، یان ئەیخوێنێتەوە بە تەواوی بەڵام تێی ناگات، یان ئەیخوێنێتەوە و تێشی ئەگات بەڵام درۆ ئەکات و ووتەکانم چەواشە ئەکات تاکو لەلای خەڵک ناشرینم بکات شتانێک ئەداتە پاڵم کە لێی بەریم.

بۆ نموونە لە پۆستی ژمارە (٣٠) ووتەی ابن شاقلا-م هێنا کە قوتابی غلام الخلال بووە، وە لەگەڵ ابن بطة نامە گۆڕینەوە لەنێوانیاندا هەبووە، ووتەکەی ابن شاقلا کێ نەقلی کردووە ؟ ابو یعلی، منیش نوسیومە کە ابو یعلی ووتەکەی ابن شاقلای نەکردووە، واتا ووتەکە ووتەی ابن شاقلایە ابو یعلی تەنہا نەقلی کردووە، هەروەک چۆن ئەو ووتەی ئەم و ئەو لەلای الذهبي نەقل ئەکات، ووتەکە ووتەی الذهبي نیە الذهبي تەنہا نەقلکەرە.

کەچی هاتووە پۆستی کردووە ئەڵێ ابو یعلی ئیمامی تۆیە و تۆ استدلال بەو ئەکەیت!

من نەک لەم پۆستەدا بەڵکو لەهەر ٣٠ پۆستەکەدا تا ئێستا یەک ووتەی ابو یعلی م نەهێناوە، ئەم درۆیەت لەکوێ هێنا ؟ ئینجا گریمان ووتەشی بہێنم ئایا بەمە کردوومە بە ئیمامم ؟ پاشان تۆ خۆت ئەڵێی لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان ئەیان ووت فعلی عەبدەکە غەیر مەخلوقە، گاڵتەت بە من ئەکرد کاتێک ووتم لەفزیە غەیر مەخلوقیەکان مەبەستیان غەیر مەخلوقی قورئان بوو نەک غەیر مەخلوقی فعلی عەبد، بەڵام ووتەکەیان هەڵە بوو بیدعە بوو، بەڵام تۆ گاڵتەت پێ ئەهات ئەت ووت نا مەبەستیان ئەوە بوو فعلی عەبد غەیر مەخلوقە، ئێ باشە هەر لەسەر قسەی خۆت من ئیلزامم کردووی، ووتەی چەند لەفزیەکی غەیر مەخلوقیم بۆ هێناوی کە

لەلایان ئاسایی بووە فعلی عەبد بە مەخلوق وەسف بکرێ، ئەمە چۆن لەیەک ئەدەیتەوە ؟ ئایا لەیەک کاتدا لەفزی مەخلوقی و لەفزی غەیر مەخلوقی بوونە ؟ گەر کێشەی لەفزییەکان ئەوە بێت کە ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوقە، بەمە ببن بە جەهمی، ئەی چۆن لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان کێشەیان لەوە نیە بووترێ فعلی عەبد مەخلوقە ؟ ئایا ئەوانیش لەفزی مەخلوقین ؟!

من هاتووم لەم ڕووە ووتەی هەندێک لەفزی غەیر مەخلوقیم هێناوە کە ئەوانیش کێشەیان نەبووە لەوەی بووترێ فعلی عەبدەکە مەخلوقە لەکاتی قورئان خوێندن، لەکاتێکدا ئەمانە غلویان هەیە لە بابەتەکە و بە بیدعە ڕەددی بیدعەیان داوەتەوە، وە من نەهاتووم بڵێم ئەوان لەسەر عەقیدەی ئەهلی سوننەن لەم بابەتە و زانیویانە مەزهەبی ئەهلی سوننە چیە، بێگومان گەر بیانزانیبوایە نەیان ئەووت لەفزمان بە قورئان غەیر مەخلوقە، بەڵام کە ئەوان فعلی عەبدەکە بە مەخلوق وەسف ئەکەن لە هەمان کاتیشدا ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە، بەم ووتەیە مەزهەبی تۆ دەربارەی هەردوو فرقەی لەفزی تێک ئەشکێنێ هەروەک چۆن لە مەزهەبی ئەهلی سوننەش تێنەگەیشتووی لەم باسە، وە دەری ئەخات کە سپی و ڕەشی باسەکە لەیەکتر جیا ناکەیتەوە

ئینجا هاتووە ووتەکەی ابن حامدی هێناوە دووبارە، الحمدلله فێری ناوەکەی بوویت لە پۆستی پێشوو دووجار نوسی بووت ابو حامد! کە پێش ئەوەی تۆ ئەم ووتەیە پۆست بکەیت من لە مانگی ١١ پۆستم کردووە ووتەکەی ڕەددە بۆ کوللابیەکان بەڵام چی بکەم کە تێناگەیت، ابن حامد خۆی ریوایەتی بوخاری ئەهێنێت لە کتێبەکانی، وەک

تۆ جاهیل نیە بەم باسە، بەڵام هێندەش دڵت بە فەهمی ابن حامد خۆش مەکە چونکە ئەویش لەفزییەکی غەیر مەخلوقیە، تەنانەت ابو یعلی ئەم ووتە بیدعیەی لەم وەرگرتووە کە ئەڵێ لەفزمان بە قورئان غەیر مەخلوقە، بۆیە هێندە دڵت خۆش مەکە بەم ووتەیە چونکە پێشی تۆ نەقلمان کردووە و روونمان کردۆتەوە باسی چی ئەکات، ئینجا تۆش لە نەتیجە ووتەی لەفزییەکی غەیر مەخلوقیت هێناوە هەرچەندە روونمان کردۆتەوە کە باسی کێ ئەکات لەم ووتەیە، گەر بڵێی ووتەکە هی خۆی نیە ئەڵێ ئەمە ووتەی ئیمام احمدە، ئەوا ئەڵێم خۆ لەفزییە غەیر مەخلوقیەکانیش ئەیان ووت ووتەکەمان ووتەی احمدە کەسیان ناڵێن ئەم ووتەیە هی خۆمە احمد لێی بەرییە، وە بۆ ئەوەی بزانی کە تۆ هێشتا لە مەزهەبی لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان تێنەگەیشتووی کە مەبەستیان قورئانەکە بوو نەک فعلی عەبد کاتێک ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان غەیر مەخلوقە، ئەوا سەیری ئەم ووتەیەی ابن حامد بکە

**ابو یعلی** ئەڵێ:

شێخەکەمان ابو عبداللە ووتی: ئاساییە بووترێ لەفزم بە قورئان غەیر مەخلوقە، چونکە احمد تەکفیری واقفەی یەکلا کردۆتەوە کە دەربارەی قورئان ناڵێن مەخلوقە، وە ناڵێن غەیر مەخلوقە، بەڵام احمد پێی خۆش نەبووە بووترێ لەفزم بە قورئان مەخلوق نیە چونکە سەلەف لە سەردەمی احمد و پێش ئەویش ئەمەیان نەووتوە.

(ابو عبداللە: ابن حامدە)

سەیرکە ابن حامد کە ئەڵێ لەفزم بە قورئان غەیر مەخلوقە ئەوە ئەکاتە بەڵگە بۆخۆی کە ئیمام احمد تەکفیری واقفەی کرد کاتێک توقف یان کرد لە قورئان، واتا بزانە کە ابن حامد و غەیر ئەویش کە ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە، مەبەستیان خودی قورئانەکەیە، نەک فعلی عەبدەکە، ئەمەش بەرامبەر لەفزیە مەخلوقیەکان ئەڵێن کە قورئانیان بە مەخلوق ئەزانی، هەر بۆیەش لەفزیە غەیر مەخلوقیەکان ئەڵێن تیلاوە مەتلوە و قیرائە مەقروئە و لەفز مەلفوزە، واتا ئەوەی ئەشی خوێنین هەر قورئانەکەیە و غەیر مەخلوقە.

ئەمما کاتێک ئەڵێت جیاوازی من و الصوری ئەوەیە ئەو وتویەتی ئیمان مەخلوقە و مەبەستی فعل بوە

بەڵام من ناڵێم ئیمان مەخلوقە و ناشڵێم مەخلوق نیە بەڵکو ئەڵێم کردەوەکە مەخلوقە !

ئەمە ڕونە کە ئەم غەبیە جهمیە هەر نازانێت چی ئەڵێت ڕەنگە لای وابێت عمل و کردەوە لە ئیمان نین بۆیە کە نەڵێت ئیمان مخلوق نیە یان مخلوقە ئیتر کردەوەی باس نەکردوە !!!

ئێ زندیق ئەو نوێژەی تۆ بەمخلوق ناوی ئەبەیت لە ئیمانە و بەشێکی ئیمانە ئیتر بۆ ناوێرێت بڵێیت ئیمان بەشێکی مەخلوقە و بەشێکی مەخلوق نیە ؟!

پێت وایە بەم پێچو پەنایە ئیتر دەربازت بوە ؟!
گێلیت گەر وابزانیت تۆ و الصوری جیاواز بون بەڵکو ئەو ئیمامی تۆیە و تۆش لەسەر دینی ئەویت .

پاشان ابن بطە دوای باسکردنی بەسەر هاتی الصوری بۆ ئەو تەفسیلەی تۆی نەدا ابن بطە نەی ئەزانی و تۆ زانیت ؟!

ئەمەش وتەی عمومیەکە

# اللفظية (٣١)



شێخ عبدالقادر گەیلانی حەنبەلی ئەڵێ:

پرسیار لە ئیمام احمد رحمه الله کرا دەربارەی ئەو کەسەی کە ئەڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە ؟ ووتی: کافر بووە، وە ئیمام احمد رحمه الله وتوویەتی: هەر کەسێک بڵێ قورئان کەلامی الله یە مەخلوق نیە بەڵام تیلاوە مەخلوقە، کافر بووە.

پاشان شێخ عبدالقادر ئەڵێ: الله هەڕەشەی بە سەقەر لە الوليد بن المغيرة المخزومي کرد کاتێک قورئانی بە ووتەی مرۆڤ ناوبرد، الله تعالى فەرمووی: ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ يُؤۡثَرُ (٢٤) إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا قَوۡلُ ٱلۡبَشَرِ (٢٥) سَأُصۡلِيهِ سَقَرَ (٢٦)﴾ [المدثر]، جا هەر کەسێک بڵێ قورئان عیبارەتە یان مەخلوقە یان لەفزم بە قورئان مەخلوقە ئەوا سەقەری بۆ هەیە، هەروەک چۆن بە الوليدی ووت ئیللا مەگەر تەوبە بکات، وە الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٦]، نەیفەرموو: تاکو کەلامی تۆ ئەبیستێ ئەی محمد (ولم يقل: حتى يسمع كلامك يا محمد).

پاشان شێخ عبدالقادر ئەڵێ: الله تعالى و پێغەمبەرەکەی فرمانیان بە ئیمانداران کردووە کە قورئان بخوێنن لە نوێژدا، وە نەهیان کردووە لە قسەکردن لەناو نوێژدا، جا ئەگەر قیرائەتی ئێمە کەلامی ئێمە بوایە کەلامی الله نەبوایە، ئەوا ئێمە ئەو شتەمان ئەنجامداوە کە نەهیمان لێکراوە لە نوێژدا.

**بڕوانە (الغنية : ٨٩-٩٠)**

عبدالقادر گەیلانی بە هەمان ووتەی ئیمام احمد ڕەددی لەفزیەکان ئەداتەوە کە زۆربەی کات بەم ئایەتە ئیمام احمد ڕەددی لەفزییەکانی ئەدایەوە ئەیووت: الله فەرمووی: تاکو کەلامی الله ئەبیستێ، نەیفەرموو: تاکو کەلامی تۆ ئەبیستێ ئەی محمد، گەر لەفزییەکان بڕوایان وابوایە ئەو قورئانەی عەبد ئەیخوێنێ کەلامی الله یە و غەیر مەخلوقە، بۆچی ئیمام احمد بەم ئایەتە ڕەددیان ئەداتەوە، ئەڵێ الله فەرمووی کەلامی الله ئەبیستێ نەیفەرموو کەلامی محمد ئەبیستێ، واتا کاتێک عەبد قورئان ئەخوێنێ کەلامەکە کەلامی الله یە لەسەر زمانی بەندەکان قورئان نابێتە مەخلوق وەک کەلامی مەخلوقات نیە، ئەوان پێیان وابوو قورئان بە لەفزی عەبد وەک کەلامی عەبد وایە قورئان لەسەر زمانی عەبدی مەخلوق ئەبێتە مەخلوق.

پاشان عبدالقادر دیسان بە ووتەی ئیمام احمد ڕەددیان ئەداتەوە دەربارەی نوێژ کردن، کە کاتی خۆی ریوایەتی ئیمام احمدمان هێنا لە ڕەددی لەفزییەکان ئەڵێ گەر قسەکەی ئێوە بێت ئەوا نوێژ بە قورئان خوێندن دروست نابێت، چونکە نوێژ بە شتی مەخلوق دروست و تەواو نابێت، ئینجا ئەو فەرموودەیەی ئەهێنا کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەهی کردووە نوێژ قسەی خەڵکی تێدا بێت، کە ئەمە ڕوونترین

بەڵگەیە کە لەفزییەکان پێیان وابوو قورئان بە لەفزی ئێمە ئەبێتە مەخلوق چونکە کەلامی عەبد مەخلوقە عەبدیش بە کەلامی خۆی قورئانەکە دەرئەبڕێ کەواتە لەسەر زمانمان ئەبێتە مەخلوق بەڵام بە نسبەت الله غەیر مەخلوقە بۆیە ئەیان ووت قورئان کەلامی الله یە مەخلوق نیە، بەڵام لەفزی ئێمە بە قورئان مەخلوقە، هەر بۆیەش زانایان لە رەددی لەفزییەکان ئەیان ووت: گەر شیعری شاعیرێک بخوێنیتەوە ئەوا شیعرەکە هەر هی شاعیرەکەیە نابێتە شیعری تۆ، تۆ تەنها گەیاندووتە، هەر بۆیەش عبدالقادر گەیلانی لە ڕەددی لەفزییەکان ئەڵێ گەر قورئان خوێندنی ئێمە کەلامی ئێمە بوایە کەلامی الله نەبوایە ئەوا ئێمە ئەو شتەمان ئەنجامداوە کە نەهیمان لێکراوە ئەویش قسە کردنە لەناو نوێژدا، هەر بۆیەش ئیمام احمد ئەیووت بە پێی قسەی لەفزییەکان بێت نوێژ دروست نابێت بە قورئان خوێندنەوە چونکە نوێژ بە شتێکی مەخلوق دروست نابێت، نەهیکراوە قسە بکەین لە نوێژدا ئینجا فەرموودەکەی ئەهێنا کە نوێژ بۆ قورئان خوێندن و زیکر و تەکبیرە ناکرێ قسەی خەڵکی تێدا بێت.

وە عبدالقادر گەیلانی ووتەی الولید بن المغیرة ئەهێنێ کە ئەڵێ ئەم قورئانە ووتەی مرۆڤە، ئەڵێ لەفزییەکانیش هەمان هەڕەشەی الولید ئەیانگرێتەوە، پێشتر ووتەی الکرجي القصاب-م هێنا کە هەمان شتی ووت، کەسیش فەلسەفە لێ نەدات بڵێ وازی لە ووتەی سەلەف هێناوە ووتەی خەلەف ئەهێنێ ووتەکانی عبدالقادر گەیلانی هەمان ووتەی ئیمام احمدە دووبارەی کردۆتەوە

لە عەقیدەی قادری هاتووە:

کەلامی اللە تعالی مەخلوق نیە، قسەی پێکردووە، وە دایبەزاندووە بەسەر پێغەمبەرەکەی صلی اللە علیه وسلم لەسەر زمانی جبریل، دوای ئەوەی جبریل بیستی لە اللە، وە جبریل خوێندیەوە بەسەر محمد صلی اللە علیه وسلم، وە محمد صلی اللە علیه وسلم خوێندیەوە بەسەر هاوەڵەکانی، وە هاوەڵەکانی خوێندیانەوە بەسەر ئوممەت، قورئان بە خوێندنەوەی مەخلوقەکان نەبوو بە مەخلوق، چونکە ئەم قورئانە خودی ئەو کەلامەیە کە اللە قسەی پێکردووە، جا قورئان غەیر مەخلوقە لە هەموو حاڵێکدا، بە خوێنراوی و بە حیفز کراوی و بە نوسراوی و بە بیستراوی، وە هەر کەسێک بڵێ قورئان مەخلوقە لە حاڵێک لە حاڵەکاندا ئەوا ئەم کەسە کافرە خوێنی حەلالە دوای استتابە کردنی لەم کوفرە.

**(الاعتقاد القادري)**

بڕوانە لە ڕەددی لەفزیەکاندا ئەڵێ: قورئان بە خوێندنەوەی مەخلوقەکان نابێتە مەخلوق، قورئان لە هەموو حاڵێکدا غەیر مەخلوقە بە نوسراوی و خوێنراوی و حیفز کراوی و بیستراوی، هەرگیز نابێتە مەخلوق، هەر کەسێک بڵێ لە حاڵێک لە حاڵەکاندا ئەبێتە مەخلوق کافرە خوێنی حەلالە دوای استتابە

ئەم ووتانە بۆ کەسانێکە کە تەنها فعلی عەبد بە مەخلوق ئەزانن قورئانەکە بە غەیر مەخلوقن ئەزانن ؟ یان بۆ کەسانێکە کە ئەڵێن قورئان بە فعلی عەبد ئەبێتە مەخلوق کاتێک ئەیخوێنێ و ئەینوسێ و حیفزی ئەکات و ئەیبیستێ ؟

عەقیدەی قادری پەیوەندی بە عبدالقادر گەیلانی نیە بەڵکو پێش لە دایکبوونی ئەو نوسراوە، خەلیفەی عەباسی القادر بالله (٤٢٢ هـ) ئەم عەقیدەی نوسیوە و بڵاوی کردۆتەوە و لە مزگەوتەکاندا بەیان کراوە و زانایان ئیقراریان لەسەری کردووە و بە عەقیدەی ئەهلی سوننە ناویان بردووە، دوای مردنیشی چەندین جار ئەم عەقیدەیە بە ئامادە بوونی زانایان خوێندراوەتەو و ئیقراری لەسەر کراوە، بەڵام ئەووترێ کە ئەم عەقیدەیە دانراوی الكرجي القصاب-ە (٣٦٠ هـ) بەڵام کە خەلیفە القادر بالله نوسیویەتیەوە و بڵاوی کردۆتەوە ئیتر بەناوی عەقیدەی قادری ناسراوە

ئەم خەلیفە عەقیدەی سونی بووە وەکو ئەوەی لێی باس ئەکەن، وە دژی ئەهلی بیدعە بووە

**اللالكائي** ئەڵێ:

لە ساڵی ٤٠٨ هـ ئەمیری ئیمانداران القادر بالله استتابەی بە فەقیهە موعتەزیلە حەنەفیەکان کرد، جا تەوبە و گەڕانەوەیان نیشاندا و خۆیان بەری کرد لە ئیعتیزال،

پاشان نەهی لێکردن لە کەلام و دەرس وتنەوە و مونازەرە کردن دەربارەی ئیعتیزال و ڕەفز و هەموو ئەو ووتانەی کە موخالفی ئیسلامن، وە بەڵێننامەی پێ نوسین دەربارەی ئەمە، هەر کاتێک موخالەفەی بکەن ئەوا سزا ئەدرێن بە توندی کە ببێتە پەند و ئامۆژگاری بۆ هاوشێوەکانیان، يمين الدولة و أمين الملة ابو القاسم محمود ملکەچی فرمانەکەی ئەمیری ئیمانداران بوو، لەسەر ڕێبازی ئەو ڕۆیشت لەو شوێنانەی کە تێیدا دەسەڵاتی پێدراوە لە خوراسان و جگە لەویش لە کوشتنی موعتەزیلە و رافیزە و ئیسماعیلی و قەرامطە و جەهمی و موشەبیهە، وە لە سێدارەی دان و بەندی کردن و نەفی کردن، وە فرمانی کرد بە لەعنەت کردنیان لەسەر مینبەری موسڵمانان، وە دوورخستنەوەی هەموو کۆمەڵێک لە ئەهلی بیدعە و دەرکردنیان لە شوێنی خۆیان، جا ئەمە بووە سوننەتێک لە ئیسلام.

**(المنتظم لابن الجوزي : ١٥ / ١٢٥-١٢٦)**

## الخطيب البغدادي ئەڵێ:

چەند جارێک القادر بالله-م بینیوە، کەسێکی سپی بوو لاشەیەکی ڕێکی هەبوو، ڕیشێکی چڕ و درێژی هەبوو بۆیەی ئەکرد، لە دینداری و بەردەوامی شەونوێژ و زۆری چاکە کردن و بەخشین بە جۆرێک بوو پێی ناسرا بوو لەلای هەموو کەسێک، لەگەڵ هەبوونی مەزهەبێکی چاک و دروستی بیروباوەڕ، کتێبێکی نوسی لە أصول تێیدا باسی فەزائیلی هاوەڵەکانی کرد لەسەر ریزبەندی ئەهلی سوننە ڕۆیشت، وە تێیدا فەزائیلەکانی عمر بن عبدالعزیزی هێنا، وە تێیدا تەکفیری موعتەزیلە و ئەوانەی کرد

کە ئەڵێن قورئان مەخلوقە، وە کتێبەکە هەموو هەینیەک ئەخوێنرایەوە لە ئەڵقەی ئەهلی سوننەدا لە مزگەوتی المهدي خەڵکیش ئامادەی بیستنی ئەبوون.

**(تاريخ بغداد : ٦١/٥)**

**الذهبي** ئەڵێ:

زانایان و قازییەکان لە کۆشکی خەلیفە کۆبوونەوە، کتێبێکی درێژ بەسەریاندا خوێنرایەوە کە القادر بالله نوسی بووی، ئامۆژگاری و تەفزیل کردنی مەزهەبی ئەهلی سوننە و تانەدان لە موعتەزیلەی لەخۆ گرتبوو.

وە لە ڕەمەزاندا دووبارە کۆبوونەوە ابو الحسن بن حاجب النعمان کتێبێکی درێژی بەسەردا خوێندنەوە کە القادر بالله نوسی بووی، کە تێیدا هاتبوو هەواڵی وەفات کردنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و ڕەددانەوەی ئەوانەی ئەڵێن قورئان مەخلوقە، وە گێڕانەوەی چیرۆکی مونازەرەکەی عبدالعزیز الکناني و بشر المریسي، پاشان کۆتایی پێهێنا بە ئامۆژگاری و فرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە.

وە لە مانگی ذي القعدة کۆبوونەوە بۆ کتێبی سێیەم کە دەربارەی فەزڵی ابو بکر و عمر و قسە ووتن بەوانە بوو کە ئەڵێن قورئان مەخلوقە، وە تێیدا مونازەرەی نێوان عبدالعزیز الکناني و بشر المریسي دووبارە کردەوە.

**بڕوانە (تاريخ الإسلام : ٢٦٨/٢٨)**

**الكرجي القصاب** دەربارەی ئایەتی: ﴿أَفَتَطۡمَعُونَ أَن يُؤۡمِنُواْ لَكُمۡ وَقَدۡ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ يَسۡمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [البقرة: ٧٥]، ئەڵێ:

گەر قورئان لە هەموو ڕوویێکیەوە غەیر مەخلوق نەبوایە ئەوا الله ئەیفەرموو: (حتى يسمع مثل كلام الله) یان (حكاية كلام الله) یان (قراءة كلام الله) بەڵام کاتێک کە فەرمووی: (كلام الله) هەموو ئەمانەی بەتاڵ کردەوە، جا هەر کەسێک بانگەشەی شتێک لەمانە بکات ئەوا سەرپێچی الله تعالى کردووە، وە ووتەکەی ڕەت کراوەیە.

وە هاوشێوەی ئەم ئایەتە ﴿وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة، ٦]، وە الله دەربارەی الوليد بن المغيرة فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ أَدۡبَرَ وَٱسۡتَكۡبَرَ (٢٣) فَقَالَ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ يُؤۡثَرُ (٢٤) إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا قَوۡلُ ٱلۡبَشَرِ (٢٥)﴾ [المدثر]، ڕەددی ووتەکەی الوليدی دایەوە کاتێک ووتی ئەم قورئانە ووتەی مرۆڤە، قورئان نابێتە ووتەی مرۆڤ لە هیچ حاڵێکدا، وە الوليد قورئانی نەبیستبوو تەنها لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەبێت یان هاوەڵەکانی، پێغەمبەر و هاوەڵانی هەموویان مرۆڤن و زمانیان زمانی مرۆڤە، ئەمەش ڕوونە.

جا ئەگەر کەسێک بەڵگەی هێنایەوە بە فەرمایشتی الله: ﴿إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ﴾، لە وەڵامدا ئەووترێ: ناکرێ نەفی بکرێ ئەم قورئانە ووتەی مرۆڤ بێت لە هەمان کاتدا ئیثباتی بکرێ کە ووتەی فریشتەیە، چونکە فریشتە تەلەفوزی پێکردووە هەروەک چۆن مرۆڤ تەلەفوزی پێکردووە، جا کاتێک الله نەفی کرد قورئان ووتەی مرۆڤ بێت ئەوا بۆ فریشتەش نەفی کراوە، جا کە شتەکە بەم شێوەیە ئەوا ئەم ئایەتە هیچ مانایەکی نیە جگە لەم مانایە: ئەم قورئانە ووتەیەکە ڕەسولێکی کەریم هێناویەتی

لەلایەن الله-وە، ووتەی الله تعالى یە ووتەی فریشتەکە نیە، ووتەکە دراوەتە پاڵ فریشتەکە بەو مانایەی کە ئەو هێناویەتی.

**(نكت القرآن : ١ / ١٢٦-١٢٧)**

بڕوانە الكرجي القصاب ئایەتی (حتى يسمع كلام الله) کە هەمیشە ئیمام احمد لە رەددی لەفزییەکان ئەیهێنایەوە رەبتی کردەوە بە ووتەکەی الوليد بن المغيرة کە ووتی ئەم قورئانە ووتەی مرۆڤە، وە ووتی قورئان لە هیچ حاڵێکدا نابێتە ووتەی مرۆڤ، ئەگەرچی الوليد ئەم قورئانەی لە دەمی مرۆڤ بیستووە بەڵام هەر کەلامی الله یە نابێتە کەلامی مرۆڤ، پاشان ئایەتێکی تری هێنا لە دژی لەفزییەکان کە زۆر ڕوونە، ئەڵێ گەر هاتن استدلال بکەن بەم ئایەتە (إنه لقول رسول كريم) ئەوا رەد ئەدرێنەوە بەوەی کە ئەمە ووتەی جبریل نیە هەروەک چۆن نەفی کراوە ووتەی مرۆڤ بێت، بۆیە دراوەتە پاڵ جبریل چونکە ئەو گەیاندوویەتی لە الله-وە، بیر بکەرەوە بۆچی لە رەددی لەفزییەکان باسی ئەوە ئەکات ئەگەر هەیە لەفزییەکان استدلال بەم ئایەتە بکەن (إنه لقول رسول كريم) ئینجا وەڵامی بۆ ئەمە داناوە گەر استدلالیان پێی کرد.

دوو جار لە قورئاندا (إنه لقول رسول كريم) هاتووە، لە سورەتی الحاقة و سورەتی التكوير، لە سورەتی الحاقة رەسولەکە پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم، وە لە سورەتی التكوير رەسولەکە جبريلە عليه السلام، هەردووکیان لەو ڕووەدا قورئانەکە دراوەتە پاڵیان کە ئەوان گەیاندوویانە لە الله-وە، نەک دانراوی خۆیان بێت

ئەو ئایەتەی کە ئیمام احمد زۆرترین جار لە ڕەددی لەفزییەکان ئەیهێنایەوە ئەمەبوو: (حتی یسمع کلام الله) ئینجا ئەیووت نەیفەرموو: تاکو کەلامی تۆ ئەبیستێ ئەی محمد، بەڵکو ووتی تاکو کەلامی الله ئەبیستێ، ئیمام احمد لە ڕەددی لەفزییەکان نەفی ئەوە ئەکات قورئان کەلامی محمد بێت یان ببێتە کەلامی ئەو کەسەی کە ئەیخوێنێت، بیر بکەرەوە گەر لەفزییەکان بڵێن کاتێک قورئان ئەخوێنین قورئانەکە کەلامی الله یە مەخلوق نیە تەنها فعلی عەبدەکە مەخلوقە لە دەم جوڵاندنی، ئەوەی ئەیبیستین کەلامی الله یە، گەر ئەمە عەقیدەیان بوایە بۆچی ئیمام احمد بە ئایەتێک ڕەددیان ئەداتەوە کە باسی ئەوە ئەکات ئەو قورئانەی ئەیبیستین لە عەبد کەلامی الله یە کەلامی عەبدەکە نیە ؟؟؟

ئاخر تۆزێک ڕەحم بەخۆتان بکەن ئەم دینە بە نرخترین شتە کە هەمانە، گەر ئەمە عەقیدەی لەفزییەکان بوایە کە ئێوە باسی ئەکەن ئەوکات ئەو ووتەیەی ئیمام احمد مانای چی دەبوو کە زۆربەی جار دووبارەی ئەکردەوە لە ڕەددی لەفزییەکان ؟ ئەی بۆ لەفزییەکان لە وەڵامدا نەیان ئەووت ئێمەش موافقی احمدین لەم ووتەیە، بەڵام احمد لە مەزهەبی ئێمە تێنەگەیشتووە باسی شتێک ئەکات کە ئێمە لێی بەرین!

خۆ تۆ ئەبێ بە شتێک ڕەددی بەرامبەر بدەیتەوە بەرامبەر تێبگات و بزانێت هەڵەیە، نەک بە شتێک ڕەددی بدەیتەوە کە هاوڕایە لەگەڵت و کێشەی نیە، ئێستا ئێمە و ئێوە کێشەمان لە فعلی عەبد نیە بە گشتی، هەردووکمان ئەڵێین فعلی عەبد مەخلوقە، بەڵام کێشەکەمان لەوە دایە ئێوە ئەڵێن لەکاتی قورئان خوێندن کوفرە بڵێی فعلی عەبد مەخلوقە، منیش ئەڵێم لەوکاتەشدا هەر مەخلوقە هیچ

بەڵگەیەکتان نیە بۆ ئەم استثناء کردنە، کەواتە مادام ئەمە کێشەی نێوانمانە من ئەبێ باسی ئەوەتان بۆ بکەم کە لە کاتی قورئان خوێندنیش فعلی عەبد مەخلوقە، نەک بڵێم ئەهلی سوننە وتوویانە فعلی عەبد مەخلوقە، چونکە گەر ئەوەی دووەم باس بکەم، ئێوەش ئەڵێن بەڵێ وایە فعلی عەبد مەخلوقە کێشەمان نیە، بەڵام باسەکە باسی کاتی قورئان خوێندنە ئایا ئەوکات مەخلوقە یان نا، کەواتە من ئەبێ لەم رووەدا رەدتان بدەمەوە نەک بە گشتی فعلی عەبد باس بکەم، ئیمام احمدیش کە توشی لەفزییەکان بووە بە پێی تێگەیشتنی ئێوە کێشەی لەفزییەکان تەنها ئەوە بووە

ئەیان ووت فعلی عەبدەکە مەخلوقە لەکاتی قورئان خوێندن ئەگینا قورئانەکە مەخلوق نیە، ئێ ئەبوایە ئیمام احمد دەست لەسەر برینەکەیان دابنێت بڵێ کە ووتتان فعلی عەبد مەخلوقە ئەوا قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق، ئەمە رەددێکی تەواو و پێکراو ئەبوو بۆیان، بەڵام نابینین ئیمام احمد بۆ یەک جاریش باسی ئەمە بکات بڵێ کە ووترا فعلی عەبد مەخلوقە قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق، یان نابینین جارێک پێی بڵێن لەفزییەکان ئەڵێن فعلی عەبد مەخلوقە بەڵام قورئانەکە غەیر مەخلوقە کە عەبد ئەیخوێنێ، ئیمام احمد هەمیشە لە رەددی ئەواندا ئەڵێ قورئان مەخلوق نیە، لە هیچ حاڵێکدا نابێتە مەخلوق، لە هەموو ڕووێکدا غەیر مەخلوقە، ئێ کەواتە ئیمام احمد هیچ رەددێکی بەهێز و قەناعەت پێکەری نەدانەوە، چونکە ئێوە پێتان وایە لەفزییەکان ئەیان ووت قورئانەکە غەیر مەخلوقە، ئیمام احمدیش لە رەددی ئەواندا هەر ئەیووت قورئان غەیر مەخلوقە، ئەبوایە پێیان بڵێ فعلی عەبد مەخلوقە بەڵام لەکاتی قورئان خوێندن ناووترێ فعلی عەبد مەخلوقە گەر ووتمان مەخلوقە ئەوا قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق، نەک هەر ئیمام احمد تەنانەت یەک زاناش بەم

جۆرە باسی بابەتەکە ناکات لە ڕەددی لەفزیەکان، لەوەش سەیرتر لە هەموو ریوایەتەکانی ئیمام احمد دەربارەی لەفزییەکان بۆ یەک جاریش دوور و نزیک باسی فعلی عەبد ناکرێ، نە لەلایەن لەفزییەکان نە لە لایەن ئیمام احمد، باشە گەر کرۆکی باسەکە مەخلوقی قورئان نەبێت بەڵکو مەخلوقی فعلی عەبد بێت کێشەکە لەسەر ئەوە بێت ئەوا ئەبوایە تەواوی ریوایەتەکان پڕ بووان لە باسکردنی فعلی عەبد، بەڵام نابیبین بۆ یەک جاریش ئیمام احمد باسی فعلی عەبد بکات، ئیللا لە ریوایەتی الصوري باسکراوە ئەویش هەر یەکێکە لە الخلال و ابن بطة لە بابی ئەوە هێناویانە کە ناووترێ ئیمان مەخلوقە و غەیر مەخلوقە، لە بابەتی لەفزییەکان نەیان هێناوە، ئینجا لە هامشی ووتەکانیدا ئیمام احمد باسی ئەوە ئەکات کە الصوري وەک کەرابیسیە، کە لە دوو پۆستدا روونمان کردۆتەوە ئەم ریوایەتە مانای چیە، وە ئینکاری ئیمام احمد لە الصوري ئەوەبوو کە ووتی ئیمان مەخلوقە، نەک کە ووتی فعل و حەرەکە مەخلوقە، باشە ئەکرێ فرقەیەک دروست بن ئیمام احمد بە دەیان ریوایەت رەددیان بداتەوە بۆ یەک جاریش باسی فعلی عەبد نەکات ؟ یەعنی چی تێئەچوو بۆ جارێک ئیمام احمد بڵێ: کە ووترا فعلی عەبد مەخلوقە قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق ؟ تەواو باسەکە دائەخرا، باشە گەر الصوري نەهاتبوایە بۆ بەغداد و ئەم قسەیەی نەکردبوایە ئیمام احمدیش نەیچوێنێ بە کەرابیسی، ئەوکات چۆن لە باسەکە حاڵی ئەبوون ؟ تێگەیشتنی ئەم باسە لەسەر ریوایەتەکەی الصوري وەستاوە ؟

تەنانەت لوین کاتێک بە ئایەتی (حتى يسمع كلام الله) ڕەددی لەفزییەکان ئەداتەوە ئیمام احمد زۆر سەرسام ئەبێت بە وەڵامەکەی ئەڵێ چەند بە جوانی وەڵامی داونەتەوە! باشە گەر لەفزییەکانیش بڵێن ئەوەی ئەیخوێنین کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، ئەوکات ئەم وەڵامە چ جوانیەکی تێدا بوو ؟ چ هێزێکی تێدا بوو ؟ ئەوەی ئێوە باسی ئەکەن تەکفیر کردنی لەفزییەکانە بە لازمی ووتەکەیان، لە کاتێکدا ئەوان بڕوایان بەوە نەبووە ئەم ووتەیە ڕایان بکێشێت بۆ ئەو ئیلزام کردنە، کەواتە تەواوی ڕەددەکانی ئیمام احمد بۆیان هیچ هێزێکی نەبووە بەڵکو ڕەددی کەسێکە کە زۆر لاوازە و بەڵگەی بەهێز نیە، بەم جۆرە هەم لە قەدری لەفزییەکان بەرز ئەکەنەوە ئەڵێن ئەوان بڕوایان وابووە قورئان غەیر مەخلوقە، وە لە قەدری ئیمام احمد ئەهێننەوە خوارەوە کە وەڵامەکانی زۆر بێ هێز بووە بۆ لەفزییەکان، ئەمانەش حەسەب فەهمی ئێوە، ئەگینا لەلای ئێمە دژەکەی تەواوە، لەفزییەکان جەهمی بوون بڕوایان بە مەخلوقی قورئان هەبوو کاتێک عەبد ئەدای ئەکات جا بەهەر جۆرێک بێت، وە ئیمام احمد زۆر لێزان بوو لە درک کردنی بە کوفرەکەیان و بەهێزی وەڵامدانەوەیان.

بەڵام لەلای ئێوە وەڵامەکانی خۆتان ڕوونتر و بەهێزترە لە وەڵامەکانی ئیمام احمد ئەوەتا ئێمە ئەڵێین فعلی عەبد مەخلوقە قورئانەکەش کە عەبد ئەیخوێنێ غەیر مەخلوقە، ئێوە پێمان ئەڵێن: کە ووتتان فعلی عەبد مەخلوقە بەم ووتەیە قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق!

بەڵام ئیمام احمد لە ڕەددی لەفزییەکان نەهات قسەیەکی لەم شێوەیەی ئێوە بکات، هەمیشە ئەیووت قورئان غەیر مەخلوقە، لەفزییەکانیش ئەیان ووت ئێ ئێمەش ئەڵێین قورئان غەیر مەخلوقە، ئیمام احمد بۆ جارێک نەهات ئەو وەڵامەیان بداتەوە کە ئێوە وەڵامی ئێمەی پێ ئەدەنەوە، کەواتە ڕەددی ئێوە زۆر وورد و بەهێزتر بوو لە هی ئیمام احمد چونکە ئێوە دەستان ئەخستە سەر برینەکان بەڵام ئیمام احمد بۆ لایەکی تر ئەڕۆیشت و کرۆکی باسەکەی روون نەئەکردەوە بۆیان!!!.

-----------------------------

ماویەتی

# اللفظية (٣٢)



**البيهقي** ئەڵێ:

لە کتێبی محمد بن نصر خوێندمەوە تێیدا هاتبوو: عن أحمد بن عمر عن عبدان عن ابن المبارك ووتی: کاغەز و حیبر مەخلوقن، بەڵام قورئان خالق نیە و مەخلوقیش نیە، بەڵکو کەلامی الله عز وجل-ە.

وقرأت في كتاب محمد بن نصر عن أحمد بن عمر، عن عبدان، عن ابن المبارك، قال: الورق والمداد مخلوق، فأما القرآن فليس بخالق ولا مخلوق، ولكنه كلام الله عز وجل.

**(الأسماء والصفات : ٥٧١)**

محمد بن نصر: المروزي-ە، گەر بووترێ البيهقي ئەشعەرییە ئەوا ابن تيمية-ش هەمان ریوایەتی نەقل کردووە لە کتێبەکەی محمد بن نصر المروزي

**ابن تيمية** ئەڵێ:

محمد بن نصر المروزي لە کتێبەکەیدا باسی کردووە: عن أحمد بن عمر عن عبدان عن ابن المبارك ووتی: کاغەز و حیبر مەخلوقن، بەڵام قورئان خالق نیە و مەخلوقیش نیە، بەڵکو کەلامی الله یە.

فذكر محمد بن نصر المروزي في كتابه عن أحمد بن عمر، عن عبدان، عن ابن المبارك، قال: الورق والمداد مخلوق، فأما القرآن فليس بخالق ولا مخلوق، ولكنه كلام الله.

**(التسعينية : ٤٣٧/٢)**

**القحطاني** ئەڵێ:

جوڵەی زمانەکانمان و دەنگی قوڕگمان مەخلوقن، هەموو ئەمانە لەناو ئەچن.

حركات ألسننا وصوت حلوقنا

مخلوقة وجميع ذلك فـان

**(نونية القحطاني : ٥٦٧)**

**القحطاني** ئەڵێ:

ئەوەی لە موصحەفەکاندا جێگیر کراوە بە پەنجەی پیر و گەنجەکان ووتەی پەروەردگارمە ئایەتەکانی و پیتەکانی، وە حیبرەکانمان و کاغەزەکان مەخلوقن.

إن الذي هو في المصاحف مثبت

بأنامل الأشياخ والشبان

هو قول ربي آيه وحروفه

ومدادنا والرق مخلوقان

**(نونية القحطاني : ٥٧٥-٥٧٦)**

**الغزالي** (٥٠٥ هـ) ئەڵێ:

کەلامی الله نوسراوە لە پەڕاوەکاندا، حیفز کراوە لە دڵەکاندا، ئەخوێندرێتەوە بە زمانەکان، بەڵام کاغەز و حیبر و نوسین و پیت و دەنگ هەموویان مەخلوقن.

**ابن أبي الخير العمراني** (٥٥٨ هـ) دەربارەی ئەم ووتەیەی الغزالي ئەڵێ:

سەبارەت بە ووتەکەی کە کاغەز و حیبر مەخلوقن، ئینکاری لەمە ناکرێ، پیت بریتی نیە لە خودی حیبرەکە و خودی کاغەزەکە، بەڵام ووتەکەی کە قورئان نوسراوە لە پەڕاوەکاندا و حیفز کراوە لە دڵەکاندا و ئەخوێندرێتەوە بە زمانەکان، گەر مەبەستی لەم ووتەیە قورئان بێت کە کەلامی الله یە بە حەقیقی، ئەوا ئەڵێین ئەمە دروستە، وە پوچەڵ بۆتەوە کە الله کەلامێکی هەبێت لە زاتی خۆیدا لێی جیا نەبێتەوە، وە ئەمەش ووتەی ئەهلی حەدیثە، وە ئەگەر مەبەستی لەم ووتەیە عیبارەتی ئەو قورئانە بێت کە لە زاتی الله دایە، ئەوا ئەم ووتەیەی ووتەیەکی بەتاڵە هیچ مانایەکی نیە جگە لە خۆداپۆشین بە ووتەی ئەهلی حەدیث، وە ئەم ووتەیەی بەڵگەیە لەسەری کە ووتی قورئان نوسراوە لە پەڕاوەکاندا ،چونکە گەر ئەو بە ڕاشکاوی بڵێ قورئان نەنوسراوە لە پەڕاوەکاندا بەڵکو ئەوەی نوسراوە دەلالەت ئەکات لە قورئان، ئەوکات ووتەکەی موخالفی ئەوە ئەبوو کە پێشەوایانی موسڵمانان لەسەرینە، بەڵام ووتەکەی داپۆشیوە.

**بڕوانە (الانتصار في الرد على المعتزلة القدرية : ٢ / ٥٩٤-٥٩٥)**

کەس نەڵێ ووتەی الغزالي کردۆتە بەڵگە، ووتەکەی الغزالي-م بۆیە هێناوە تاکو لە ووتەکەی ابن أبي الخير العمراني تێبگەن کە ڕەددی الغزالي ئەداتەوە.

------------------------------

ماویەتی

# اللفظية (٣٣)



**ابن بطة** باسی سەلەفی صالح و پێشەوایانی ئوممەت ئەکات ئەڵێ:

ناشرینی و شەرمەزاری بۆ ئەو کەسەیە کە لایداوە لە ڕێبازی ئەوان و شوێنی جەهمی مەلعون و کۆمەڵەکەی کەوتووە و کردوویەتی بە پێشەوای خۆی، وەک: ضرار وأبو بكر الأصم وبشر المريسي وابن أبي دؤاد والكرابيسي وشعيب الحجام وبرغوث والنظام و هاوشێوەکانیان لە سەرانی کوفر و پێشەوایانی گومڕایەتی ئەوانەی کە ئینکاری قورئان و سوننەتیان کرد و کتێبی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەیان ڕەت کردەوە و کافر بوون بە قورئان و سوننەت بە ئاشکرا و ئەنقەست و عینادی و حەسودی و زوڵم و کوفر، وە هەندێک لە هەواڵەکانیان و خراپی مەزهەبیان و ووتەکانیان پێت ڕائەگەیەنم کە پەندی تێدایە بۆ هەر کەسێک کە بێ ئاگا بێت.

**(الإبانة الكبرى : ٢/١٦٧)**

ابن بطة بابێکی داناوە بە ناونیشانی: (باب: ما روي في جهم وشيعته الضلال، وما كانوا عليه من قبيح المقال).

واتا: ئەوەی ڕیوایەت کراوە دەربارەی جەهمی کوڕی صەفوان و کۆمەڵە گومڕاکەی، وە ئەو ووتە ناشرینانەی کە ئەوان لەسەری بوون و بڕوایان پێی بووە.

لەژێر ئەم بابەدا ابن بطة کە باسی جەماعەتەکەی جەهمی کوڕی صەفوان ئەکات ناوی ئەمانە ئەهێنێت:

بشر المريسي

ابن أبي دؤاد

أبو حنيفة

إبراهيم بن إسماعيل بن علية

محمد بن شجاع الثلجي

يعقوب بن شيبة السدوسي

حسين الكرابيسي

أحمد الشراك

کە هەر هەشتیان یەک شت کۆیان ئەکاتەوە ئەویش جەهمیەت و بڕوا بوون بە مەخلوقی قورئانە، ابن بطة-ش ئەو ریوایەتانە ئەهێنێت لەم هەشت کەسە کە

دەربارەی قورئان قسەیان کردووە، کە چوارەکەی سەرەتا بە ڕوونی وتوویانە قورئان مەخلوقە، دووەکەی تر توقف-یان کردووە لە قورئان، دووەکەی کۆتاییش لەفزی بوونە.

ابن بطة کە دێتە سەر باسی الشراك ئەم ریوایەتە ئەهێنێ:

**الفضل بن زياد** بە ئیمام احمد ئەڵێ:

پێم گەیشتووە کە الشراك تەوبەی کردووە و گەڕاوەتەوە.

ئیمام احمد ووتی: درۆیە، ئەمانە تەوبە ناکەن، هەروەک أيوب السختياني وتوویەتی: یەکێک لەمانە لە دین دەرچێت ناگەڕێتەوە بۆی.

وە کە دێتە سەر باسی الكرابيسي ئەم ریوایەتە ئەهێنێ:

**المروزي** ئەڵێ: ووتم بە باوکی عبدالله: نامەیەکم لە بەغداد بۆ هات کە کەسێک شوێنی کەرابیسی کەوتووە لە ووتنی (لەفزم بە قورئان مەخلوقە).

ئیمام احمد ووتی: کەرابیسی بۆتە جەهمی و جەهمیەتی دەرخستووە، پێویستە تەحزیری لە کەرابیسی و هەموو ئەوانەش بدەین کە شوێنی کەوتوون.

وە ووتی: بشر المريسي مرد کەرابیسی شوێنی گرتەوە.

**بڕوانە (الإبانة الكبرى : ١٦٨/٢) وە لاپەڕەکانی دواتری**

ابن بطة لە باسکردنی جەهم و جەماعەتەکەی ناوی کەرابیسی و الشراك ئەهێنێت، لە کاتێکدا ئەمانە تەنها وتوویانە لەفزمان بە قورئان مەخلوقە و تیلاوەمان بۆ قورئان مەخلوقە، کەچی بوخاری لە کتێبی خلق أفعال العباد دەیان جار ئەڵێ فعلی عەبد مەخلوقە، جوڵە و دەنگ و ئەو کارانەی ئەنجامی ئەدەن مەخلوقە، تیلاوە مەخلوقە (بە مانای فعلی عەبد نەک بە مانای قورئانەکە وەک لەفزیەکان) ئەڵێ قیرائە مەخلوقە (بە مانای فعلی عەبدەکە نەک بە مانای قورئانەکە وەک لەفزیەکان) ئەگەرچی ئێمە بەکارهێنانی ئەم ووشانە وەک تیلاوە و قیرائە بە مەخلوق و غەیر مەخلوق بە هەڵە ئەزانین تەنانەت گەر مەبەست لێی فعلی عەبدیش بێت، وە بوخاری هاتووە کتێبی لەسەر ئەم بابەتە نوسیوە زۆر لە کەرابیسی و الشراك زیاتر باسی ئەم بابەتەی کردووە، ئایا گەر ووتنی فعلی عەبد مەخلوقە لەکاتی قورئان خوێندنەوە مەزهەبی لەفزییەکان بێت ئەوا لە پێشتر نیە کە ناوی بوخاری بهێنرێت لە شوێنی کەرابیسی و الشراك ؟ خۆ بە پێی فەهمی دوو جەزائیریەکە بێت بۆ مەزهەبی لەفزییەکان ئەوا ئەوەی بوخاری کردوویەتی کەرابیسی و الشراك بە چارەگی ئەو نەیان کردووە لە بڵاوکردنەوەی کوفر و عەقیدەی لەفزییەکان، نازانم بۆ ابن بطة ناوی ئەوان ئەهێنێت و بێدەنگە لە بوخاری، تەنانەت کتێبی خلق أفعال العباد کە دوو جەزائیریەکە پێیان وایە پڕیەتی لە کوفر و لەسەر مەزهەبی لەفزییەکان نوسراوە کەچی نابینین یەک زانای ئەم ئوممەتە دوای نوسینی ئەم کتێبە بوخاری تەکفیر کردبێت، یان بڵێ بوخاری کتێبێکی کوفری نوسیوە، یان قسە لەسەر کتێبەکەی بکەن و تەحزیری لێ بدەن، بەڵکو ئەوەی قسە هەیە لەسەری هی ئەو کاتەیە کە چوو بۆ نەیسابور، کە پاشان نەیسابوری جێهێشت چەند مانگێک بەر لە مردنی ئەم کتێبەی نوسی، نازانم

بۆ کەسێک لە ئوممەت پەیدا نەبوو کە بڵێ ئەم کتێبە پڕە لە کوفر و لەسەر مەزهەبی لەفزییەکان نوسراوە، هەرچی زانا هەیە ئەڵێ بوخاری ئەم کتێبەی نوسی سەلماندی کە لەفزی نیە، بەڵام لای دوو گومڕاکەی سەردەم الله لەناویان ببات گەر شایەنی هیدایەت نین شتێک دەرکەوتووە کە لە ماوەی ۱۲۰۰ ساڵ شاراوە بووە لە ئوممەت!

جگە لەمەش ابن بطة نەک بە خراپە باسی بوخاری ناکات بەڵکو لە کتێبەکەیدا لە چوار شوێندا ریوایەت لە بوخاری ئەکات لە ڕێگای شێخەکەی خۆی الحسین بن إسماعیل المحاملي، کە ئەم المحاملي-ە یەکێکە لە راوییەکانی سەحیحی بوخاری، بەڵام خیلاف هەیە کە سەحیحی بوخاری بە کاملی لە بوخاری بیستووە یان بەشێکی لێ بیستووە.

هەروەها الآجري لە کتێبی الشریعة لە دوو شوێندا ریوایەت ئەکات لە بوخاری لە ڕێگای شێخەکانی خۆیەوە.

کە هەریەک لە الآجري و ابن بطة دوای مردنی بوخاری لە دایکبوونە، واتا ئاگاداری حاڵی بوخارین، نەک بووترێ ئەمە سەرەتا وابووە پێش ئەوەی بوخاری باسی مەخلوقی فعلی عەبد بکات

هەروەها خاڵێکی تر کە لە زۆربەی ریوایەتەکان ئیمام احمد باسی ئەکات، کاتێک ووتەکەی کەرابیسی بۆ نەقل ئەکەن ئیمام احمد ئەڵێ ئەمە خودی ووتەی جەهمە، جەهم سەرەتا ئەم قسەیەی کرد!

ئایا جەهمی کوڕی صەفوان کە ووتی لەفزم بە قورئان مەخلوقە مەبەستی مەخلوقی فعلی عەبد بوو یان مەخلوقی قورئان ؟

نەکا بڵێن جەهم پێی وابوو قورئانەکە غەیر مەخلوقە بەڵام فعلی عەبدەکە لە دەم و زمان جوڵاندنی مەخلوقە، وە ئەو قورئانەی کە لە دەمی عەبد دەرئەچێت مەخلوق نیە!!!

خۆ مەعلومە لە باسی قەدەردا جەهم جەبریە دژی قەدەریەکانە، زانایان لە فعلی عەبد باسی قەدەریەکان ئەکەن کە پێیان وایە عەبد خۆی خالقی فعلی خۆیەتی، الله فعلی عەبد خەلق ناکات، کە ئەهلی سوننە ئەڵێن الله فعلی عەبد خەلق ئەکات و عەبد ئەنجامی ئەدات، بەڵام جەبریەکان غلو ئەکەن لە قەدەردا ئەڵێن خودی فعلەکە فعلی الله یە نەک فعلی عەبدەکە، الله ئەنجامی ئەدات نەک عەبدەکە، بەڵام شوێنی ئەنجامدانی لە عەبدەکەیە، واتا عەبدەکە ئەبێتە (محل) بۆ ئەنجامدانی فعلەکە، الله لە عەبد دا فعلەکە ئەنجام ئەدات، هەروەک چۆن گەڵای دار هەڵئەوەرێ دارەکە هیچ فعلێکی ئەنجام نەداوە بەڵکو فعلێک ئەنجام دراوە لە دارەکەدا، گەر نموونەیەکی زیندووش بهێنمەوە وەک سەیارە لێخوڕین کە تۆ سەیارە لێئەخوڕی هەرچی جوڵەی سەیارەکە هەیە تۆ ئەنجامی ئەدەیت سەیارەکە خۆی هیچ جوڵە و فعلێکی نیە هەمووی تۆ ئەنجامی ئەدەیت لە سەیارەکەدا، ئەمەش ئاوایە لەلای جەهم کە جەبریە، بەڵام ئەگەرچی پێی وایە فعلەکە کە لە عەبد دا بەدی ئەکرێت فعلی الله یە لەگەڵ ئەوەشدا بڕوای وایە کە الله فعلەکە خەلق ئەکات، هەروەک چۆن موعتەزیلە پێیان وایە قورئان کەلامی الله یە بەڵام الله ئەم کەلامەی خەلق کردووە،

جا لێرەدا نامانەوێ درۆ بکەین وەک هەندێک کەس بۆ چەواشە کردنی خەڵک و سەرخستنی مەزهەبەکەمان بە درۆ بڵێین جەهم و جەبریەکان پێیان وایە فعلی عەبد غەیر مەخلوقە، نەخێر ئەوانیش بە مەخلوقی ئەزانن بەڵام پێیان وایە فعلەکە فعلی الله یە نەک فعلی عەبد بێت، جا مەبەستم لە باسکردنی ئەم خاڵە ئەوە بوو کە کاتێک ئیمام احمد مەزهەبی لەفزیەکان ئەداتە پاڵ جەهم ئەڵێ ئەمە ووتەی ئەوە، زۆر دوورە وا لەیەک بدرێتەوە کە جەهم وتوویەتی: قورئانەکە غەیر مەخلوقە کە عەبد ئەیخوێنێ، بەڵام فعلی عەبدەکە مەخلوقە، چونکە ئەو پێی وایە فعلەکە فعلی الله یە، گەر مەبەستی لەفزیەکان مەخلوقی فعلی عەبد بێت نەک مەخلوقی قورئان ئەوا لە پێشتر بوو بدرێنە پاڵ قەدەریەکان چونکە قەدەریەکان ئەڵێن عەبد خۆی خالقی فعلی خۆیەتی، الله فعلی عەبد خەلق ناکات.

---------------------------

ماویەتی

# اللفظية (٣٤)



**قوام السنة الأصبهاني** ئەڵێ:

یەکەم کەس قسەی کرد دەربارەی لەفز و ووتی لەفزمان بە قورئان مەخلوقە حسين الكرابيسي بوو، جا أحمد بن حنبل تەبدیعی کرد، وە زانایانی شارەکان موافەقەی احمدیان کرد لە تەبدیع کردنی کەرابیسی ... (ئینجا ناوی ٤٧ زانا ئەهێنێت، دوای هێنانی ناویان لە کۆتایی ئەڵێ) مەزهەبی ئەم زانایانە و مەزهەبی هەموو ئەهلی سوننە ئەوەیە کە قورئان کەلامی الله یە ئایەت بە ئایەتی و ووشە بە ووشەی و پیت بە پیتی لە هەموو حاڵێکیدا هەر کاتێک بخوێنرێ و بنوسرێ و ببیسترێ.

**بڕوانە (الحجة في بيان المحجة : ١ / ٣٤٠-٣٤٤ )**

سەیرکەن لە ڕەددی حسين الكرابيسي ئەڵێ: زانایانی ئەهلی سوننە ووتیان: قورئان پیت بە پیتی و ئایەت بە ئایەتی کەلامی الله یە، لە هەموو حاڵێکدا بە نوسراوی بە خوێنراوی بە بیستراوی

بۆچی نەیووت: ئەهلی سوننە لە ڕەددی الكرابيسي ووتیان: فعلی عەبد مەخلوقە بەڵام لەکاتی قورئانخوێندن فعلی عەبدەکە بە مەخلوق وەسف ناکرێت ؟! بۆچی باسی ئەوەی کرد کە قورئان لە هەموو بارێکدا کەلامی الله یە ؟ مەعلومە کە باسەکە باسی قورئانەکە نەک فعلی عەبد

### أبو سعيد الأشج ئەڵێ:

قورئان کەلامی الله یە مەخلوق نیە، وە لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە، وە قورئان بە لەفزمان مەخلوق نیە، وە قورئان لە سینەماندا مەخلوق نیە، وە ئەو قورئانەی کە لە میحرابەکانماندا ئەیخوێنینەوە مەخلوق نیە.

**(الحجة في بيان المحجة : ٣٨٨/١)**

أبو سعيد الأشج (٢٥٧ هـ) زانایەکی سەلەفە شێخی ابن أبي حاتم-ە زۆربەی ریوایەتەکانی تەفسیرەکەی لە ڕێگای ئەو ئەهێنێت، سەیرکەن کە رەددی لەفزیە مەخلوقیەکان ئەداتەوە و ئەڵێ لەفزمان بە قورئان غەیر مەخلوقە، ئایا باسی فعلی عەبد ئەکات یان باسی قورئان ؟ ئەڵێ قورئان بە لەفزمان مەخلوق نیە، قورئان لە سینەماندا مەخلوق نیە، ئەو قورئانەی ئەیخوێنین مەخلوق نیە، ئایا پێتان وایە زانایەکی وەکو ئەو لە مەزهەبی لەفزیەکان تێنەگەیشتووە لەخۆیەوە قسە ئەکات ؟ وەک ئەوەی هەندێک ئەحمەق باسی ئەکەن کە گوایە لەفزیە غەیر مەخلوقیەکان نەیانزانیوە مەسەلە چیە، بینیویانە ئەوان ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوقە،

ئەوانیش لە بەرامبەر هاتوون وتوویانە لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە، بەبێ ئەوەی بزانن مەسەلە چیە و ڕەددی چی ئەدەنەوە لەخۆیانەوە لە دژی ئەوان قسەیان کردووە! بەڵکو تێگەیشتوون کە لەفزیە مەخلوقیەکان مەبەستیان مەخلوقی قورئانە بۆیە باسی ئەوە ئەکەن قورئان لە هیچ حاڵێکدا نابێتە مەخلوق، بەڵام بە هەڵە ڕەددی ئەوانیان دایەوە ووتیان لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە، هەڵەکە لە ڕەددەکەیان بوو کە غلویان کرد ووتەیەکی داهێنراویان بەکارهێنا، نەک لەوەی تێناگەن مەسەلە چیە و لەفزیەکان چی ئەڵێن و چۆن ڕەد ئەدرێنەوە، پاشان ئەبینین ڕەددی لەفزیە غەیر مەخلوقیەکان بۆ مەخلوقیەکان هەمان ڕەددی ئیمام احمدە، وە بەڵگەکانیان هەمان بەڵگەی ئیمام احمدە، کەواتە تێگەیشتوون باسەکە چیە و ئەوان چیان ووتوە، ئەگینا گەر لێیان تێنەگەن ئەوا بە هەمان شێوەی ئیمام احمد ڕەددیان نادەنەوە، تۆ گەر لە مەزهەبی مورجیئە تێنەگەیت و نەزانی چی ئەڵێن ئەوا لەوەش تێناگەیت کە سەلەف بۆ بەم ئایەتە ڕەددی مورجیئە ئەدەنەوە ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ﴾ [التوبة: ١٢٤]، ئەکرێ دوو لایەن بە هەڵە لە لایەنێک تێبگەن بەڵام هەردوو لایەنەکە بە هەمان بەڵگە و بە هەمان شێوە ڕەددی لایەنەکە بدەنەوە ؟!

## أبو الشيخ الأصبهاني:

ئەم فەرموودەیە ئەهێنێت کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (نوێژ نابێت قسەی خەڵکی تێدا بێت، بەڵکو تەنها زیکر و تەسبیح و خوێندنی قورئانە)

پاشان ئەم فەرموودەیە ئەهێنێت کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە حەجدا بە وەفدی شارەکانی تری ئەووت: (کەسێک لە ئێوە نام بات بۆلای قەومەکەی ؟ بە ڕاستی قورەیش ڕێگریان لێکردووم کە کەلامی پەروەردگارم بگەیەنم)

هەروەها ئەم ئایەتە ئەهێنێت: ﴿وَإِنۡ أَحَدٌ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾

دواتر ووتەی محمد بن شعیب بن شابور ئەهێنێت کە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەڵێ: کلام الله: قورئانە.

دوای هێنانی ئەم بەڵگانە **أبو الشيخ الأصبهاني** ئەڵێ:

جبریل قورئانی بیستووە لە الله عز وجل، وە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم قورئانی بیستووە لە جبریل علیه السلام، وە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم الله لێیان ڕازی بێت قورئانیان بیستووە لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ئاوا چین دوای چین لە یەکتریان بیستووە تاکو ئەمڕۆمان، قورئان دوای ئێمەش هەروەک پێش ئێمە ئەبێت کە کەلامی الله یە مەخلوق نیە، وە هەر کەسێک پێی وابێت قورئان مەخلوقە یان هەندێکی مەخلوقە یان بەشێکی مەخلوقە لە حاڵێک لە حاڵەکاندا و لە ڕوویێک لە ڕووەکاندا، ئەوا پێی وایە کە جبریل شتێکی مەخلوقی لە الله بیستووە، وە شتێکی مەخلوقی بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هێناوە، وە پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم شتێکی مەخلوقی بۆ ئوممەتەکەی هێناوە.

**(الحجة في بيان المحجة : ١ / ٢٢٤-٢٢٥)**

بڕوانە أبو الشيخ بە هەمان ئایەت و فەرمووده ڕەددیان ئەداتەوە کە ئیمام احمد ڕەددی داونەتەوە، کە هەمووی بەڵگەن لەسەر ئەوەی خوێنراوەکە قورئانە کەلامی الله یە نابێتە مەخلوق کاتێک عەبد ئەیخوێنێ، وە ئەڵێ هەر کەسێک پێی وابێت قورئان لە حاڵێک لە حاڵەکاندا مەخلوقە ئەوا پێی وایە کە جبريل شتێکی مەخلوقی هێناوە بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم شتێکی مەخلوقی هێناوە بۆ ئوممەتەکەی، کە ئەمە هەمان ڕەددی ئیمام احمدە بۆ لەفزیەکان، گەر أبو الشيخ لە مەزهەبی لەفزیەکان تێنەگات چۆن هەمان ئایەت و فەرمووده استدلال پێ ئەکات لە دژیان ؟ گەر لە مەزهەبیان تێنەگات نازانێ وەجهی استدلال کردن چیە بەم ئایەت و فەرموودانە، جەماعەتی دوو جەزائیریەکە ئێستا لەم حاڵەدان کە نازانن مەزهەبی لەفزیەکان چی بووە بۆیە زۆر قورسە لەسەرتان کە تێبگەن بۆ ئیمام احمد لە هەموو ڕەددەکانی باسی ئەوە ئەکات قورئان مەخلوق نیە و لە هیچ حاڵێکدا نابێتە مەخلوق، بۆ جارێکیش باسی ئەوە ناکات کە فعلی عەبد لەو کاتەدا بە مەخلوق وەسف ناکرێت

**أبو الشيخ الأصبهاني** قسە لەسەر ئەم ئایەتە ئەکات ئەڵێ:

﴿قُلۡ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسۡتَمَعَ نَفَرٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَقَالُوٓاْ إِنَّا سَمِعۡنَا قُرۡءَانًا عَجَبٗا﴾ [الجن: ١]

ئەمە ئەسلە لەوەی کە لەفز بە قورئان بریتیە لە قورئان، چونکە جنەکان لەفز و قیرائە و تیلاوەی پێغەمبەریان بیست صلى الله عليه وسلم، وە ووتیان: ئێمە قورئانێکی سەیرمان بیست.

هەروەها ئەڵێ: الله نەیفەرموو جنەکان گوێ ئەگرن لە حیکایەتی قورئان، وە نەیفەرموو ئەوەی ئەیبیستن حیکایەتی قورئانە، بەڵکو الله تبارك وتعالى ڕوونی کردەوە کە لەفزی پێغەمبەرەکەی بە قورئان بریتیە لە قورئان، وە قیرائەتی بۆ قورئان بریتیە لە قورئان، وە کەلامی بە قورئان بریتیە لە کەلامی الله عز وجل.

**بڕوانە (الحجة في بيان المحجة : ١ / ٣٨٩-٣٩٠)**

سەیرکەن أبو الشيخ کە لەفزیەکی غەیر مەخلوقیە ئەڵێ لەفزی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە قورئان بریتیە لە قورئان، ئایا کە أبو الشيخ لەفز یەکسان ئەکات بە قورئان و ئەڵێ لەفز قورئانەکەیە، پاشان کە ئەڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوق نیە، پێتان وایە مەبەستی لە لەفز فعلی عەبد بێت ؟! لە کاتێکدا پێشتر ووتی لەفزەکە قورئانەکەیە، ئایا پێتان وایە کە بڵێ لەفز فعلی عەبدە و فعلی عەبدەکەش قورئانە ؟ ئەمە ئەچێتە عەقڵەوە زانایەک بڵێ فعلی عەبدەکە قورئانەکەیە ؟! بۆیە روونە کە ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە مەبەستیان لە لەفز قورئانەکەیە نەک فعلی عەبدەکە، چونکە خۆی ووتی لەفزەکە بریتیە لە قورئانەکە

### قوام السنة الأصبهاني ئەڵێ:

ریوایەت کراوە لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کە فەرموویەتی: (نوێژەکانمان نابێت هیچ شتێک لە قسەی مرۆڤی تێدا بێت، بەڵکو تەنها قورئان خوێندنە)

جا گەر قیرائە مەقروء نەبێت ئەوا مانای فەرموودەکە ئاوای لێدێت: (نابێت هیچ قسەیەکی مرۆڤی تێدا بێت، بەڵکو تەنها قسەی مرۆڤە) ئەم ووتەیەش هیچ مانایەکی نیە، وە ئوممەت کۆکە لەسەر ئەوەی کە ئەگەر کەسێک سوێند بخوات بە تەڵاق کە قسە ناکات، جا قورئان بخوێنێ ئەوا سوێندەکەی ناکەوێت، جا ئەگەر قیرائە کەلامی مرۆڤ بوایە ئەوا سوێندەکەی ئەکەوت.

**(الحجة في بيان المحجة : ١/٤٠٠)**

قوام السنة کە ئەویش لەفزییەکی غەیر مەخلوقیە بە بەڵگەکانی و ڕەددەکانی بۆ لەفزییەکان بە روونی دەرئەکەوێت کە مەبەستیان لە لەفز قورئانەکەیە نەک فعلی عەبدەکە، بۆیە ئەڵێ گەر قیرائە کەلامی مرۆڤ بێت ئەوا ئەو کەسە سوێندی ئەکەوێت کە سوێندی خواردووە قسە نەکات کاتێک قورئان ئەخوێنێت، ئایا پێتان وایە قوام السنة کە ئەڵێ قیرائە بریتیە لە قورئان مەبەستی لە قیرائە فعلی عەبد بێت بڵێ فعلی عەبد بریتیە لە قورئان ؟! کە ئەمە کوفرە و مەزهەبی حلولیەکانە، وە ئەگەر بمەوێ بیسەلمێنم کە لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان مەبەستیان ئەوە بووە قورئان مەخلوق نیە نەک فعلی عەبد مەخلوق نیە ئەوا هێندە بەڵگە ئەخەمە ڕوو کە پۆستەکان ژمارەیان زۆر زیاتر بێت لەمەی ئێستا، وە بیر لە قیامەتت بکەرەوە فەهمی هەموو ئەم زانایانە بە هیچ مەزانە لە بەرامبەردا فەهمی دوو کەسی سەردەمەکەت بە کوێرانە وەربگریت وەک ئەوەی بڵێی ئەم دوو کەسە ئیمام احمد و ئیمام شافعی بن، باشە ئەم دوو کەسە چیان هەیە کە نەتوانرێ لە فەهمی ئەوان لابدرێت و قورس بێت قەناعەت بکەیت کە ئەوان بە هەڵە لەم باسە حاڵی بوونە ؟ لە کاتێکدا خۆتان باش

ئەزانن یەک سەلەف و خەلەفیان نیە بەو جۆرەی ئەوان باسی مەزهەبی لەفزییەکانیان کردبێ، من تا قیامەت مۆڵەتتان ئەدەمێ لە زانایەکی ئەهلی سوننە بیهێنن کە بڵێ لەفزییەکان ئەوا نەبوون کە ئەیان ووت فعلی عەبد مەخلوقە لەکاتی قورئان خوێندنەوە، وە ئەهلی سوننە لە رەددی ئەوان ووتیان: فعلی عەبد بە گشتی مەخلوقە بەڵام لەکاتی قورئان خوێندنەوە فعلی عەبدەکە بە مەخلوق وەسف ناکرێت، گەر بە مەخلوق وەسفی بکەیت ئەبیتە جەهمی، بزانە یەک زانا ئەدۆزنەوە وەک دوو جەزائیریەکە بەم جۆرە باسی بابەتەکە بکەن، ئاخر ئەم دوو کەسە چین کە ووتەیان بکرێ بە ئەسل و ووتەی هەموو زانایانی تر بە ووتەی ئەوان بەراوورد بکرێن گەر مواقفی ئەم دووانە نەبوون ئەوا تێنەگەیشتوون و نەیانزانیوە مەسەلە چیە!!! ئەوپەڕی هەیە لەم بابەتە ئەوەیە کە ئەوان چەند ساڵێک پێش ئێوە گەیشتوون بە کتێبەکانی سەلەف، نەک ئەوان وەک دوو پارێزەری مەنهەجی سەلەف سەیر بکەن، الله هەردووکیان لەناو ببات گەر شایەنی هیدایەت نین.

----------------------------

ماویەتی

# بەشێک

یا رب گەر ئەوەی من باسی ئەکەم دەربارەی لەفزییەکان هەڵەیە و دینی جەهمیەکان بڵاو ئەکەمەوە ئەوا لەعنەتم لێبێت

ئامین

وە ئەگەر ئەوەی جەماعەتی دوو جەزائیریەکە باسی ئەکەن دەربارەی لەفزییەکان هەڵەیە و بە ناحەق خەڵک و زانایان تەکفیر ئەکەن لەعنەتیان لێبێت

کێ لەوان وەک من دڵنیایە لە عەقیدەکەی با وەک من ئامین بکات

یا رب ئەوەی لەسەر حەقە سەری بخەیت

ئەوەی ناحەقە سەرشۆڕ و بێ قیمەتی بکەیت

ئامین

# اللفظية (٣٥)



***ابن منده*** لە کتێبی (الرد على اللفظية) ئەڵێ:

خیلاف نیە لەنێو زانایانی شارەکان لەوەی کە لەفز بە قورئان و ئیمان مەخلوق نیە، وە ئەو کەلامەی دابەزیوە خودی کەلامی الله یە، جا ئەوانەی کە باسمان کردن لە پێشەوایانی خەڵکی رۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ئەستێرەی خەڵکی زەوین، وە چرای هیدایەتن، وە پارێزگارن لە دینی الله، وە بە ووتەی ئەوان ئاگری بیدعە و گومڕایی کوژایەوە، کۆکن لەسەر تەبدیع کردنی لەفزیەکان و کوفرەکەیان، وە بە هەمان شێوە هەر کەسێک بڵێ ئیمان مەخلوقە، وە هەر کەسێک پێی وابێت خوێنراو (مەتلو) لە کتێبی الله حیکایەت و عیبارەتە لە کەلامی الله، هەروەک چۆن پەکخەرەکانی سیفات پێیان وابوو قورئان دانەبەزیوە لە ئاسمان بەڵکو جبریل بە حیکایەتی کەلامی الله دابەزیوە، وە بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم گەیشتووە حیکایەتی ئەوەی کە جبریل هێناویەتی لە الله-وە، وە بە هەمان شێوە بە ئێمە گەیشتووە، لە ئینکاری کردنیان بۆ قورئان و درۆ کردنیان بە ناوی الله ئەم قسانەیان کرد.

جا مرۆڤ تەقوای پەروەردگاری بکات و پەند لەوانەی پێش خۆی وەربگرێت ئەوانەی ئەمە مەزهەب و ووتەیان بووە کە چۆن لە دونیا دەرچوو بە هەجر کراوی و زەم کراوی و دەر کراوی لە مەجلیسەکان و شارەکاندا، بەهۆی عەقیدە و ووتە ناشرینەکەی کە موخالفی دینی الله یە، ئەوانەی پێشەوای ئەهلی گومڕاین کە لە مەجلیس و کۆبوونەوەکانی ئەهلی عیلم باس ناکرێن ئیللا لەعنەتیان لێ ئەکرێت، وەک: الكرابيسي و ابن كلاب و الشراك وابن الأشعري و هاوشێوەکانیان ئەوانەی کە مەرجەعیان لە دیندا عەقڵە هیچەکانیان و ڕەئیە بێزراوەکانیانە.

هەر لە هەمان کتێبدا ابن مندە ئەڵێ:

أخبرنا أحمد بن محمد بن إبراهيم حدثنا أبو حاتم الرازي ووتی:

لە ووتەی جەهم بن صەفوان و حسين الكرابيسي و داود بن علي ئەوەیە کە لەفزیان بە قورئان مەخلوقە، وە ئەو قورئانەی دابەزیوە بەسەر پێغەمبەرمان صلى الله عليه وسلم کە جبریلی ئەمین هێناویەتی حیکایەتی قورئانە، جا ابو عبدالله احمد بن محمد بن حنبل بە جەهمی دانان، وە زانایانی شارەکان هەموویان شوێنی احمد کەوتن لە جەهمی دانانیان، هیچ خیلاف نیە لە نێو ئەهلی ئەثەر لەم بابەتەدا.

بەشێکی کەم لە دەستنوسی ئەم کتێبەی ابن مندە بەردەستە کە بۆ ڕەددانەوەی لەفزیەکان نوسیویەتی، وە هەندێک زانا بەشێک لە ریوایەتەکانی ئەم کتێبەیان نەقل

کردووە وەک ابو اسماعیل الأنصاري و قوام السنة الأصبهاني، کە ئەوەی دووەمیان بەشێکی باشی کتێبەکەی ریوایەت کردووە لە أبو عمرو عبدالوهاب کە کوڕی ابن مندە-یە.

سەیرکەن ابو حاتم الرازي ئەم زانا گەورەیەی سەلەف چۆن باسی مەزهەبی کەرابیسی و لەفزیەکان ئەکات، ئایا ووتی کەرابیسی و داود ئەیان ووت فعلی عەبدەکە مەخلوقە کە قورئان ئەخوێنێ بەڵام قورئانەکە غەیر مەخلوقە ؟ یان ووتی کەرابیسی و داود ئەیان ووت ئەو قورئانەی جبریل هێناویەتی بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم حیکایەتی قورئانە ؟ ئەوە چیتانە تێگەیشتنی ابو حاتم الرازي بۆ مەزهەبی لەفزییەکان قبوڵ ناکەن تێگەیشتنی ابو فلان و ابو علانی جەزائیری قبوڵ ئەکەن ؟!!!

ابو حاتم-یش لە مەزهەبی کەرابیسی و لەفزییەکان تێنەگەیشتبوو ؟!!!

ئەم ریوایەتە بەسە بۆ کەسێک کە حەقی بوێت لەم باسەدا، هەرچەندە لە پۆستەکانی سەرەتادا ئەم ریوایەتەم هێناوە بەڵام ئێستا بۆیە دووبارەی ئەکەمەوە چونکە ابن مندە-ش لە کتێبی (الرد علی اللفظية) هێناویەتی، واتا ئەویش بە هەمان جۆر لە مەزهەبی لەفزییەکان تێگەیشتووە نەک وەک دوو جەزائیریەکە الله لەناویان ببات، وە پێش هێنانی ریوایەتەکەش ابن مندە کە باسی مەزهەبی لەفزییەکان ئەکات هەر بەو جۆرە باسی ئەکات کە لەفزییەکان قورئانەکە بە مەخلوق ئەزانن (مەتلو) نەک باسی

فعلی عەبد بکات، وە ئەوەی ئەیخوێنین حیکایەتی کەلامی الله یە لەلای لەفزیەکان، وە بینیمان کە ابن مندە ناوی کەرابیسی و الشراك و ابن کلاب و ابو الحسن الأشعري بەیەکەوە هێنا، هەموویانی بە خاوەنی یەک عەقیدە وەسف کرد دەربارەی قورئان چونکە هەموویان کۆکن کە ئەم قورئانەی زەوی مەخلوقە و حیکایەتی قورئانەکەی ئاسمانە نەک خودی قورئانەکە بێت و کەلامی الله بێت

**اللالكائي** ئەڵێ:

وأخبرنا عبيدالله قال أخبرنا أحمد بن كامل قال حدثني أبو عبدالله الوراق ووتی:

من کتێبەکانی داود الأصبهاني-م ئەنوسیەوە، جا ڕۆژێکیان من لەلای داود بووم لە مەدخەلی ماڵەکەیدا لەگەڵ ژمارەیەک لە کەسانی غەریب، پرسیاری قورئانی لێکرا

داود ووتی: ئەو قورئانەی کە الله فەرموویەتی: (لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ) وە فەرموویەتی: (فِى كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ) مەخلوق نیە، بەڵام ئەو قورئانەی کە لەناوماندایە لەشگران و ئافرەتی خوێن بینیو دەستی لێئەدەن مەخلوقە.

القاضي أحمد بن كامل ووتی: ئەمە مەزهەبی الناشئ-ە، وە ئەمە کوفرە بە الله-ی العظیم، بە سەحیحی هاتووە لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کە نەهیکردووە لەوەی سەفەر بکرێت بە قورئان بۆ خاکی دوژمن، لە ترسی ئەوەی بکەوێتە ژێر دەستی دوژمن، جا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەوەی لە موسحەف و موسحەفەکاندا

نوسراوه به قورئانی دانا، جا قورئان لەسەر ڕووێک بخوێنرێ ئەوا هەر یەک قورئانه و مەخلوق نیه.

**(شرح أصول اعتقاد : ٦١٣)**

سەیرکەن کاتێک داود الأصبهاني ئەڵێ ئەم قورئانەی زەوی مەخلوقه بەڵام قورئانەکەی ئاسمان مەخلوق نیه، القاضي أحمد بن كامل به هەمان ئەو ووتەیه رەددی داود ئەداتەوه که رەددی لەفزیەکانی پێ دراوەتەوه، لەخۆت بپرسه بۆ ؟ ئینجا اللالكائي ئەم ریوایەته لەو فەصله ئەهێنێت که بۆ باسکردنی لەفزیەکان دایناوه، بۆچی ووتەی داود که ئەڵێ قورئانی ئاسمان مەخلوق نیه و قورئانی زەوی مەخلوقه لەژێر فەصلی لەفزیەکان ئەهێنێت گەر ئەمه ووتەی لەفزیەکان نەبێت ؟ چونکه داود گەر دوو کوفری جیاوازی هەبێت هەر کوفرێک لەژێر بابەتێکدا باس ئەکات نەک دوو کوفری جیاوازی داود لەژێر یەک بابەتدا بهێنێت، که له هەر لەژێر ئەم بابەتەدا هێناویەتی که باسی لەفزی بوونی داود ئەکات، وه له پۆستەکانی سەرەتا که دەربارەی عەقیدەی داود کردم چەندین بەڵگەمان هێنا که داود لەفزی بووه به ڕوونی ئەیووت لەفزم به قورئان مەخلوقه، وه قوتابی کەرابیسی بووه، بۆیه ئەم ووتەیه هیچ سەیر نیه لەلایەن داود، جا لێرەدا داود دوو جەزائیریەکه سەرشۆڕ و شەرمەزار ئەکات، چونکه ئێمه و دوو جەزائیریەکه هەردووک لامان کۆکین که داود لەفزی بووه بەڵگەی روون هەیه لەسەری، بەڵام خیلافمان هەیه که ئایا مەزهەبی لەفزیەکان چی بووه، من ئەڵێم لەفزیەکان مەبەستیان مەخلوقی قورئان بووه لەم ووتەیه، ئەوانیش ئەڵێن نەخێر لەفزیەکان قورئانیان به مەخلوق نەئەزانی تەنها فعلی عەبدیان به مەخلوق

ئەزانی، کەواتە با داود کە کەسێکی لەفزیە بێت بۆمانی روون بکاتەوە مەبەستی لەفزیەکان چی بووە، بە پێی فەهمی ئێوە بێت داود قورئان بە غەیر مەخلوق ئەزانێت وە دژی ئەوەیە کە بووترێ قورئان مەخلوقە، وە بە پێی فەهمی من داود و هەموو لەفزیەکان مەبەستیان لە ووتەکەیان ئەوە بوو قورئان بە نسبەت الله غەیر مەخلوقە بەڵام کە عەبد ئەدای ئەکات قورئانەکە ئەبێتە مەخلوق لەلایەن عەبدەوە، لە نەتیجەدا داودی لەفزی فەهمی کام لە ئێمەی پشت ڕاست کردەوە ؟ ئایا ووتی ئەم قورئانەی زەوی مەخلوق نیە بەڵام فعلی عەبد مەخلوقە ؟ یان ووتی ئەم قورئانەی سەر زەوی مەخلوقە کە عەبد ئەیخوێنێ و ئەینوسێ بەڵام قورئانەکەی ئاسمان غەیر مەخلوقە کە لەلای الله-یە ؟

بۆیە ئەم ریوایەتە وەک تیرێک وایە بۆ سەر دڵتان، بەڵام دڵێک مرد بێت تیر چۆن کاری تێ ئەکات ؟ وە ووتەکەی ابو حاتم دەربارەی عەقیدەی کەرابیسی و داود شمشێرێکە لە هەناوتاندا چەقیوە.

-----------------------------

ماویەتی

# بەشێک

قال **البخاري** رحمه الله:

وَمَا ذُكِرَ فِي خَلْقِ أَفْعَالِ الْعِبَادِ وَأَكْسَابِهِمْ، لِقَوْلِهِ تَعَالَى: {وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا}.

**(صحيح البخاري / كتاب التوحيد / بَابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: فَلاَ تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَنْدَادًا)**

سەیرکەن بوخاری لە سەحیحەکەیدا هەمان ئەو مەنهەجەی هەیە کە لە کتێبی (خلق أفعال العباد) باسی ئەکات، وە بوخاری لە کتێبی (خلق أفعال العباد) ئەم دوو ئایەتە ئەهێنێت بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە فعلی عەبد هەموو کات مەخلوقە، کە لێرەشدا بۆ هەمان مەبەست هێناویەتی، ئەمەش ئەو درۆیەی جەزائیریەکە هەڵئەوەشێنێتەوە کە ئەڵێ: بوخاری سەحیحەکەی پێش کافر بوونی نوسیوە، لە کۆتایی تەمەنی کتێبی (خلق أفعال العباد)ی نوسیوە، بۆیە فەرموودەکانی سەحیحەکەی وەرئەگرین چونکە پێش کافر بوونی نوسیویەتی!!!

دەی ئەوەتا لە سەحیحەکەشی هەر کافر بووە بە پێی مەزهەبی ئێوە، بۆیە ئەزیەت بکێشن و دەست بکەن بە بانگەواز کە ئەم کتێبە کوفری تێدایە و خاوەنەکەی کافرە فەرموودەکانی ناو کتێبەکە قبوڵ ناکرێت چونکە کافر ریوایەتی کردووە، جگە لە ئێوە کەس نیە ئوممەت ئاگادار بکاتەوە لەم بابەتانە، بەڵام نەکەن وەک نەززامیەکان بڵێن

ئاساییە کافرە بەڵام لە ریوایەتدا سیقەیە و فەرموودەی قبوڵە! بە ئیجماع ریوایەتی کافر قبوڵ نیە.

# بەشێک

لەلای سەلەف خەلق جیایە لە مەخلوق

خەلق سیفەتی الله یە مەخلوق نیە

مەخلوق دروستکراوەکانی الله-ن

فعلەکە فعلی الله یە مەخلوق نیە، دروستکراوەکە مەفعولەکەیە کە مەخلوقە

الله تعالى بە دەستی خۆی ئادەمی دروستکردووە، فعلی الله لە دروستکردنی ئادەم مەخلوق نیە، بەڵام ئادەم کە بە فعلی الله دروست بووە مەفعولە و مەخلوقە

واتا الله تعالى بە فعلی غەیر مەخلوقی خۆی ئادەمی مەخلوقی دروستکردووە

جا هەروەک چۆن الله تعالى بە فعلی غەیر مەخلوقی خۆی ئادەمی مەخلوقی دروستکردووە، بە هەمان شێوە ئێمەی مرۆڤیش بە فعلی مەخلوقی خۆمان کەلامی غەیر مەخلوقی الله ئەخوێنین و ئەنوسین

بەڵام دوو جەزائیریەکە ناچێتە عەقڵیانەوە کە بە فعلێکی مەخلوقی بەندە کەلامی غەیر مەخلوقی خالق بخوێنرێ و بنوسرێ، ئەی چۆن بڕوا بەوە ئەکەن کە الله بە فعلی

غەیر مەخلوقی خۆی ئادەمی مەخلوقی دروستکردووە، وە بە کەلامی غەیر مەخلوقی خۆی (كُنْ) مەخلوقاتی دروستکردووە ؟!

غەیر مەخلوقی فعلی الله و کەلامی الله ئادەم و باقی مەخلوقات ناکات بە غەیر مەخلوق

مەخلوقی فعلی ئێمەش کەلامی غەیر مەخلوقی الله ناکات بە مەخلوق.

# بەشێک

کابرای عمومی دەروێشی جەزائیری ئەڵێ:

(خۆ لە سەردەمی ئیمام احمد کەلامی نەفسی هەر لە ئارادا نەبووە) !!!

وەرە ئەمە ئاستی زانستیت بێت لە تێگەیشتن لە ووتەی فرقەکان کەچی بەم حاڵەوە ڕاست و چەپ زانایان تەکفیر بکەیت چونکە هاوڕای بیدعە پیسەکەی شێخە جەزائیریە بێ قیمەتەکەیان نەکردووە

ئەڵێ لە سەردەمی ئیمام احمد خۆ کەلامی نەفسی هەر لە ئارادا نەبووە!!!

ئەمە قسەی کەسێکە کە ئەلیف و بێ نەزانێت دەربارەی عەقیدەی فرقەکان لە سیفەتی کەلام، داماو یەکەم کەس کە باسی کەلامی نەفسی کرد ابن کلاب بوو کە ساڵێک پێش ئیمام احمد مردووە (٢٤٠ هـ)

چۆن لە سەردەمی ئیمام احمد کەلامی نەفسی لە ئارادا نەبووە ؟ ئەسلەن تۆ ئەزانی کەلامی نەفسی چیە ؟ ئەزانێ کێ بوون ئەمەیان ئەووت ؟ وە مەبەستیان چی بوو ؟

قال عبدالله:

سألت أبي رحمه الله عن قوم، يقولون: لما كلم الله عز وجل موسى لم يتكلم بصوت ؟

فقال أبي: بلى إن ربك عز وجل تكلم بصوت هذه الأحاديث نرويها كما جاءت.

**(السنة لعبدالله : ٥١٨)**

سەیرکە عبدالله پرسیاری ووتەی کوللابیەکان ئەکات لە باوکی، کە نەفی ئەوە ئەکەن الله بە حەرف و بە صەوت قسە بکات، لە کاتێکدا جەهمی و موعتەزیلە نەفی ئەوە ناکەن کە الله بە دەنگ و بە پیت قسەی کرد لەگەڵ موسى عليه السلام، بەڵام ئەڵێن الله کەلامەکەی خەلق کرد لە دارەکە

سەیرکە الحاكم لە تاريخ نيسابور ئەم ووتەیەی ابن خزيمة نەقل ئەکات کە چی ئەڵێ بە کوللابیەکان

قال ابن خزيمة:

فقد كان أحمد بن حنبل من أشد الناس على عبد الله بن سعيد وعلى أصحابه كالحارث وغيره.

**(تذكرة الحفاظ للذهبي : ٢/٢١١)**

سەیرکە ابن خزیمة توندی ئیمام احمد بەرامبەر ابن کلاب باس ئەکات چونکە وەک باسم کرد ابن کلاب ساڵێک زووتر مردووە لە یەک سەردەمدا ژیاون.

ئینجا کێ وتوویەتی کەرابیسی و لەفزییەکان بڕوایان بە کەلامی نەفسی هەبووە نەفی حەرف و صەوتیان کردووە تاکو تۆ ئەمە باس بکەیت ؟

تۆ هێشتا لە مەزهەبی لەفزییەکان و کوللابیەکان حاڵی نەبووی هاتووی تێکەڵت کردوون، کەرابیسی نەفی حەرف و صەوتی نەئەکرد، بڕوای بە کەلامی نەفسی نەبوو، پێی وابوو الله بە دەنگ و بە پیت قسەی کردووە، قورئانەکەی ئاسمان کەلامی الله یە مەخلوق نیە بە پیت و بە دەنگ قسەی پێکردووە، بەڵام کە عەبد ئەدای ئەکات ئەبێتە مەخلوق، بەڵام ابن کلاب بڕوای بە کەلامی نەفسی هەبوو کە یەکەم کەس بوو ئەمەی داهێنا و نەفی حەرف و صەوتی کرد، ئەیووت الله بە دەنگ و بە پیت قسە ناکات، بەڵکو کەلامی نەفسی هەیە نە دەنگە و نە پیتە، ئەو قورئانەی دابەزیوە حیکایەتە لە کەلامی نەفسی الله بە دەنگ و پیتی ئێمە، جا لەفزییەکان و کوللابیەکان و ئەشعەریەکان کە ئەشعەری ئەڵێ عیبارەت نەک حیکایەت، هەر سێکیان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەم قورئانەی دونیا مەخلوقە لەفزی بەندەکانە حیکایەت و عیبارەتە لە قورئانەکەی ئاسمان، بەڵام کەرابیسی لەوەدا پێچەوانەیانە کە قورئانەکەی ئاسمان بە پیت و بە دەنگ الله قسەی پێکردووە، هەرچی کوللابی و ئەشعەرینە پێیان وایە قورئانەکەی ئاسمان کەلامی نەفسیە لە زاتی الله دا بێ دەنگ و بێ پیتە، جا خاڵی هاوبەش هەیە لە نێوانیان دەربارەی مەخلوقی ئەم قورئانەی دونیا بۆیە هەرچی

ئەشعەری هەیە لە مانادا موافقی لەفزییەکانە و ئەم قورئانەی دونیا بە مەخلوق ئەزانن، ئەگەرچی هۆکاری گەیشتن بەم عەقیدەیان دوو شتی جیاواز بێت.

وە دڵت خۆش نەکەیت بڵێی ئێستا پۆستم لەسەر ناکات چونکە وەڵامی پێ نیە، واللە هێندە درۆت کردووە بە دەممان نازانم فریای کامەی بکەوم، وە هێندە چەواشەکاری و درۆت کردووە لە گەیاندنی باسەکان نازانم کەی فریای پۆست کردن بکەوم، نامەوێ زنجیرەکەم دوابکەوێ بۆیە جارێ ئیهمالم کردوویت، بەڵام ان شاء اللە دواتر دێمەوە بۆ گیانت، وە هێندە خۆم ماندوو ناکەم پێت ئەمجارە بەس موباهەلەت لەگەڵ ئەکەم بە لەعنەت کردن، ئینجا ئەیبینی لە چەندین درۆتدا موباهەلەت لەگەڵ ئەکەم، وە ئەگەر من لە عەقیدە و قسەی خۆم دڵنیا نەبم جورئەت ناکەم خۆم بدەمە بەر لەعنەتی اللە، ئەمەش بۆیە باس ئەکەم بینیومە پۆستت کردووە ئەڵێی دەمم داخستوون وەڵامیان پێ نیە بۆیە بێدەنگ بوونە لە ئاستم!!! پێم باش بوو ئیهمالت بکەم بەڵام کە ئیهمال کردن وات لێ ئەکات وابزانی بەرامبەر وەڵامی پێ نیە ئەوا نەک وەڵامی درۆ و چەواشەکانت ئەدەمەوە بەڵکو سوورم لەسەر ئەوەی لە هەر درۆ و چەواشەیەکت موباهەلەت لەگەڵدا بکەم، تۆ تاکو ئێستا هەر بەپێی عەقیدەکەی خۆت مولزەم کراوی بە سێ کوفری گەورە، کە خۆت لێی دزیەوە و دەستت کرد بە چەواشە ووتت من بروام بە عەقیدەی تۆ نیە تا مولزەمم بکەیت، ئێ واللە بەپێی عەقیدەی خۆت مولزەمم کردبووی، هێندە گەمژە نین بەپێی عەقیدەی خۆمان بەرامبەرەکەمان مولزەم بکەین کە ئەزانین هەمان عەقیدەی ئێمەی نیە.

# اللفظية (٣٦)



**محمد بن موسى الحضرمي** ئەڵێ:

ووتم بە احمد بن صالح المصري: الكرابيسي ئەڵێ: لەفزمان بە قورئان مەخلوقە.

ووتی: درۆی کرد دوژمنی الله، بەڵکو لەفز بە قورئان مەلفوزە، وە دیراسە مەدروسە، وە حیکایەت حیکایەتکراوە، وە تیلاوە مەتلوە، قورئان کەلامی الله عز وجل-ە مەخلوق نیە، هەر کەسێک بڵێ قورئان مەخلوقە ئەوا کافرە بە الله عز وجل، گەر دەسەڵاتم هەبوایە ڕێگام نەئەدا لە گۆڕستانی موسڵمانان بنێژرێ.

محمد بن موسى ئەڵێ ووتم: چ کوفرێکە ؟

ووتی: کوفرێکی لە دین دەرخەرە.

**ابن منده** دوای هێنانی ئەم ریوایەتە ئەڵێ:

ئەمە سیفەتی ئەشعەرییەکانە، ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، وە مەقروء و مەتلو حیکایەتی کەلامی اللّٰه-ن، وە ئەوەی لە نێوان دوو بەرگەکە نوسراوە پیتەکانی مەخلوقە، جا ئەوان ئەڵێن قورئان مەخلوقە بەڵام بە ڕاشکاوی نا.

**(مجلس في الرد على الزنادقة لابن منده)**

احمد بن صالح المصري لە تەبەقەی ئیمام احمد بووە، ئیمام احمد لە عەقیدە و لە فەرموودەدا ستایشی کردووە، زانا بووە لە زانستی فەرموودە و عیلەل، خۆیی و محمد بن یحیی الذهلي زاناترین کەسن بە فەرموودەکانی الزهري، ئەمەش بە شایەتی ئیمام احمد بۆیان، هەروەها ابو زرعة الدمشقي ئەڵێ چوون بۆ عیراق احمد بن حنبل پێی ووتم: کێت بە جێهێشت لە مصر ؟ ووتم: احمد بن صالح، احمد بن حنبل دڵخۆش بوو بەمە، وە بە چاکە باسی کرد و دوعای بۆ کرد، هەروەها کاتێک احمد بن صالح دێتە بەغداد ئەچێتە ماڵی ئیمام احمد ئیمام احمد پێشوازی لێ ئەکات و نزیکی ئەکاتەوە بەیەکەوە موذاکەرەی فەرموودەکانی الزهري ئەکەن.

ئەمانە بۆیە باس ئەکەم چونکە گەر خاوەنی ووتەکە نەناسن ئەوا قەدری ووتەکەشی نازانن.

سەیرکەن احمد بن صالح لە ڕەددی ووتەکەی کەرابیسی ئەڵێ درۆ ئەکات لەفز مەلفوزە، تیلاوە مەتلوە، قورئان کەلامی اللّٰه یە مەخلوق نیە، ئەوەی بڵێ مەخلوقە کافرە

ئایا گەر کەرابیسی مەبەستی لە ووتەکەی ئەوە بێت فعلی عەبدەکە مەخلوقە نەک قورئانەکە، واتا لەفز لەلای کەرابیسی مانای فعلی عەبد بدات، ئەی چۆن احمد بن صالح لە رەددی کەرابیسی ئەڵێ لەفز مەلفوزە ؟ واتا ئەڵێ فعلی عەبدەکە قورئانە ؟!!! چونکە کۆکین لەسەر ئەوەی کە مەلفوز قورئانەکەیە، وە ئێوە ئەڵێن لەفزیەکان کە باسی لەفز ئەکەن مەبەستیان فعلی عەبدە نەک قورئان، ئێ باشە احمد بن صالح لە رەددی لەفزیەکان ئەڵێ: لەفز مەلفوزە!!! بە قسەی ئێوە بێت احمد بن صالح وتوویەتی فعلی عەبد قورئانە!!! معاذ الله ئەمە کوفرە، بەهۆی جەهلەکەیانەوە بەم بابەتە بێ ئاگایانە کوفر ئەدەنە پاڵ زانایان، ئینجا هەرچی زانا هەیە کە وتوویانە لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە ناڵێن قیرائە و مەقروء دوو شتی جیان و هەردووکیان غەیر مەخلوقن، بەڵکو ئەڵێن قیرائە و مەقروء و تیلاوە و مەتلو و لەفز و مەلفوز یەک شتن و غەیر مەخلوقە، ئایا کە ئەڵێن ئەم دووانە یەک شتن واتا فعلی عەبدەکە قورئانە ؟!!! ئێوە وا باسی ئەکەن، چونکە ئەڵێن لەفزیەکان مەبەستیان لە لەفز و قیرائە و تیلاوە فعلی عەبدە، ئێ ئەوەتا لە رەددی لەفزیەکان ووتراوە: تیلاوە و مەتلو و لەفز و مەلفوز و قیرائە و مەقروء یەک شتن، کەواتە وتوویانە فعلی عەبدەکە یەکسانە بە قورئان!!! ئەمەش کوفرێکی بەواحە گومانی تێدا نیە، کەواتە ابو حاتم و احمد بن صالح و ابن مندە و ابن حامد و السجزي و جگە لەوانەش هەموویان کافرن، مەڵێن ئیمام احمد تەبدیعی کردوون ئێمەش تەبدیعیان ئەکەین، ئیمام احمد لێیان تێگەیشتووە بۆیە تەبدیعیان ئەکات، بەڵام ئێوە سوێند بە الله لەم بابەتەدا نە لە مەزهەبی ئەهلی سوننە و نە لە مەزهەبی دوو فرقە لەفزیەکە تێگەیشتوون

یان ئەم زانایانەش جاهیل بوونە لە ووتەی کەرابیسی تێنەگەیشتوون بۆیە بەم جۆرە ڕەددی ئەدەنەوە ؟!!!

## احمد بن علي بن الجارود ئەڵێ:

بیستم بە ابو حاتم ووترا: کەسانێک دەڵێن: لەفز و مەلفوز جیان، قیرائە و مەقروء جیان.

ابو حاتم ووتی: ئەمانە جەهمین، لەفز و مەلفوز، قیرائە و مەقروء یەک شتن، وە غیر مەخلوقە.

**(الحجة في بيان المحجة : ٣١٣/١)**

سەیرکەن ابو حاتم الرازي ئەم ئیمامە گەورەی سەلەف لە ڕەددی لەفزیەکان ناڵێ لەفز مەخلوق نیە و مەلفوزیش مەخلوق نیە، بەڵکو ئەڵێ لەفز و مەلفوز یەک شتن و غەیر مەخلوقە، واتا جیایان ناکاتەوە لە یەکتر، ئایا گەر مەزهەبی لەفزیەکان باسکردنی فعلی عەبد بێت، ئایا پێتان وایە ابو حاتم بڵێ فعلی عەبد و قورئان یەک شتە ؟ ئەبوایە بڵێ لەفزەکە مەخلوق نیە و مەلفوزەکەش مەخلوق نیە حەسەب فەهمی ئێوە، بەڵام ئەڵێ یەک شتن، ئەم ئیمامە گەورەش لە مەزهەبی لەفزیەکان تێنەگەیشتووە ؟ لە کاتێکدا هەرچی ووتەی لەفزیە غەیر مەخلوقیەکانە کەسیان لەفز و مەلفوز جیا ناکەنەوە، هەموویان ئەڵێن لەفز مەلفوزە، ناتوانن پینەشی بکەن بڵێن مەبەستی ئەوەیە کە لەفز و مەلفوز هەردووکیان هەمان حوکمیان هەیە و غەیر

مەخلوقە، بەڵكو ئەڵێن لەفز مەلفوزە، لەفز و مەلفوز یەک شتە، واتا جیای ناکەنەوە لە یەکتر، ئەمەش ئەوە دەرئەخات کە لەفزییەکان مەبەستیان لە

لەفز قورئانەکە بوو کە بە مەخلوق وەسفیان ئەکرد، بۆیە ئەوان لە وەڵامدا ئەیان ووت لەفزەکە مەخلوق نیە و هەر قورئانەکەیە، ئێ والله مەحاڵە عەوامێكیش جورئەت بکات بڵێ فعلی عەبدەکە قورئانەکەیە و هەمان شتە، چ جای ئەم زانا گەورانە بڵێن فعلی عەبد و قورئان هەمان شتن فعلەکە قورئانەکەیە! ئەمە سوکایەتی کردنە بەم زانایانە بەوەی کە لە مەزهەبی لەفزییەکان تێنەگەیشتوون لەخۆیانەوە قسەیان کردووە، ئینجا تانەدانە لە دینیان پێیان وایە ئەم زانایانە فعلی عەبدیان بە غەیر مەخلوق وەسف کردووە، ئەسلەن پێیان وایە ئەم زانایانە فعلی عەبدیان یەکسان کردووە بە قورئانەکە حەسەب قسەی خۆیان، چونکە ئەڵێن لەفز واتا فعلی عەبد، ئێ ئەم زانایانە ئەڵێن لەفزەکە مەلفوزە، واتا فعلەکە قورئانە!!! پەنا بە الله.

ئینجا دوو جەزائیریەکە الله لەوە بێ قیمەت تریان بکات و لەناویان ببات هەر یەکێکیان بە درۆیەک خۆی لەم ریوایەتە دەرباز ئەکات چونکە جورئەتیان نیە بڵێن ابو حاتم مبتدعە لەفزییەکی غەیر مەخلوقیە، لە کاتێکدا ئەوان حوکمەکانی ئیمام احمد وەک بیرکاری ئەسەپێنن بەسەر هەموو کەسێک بەبێ حیساب کردن بۆ هیچ شتێک، ئەمەش مولزەمیان ئەکات ابو حاتم تەبدیع بکەن، بۆیە ناچارن ریوایەتەکە بەتاڵ بکەنەوە، ابو ع ئەڵێ ووتەکەی ابو حاتم هیچ عەیبی نیە باسی قورئان ئەکات! لە کاتێکدا ئەمە چەواشە کردنێکی بێ ئابرووانەیە چونکە ابو حاتم ئەڵێ لەفز و

مەلفوز یەک شتن هەردووکی غەیر مەخلوقە، بەڵام ابو ع ئەزانێ سەنەدەکە سەحیحە هیچ کێشەی نیە ناچار تەئویلی ووتەکەی ئەکات، ابو ز ئەزانێ ووتەکە روونە ووتەی لەفزییە غەیر مەخلوقیەکانە مەجالی چەواشە کردن نیە لە رووی دەقەوە، هاتووە ئەڵێ ئەم ووتەیە مونکەرە و ئیسبات نەبووە! ئێ خۆ ئەمە بە هەوەس نیە، فەرموو یەک ووتەی ابو حاتم بهێنە کە تەبدیعی لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان بکات، تاکو ئێمەش بڵێین ئەم ریوایەتە مونکەرە ابو حاتم ووتەی هەیە دژی ئەمە، بۆیە ئەم ئینکار کردنە جگە لە هەوەس بازی هیچی تر نیە، وە هێشتا جورئەتتان پەیدا نەکردووە ئەویش تەبدیع بکەن بۆیە ئاوا خۆتان ئەهێنن و ئەبەن، ئەگینا ئێوە هێندە بە ئەدەب و بە رەحم نین بەرامبەر زانایان، ئەوەی قەدری زانا بێت لەلای ئێوە نیە.

ئینجا گەر هەر سوورن ئینکاری ئەم ریوایەتە بکەن، ئەوا قەرینەیەک ئەهێنین بۆ بەهێزکردنی ئەوەی ابو حاتم بروای وابووە لەفز و مەلفوز یەک شتن و هەردووکیان غەیر مەخلوقە واتا لەفزیەکی غەیر مەخلوقی بووە

قەرینەکەش ئەمەیە، ئەو ریوایەتەی احمد بن صالح کە ابن مندە هێناویەتی ئەزانن لە رێگای کێ هێناویەتی ؟ لە رێگای ابو حاتم الرازي

ئەمەش سەنەدەکەیەتی:

قال ابن منده: أخبرنا أبو عمرو قال حدثنا أبو حاتم قال حدثنا محمد بن موسى الحضرمي قال سمعت أحمد بن صالح المصري ... هتد

گەر بووترێ ابو حاتم کێیە لەم سەنەدە بەڵکو کونیەی کەسێکی ترە ؟

لەم نامیلەکە کورتەدا ابن مندە تەنها ٤ ریوایەتی هێناوە، هەر چواریان لە ڕێگای ابو عمرو عن ابو حاتم، لە ریوایەتی یەکەم ابن مندە ئەڵێ: ابو حاتم محمد بن ادریس، واتا ناوەکەی بە ئاشکرا ئەڵێ، جا ابو حاتم کە خۆی ئەمە بە روونی بڵێ، پاشان ووتەیەکی هاوشێوەی ئەمە ریوایەت بکات لە احمد بن صالح ئەمە ئەبێتە قەرینەیەک کە ابو حاتم ئەمە عەقیدەی بووە، ئەگینا ئەهلی سوننە ووتەیەکی بیدعی ریوایەت ناکەن ئیللا مەگەر بۆ رەددانەوەی بێت.

ئێستاش پێتان ئەڵێمەوە لە قیامەت کەس بە کەڵکتان نایەت، با نەفس زاڵ نەبێت بەسەرتان مەڵێن ئاخر قسەمان تێدا کردووە ئێستا چۆن بڵێین پەشیمانین! ئێوە پێتان وایە لەفزییە مەخلوقیەکان کە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە مەبەستیان ئەوە بوو فعلی عەبد مەخلوقە، وە لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان لە وەڵامدا کە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوق نیە مەبەستیان ئەوە بوو فعلی عەبد غەیر مەخلوقە، ئێ دە سەیری ووتەی لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان بکەن هەموویان ئەڵێن لەفز مەلفوزە تیلاوە مەتلوە قیرائە مەقروئە، ئەمانە یەک شتن، وە غەیر مەخلوقە، ئێ واللە مەحاڵە ئەم هەموو زانا گەورەیە بڵێن فعلی عەبد قورئانە، فعلی عەبد یەک شتە لەگەڵ قورئانەکە! نابینیت لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان بڵێن لەفز و مەلفوز جیاوازن بەڵام هەردووکیان غەیر مەخلوقە، بەڵکو ئەڵێن یەک شتە لەفز مەلفوزە، حەیفە فەهمی ابو حاتم و احمد بن صالح و السجزي و ابن حامد و ابن مندە و ابو

الشیخ و قوام السنة بە هیچ نەزانیت پێت وابێ تەنها دوو جەزائیریەکە تێگەیشتوون لە مەزهەبی لەفزییەکان، ئاخر بیر لەوە بکەنەوە کە بە پێی فەهمی ئێوە عەقیدەی لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان ئەبێتە عەقیدەی حلولیەکان، ئەڵێن فعلی عەبدەکە قورئانە!!!

ئەمەی خوارەوەش با ببێتە بەڵگەیەکی تر کە تۆزێک بەهۆش بهێنەوە تێبگەن لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان مەبەستیان چی بووە لە ووتەکەیان و بۆ ئەمەیان ووتوە، گەر لەوە تێگەیشتن لە ووتەی لەفزییەکان مەخلوقیەکانیش تێئەگەن، چونکە ووتەی ئەمانە ڕەددە بۆ ئەوان .

## عبدالواحد المقدسي الحنبلي (٤٨٦ هـ) ئەڵێ:

تیلاوە مەتلوە، وە قیرائە مەقروئە، وە مەبەستمان لەم ووتەیە ئەوەیە کە ئەوەی ئەیبیستین لە خوێنەر خودی کەلامی الله یە، نەک خوێندنەوەی کەلامی الله بێت، وە ئەشعەرییەکان ووتیان: تیلاوە مەتلو نیە، وە قیرائە مەقروء نیە، وە مەبەستیان لەم ووتەیە ئەوەیە کە ئەوەی لە خوێنەر ئەبیسترێ کەلامی الله تعالی نیە، بەڵکو کەلامی خوێنەرەکەیە و مەخلوقە.

**(التبصرة في أصول الدين : ٩٥-٩٦)**

رحمك الله تێبگە لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان کە ئەڵێن تیلاوە مەتلوە مەبەستیان ئەوە نیە خودی فعلی عەبدەکە قورئانەکە بێت، لە کاتێکدا حەسەب فەهمی ئێوە

وادەرئەچێ! وە مەحاڵە مەبەستیان لە لەفز و تیلاوە و قیرائە فعلی عەبد بێت، چونکە گەر مەبەستیان فعلی عەبد بێت ئەوا یەکسانی ناکەن بە قورئانەکە ناڵێن لەفز مەلفوزە تیلاوە مەتلوە قیرائە مەقروئە، وە ئەم ووتەیەی عبدالواحد دەریخست کە جیاکاری بوخاری لەنێوان تیلاوە و مەتلو جیاوازە لەگەڵ جیاکاری کوللابی و ئەشعەری، چونکە کوللابی و ئەشعەری لەلای ئەوان مەتلو نە پیتە نە دەنگە کەلامی نەفسیە لە زاتی الله دایە، وە تیلاوە بریتیە لەو قورئانەی دونیا کە ئێمە ئەیخوێنین عیبارەت و حیکایەتە لە کەلامە نەفسیەکە، واتا ئەم قورئانە مەخلوقە کەلامە نەفسیەکە غەیر مەخلوقە، کە بوخاری بە ڕوونی ئەوانە تەکفیر ئەکات کە وائەڵێن، بوخاری مەبەستی لە تیلاوە فعلی عەبدە، مەبەستی لە مەتلو قورئانەکەیە، هەرچەندە ئێمە ئەم ووشانە بە هەڵە ئەزانین چونکە لەگەڵ ووتەی کوللابیەکان یەک ئەگرێتەوە، ئەولاتر بوو تەنها بڵێ فعلی عەبد مەخلوقە و قورئان غەیر مەخلوقە، نەک فعلی عەبد بە تیلاوە و قیرائە ناوببات و بڵێ تیلاوە و قیرائە مەخلوقە، چونکە سەلەف بەم ووتانە دەریان نەبڕیوە، بەڵام بەم ووتانە نە تەبدیعی ئەکەین نە تەکفیر، چونکە لە کتێبەکەی بە ڕوونی باس ئەکات کە تیلاوە و قیرائە لای ئەو واتا فعلی عەبد، وە مەتلو و مەقروء ئەو قورئانەیە کە لە موسحەف نوسراوە و ئەخوێنرێ و ئەنوسرێ و ئەبیسترێ و حیفز ئەکرێ، ئینجا خودی ووشەکە لەخۆیدا کوفر نیە تا بووترێ: هەر کەسێک ئەمەی ووت کافرە با مەبەستیشیان جیا بێت، بەڵکو ئەم ووشانە لەفزیەکان وەک فێڵێک بەکاریان ئەهێنا بۆ شاردنەوەی کوفرەکەیان، بێگومان گەر ووتەکەیان کوفرێکی ڕوون و ڕاشکاو بوایە ابن بطة بەم جۆرە وەسفی ناکات کە بڵێ تەنها ئیمام احمد هەستی بە شاراوەیی کوفرەکەیان کرد، جا کاتێک ووشەیەک

فرقەیەک بۆ شاردنەوەی کوفرەکەی بەکاری ئەهێنێت جیایە لەوەی کە کەسێکی تر ئەم ووشەیە بۆ دەربرینی حەقێک بەکار ئەهێنێت، هەروەک اسحاق بن راهویە ئەڵێ: هەر کەسێک بڵێ: قورئان محدث-ە مەبەستی مەخلوق بێت لەم ووتەیە ئەوا کافرە، سەیرکەن چۆن اعتبار بۆ مەبەستی کەسەکە دائەنێت کاتێک ووتەکە کوفرێکی ڕوون و ڕاشکاو نیە مانای جیا لەخۆ ئەگرێت.

----------------------------

ماویەتی

# بەشێک

یەکەم کەس کە ووتی لەفزم بە قورئان مەخلوقە جەهمی کوڕی صەفوان بوو

دواتر بشر المريسي ئەمەی ووت

ئیمام احمد ئەم ووتەیەی داوەتە پاڵ جەهم و بشر

پاشان کەرابیسی ئەمەی ووت

بۆیە ئیمام احمد ئەیووت بشر مرد و کەرابیسی شوێنی گرتەوە

ئایا جەهم و بشر بڕوایان وابووە فعلی عەبدەکە مەخلوقە بەڵام قورئان غەیر مەخلوقە ؟!!!

ئیمام احمد لە چەندین ریوایەتدا کە ووتەی کەرابیسی و لەفزییەکانی بۆ نەقل ئەکەن ئەڵێ: ئەمە خودی ووتەی جەهمە

الله لەناوتان ببات کە پێتان وایە جەهم قورئانی بە مەخلوق نەئەزانی تەنها فعلی عەبدی بە مەخلوق ئەزانی، مەحاڵیشە بووترێ جەهم و کەرابیسی هەمان قسەیان کردووە بەڵام مەبەستیان جیابووە، چونکە ئیمام احمد ووتەی کەرابیسی دایە پاڵ جەهم و هەمان حوکمی جەهمی بەسەردا.

# اللفظية (٣٧)



سەرەتا وا دامنا کە ئەم پۆستە رەد بێت بۆ پۆستی بەچکە جەزائیریەکە، بەڵام دواتر هەژمارم کرد بە یەکێک لە پۆستەکانی زنجیرەکە چونکە ئەم ریوایەتە کە بەچکە جەزائیریەکە دەستی پێوە گرتووە وەکو چەکێک وایە کە دەمی لولەکەی لەخۆی کردووە و ماڵی خۆی پێ وێران کرد، وە هەر کەسێک تاکو ئێستا لە مەزهەبی لەفزییەکان تێنەگەیشتووە با زۆر بە ووردی ئەم پۆستە بخوێنێتەوە چونکە پێم وایە زۆر بە ڕوونی دەست لەسەر برینەکان دائەنێت و پەردە لەسەر گومان و چەواشەکان لائەبات

عومی بەچکە جەزائیری ئەم ریوایەتەی خوارەوەی کردۆتەوە بەڵگە

قال الخلال:

وأخبرني محمد بن أبي هارون أن إسحاق حدثهم قال: سمعت أبا عبد الله يقول: من زعم أن لفظي بالقرآن مخلوق فهو جهمي.

وقال: أرأيت حيث جاء جبريل إلى النبي صلى الله عليه وسلم فتلا عليه القرآن، فتلاوة جبريل على النبي صلى الله عليه وسلم بالقرآن أكان مخلوقا ؟!

**(السنة للخلال : ٢٠٩٠)**

عمومی بەچکە جەزائیری ئەڵێ:

(وە ئەگەر ئینکاریان کرد ئەم زندیقانە کە لفظیەکان مەبەستیان قورئانەکە بوە

ئەوە ئەو قەولەی ئیمام ئەحمەدیان بۆ دابنێن کە لەڕەسمەکەدا دەم ناوە کە ئیمام ئەحمەد ئینکاری ئەوە ئەکات بگوترێت تلاوەی جبریل بۆ قورئان مەخلوقە

وەوەکو الزام ڕەدی لفظیەکانی پێ ئەداتەوە

وە باس باسی وەسف کردنی تلاوەیە بە مەخلوق نەک قورئانەکە بۆیە با کوێر بن زندیقەکان بەم ئاثارانە بڕوانە چۆن ئیمام ئەحمەد بە ئینکاریەوە دەفەرموێت :

أرأيت حيث جاء جبريل الى النبي فتلا عليه القرآن فتلاوة جبريل على النبي بالقرآن أكان مخلوقا؟

واتا ئیمام احمد لە اسحاق ی مامی ئەپرسێت بە ئینکاریەوە و دەڵێت :سەیرکە ئایا کاتێک جبریل هات بۆلای محمد ﷺ وەقورئانی خوێندەوە بەسەریدا ئایا خوێندنەوەی قورئانەکە لەلایەن جبریلەوە بەسەر محمددا

ﷺ مەخلوق بوە ؟!

لێرەدا باسی تلاوەکەیە  کە ئایا بە مەخلوق وەسف ئەکرێت  کە زندیقەکانی ئێستا ئەڵێن بەڵێ تلاوە بریتی نیە لە متلو بۆیە تلاوە مەخلوقە  بەڵام ئیمام احمد ئینکاری لەوە دەکات کە وا بگوترێت وەئێمە لەسەر ڕێبازی ئیمام احمدین نەکە لەسەر ڕێبازی بەعر و بەعیر).

ووتەی عمومیە بەچکە جەزائیریەکە بەکۆتا هات کە لەنێوان دوو کەوانە دامناوە.

وەک مەعلومە خیلافی نێوان ئێمە و دوو جەزائیریەکە و مەڕەکانیان ئەوەیە کە ئێمە ئەڵێین: لەفزیەکان کە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان یان تیلاوەمان بۆ قورئان یان قیرائەمان بە قورئان مەخلوقە، لە هەموو ئەمانەدا مەبەستیان مەخلوقی قورئان بوو، بەڵام دوو جەزائیریەکە ئەڵێن نەخێر لەفزیەکان لەم ووتانەدا مەبەستیان مەخلوقی فعلی عەبد بوو قورئانەکەیان بە مەخلوق نەئەزانی، تەنها لەسەر ئەوە تەکفیر کران کە فعلی عەبدیان لەکاتی قورئان خوێندنەوە بە مەخلوق وەسف کرد، هەروەک ئەبینین ئەم عمومیەش شوێنی شوانەکەی کەوتووە لەم باسەدا ئەم ریوایەتەی هێناوە کە ئیمام احمد ئینکاری لە لەفزیەکان ئەکات کە ئەڵێن تیلاوەی قورئان مەخلوقە، وە ئەو پێی وایە کە تیلاوە لای لەفزیەکان واتا فعلی عەبد نەوەک قورئان، ئەڵێ ئەها سەیرکە ئیمام احمد بە ئینکار کردنەوە بە اسحاقی مامی ئەڵێ ئایا تیلاوەی جبریل بە قورئان مەخلوق بوو؟! (فتلاوة جبريل على النبي بالقرآن أكان مخلوقا؟!) ئیمام احمد ئینکاری لەم ووتەیە ئەکات واتا نابێ بووترێ تیلاوەمان بە

قورئان مەخلوقە، ئەمە مەبەستی عمومیەکەیە لە تەعلیقدانی لەسەر ئەم ریوایەتە وەک بە روونی دیارە.

ئێمەش چەند هەڵوەستەیەک ئەکەین لەسەر قسەکانی، بە یارمەتی الله بۆتانی روون ئەکەینەوە کە چۆن بە هێنانی ئەم ریوایەتە ماڵی خۆی وێران کرد

سەرەتا خاڵێکی لاوەکی باس ئەکەم، ئەڵێ ئیمام احمد بە اسحاقی مامی ووت!

ئەڵێین ئەم اسحاقە اسحاق بن حنبل نیە کە مامی ئیمام احمدە، بەڵکو اسحاق بن ابراهیم بن هانئ-ە کە یەکێکە لە هاوەڵە دیارەکانی ئیمام احمد و خاوەنی مسائل ابن هانئ-ە

دووەم خاڵ: کاتێک ئیمام احمد بە ئینکار کردنەوە بە اسحاق ئەڵێ: ئایا تیلاوەی جبریل بە قورئان مەخلوق بوو ؟! هەموو کەسێکی عاقڵ لەوە تێئەگات کە ئیمام احمد ئینکاری ئەم ووتەیە ئەکات واتا دژەکەی ئیسبات ئەکات، واتا ئەڵێ مەخلوق نیە، واتا تیلاوەی جبریل بە قورئان مەخلوق نیە، نەک مەبەستی ئەوە بێت نابێ بووترێ مەخلوقە و نابێ بووترێ غەیر مەخلوقە، چونکە ئەوەی دوو جەزائیریەکە باسی ئەکەن کە فعلی عەبد لەوکاتەدا نە مەخلوقە و نە غەیر مەخلوق ئەمە وڕێنە کردنە، هەر بۆیە ئیمام احمد هێندە ووتەی واقفەکان بە هیچ ئەزانێت کە ئەڵێن ناڵێین قورئان مەخلوقە و ناڵێین غەیر مەخلوقە، ئیمام احمد ئەڵێ هێشتا ئەوانەی ئەڵێن قورئان مەخلوقە بەڵگەیان بەهێزترە ئەگەرچی هیچ کامیان بەڵگەیان نیە، هەروەها

لە شوێنێکی تر ئەڵێ چۆن نازانێ ؟ یان ئەوەیە یان ئەمە، یان حەلالە یان حەرام، واتا یان مەخلوقە یان غەیر مەخلوق چۆن توقف ئەکات ؟!

خاڵی سێیەم: گەر عومومیەکان هەر ملهوری بکەن و بڵێن نەخێر ئیمام احمد کە بە ئینکار کردنەوە ئەڵێ ئایا تیلاوەی جبریل بە قورئان مەخلوقە ؟! ئەوا مەبەستی ئەوەیە ناووترێ مەخلوقە و ناووترێ غەیر مەخلوقە، مەبەستی ئەوە نیە غەیر مەخلوقە واتا ئیسباتی دژەکەی ناکات.

ئەوا ئەڵێین زۆر باشە با بچینە سەر ریوایەتە ئەسلەکە بزانین ئیمام احمد مەبەستی چیە.

الخلال ئەم ووتەیەی ئیمام احمدی لە ڕێگای کام قوتابی ئیمام احمد ریوایەت کردووە ؟ لە ڕێگای ابن هانئ ریوایەتی کردووە کە ناوی اسحاقە هەروەک لە ریوایەتەکە هاتووە، ئەم ریوایەتە لە مسائل ابن هانئ هاتووە کە ریوایەتە ئەسلەکەیە، با بزانین ریوایەتەک ئەسلەکەیە چۆن هاتووە

قال **ابن هانئ**:

سمعت أبا عبدالله يقول: من زعم أن لفظي بالقرآن مخلوق فهو جهمي.

وقال: أرأيت حيث جاء جبريل إلى النبي صلى الله عليه وسلم فتلا عليه القرآن، فتلاوة جبريل على النبي صلى الله عليه وسلم بالقرآن أكان مخلوقا ؟! ما هو بمخلوق.

## ابن هانئ ئەڵێ:

بیستم باوکی عبدالله ئەیووت: هەر کەسێک پێی وابێت لەفزی بە قورئان مەخلوقە ئەوا جەهمیە.

وە ووتی: ئایا جبریل علیه السلام کاتێک هات بۆلای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم قورئانی بەسەردا خوێندەوە، ئایا تیلاوەی جبریل بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم مەخلوق بوو ؟! مەخلوق نیە.

**(مسائل ابن هانئ : ١٨٥٣-١٨٥٤)**

سەیرکەن ئەمە ریوایەتە ئەسلەکەیە کە ابن هانئ لە مسائلەکانی هێناویەتی، ئیمام احمد ئەڵێ: ئایا تیلاوەی جبریل بە قورئان مەخلوق بوو ؟! نەخێر مەخلوق نەبوو.

واتا تیلاوەی جبریلی بە غەیر مەخلوق وەسف کرد، بەمەش مەڕی کابرای جەزائیری کلکی کەوتە ژێر قاچمان هیچ مەجالی جوڵەی نەما، هەرچەند باعە باعیش بکات شوانە جەزائیریە ئەحمەقەکەی شێخی فریای ناکەوێت لەم گێژاوەدا ڕزگاری بکات.

بۆ تەئکید کردنەوە لەسەر ئەم ریوایەتە ابن بطة-ش هەمان ریوایەتی هێناوە لە ڕێگای ابن هانئ کە ئیمام احمد ئەڵێ: (ما هو بمخلوق) واتا تیلاوەی جبریل مەخلوق نیە.

**بڕوانە (الإبانة الكبرى : ٢٢٥٢)**

کەواتە ئیمام احمد ئەڵێ تیلاوەی جبریل بە قورئان مەخلوق نیە، وە کاتێک الخلال (ما هو بمخلوق) ناهێنێت لەبەر ئەوەیە کە خودی ووتەکەی ئیمام احمد روونە کە بە ئینکار کردنەوە ئەڵێ ئایا تیلاوەی جبریل بە قورئان مەخلوق بوو ؟! واتا نەخێر مەخلوق نیە، بۆیە الخلال ووتەکەی کۆتایی ناهێنێت کە تەئکید کردنەوەیە بۆ ماناکەی پێشوو، چونکە تەنها بە ئینکار کردنەکە زانرا کە ئیمام احمد تیلاوەی جبریل بە قورئان بە غەیر مەخلوق وەسف ئەکات.

جا عمومیەکە استدلال بەم ریوایەتە ئەکات پێی وایە گەر بڵێی فعلی عەبد مەخلوقە لەکاتی قورئان خوێندن ئەوا لەفزیت و جەهمیت، پێی وایە لەفزییەکان کە باسی تیلاوە و لەفزیان ئەکرد مەبەستیان فعلی عەبد بوو نەک قورئانەکە.

دەی ئەوەتا ئیمام احمد لە رەددی لەفزییەکاندا نەفی ئەوە ئەکات کە تیلاوەی جبریل مەخلوق بێت، وە ئەڵێ تیلاوەی جبریل مەخلوق نیە.

جا ئێستا لێیان ئەپرسین ئیمام احمد مەبەستی لە تیلاوەی جبریل چیە ؟ مەبەستی قورئانەکەیە ؟ یان مەبەستی فعلی جبریلە ؟

گەر ئەڵێن مەبەستی فعلی جبریلە، ئەوا ئیمام احمد ووتی تیلاوەی جبریل مەخلوق نیە، ئایا ئیمام احمد پێی وایە فعلی جبریل و فعلی ئێمەش کاتێک قورئان ئەخوێنین غەیر مەخلوقە ؟!!! ئەوکات ئیمام احمدتان کردووە بە مبتدع بەڵکو ووتەکەی کوفرە

گەر ئەڵێن نەخێر مەبەستی لە تیلاوەی جبریل خودی قورئانەکەیە نەک فعلی جبریل، ئەوا ئەوکات ئەڵێین بەڵێ وایە، ئەم وەڵامەی ئیمام احمد ڕەددە بۆ ئێوە و بۆ لەفزییەکانیش چونکە ئێوە پێتان وایە لەفزییەکان تەنها ئەیان ووت فعلی عەبدەکە مەخلوقە قورئان مەخلوق نیە، کەواتە بۆچی ئیمام احمد لە ڕەددی ئەواندا ئەڵێ تیلاوەی جبریل مەخلوق نیە ؟ لەکاتێکدا بە یەقینەوە ئەزانین کە ئیمام احمد بەرییە لەوەی کە بڵێ فعلی جبریل مەخلوق نیە، کەواتە روون بوویەوە لەفزییەکان کە ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان و تیلاوەمان بە قورئان مەخلوقە مەبەستیان مەخلوقی قورئان بوو نەک مەخلوقی فعلی عەبد، بۆیە ئیمام احمد لە رەددی لەفزییەکان ووتی تیلاوەی جبریل بە قورئان مەخلوق نیە، وە لە چەندین ریوایەتی تردا ئەڵێ لەفزییەکان پێیان وایە جبریل بە شتێکی مەخلوق هاتووە، ناڵێ پێیان وایە فعلی جبریل مەخلوقە، کەواتە روونە مەبەستی لەفزییەکان قورئان بوو نەک فعلی عەبد، بۆیە دوو جەزائیریەکە و جەماعەتەکەیان هیچ چارێکیان نیە لە ریوایەتەکەی ابن هانئ یان ئەبێ بڵێن لەفزییەکان کە ئەیان ووت تیلاوەمان بە قورئان مەخلوقە مەبەستیان مەخلوقی قورئان بوو، ئەوکات هاتوونەتە سەر قسەی ئێمە، وەیان ئەبێ بڵێن مەبەستیان لە تیلاوە فعلی عەبد بوو، ئەوکات ئەبێ ئیمام احمد تەبدیع بکەن چونکە ووتی تیلاوەی جبریل مەخلوق نیە.

----------------------------

ماویەتی

# بەشێک

## لە تەئویلی ئەشعەرییەکانەوە بۆ تەئویلی باطنیە زندیقەکان و مولحیدەکان

عومومیە بەچکە جەزائیریەکە پێشتر هەر ووتەیەکی ئەهلی سوننەم ئەهێنا لە دژی ڕێک وەک ئەشعەرییە کافرەکان تەئویلی ئەکرد و مانای ووتەکەی بەلایەکی تردا ئەبرد، بەڵام ئەمجارە هێندە بێ شەرم و ڕوو قایم بووە وەک یونس ڕاوی و مەریوان هەڵەبجەیی مولحید بە ئاشکرا تەئویلی ووتەکان ئەکات، هەرکات لە بەرژەوەندی خۆی بێت بەلایەک ئەیبات، کە زانی لە بەرژەوەندی خۆی نیە بە لایەکی تریدا ئەبات، کە ئەم جۆرە تەئویل و چەواشە کردنەم لە جەهمی و ئەشعەرییە زندیقەکانیش کەم بینیوە، زیاتر مولحیدەکانی ئەم سەردەمە ئەم جۆرە کارانە ئەکەن.

پۆستێکی کرد ئەم ووتەیەی ئیمام احمدی دانابوو کە ابن هانئ ریوایەتی کردووە لە ڕەددی لەفزییەکان ئەڵێ:

سمعت أبا عبد الله يقول: من زعم أن لفظي بالقرآن مخلوق فهو جهمي.

وقال: أرأيت حيث جاء جبريل إلى النبي صلى الله عليه وسلم فتلا عليه القرآن، فتلاوة جبريل على النبي صلى الله عليه وسلم بالقرآن أكان مخلوقا ؟!

**(السنة للخلال : ٢٠٩٠)**

عمومیەكە ووتی لەفزییەكان ووتیان تیلاوە مەخلوقە، ئیمام احمد ئینكاری لێكردن ووتی تیلاوەی جبریل بە قورئان مەخلوق بوو ؟! (فتلاوة جبريل على النبي صلى الله عليه وسلم بالقرآن أكان مخلوقا ؟!)

وە عمومیەكە لێرەدا تیلاوە بە فعلی جبریل هەژمار ئەكات، واتا لەفزییەكان كە ئەیان ووت تیلاوە مەخلوقە واتا فعلی ئێمە مەخلوقە، ئیمام احمدیش كە بە ئینكار كردنەوە ئەڵێ ئایا تیلاوەی جبریل بە قورئان مەخلوق بوو ؟! واتا نابێ بووترێ فعلی ئێمە مەخلوقە یان مەخلوق نیە لەكاتی قورئان خوێندنەوە

ئەمەش دەقی ووتەی عمومیەكە كە لەسەر ئەم ریوایەتە قسە ئەكات وەكو خۆی دووبارە دای ئەنێمەوە لە نێوان دوو كەوانە

(وە ئەگەر ئینكاریان كرد ئەم زندیقانە كە لفظیەكان مەبەستیان قورئانەكە بوە

ئەوە ئەو قەولەی ئیمام ئەحمەدیان بۆ دابنێن كە لەڕەسمەكەدا دەم ناوە كە ئیمام ئەحمەد ئینكاری ئەوە ئەكات بگوترێت تلاوەی جبریل بۆ قورئان مەخلوقە

وەوەكو الزام ڕەدی لفظیەكانی پێ ئەداتەوە

وە باس باسی وەسف کردنی تلاوەیە بە مەخلوق نەک قورئانەکە بۆیە با کوێر بن زندیقەکان بەم ئاثارانە بڕوانە چۆن ئیمام ئەحمەد بە ئینکاریەوە دەفەرموێت :

أرأيت حيث جاء جبريل الى النبي فتلا عليه القرآن فتلاوة جبريل على النبي بالقرآن أكان مخلوقا؟

واتا ئیمام احمد لە اسحاق ی مامی ئەپرسێت بە ئینکاریەوە و دەڵێت :سەیرکە ئایا کاتێک جبریل هات بۆلای محمد ﷺ وەقورئانی خوێندەوە بەسەریدا ئایا خوێندنەوەی قورئانەکە لەلایەن جبریلەوە بەسەر محمددا

ﷺ مەخلوق بوە ؟!

لێرەدا باسی تلاوەکەیە کە ئایا بە مەخلوق وەسف ئەکرێت کە زندیقەکانی ئێستا ئەڵێن بەڵێ تلاوە بریتی نیە لە متلو بۆیە تلاوە مەخلوقە بەڵام ئیمام احمد ئینکاری لەوە دەکات کە وا بگوترێت وەئێمە لەسەر ڕێبازی ئیمام احمدین نەکە لەسەر ڕێبازی بەعر و بەعیر).

سەیرکەن ئەڵێ: لێرەدا باس باسی تیلاوەیە ئایا بە مەخلوق وەسف ئەکرێ ؟ واتا ئیمام احمد باسی تیلاوە ئەکات و ئینکاری ئەکات کە بە مەخلوق وەسف بکرێ، بە ئینکار کردنەوە ئەڵێ (أكان مخلوقا) ؟! واتا نابێ بووترێ مەخلوقە

کە منیش هاتم ریوایەتە ئەسلیەکەم هێنا لە مسائل ابن هانئ، ئیمام احمد ئەڵێ: أكان مخلوقا ؟! ما هو مخلوق.

ئەڵێ ئایا تیلاوەی جبریل بە قورئان مەخلوق بوو ؟ نەخێر مەخلوق نەبوو

عمومیەکە کاتێک زانی ریوایەتەکە لە دژی خۆیەتی هات چەواشە کارییەکی زۆر گەورەتر لە هی پێشووی کرد، جەهلی خۆی بە زمانی عەرەبی هەروەها درۆ و چەواشەی خۆی دەرخست

هات ووتی: (ما هو بمخلوق) موزەکەرە، تیلاوە موئەنەسە، نابێ زەمیری موزەکەر بۆ موئەنەس بەکاربێت، گەر باسەکە باسی تیلاوە بێت ئەوا ئەیووت (ما هي بمخلوقة).

ئەڵێین باشە عمومی بێ شەرم خۆ تۆ خۆت لە پۆستی یەکەم کاتێک ئیمام احمد ووتی: (تلاوة جبريل على النبي صلى الله عليه وسلم بالقرآن أكان مخلوقا ؟!) ووتت باس باسی تیلاوەیە، ئیمام احمد ئینکاری ئەکات کە بووترێ تیلاوە مەخلوقە، بە ئینکار کردنەوە بە اسحاقی مامی ئەڵێ ئایا تیلاوەی جبریل بە قورئان مەخلوق بوو ؟!

نازانم چۆن ئینسانێک لەم ئاستە دابێت لە عیلم و لە فەهم جورئەت ئەکات ئاوا زمانی درێژ بێت و خەڵک تەکفیر بکات و باسی زمانی عەرەبی بکات؟!

باشە ئەی (أكان مخلوقا) چیە ؟ موزەکەرە یان موئەنەسە ؟ خۆ مەعلومە موزەکەرە، نەیووت (أكانت مخلوقة) ئەی بۆ لێرەدا بەلاتەوە ئاساییە کە موزەکەر بۆ تیلاوە بەکار بێت ؟! بۆ لێرەدا نەت ووت (أكان مخلوقا) موزەکەرە مەبەست پێی تیلاوە نیە چونکە

تیلاوە موئەنەسە ؟! ووتت باسەکە باسی تیلاوەیە ئیمام احمد ئەڵێ (أكان مخلوقا) ئینکاری لەوە ئەکات کە بووترێ تیلاوە مەخلوقە!!!

والله هیچ جەهمیەکی زندیقیشم نەدیوە هێندەی تۆ بێ شەرم و ڕوو قایم بێت، لەیەک ریوایەتدا دوو رستەی بەدوای یەکتر هاتوون، هەردووکیان بە سیغەی موزەکەر هاتوون، ئەڵێ موزەکەرەکەی یەکەم باسی تیلاوە ئەکات چونکە لێرەدا خزمەت بە عەقیدەکەی خۆی ئەکات کێشەی نیە، بەڵام موزەکەرەکەی دووەم کە هەر باسی هەمان بابەتە، ئەڵێ نابێ موزەکەر بۆ تیلاوە بەکاربێت!!!

بەڕاستی هێندە درۆزن و چەواشە کارێکی پیسی خەفەت ئەخۆم کە کاتت پێ سەرف ئەکەم، بەڵام ئەمەوێ تۆزێک خەڵکە خەوتووەکەی دەوروبەرت بە ئاگا بهێنمەوە کە هێندە جاهیلن بە زمانی عەرەبی بە دوو ئیعراب کردن چەواشەیان ئەکەی وائەزانن زۆر بلیمەتی!

فتلاوة جبريل على النبي صلى الله عليه وسلم بالقرآن (أكان مخلوقا ؟!) (ما هو بمخلوق).

والله ڕووێکی زۆر قایمی ئەوێت بڵێی: (أكان مخلوقا) کە موزەکەرە مەبەست پێی تیلاوەیە، بەڵام (ما هو بمخلوق) کە ئەویش هەر موزەکەرە مەبەست پێی تیلاوە نیە چونکە تیلاوە موئەنەسە!!!

بۆ ئەو موزەکەر ئاساییە بۆ مؤنث بەکاربێت کاتێک ووتەکە خزمەت بە چەواشەکانی ئەکات، بەڵام من هەر لە هەمان سیاقدا و هەمان بابەت بۆم نیە بڵێم موزەکەرەکە

مەبەست پێی تیلاوەیە، چونکە ووتەکە خزمەت بە چەواشەکەی ناکات و ڕوونی ئەکاتەوە کە لەفزییەکانیش و ئیمام احمدیش مەبەستیان لە تیلاوە قورئانەکە بووە نەک فعلی جبریل.

ئینجا ووڕێنەکەی کە هەمیشە دووبارەی ئەکەنەوە ئەڵێن فعلی عەبد لەو کاتەدا نە مەخلوقە نە غەیر مەخلوق، کە تەحەدداى ئەکەم یەک زانا بهێنێت ئەم قسەیەی کردبێت، ئەیەوێ ووتەکەی ئیمام احمد بۆ ووڕێنەکەی خۆی بەکار بهێنێت کە لە شوانەکەی خۆی وەری گرتووە، ئەڵێ ئیمام احمد کە ووتی (أكان مخلوقا ؟!) باسەکە باسی تیلاوەیەی جبریلە، ئیمام احمد ئینکاری کرد بووترێ تیلاوە مەخلوقە، واتا تیلاوە کە فعلی جبریلە نەئەووترێ مەخلوقە و نە ئەووترێ غەیر مەخلوقە، بەم جۆرە ووتەکەی ئیمام احمد بۆ عەقیدە گڵاوەکەی بەکار ئەهێنێت.

کاتێک هاتم پەردەم لەسەر ئەم چەواشە کارییەی لادا، ووتم الخلال ریوایەتەکەی بە کورتی هێناوە، ئەسلی ریوایەتەکە لای ابن هانئ-ە لە مسائلەکانی هێناویەتی کە الخلال و ابن بطة هەر لە ڕێگای ابن هانئ ریوایەتیان کردووە، ئیمام احمد مەبەستی لە (أكان مخلوقا) ئەوەیە کە مەخلوق نیە، واتا ئیسباتی دژەکەی ئەکات بۆیە الخلال اکتفای کردووە بە ئینکار کردنەکە، وە رستەی دواتر کە ابن هانئ هێناویەتی تەواو پشتی ئەشکێنێ کە ئیمام احمد ئەڵێ (أكان مخلوقا ؟! ما هو بمخلوق)

ووتم ئەوەتا مەبەستە گڵاوەکەی تۆی نیە کە بڵێ تیلاوەی جبریل نە مەخلوقە و نە غەیر مەخلوق، بەڵکو ئەڵێ مەخلوق نیە

عومیەکە جاهیلەکە بە عەقیدە و بە زمان کە زانی مەجالی هیچی نەماوە ئەمجارە هات قسەیەکی کرد بێ شەرمانەتر بوو لە ووتەی پێشووی، ووتی: ئیمام احمد کە ئەڵێ (أكان مخلوقا ؟! ما هو بمخلوق) (ئایا مەخلوق بوو ؟! نەخێر مەخلوق نەبوو).

أكان مخلوقا ؟! مەبەست پێی تیلاوەی جبریلە واتا فعلی جبریل کە قورئانەکە ئەخوێنێتەوە، کە مباشر لەدوای ئەو ڕێک ئەڵێ (ما هو بمخلوق) ئەمەیان مەبەست پێی تیلاوەی جبریل نیە بەڵکو مەبەستی قورئانەکەیە!!!!! چونکە موزەکەر بۆ تیلاوە بەکارنایەت!!!! لە کاتێکدا (أكان مخلوقا) موزەکەر بوو هەر خۆی ووتی مەبەست پێی تیلاوەیە!!!!

والله نازانم چۆن لە ڕووت هاتووە ئەم شتانە بنوسیت! وە گومانم وایە لە دڵی خۆتدا ئەزانی درۆ ئەکەیت و چەواشە ئەکەیت بەڵام ئێوەی عومی هێندە پیسن بە تایبەتی ئەوانەتان کە دەعوە ئەکەن بۆ بیدعەکانتان هێندە دڵ ڕەق و دڵ ڕەشن حەقیش ببینن هەرگیز ناگەڕێنەوە هەوڵ ئەدەن تەئویلی بکەن، شەرم لەخۆت ناکەیت ئەم کەلامە پڕوپوچە ئەدەیتە پاڵ ئیمام احمد؟! کە ئەمە لە کەلامی منداڵێک ناچێت کە تازە فێرە قسە کردن بووە، لە کەلامی شێتێک ناچێت کە قسەی هەڵیت و پەڵیت ئەکات، هەر لە ووڕێنەکانی خۆتان ئەچێت، ئاخر مرۆڤ تۆزێک عاقڵ بێت لە ڕووی دێت ئەئویلی هێندە بێ حەیا بکات ؟!

ئیمام احمد ئەڵێ: (تیلاوەی جبریل بە قورئان ئایا مەخلوق بوو ؟! نەخێر مەخلوق نەبوو)

کێ هەیە تۆزێک عەقل و حەیای هەبێت و ڕێزی خۆی بگرێت بتوانێ بڵێ: ڕستەی (نەخێر مەخلوق نەبوو) پەیوەندی بە رستەی پێش خۆی نیە کە ووتی (ئایا مەخلوق بوو) ؟!!!

هێندە بێ حەیا بیت کاتێک ریوایەتی ابن هانئ درۆکەت سپی ئەکاتەوە دووبارە دەست ئەکەیتەوە بە تەئویلێکی تری بێ شەرمانە! ئەڵێ رستەی (ئایا مەخلوق بوو) باسی تیلاوە ئەکات کە فعلی جبریلە، بەڵام رستەی (نەخێر مەخلوق نەبوو) باسی قورئان ئەکات تەواوکەری قسەی پێشوو نیە واتا باسی تیلاوە ناکات!!!

والله لە جەهمیە زندیقەکانیش تەئویلی ئاوا بێ حەیام نەدیوە، مەگەر یونس راوی و مەریوان هەڵەبجەیی مولحید جورئەت بکەن ئەم جۆرە قسانە بکەن، (ئایا مەخلوق بوو ؟! نەخێر مەخلوق نەبوو) ئەڵێ رستەی دووەم وەڵام نیە بۆ رستەی یەکەم، رستەی یەکەم باسی تیلاوەی جبریل ئەکات، رستەی دووەم باسی قورئان ئەکات!!! لەبڕی تۆ شەرم لەخۆم ئەکەم کە ئەم قسانە هەڵیت و پەڵیتانەت

نەقل ئەکەم، گومانم وایە لە دڵی خۆتدا ئەزانی چەواشە ئەکەیت کاتێک رستەی دووەم و یەکەم لەیەکتر دائەبڕی و ئەڵێی باسی دوو شتی جیا ئەکات، وە ئەگەر هەر سووری لەسەر ئەم قسەیەت ئامادەم موباهەلەت لەگەڵ بکەم لەعنەتی الله م لێبێت گەر رستەی (ما هو بمخلوق) باسی هەر هەمان شتی پێش خۆی نەکات کە رستەی (أكان مخلوقا) بوو، گەر تۆش زۆر بلیمەتی لە عەرەبی و ئێمە جاهیلین فەرموو بڵێ: لەعنەتی الله م لێبێت گەر (أكان مخلوقا) و (ما هو بمخلوق) هەردووکیان باسی هەمان شت بکەن

ئاخر داماو گەر ئەڵێی (ما هو بمخلوق) موزەکەرە بۆ تیلاوە نابێت کە موئەنەسە، ئێ خۆ (أكان مخلوقا) هەر موزەکەر بوو ئەی بۆ لەوێدا ئاساییە بۆ تیلاوە بێت ؟!

گەر ئەڵێن ئەی باشە تیلاوە موئەنەسە چۆن زەمیری موزەکەر بۆی بەکاردێت ؟ بۆ ووترا (أكان مخلوقا ؟! ما هو بمخلوق) بە موزەکەری ؟

ئەوا لە وەڵامدا ئەڵێین ئەم ئُسلوبە باوە لە زمانی عەرەبیدا لە چەندین باردا موئەنەس ئەکرێ بە موزەکەر، وە موزەکەر ئەکرێ بە موئەنەس، ئەمە خۆ بیرکاری نیە بووترێ ١+١=٢ تاکو قیامەت، یەکێک لەو حاڵەتانەش کە موزەکەر ئەکرێ بە موئەنەس و موئەنەس ئەکرێ بە موزەکەر حیساب کردنە بۆ مانای ووشەکە، ووشەکە خۆی موئەنەسە بەڵام لە ڕستەکەدا مانای شتێکی تر ئەدات کە موزەکەرە، جا زەمیری موزەکەری بۆ بەکاردێت بە اعتبار دانان بۆ ماناکەی ئەگەرچی خودی ووشەکە موئەنەس بێت، وە بە پێچەوانەش، نموونەی ئەمەش لە قورئان و غەیری قورئانیش زۆرە.

بۆ نموونە:

﴿لِّنُحۡـِۧيَ بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗا﴾

بلدة: موئەنەسە

میتا: موزەکەرە

نەیفەرموو: میتة، هەندێک لە موفەسیرین و زمانزانان ئەڵێن: بلدة مەبەست پێی شوێنەکەیە، واتا المكان، مکان-یش موزەکەرە بۆیە (میتا) بە موزەکەر هاتووە، واتا حیساب بۆ مانای ووشەکە کراوە نەک لەفزەکەی

**الطبري** ئەڵێ:

وقال: ﴿بَلْدَةً مَيْتًا﴾ ولم يقل ميتة، لأنه أريد بذلك لنحيي به موضعًا ومكانًا ميتًا.

نموونەیەکی تر:

﴿فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّى﴾

الشمس: موئەنەسە، بە (هذا) ئیشارەتی بۆ کراوە کە بۆ موزەکەر بەکاردێت

هەندێک لە موفەسیرین و زمانزانان لەم ئایەتەدا چەند وەجهێک باس ئەکەن، یەکێکیان ئەوەیە کە الشمس واتا خۆر بریتیە لە رووناکی و نور، بەهۆی ماناکەیەوە (هذا) بەکارهاتووە چونکە النور والضياء موزەکەرن.

**ابن الأنباري** ئەڵێ:

(فلما رأى الشمس بازغة قال: هذا ربي)

فقال: الشمس مؤنثة أشار إليها بالتذكير، ولم يشر بالتأنيث، فيقول: هذه ربي، لأن المعنى: قال: هذا النور ربي، وهذا الضياء ربي، فلما ذكر الشمس وهي مؤنثة، وأشار إليها بالتذكير على معنى النور.

نموونەی لەم جۆرە لە قورئاندا زۆرە، هێنانی هەر نموونەیەکیش مانای ئەوە نیە هەموو زانایان موافقن بەم جۆرە ئایەتەکە تەفسیر بکرێ، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە کە ئەم جۆرە ئسلوبە هەیە لە زمانی عەرەبیدا بۆیە لەو ئایەتانەی کە مشکل-ن هەندێک لە موفەسیرین ئەم ڕێگایە ئەگرنە بەر، وە کەسیش ڕەددی نەداونەتەوە کە بڵێن ئەم شتە نیە لە زمانی عەرەبیدا، بەڵام لەلای عمومیە چەپەڵەکە ئەم شتانە بۆتە مەحاڵ بەهۆی جەهلی بە زمانی عەرەبیەوە.

**ابن الأنباري** ئەڵێ:

سئل المبرّد بحضرة إسماعيل بن إسحاق القاضي عن ألف مسألة هذه من جملتها، وهو أن السائل قال: ما الفرق بين قوله: جاءَتْها رِيحٌ عاصِفٌ ولِسُلَيْمانَ الرِّيحَ عاصِفَةً وقوله: كَأَنَّهُمْ أَعْجازُ نَخْلٍ خاوِيَةٍ وكَأَنَّهُمْ أَعْجازُ نَخْلٍ مُنْقَعِرٍ؟ فقال: كل ما ورد عليك من هذا الباب فلك أن تردّه إلى اللفظ تذكيرا، ولك أن ترده إلى المعنى تأنيثا.

پرسیار لە المبرد ئەکەن بۆچی ریح بە (عاصف) و بە (عاصفة) هاتووە، جارێک مذکر و جارێک مؤنث ؟ یان نخل جارێک بە (خاوية) هاتووە مؤنث، وە جارێک بە (منقعر) هاتووە مذکر ؟

لە وەڵامدا ئەڵێ:

هەر شتێکی لەم جۆرەت هاتە پێش ئەوا بۆت هەیە بیکەیت بە موزەکەر حەسەب لەفزی ووشەکە، وە بۆت هەیە بیکەیت بە موئەنەس حەسەب مانای ووشەکە.

لێرەدا مەبەست خودی ئەم نموونانە نیە، مەبەستم ئەم ئسلوبەیە کە لە زمانی عەرەبیدا هەیە.

وە بابەتەکەی ئێمەش کە تیلاوەی قورئانە، لە فەرموودە و ووتەی زانایاندا تیلاوە و قیرائە بە مانای خودی قورئانەکە هاتوون لە هەندێک جێگادا، وە بە مانای خوێندنەوەش هاتوون واتا فعلی عەبدەکە لە هەندێک جێگادا، هیچ زانایەک نەهاتووە بڵێ تیلاوە واتا فعلی عەبد، یان بڵێ تیلاوە واتا قورئان، بەڵکو ئەم ووشانە ئەوکاتە بە هەستیار دانراون و حیساب بۆ بەکار هاتنیان کراوە کاتێک کە لەفزیەکان پەیدابوون کە ئەم ووشانەیان بەکار ئەهێنا و مەبەستیان پێی ئەوەبوو قورئان بە خوێندنەوەی ئێمە ئەبێتە مەخلوق.

عَنْ عَلِيٍّ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نَهَانِي عَنْ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ، وَأَنَا رَاكِعٌ.

**ئیمام علي** رضي الله عنه ئەڵێ: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەهی لێکردم قورئان بخوێنم لە ركوعدا.

لێرەدا قراءة القرآن فعلی عەبدە، کە نەهی لێکراوە واتا فعلە چونکە نەهی لە شتێک ئەکرێ کە ئەتەوێ ئەنجامی بدەیت

کاتێک معاوية بن الحكم السلمي رضي الله عنه لەناو نوێژدا قسە ئەکات، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی ئەفەرمووێ:

إِنَّ هَذِهِ الصَّلَاةَ لَا يَصْلُحُ فِيهَا شَيْءٌ مِنْ كَلَامِ النَّاسِ، إِنَّمَا هُوَ التَّسْبِيحُ وَالتَّكْبِيرُ وَقِرَاءَةُ الْقُرْآنِ.

نوێژەکانمان نابێت هیچ شتێک لە قسەی خەڵکی تێدا بێت، بەڵکو تەنها تەسبیح و تەکبیر و قیرائەی قورئانە.

لێرەدا مەبەست لە تەسبیح و تەکبیر و قیرائەی قورئان ووتنی زیکرەکانی ناو نوێژ و قورئانی ناو نوێژە، نەک مەبەستی فعلی عەبدەکە بێت کە ئەمانە ئەکات، ووتەکانیشی بەرامبەر کەلامی مرۆڤە، واتا نابێت کەلامی مرۆڤ لەنوێژدا هەبێت بەڵکو تەنها کەلامی الله یە، هەر بۆیەش ئیمام احمد بەم فەرموودەیە رەددی لەفزیەکانی ئەدایەوە، گەر لەفزیەکان بڵێن کەلامی ناو نوێژ غەیر مەخلوقە تەنها فعلەکەمان مەخلوقە لە دەم جوڵاندن، ئەوکات ئەم فەرموودەیە چۆن ئەبێتە رەد بۆیان کە باسی ئەوە ئەکات نابێ قورئان قسەی خەڵکی تێدا بێت ؟! ئیمام احمد لە رەددی ئەواندا لە

بارەی ئەم فەرموودەیە ئەیووت: گەر قسەی لەفزیەکان بێت ئەوا نوێژ بە خوێندنی قورئان دروست نابێت چونکە نوێژ بە شتێکی مەخلوق دروست نابێت

﴿أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيۡلِ وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودًا﴾

قرآن الفجر: واتا نوێژی بەیانی

هەندێک لە موفەسیرین (قرآن الفجر) بە قیرائەتی قورئان لە نوێژی بەیانی تەفسیر ئەکەن

هەروەک شاعیریش لە وەسفی ئیمام عثمان رضي الله عنه ئەڵێ:

ضحوا بأشمط عنوان السجود به

يقطع الليل تسبيحا وقرآنا

(أي: تسبيحا وقراءة)

قرآن لێرەدا واتا قیرائەت

**ابو عبید القاسم بن سلام** ئەڵێ:

يقال:" قرأت قراءة وقرآنا، بمعنى واحد.

واتا: قرأت قراءة، وقرأت قرآنا، هەردووکیان یەک مانایە

کەواتە ووشەی قیرائە و تیلاوە ووشەیەک نیە یەک مانای جێگیری هەبێت بووترێ تەنها بە مانای قورئانەکە دێت، یان تەنها بە مانای فعل دێت، بەڵکو زانایان حەسەب دروست بوونی فرقەکان و بیدعەکانیان حوکمیان لەسەر ئەم ووشانە داوە

هەروەها لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان لە ڕەددی لەفزییە مەخلوقیەکاندا هەمیشە ئەڵێن: (التلاوة هي المتلو) تیلاوە مەتلوە.

ئایا گەر لەفزییە مەخلوقیەکان مەبەستیان لە تیلاوە فعلی عەبد بێت نەک قورئانەکە، ئەوا چۆن لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان ئەڵێن تیلاوە مەتلوە ؟! ئەچێتە عەقڵەوە بڵێن فعلی عەبدەکە قورئانە ؟! بۆیە بێگومان لەفزییە مەخلوقیەکان مەبەستیان لە تیلاوە قورئانەکە بوو، بۆیە ئەوانیش ئەیان ووت تیلاوە مەتلوە و غەیر مەخلوقە.

ئیمام احمدیش باش لە ووتەکەیان تێگەیشتووە بۆیە بەم جۆرە لە ڕیوایەتەکەی ابن هانئ ڕەدیان ئەداتەوە، ئەزانێ ئەوان کە ئەڵێن تیلاوەم بۆ قورئان مەخلوقە مەبەستیان خودی قورئانەکە، بۆیە بە زەمیری موزەکەر باسی ئەکات و ئەڵێ مەخلوق

نیه، نەک بڵێین ئیمام احمد لەفزیەکی غەیر مەخلوقی بووە حاشا لە ئەو، وە ووتەکەشی لە پێگەی ڕەددانەوەی بەرامبەر بووە کە قورئانیان بە مەخلوق زانیوە بەم عیبارەتە دەریان بڕیوە.

ریوایەتێکی هاوشێوەی ئەمەش هەیە ڕوونی ئەکاتەوە کە ئیمام احمد مەبەستی خودی قورئانەکە بووە کە جبریل ئەیخوێنێ نەک فعلی جبریل، وە لەفزییەکانیش مەبەستیان هەر خودی قورئانەکە بووە نەک فعلی جبریل

قال أبو إسحاق الهاشمي:

سألت أبا عبد الله أحمد بن حنبل، فقلت: إذا قالوا لنا: القرآن بألفاظنا مخلوق، نقول لهم: ليس هو بمخلوق بألفاظنا أو نسكت؟ فقال: " اسمع ما أقول لك: القرآن في جميع الوجوه ليس بمخلوق " ثم قال أبو عبد الله: «جبريل حين قاله للنبي صلى الله عليه وسلم كان منه مخلوقا؟ والنبي حين قاله كان منه مخلوقا؟ هذا من أخبث قول وأشره» ثم قال أبو عبد الله: «بلغني عن جهم أنه قال بهذا في بدء أمره».

ابو اسحاق الهاشمي ئەڵێ:

پرسیارم کرد لە باوکی عبداللە احمد بن حنبل، ووتم: گەر پێیان ووتین: قورئان بە لەفزمان مەخلوقە، ئایا پێیان ئەڵێین: قورئان بە لەفزمان مەخلوق نیە، یان بێ دەنگ ئەبین ؟

ووتی: گوێ بگرە چیت پێ ئەڵێم، قورئان لە هەموو رووێکەوە غەیر مەخلوقە.

ابو اسحاق ئەڵێ: پاشان باوکی عبدالله ووتی: جبریل کاتێک قورئانی ووت بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئایا قورئان لە جبریلەوە مەخلوق بوو ؟! وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کاتێک قورئانی ووت ئایا قورئان لە پێغەمبەرەوە مەخلوق بوو ؟! ئەمە لە پیسترین و خراپترین ووتەکانە.

ابو اسحاق ئەڵێ: پاشان باوکی عبدالله ووتی: پێم گەیشتووە لە جەهمەوە کە لە سەرەتادا ئەمەی ئەووت.

**(الإبانة الكبرى لابن بطة : ٢٢٥٠)**

سەیرکەن ووتەکانی ئیمام احمد وەک ریوایەتەکەی ابن هانئ وایە کاتێک لەم ریوایەتە ئەڵێ: (جبريل حين قاله للنبي صلى الله عليه وسلم كان منه مخلوقا ؟!)

جبریل کاتێک قورئانی بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ووت، ئایا قورئانەکە لە جبریلەوە مەخلوق بوو ؟

ڕێک هەمان مانای ریوایەتەکەی ابن هانئ (فتلاوة جبريل على النبي صلى الله عليه وسلم بالقرآن أكان مخلوقا ؟! ما هو بمخلوق)

لە هەردووک ریوایەتدا ئیمام احمد باسی قورئانەکە ئەکات کە جبریل خوێندوویەتی بەسەر رسول الله صلى الله عليه وسلم، نەک باسی فعلی جبریل بکات کە عومیەکە تیلاوەی جبریل بە فعلی جبریل حیساب ئەکات و ئەڵێ ئیمام احمد توقفی لێکردووە!!!

ئایا ئامادەیە بڵێ لە ریوایەتەکەی ابو اسحاق الهاشمي-ش توقفی کردووە کاتێک ئەڵێ (جبریل حین قاله للنبي صلی الله علیه وسلم کان منه مخلوقا ؟!) ووتی: کان منه مخلوقا ؟! نەیووت مەخلوقە یان مەخلوق نیە، تەنها ووتی ئایا قورئانەکە لە جبریلەوە مەخلوق بوو ؟! ئایا ئەمە ئینکار کردنەکە واتا نەخێر مەخلوق نەبوو، یان توقف کردنە ؟! الله خۆت و شێخەکەشت لەناو ببات، ئینجا ئەڵێ تۆ زندیقی تیلاوە جیا ئەکەیتەوە لە مەتلو، کەچی خۆی ئەڵێ ئیمام احمد توقفی کردووە لە تیلاوەی جبریل ناڵێ مەخلوقە و ناڵێ غەیر مەخلوقە، بەڵام قورئانەکە غەیر مەخلوقە! ئەی باشە تۆ خۆشت تیلاوە و مەتلوت لەیەکتر جیا نەکردەوە بەم قسەیەت ؟! توقفت نەکرد لە تیلاوە، وە مەتلوت بە غەیر مەخلوق وەسف نەکرد ؟!

ئینجا درۆ بە دەمم مەکە بڵێ ئەمە ئەڵێ تیلاوە مەخلوقە، لەعنەتم لێبێت گەر لەیەک پۆستدا ئەمەم ووتبێ، لەعنەت لەتۆ بێت گەر وام نەووتبێ، ئامین، تۆش بڵێ ئامین، گەر ئامینت نەکرد واتا خۆشت ئەزانی درۆت بە دەمم کردووە.

کۆمەڵێک بوهتانت داوەتە پاڵم لەم پۆستەی دواییت کە ئەوانیش هەر بە موباهەلە ڕەددت ئەدەمەوە لەگەڵ باقی بوهتانەکانی ترت.

# اللفظية (٣٨)



(لەفزم بە قورئان مەخلوقە) و (قورئان بە لەفزم مەخلوقە) هەردووک ووتە یەک مانا و یەک حوکمی هەیە لەلای سەلەف، واتا قورئان بە لەفزی ئێمە ئەبێتە مەخلوق

### ابو اسحاق الهاشمي ئەڵێ:

پرسیارم کرد لە باوکی عبدالله احمد بن حنبل، ووتم: گەر پێیان ووتین: قورئان بە لەفزمان مەخلوقە، ئایا پێیان ئەڵێین: قورئان بە لەفزمان مەخلوق نیە، یان بێ دەنگ ئەبین ؟ (إذا قالوا لنا: القرآن بألفاظنا مخلوق، نقول لهم: ليس هو بمخلوق بألفاظنا أو نسكت ؟)

ووتی: گوێ بگرە چیت پێ ئەڵێم، قورئان لە هەموو ڕوویەکەوە غەیر مەخلوقە.

ابو اسحاق ئەڵێ: پاشان باوکی عبدالله ووتی: جبريل کاتێک قورئانی ووت بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئایا قورئان لە جبریلەوە مەخلوق بوو ؟! وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کاتێک قورئانی ووت ئایا قورئان لە پێغەمبەرەوە مەخلوق بوو ؟! ئەمە لە پیسترین و خراپترین ووتەکانە.

ابو اسحاق ئەڵێ: پاشان باوکی عبدالله ووتی: پێم گەیشتووە لە جەهمەوە کە لە سەرەتادا ئەمەی ئەووت.

**(الإبانة الكبرى لابن بطة : ٢٢٥٠)**

سەیرکەن ابو اسحاق بە ئیمام احمد ئەڵێ: گەر لەفزییەکان ووتیان: (قورئان بە لەفزمان مەخلوقە) بڵێین مەخلوق نیە یان بێدەنگ بین ؟ ئیمام احمد بە ابو اسحاقی نەووت لەفزییەکان ناڵێن قورئان بە لەفزمان مەخلوقە، بەڵکو ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، واتا ووتنی قورئان بە لەفزمان مەخلوقە بە ووتەی لەفزییەکانی حیساب کرد و جیاوازی پێ نەکرد لەگەڵ ووتنی لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، چونکە هەردووک ووتەکە واتا قورئان بە لەفزی ئێمە ئەبێتە مەخلوق، بەڵام لەفزییەکان زیاتر لەفزمان بە قورئان مەخلوقەیان ئەووت چونکە ووتەکە شاراوە و فێڵاوییە بۆ چەواشە کردن و شاردنەوەی کوفرەکەیان باشترە.

**ابن تيمية** ئەڵێ:

بە دەستوخەتی القاضي أبي يعلى بینیم لەسەر پشتی کتێبی (العدة) نوسیبووی: نەقلم کردووە لە کۆتایی کتێبی (الرسالة)ی بوخاری دەربارەی ئەوەی کە قیرائە جیایە لە مەقروء، ابو عبدالله البخاري ووتی: احمد بن حنبل ووتی: لەفزی ئەو کەسەیە کە ئەڵێ: قورئان بە لەفزی ئێمە مەخلوقە.

**(مجموع الفتاوى : ٣٦٦/١٢)**

هەر لە هەمان نەقلدا ابو يعلى ئەڵێ: بوخاری لە کتێبەکەی وتوویەتی: لە ٢٢ رێگاوە ریوایەتی احمدم لەلایە کە هەموویان پێچەوانەی یەکترن، وە ئەوەی لەلام سەحیحە ئەوەیە کە احمد وتوویەتی: نەم بیستووە هیچ زانایەک بڵێ لەفزم بە قورئان غەیر مەخلوقە.

ئەوەی بوخاری بە سەحیحی داناوە ئەو ریوایەتەیە کە ابو طالب ووتی لەفزم بە قورئان غەیر مەخلوقە، ئیمام احمد پێی ووت: نەم بیستووە هیچ زانایەک وابڵێ

**ابن أبي يعلى** لە تەرجەمەی (الحسين بن علي أبو علي) ئەڵێ:

احمد السنجي لەگەڵ ئەوانەی باسکردووە کە بە ئیمامەکەمان (واتا ئیمام احمد) گەیشتووە و شتی لێ بیستووە، وە کتێبێکی هەیە دەربارەی سوننەت تێیدا باسی کردووە کە هەر کەسێک بڵێ: لەفزم بە قورئان مەخلوقە یان قورئان بە لەفزم مەخلوقە ئەوا جەهمیە، وە جەهمیەکان لەلای ئێمە کافرن، وە لەفزیەکان زندیقی ئەم ئوممەتەن، وە ئەوان لە هەمووان زیاتر شت لە خەڵک ئەشێوێنن و سەریان لێ تێک ئەدەن.

**(طبقات الحنابلة : ١٤٢/١)**

بڕوانە جیاوازی نەکرد لە نێوان ووتنی لەفزم بە قورئان مەخلوقە و قورئان بە لەفزم مەخلوقە، گەر ئەمە نەووترابێ و کەس مەبەستی نەبوو بێت ئەوا ناڵێ هەر کەس ئەمە بڵێ جەهمیە

أبو حاتم و أبو زرعة لە عەقیدەکەیاندا ئەڵێن:

هەر کەسێک بڵێ: لەفزم بە قورئان مەخلوقە یان قورئان بە لەفزم مەخلوقە ئەوا جەهمیە.

**(عقيدة الرازيين)**

علي بن خشرم المروزي ئەڵێ:

هەر کەسێک بڵێ: قورئان بە لەفزم یان لەفزم بە قورئان، یان قورئان بە قیرائەتی من یان قیرائەتی من بۆ قورئان، قورئانەکە پێش بخات یان دوابخات هەر یەک شتە، هیچ جیاوازیان نیە، وە پێی سەیر بوو ئەوەی جیاوازی بکات لە نێوان ئەم ووتانە.

**(شرح أصول اعتقاد للالكائي : ٥٩٠)**

محمد بن أسلم الطوسي ئەڵێ:

هەر کەسێک بڵێ: قورئان ئەبێتە مەخلوق بە لەفز، ئەوا پێی وایە قورئان مەخلوقە.

**(شرح أصول اعتقاد للالكائي : ٥٨٨)**

بڕوانن ووتەی لەفزیەکانی بەوە هەژمار کرد قورئان ئەبێتە مەخلوق بە لەفزمان

**ئیمام الشافعي** ئەڵێ:

هەر کەسێک بڵێ: لەفزم بە قورئان یان قورئان بە لەفزم مەخلوقە ئەوا جەهمیە.

**(شرح أصول اعتقاد للالكائي : ٥٩٩)**

**ابو عثمان الصابوني** ئەڵێ:

ئەوەی الطبري لە احمد-ی گێڕاوەتەوە کە لەفزییەکان جەهمین، ئەمە سەحیحە لە احمد-ەوە، وە احمد ئەمەی ووتوە چونکە جەهم و هاوەڵەکانی بە ئاشکرا ووتیان قورئان مەخلوقە، وە ئەوانەی ووتیان لەفزمان مەخلوقە بە قورئان بە پلەبەندی چوون بەرەو ووتنی: قورئان مەخلوقە، لە ئەهلی سوننە ترسان لەو سەردەمە بە ئاشکرا بڵێن قورئان مەخلوقە، جا باسی لەفزیان کرد مەبەستیان ئەوە بوو قورئان بە لەفزمان مەخلوقە، بۆیە احمد ناوی بردن بە جەهمی.

**(عقيدة السلف وأصحاب الحديث : ١٧٢-١٧٣)**

---------------------------

ماویەتی

# اللفظية (٣٩)



ئەم ریوایەتەم لە پۆستی ژمارە (٣٦) هێنا کە ئەوکات بۆ ڕوونکردنەوەی مەزهەبی لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان و مەزهەبی کەرابیسی هێنام، بەڵام لەم پۆستەدا لە ڕوویێکی ترەوە قسەی لەسەر ئەکەم.

**محمد بن موسى الحضرمي** ئەڵێ:

ووتم بە احمد بن صالح المصري: الكرابيسي ئەڵێ: لەفزمان بە قورئان مەخلوقە.

ووتی: درۆی کرد دوژمنی الله، بەڵکو لەفز بە قورئان مەلفوزە، وە دیراسە مەدروسە، وە حیکایەت حیکایەتکراوە، وە تیلاوە مەتلوە، قورئان کەلامی الله عز وجل-ە مەخلوق نیە، هەر کەسێک بڵێ قورئان مەخلوقە ئەوا کافرە بە الله عز وجل، گەر دەسەڵاتم هەبوایە ڕێگام نەئەدا لە گۆڕستانی موسڵمانان بنێژرێ.

محمد بن موسى ئەڵێ ووتم: چ کوفرێکە ؟

ووتی: کوفرێکی لە دین دەرخەرە.

ابن مندە دوای هێنانی ئەم ریوایەتە ئەڵێ:

ئەمە سیفەتی ئەشعەرییەکانە، ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، وە مەقروء و مەتلو حیکایەتی کەلامی الله-ن، وە ئەوەی لە نێوان دوو بەرگەکە نوسراوە پیتەکانی مەخلوقە، جا ئەوان ئەڵێن قورئان مەخلوقە بەڵام بە ڕاشکاوی نا.

**(مجلس في الرد على الزنادقة لابن منده)**

سەیرکەن ابن مندە دوای هێنانی ووتەکەی کەرابیسی تەعلیق ئەدات و ئەڵێ: ئەمە عەقیدەی ئەشعەرییەکانە پێیان وایە قورئان مەخلوقە و حیکایەتی کەلامی الله یە، بەڵام بە ڕاشکاوی ناڵێن قورئان مەخلوقە، باشە بە پێی فەهمی دوو جەزائیریەکە بێت چۆن خودی ووتەی کەرابیسی ئەبێتە ووتەی ئەشعەرییەکان ؟ ابن مندە تەعلیق لەسەر خودی ووتەکەی کەرابیسی ئەدات کە وتوویەتی لەفزم بە قورئان مەخلوقە، ئەڵێ ئەمە عەقیدەی ئەشعەرییەکانە پێیان وایە قورئان مەخلوقە بەڵام بە ڕاشکاوی دەری نابڕن، دوو جەزائیریە گومڕاکە و کلکەکانیان پێیان وایە کەرابیسی تەنها ئەیووت فعلی عەبدەکە مەخلوقە کاتێک قورئان ئەخوێنێ، قورئانەکە کەلامی الله یە مەخلوق نیە ! ئایا ئێوە لە ابن مندە باشتر تێگەیشتوون لە مەزهەبی کەرابیسی ؟! گەر نەخوێندەوارێکیش بڵێ خۆ کەرابیسی ئەیووت قورئان کەلامی الله یە مەخلوق نیە! ئەڵێین کوللابیەکان و ئەشعەرییەکانیش ئەڵێن قورئان کەلامی الله یە مەخلوق نیە، بەڵام کە لە عەقیدەیان ئەکۆڵیتەوە دەرئەکەوێ کە قورئان بە مەخلوق ئەزانن.

ووتەکەی احمد بن صالح المصري-ش کە لە ڕەددی کەرابیسی ئەڵێ: لەفز مەلفوزە، تیلاوە مەتلوە، ئایا گەر کەرابیسی مەبەستی لە لەفز فعلی عەبد بێت نەک قورئانەکە، احمد بن صالح چۆن ئەڵێ لەفز مەلفوزە ؟! ئایا مەعقولە بڵێ فعلی عەبدەکە قورئانە ؟! چونکە لەلای ئێوە لەفز واتا فعلی عەبد نەک خودی قورئانەکە!

ئینجا احمد بن صالح ئەڵێ: قورئان کەلامی الله یە مەخلوق نیە، هەر کەس بڵێ قورئان مەخلوقە کافرە، بۆچی لە ڕەددی کەرابیسی ئەم قسەیە ئەکات ؟ بۆ جارێک نەمان بینی زانایەک لە ڕەددی لەفزییەکان بڵێ: لەکاتی قورئان خوێندن نابێ بووترێ فعلی عەبد مەخلوقە، گەر ووترا ئەوا قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق، گەر باس باسی فعلی عەبدە نەک قورئان بۆ ئەهلی سوننە هەمیشە لە ڕەددی لەفزییەکان باسی قورئان ئەکەن نەک فعلی عەبد ؟! تا قیامەت مۆڵەتتان ئەدەم ووتەی یەک لەفزی بهێنن کە بڵێ: کاتێک قورئان ئەخوێنم فعلی من مەخلوقە بەڵام قورئانەکە غەیر مەخلوقە، ئەچێتە عەقڵەوە مەبەستیان لە ووتەکەیان فعلی عەبد بێت کەچی هەموویان کۆک بن لەسەر ئەوەی کە هەمیشە بە لەفز ووتەکەیان دەرببڕن کەسیان بۆ جارێک نەڵێ فعلم مەخلوقە، هەموویان ئەڵێن تیلاوەم مەخلوقە یان قیرائەم یان لەفزم یان کەلامم، نابینی کەسیان بڵێن فعلم مەخلوقە، گەر مەبەستەکەیان فعلی عەبدە بۆ ووشە مەبەستەکە بەکارناهێنن هەمیشە ووشەی لەفز و تیلاوە و قیرائە و کەلام بەکار ئەهێنن ؟!

وە تا قیامەت مۆڵەتتان ئەدەم ووتەی یەک سەلەف بهێنن کە بڵێ فعلی عەبد مەخلوقە بەڵام لەکاتی قورئان خوێندن بڵێی فعلی عەبد مەخلوقە ئەبێتە کوفر، خۆ ئەگەر ئەمە مەبەستی لەفزییەکان بوایە ئەبوایە زۆرێک لە سەلەف ئەم قسەیە بکەن و بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە کە کوفری ئەوان لەچیدایە، بەڵام من تەنها داوای یەک ووتە ئەکەم لێتان زیاتر نا.

---------------------------

ماویەتی

# اللفظية (٤٠)



لەفزییەکان بڕوایان وابوو قورئان کەلامی اللّٰه یە مەخلوق نیە بە نسبەت اللّٰه کە قسەی پێکردووە، بەڵام کاتێک کە ئێمە ئەیخوێنینەوە بە لەفزی خۆمان قورئانەکە ئەبێتە مەخلوق بە لەفزی ئێمە، وەک کەلامی ئێمە وایە کاتێک کە قسە ئەکەین، چونکە ئێمە قسەمان پێ کردووە قسەکردنی ئێمەش مەخلوقە، کەواتە قورئانەکە ئەبێتە مەخلوق کاتێک ئێمە ئەیخوێنین.

لە پۆستەکانی پێشوو ریوایەتی زۆرمان هێناوە لە ئیمام احمد و سەلەف کە لە ڕەددی لەفزییەکان ئەڵێن: (قورئان مەخلوق نیە لە هیچ حاڵێکدا، لە هەموو بارێکدا غەیر مەخلوقە) کە ئەم ڕەددە نیشانەی ئەوەیە کە لەفزییەکان ئەیان ووت کاتێک ئێمە قورئان ئەخوێنین ئەبێتە مەخلوق بە لەفزی ئێمە.

بەڵام لەم پۆستەدا ئەوە ئەسەلمێنین کە لەفزییەکان کاتێک ئەیان ووت: (لەفزمان بە قورئان مەخلوقە) مەبەستیان ئەوە بوو کاتێک قورئان ئەخوێنین قورئان وەک کەلامی خۆمان وایە چونکە ئێمە قسەی پێ ئەکەین و دەری ئەبڕین، کەلامی ئێمەش مەخلوقە کەواتە قورئانەکە ئەبێتە مەخلوق وەک کەلامی ئەو کەسە وایە کە ئەیخوێنێت

**ابو طالب ئەڵێ:**

ووتم بە باوکی عبداللە: نامەم بۆ نوسراوە لە طرسوس کە الشراك پێی وایە قورئان کەلامی اللە یە، بەڵام کاتێک کە خوێندمەوە تیلاوەم مەخلوقە

ئیمام احمد ووتی: قاتلە اللە، ئەمە خودی ووتەی جەهمە

ابو طالب ئەڵێ ووتم: پیاوێک ووتی: قورئان کەلامی اللە یە و مەخلوق نیە، بەڵام لەفزم بە قورئان مەخلوقە

ئیمام احمد ووتی: هەر کەس ئەم قسەیە بکات ئەوا هەموو شتێکی ووتوە (واتا ئەوەی جەهمیەکان ووتویانە ئەویش ووتویەتی) قورئان کەلامی اللە یە لە هەموو حاڵێکدا، بەڵگەش لەسەری فەرموودەکەی ابو بکر-ە، ابو بکر ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿الٓمٓ (١) غُلِبَتِ ٱلرُّومُ (٢)﴾ پێی ووترا: ئەم ووتەیە هاوەڵەکەت هێناویەتی، ابو بکر ووتی: نەخێر واللە، بەڵکو کەلامی اللە یە

ئیمام احمد ووتی: ئەم ئایەتە و جگە لەویش کەلامی اللە یە

ابو طالب ئەڵێ ووتم: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِی خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَۖ ثُمَّ ٱلَّذِینَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمۡ یَعۡدِلُونَ﴾ ئەمەی تازە خوێندمەوە کەلامی اللە یە ؟

ئیمام احمد ووتی: بەڵێ والله کەلامی الله یە، وە هەر کەسێک بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە ئەوا هەموو شتێکی ووتوە، چی ئەمێنێتەوە کاتێک ووتی لەفزم ؟! گەر نەگەڕایەوە لەم ووتەیە خۆتی لێ بپارێزە و قسەی لەگەڵ مەکە، ووتەی ئەم پیاوە وەک ووتەکەی الشراك-ە، أخزاه الله

**ابو طالب** ئەڵێ:

ووتم ئەی باوکی عبدالله من بەڵگەم هێناوەتەوە لە دژی لەفزییەکان بە قورئان و فەرموودە، حەز ئەکەم بەڵگەکانت بۆ باس بکەم:

الله عز وجل فەرموویەتی: ﴿وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ ئایا لە محمد کەلامی الله نەبیستراوە ؟

الله عز وجل فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾

الله تبارك وتعالى فەرموویەتی: ﴿أَفَتَطۡمَعُونَ أَن يُؤۡمِنُواْ لَكُمۡ وَقَدۡ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ يَسۡمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعۡدِ مَا عَقَلُوهُ﴾

وە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ﴾

وە فەرموویەتی: ﴿وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ﴾

وە فەرموویەتی: ﴿وَأَنۡ أَتۡلُوَاْ ٱلۡقُرۡءَانَۖ﴾

وە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا﴾

وە فەرموویەتی: ﴿فَٱقْرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ﴾

لە هەموو حاڵێکدا هەر قورئانە

وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە فەرموودەی جابر رضي الله عنه فەرموویەتی: (إن قريشا منعوني أن أبلغ كلام ربي)

وە پێغەمبەر عليه السلام فەرمووی بە معاوية بن الحكم رضي الله عنه: (إن هذه الصلاة لا يصلح فيها شيء من كلام الآدميين إلا القرآن)

قورئان جیایە لە کەلامی مرۆڤ

وە ابو بكر الصديق رضي الله عنه ووتی: نەخێر بەڵکو کەلام و ووتەی الله یە.

باوکی عبدالله پێی ووتم: چەند بە چاکی بەڵگەت لە دڕیان هێناوەتەوە، جبریل بە شتێکی مەخلوق هات بۆلای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ؟! وە پێغەمبەریش عليه السلام بە شتێکی مەخلوق هات بۆ خەڵکی ؟!

ابو طالب ئەڵێ ووتم: ئەتوانم بڵێم: ئەمە ووتەی جەهمە، وە لە هەموو حاڵێکدا قورئان کەلامی الله عز وجل-ە ؟

ووتی: بەڵێ.

ابو طالب ئەڵێ: دوای ئەمە چوومەوە بۆ لای، ووتی: چەند ئایەتێکی ترم بینیوە کە بەڵگەیە لە دژیان، ﴿وَقُرۡءَانًا فَرَقۡنَٰهُ لِتَقۡرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ [الإسراء: ١٠٦]، وە لە سورەتی الجمعة: ﴿هُوَ ٱلَّذِی بَعَثَ فِی ٱلۡأُمِّیِّـۧنَ رَسُولًا مِّنۡهُمۡ یَتۡلُوا۟ عَلَیۡهِمۡ ءَایَـٰتِهِۦ وَیُزَكِّیهِمۡ وَیُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَـٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبۡلُ لَفِی ضَلَـٰلٍ مُّبِینٍ﴾ [الجمعة: ٢].

**بروانە (السنة للخلال : ٢٠٥٦)**

سەیری ئەو ووتانە بکەن کە هێڵم بە ژێری داهێناوە، هەمووی باسی ئەوەیە کە ئەو قورئانەی بەندەکان ئەیخوێنین قورئانە و کەلامی الله یە، لە هەموو حاڵێکدا هەر قورئانە و کەلامی الله یە، نابێتە کەلامی مرۆڤ کاتێک مرۆڤ ئەیخوێنێت

سەیری ووتەکانی ئیمام احمد بکە:

قورئان لە هەموو حاڵێکدا کەلامی الله یە

بەڵگە لە دژی لەفزییەکان فەرموودەکەی ابو بکر الصدیق-ە رضي الله عنه، کاتێک سەرەتای سورەتی الروم-ی خوێند قورەیش پێیان ووت ئەمە کەلامی هاوەڵەکەتە، ووتی: نەخێر، نە کەلامی منە، نە کەلامی هاوەڵەکەمە، بەڵکو کەلامی الله یە

سەیری پرسیارەکانی ابو طالب بکە:

ئایەتی یەکەمی سورەتی الأنعام ئەخوێنێتەوە، ئەڵێ ئەوەی خوێندمەوە کەلامی الله یە؟

ئیمام احمد ئەڵێ: بەڵێ والله ئەمە کەلامی الله یە

ئەڵێ: ئەتوانم بڵێم قورئان لە هەموو حاڵێکدا کەلامی الله یە ؟

ئیمام احمد ئەڵێ بەڵێ

ئینجا سەیری بەڵگەکانی ابو طالب بکە کە لە دژی لەفزیەکان هێناویەتی

هەموو ئایەت و فەرموودەکان باسی ئەوە ئەکەن کە ئەوەی ئێمە ئەیخوێنین هەر قورئانە، هەر کەلامی الله یە، نابێتە کەلامی مرۆڤ، ئایەتەکان ئەو قورئانەی مرۆڤ ئەیخوێنێت هەر بە قورئان ناوی ئەبات، هەر بە کەلامی الله ناوی ئەبات، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەفەرمووێ: بمبەن بۆ لای خۆتان قورەیش ڕێگریم لێ ئەکەن کەلامی الله بگەیەنم، هەروەها ئەفەرمووێ: نوێژ نابێ قسەی خەڵکی تێدا بێت بەڵکو تەنها قورئانە، واتا قورئان جیایە لە کەلامی ئێمە، هەر بۆیە ئیمام احمد دەربارەی ئەم فەرموودەیە ئەیووت: گەر بە پێی قسەی لەفزیەکان بێت ئەوا نوێژ دروست نابێت بە قورئان چونکە نوێژ بە شتێکی مەخلوق دروست نابێت، فەرموودەکە بەڵگەی تێدایە کە قورئان جیایە لە کەلامی مرۆڤ، هەروەک ابو طالب-یش باسیکرد کە قورئان جیایە لە کەلامی مرۆڤ، هەروەها ووتی: لە هەموو حاڵێکدا هەر قورئانە، هەروەها ووتی: موشریک کەلامی الله لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەبیستێ

ئینجا لە کۆتایی کە ئیمام احمد باسی دوو ئایەتی تریش ئەکات لە دژی لەفزییەکان کە هەردووک ئایەتەکە باسی ئەوە ئەکەن ئەوەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەیخوێنی قورئانە و کەلامی الله یە.

گەر لەفزییەکان بڵێن: ئەو قورئانەی کە ئێمە ئەیخوێنین کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، ئەوا ئەم ئایەت و فەرموودە و ووتانە چ ڕەددێکی تێدا بوو بۆیان کە باسی ئەوە ئەکەن ئەوەی مرۆڤ ئەیخوێنێ قورئانە و کەلامی الله یە، لە هەموو بارێکدا هەر قورئانە و کەلامی الله یە ؟ مەگەر کەسێک الله دڵی کوێر کردبێت لە ئاست بینینی حەق، ئەگینا ولله الحمد بەڵگەکان زۆر ڕوونن.

## محمد بن مسلم ئەڵێ:

احمد بن حنبل ووتی: لەفزییەکان خراپترن لە واقفەکان، سەر لە خەڵکی ئەشێوێنن، الله عز وجل فەرموویەتی: ﴿حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٦]، وە فەرموویەتی: ﴿يَسۡمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ﴾ [البقرة: ٧٥]، لە کێی ئەبیستن ؟!

محمد بن مسلم ئەڵێ: احمد پێی ووتم: قورئان هەر چۆن تەسەروفی پێ بکرێ کەلامی الله یە، وە لەفزییەکان جەهمین.

محمد بن مسلم ئەڵێ ووتم: بیستووتە یەکێک لە جەهمیەکان ئەمەی ووتبێ (واتا بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە) ؟

ووتی: پێم گەیشتووە المريسي ئەیووت.

**(السنة للخلال : ٢٠٨٠)**

سەیری ئەم ووتەیەی ئیمام احمد بکە (قورئان چۆن تەسەروفی پێ بکرێ هەر کەلامی اللّٰە یە، وە لەفزییەکان جەهمین)

گەر لەفزییەکان باسی ئەوە بکەن تەنها فعلی عەبدەکە مەخلوقە قورئان مەخلوق نیە کە ئەیخوێنین، ئەوکات ئەم ووتەیەی ئیمام احمد چەندە بێ نرخ ئەبێت بۆیان ؟!

ئیمام احمد ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿يَسۡمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ﴾ [البقرة: ٧٥]، پاشان ووتی: لە کێی ئەبیستن ؟!

(يسمعون كلام الله) واتا کەلامی اللّٰە لە تۆی مرۆڤ ئەبیستن، تۆ کەلامی اللّٰە ئەخوێنیتەوە بۆیان، لە تۆشی ببیستن هەر کەلامی اللّٰە یە، نابێتە کەلامی تۆ

### يعقوب بن بختان ئەڵێ:

بیستم باوکی عبداللّٰە باسی لەفزییەکانی کرد، پاشان ووتی: اللّٰە عز وجل فەرموویەتی: ﴿فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ [مريم: ٩٧]

یعقوب ئەڵێ پێم ووت: فەرمایشتی الله عز وجل: ﴿وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٦]، کەلامی الله-یان لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بیست ؟

ووتی: بەڵێ.

**(السنة للخلال : ٢٠٩٣)**

لە باسی لەفزییەکاندا یعقوب بن بختان ئەپرسێ: ئایا کەلامی الله-یان بیست لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم! تێبگە بۆ ئەم پرسیارە ئەکات، ئەسلەن جەهمی و موعتەزیلە کێشەیان لەوە نەبووە کە قورئان کەلامی الله یە، بەڵام ئەیان ووت مەخلوقە، نابینی سەلەف لە ڕەددی جەهمیەکان بڵێن قورئان کەلامی الله یە، بەڵکو ئەیان ووت مەخلوق نیە، چونکە جەهمیەکان ئەیان ووت قورئان کەلامی الله یە

ئەی کەواتە بۆچی ئیمام احمد لە ڕەددی لەفزییەکان تەئکید لەسەر ئەوە ئەکاتەوە کە ئەم قورئانەی ئەیخوێنین لە هەموو حاڵێکدا هەر قورئانە و کەلامی الله یە و کەلامی مرۆڤ نیە، وە باسی ووتەکەی ابو بکر ئەکات کە ڕەددی قورەیشی دایەوە کە ووتیان ئەمە کەلامی هاوەڵەکەتە، ووتی نەخێر کەلامی من نیە و کەلامی هاوەڵەکەشم نیە، بەڵکو کەلامی الله یە

### عبدالله ئەڵێ:

پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی ئەو کەسەی کە ئەڵێ: لەفزم بە قورئان مەخلوقە ؟

ووتی: الله عز وجل فەرموویەتی: ﴿وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾، وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (حتى أبلغ كلام ربي)، وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هذه الصلاة لا يصلح فيها شيء من كلام الناس).

**(السنة للخلال : ٢٠٧٠ / ب)**

ئایەتەکە و دوو فەرموودەکە کە ئیمام احمد کردوویەتی بە بەڵگە هەر سێکیان بەڵگەی تێدایە کە قورئان کەلامی الله یە، مرۆڤ کە ئەیخوێنێ کەلامی الله ئەخوێنێ و ئەیگەیەنێ نەک کەلامی خۆی

### يعقوب بن ابراهيم الدورقي ئەڵێ:

بە احمد بن حنبل-م ووت: چی ئەڵێی دەربارەی ئەو کەسەی کە پێی وایە لەفزی بە قورئان مەخلوقە ؟

ووتی: ئەمانە لەلای من خراپترن لە جەهمیەکان، هەر کەسێک ئەمە بروای بێت ئەوا بروای وایە کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم قسەی کردووە بە شتێکی مەخلوق، وە جبریل شتێکی مەخلوقی هێناوە بۆ پێغەمبەرەکەمان، ئەمانە لەلای من خراپترن لە

جەهمیەکان، قسە لەگەڵ ئەمانە مەکە، وە قسە لە هیچ شتێکی ئەم بابەتە مەکە، قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە لە هەموو ڕوویکەوە، بەهەر جۆرێک بێت، لەسەر هەر حاڵێک بێت، هەرگیز نابێتە مەخلوق، الله تبارك وتعالى فەرموویەتی: ﴿وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٦]، نەیفەرموو: (حتى يسمع كلامك يا محمد) تاكو ووتەی تۆ ئەبیستێ ئەی محمد، وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لا يصلح في الصلاة شيء من كلام الناس) نابێت هیچ قسەیەکی خەڵک لە نوێژدا بووترێ، وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (حتى أبلغ كلام ربي) تاکو کەلامی پەروەردگارم ئەگەیەنم.

ئەمە ووتەی جەهمە (واتا لەفزم بە قورئان مەخلوقە) ئەوەی ئەم ووتەیەی هێناوە غەزەبی الله-ی لەسەر بێت.

الدورقي ئەڵێ ووتم: ئەمانە لە دەوری ابطال و تعطیل ئەخولێنەوە ؟

ووتی: بەڵێ، لەعنەتی الله لەسەریان بێت.

**(السنة للخلال : ٢٠٧٢)**

ئەم ریوایەتە لە خۆر رۆشنترە، ئیمام احمد لە دژی لەفزیەکان ئەم ئایەتە ئەخوێنێتەوە ﴿وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾، پاشان ئیمام احمد ئەڵێ: الله نەیفەرموو: (حتى يسمع كلامك يا محمد) تاكو ووتەی تۆ ئەبیستێ ئەی محمد

تێبگە بۆ لە رەددی لەفزییەکان ئەڵێ: الله فەرمووی: کەلامی الله ئەبیستێ، نەیفەرموو: کەلامی محمد ئەبیستێ ؟!

ئاخر گەر لەفزییەکان نەڵێن کاتێک ئێمە قورئان ئەخوێنین قورئان وەک کەلامی ئێمە وایە چونکە ئێمە قسەی پێ ئەکەین، گەر وانەڵێن ئەوکات ووتەکەی ئیمام احمد چ مانایەکی هەیە ؟! گەر لەفزییەکان بڵێن ئەو قورئانەی ئەیخوێنین کەلامی الله یە مەخلوق نیە تەنها فعلی عەبد مەخلوقە، ئەوکات ئەم ووتەیەی ئیمام احمد لە دژیان چەندە بێ نرخ و دوور لە بابەت ئەبوو! حەقی لەفزییەکان بوو گاڵتەی پێ بکەن بڵێن احمد نازانێ ئەڵێ چی و باسی چی ئەکات! حاشا لە ئیمام احمد بەڵام عمومیەکان الله لەناویان ببات بە تابع و مەتبوعەوە بە جۆرێک باسی مەزهەبی لەفزییەکان ئەکەن وەڵامەکانی ئیمام احمد زۆر بێ نرخ دەرئەکەوێ حەسەب فەهمی ئەوان بێت.

هەروەها ووتەکەی ئیمام احمد سەیرکەن کە ووتی: لەفزییەکان بڕوایان وایە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم قسەی کردووە بە شتێکی مەخلوق، ئاخر بە پێی فەهمی ئێوە بێت ئیمام احمد درۆی کردووە بە دەمی لەفزییەکان و بوهتانی پێکردوون، حاشا لە ئیمام احمد

**يعقوب بن بختان** ئەڵێ:

پرسیارم لە باوکی عبدالله کرد دەربارەی ئەو کەسەی کە ئەڵێ: ووتەی من و لەفزی من، وە کەلامی الله مەخلوق نیە ؟ (واتا ئەڵێ: کەلام و لەفزم مەخلوقە، بەڵام کەلامی الله مەخلوق نیە)

ووتی: ئەمە ووتەیەکی خراپە، ئەمانە لە جەهمیەکان خراپترن.

**(السنة للخلال : ٢٠٨٨)**

کابرای لەفزی ئەڵێ: (کەلامی من و لەفزی من مەخلوقە، کەلامی الله مەخلوق نیە) بیر بکەرەوە لەفزییەکان بۆ باسی کەلام ئەکەن لەم بابەتە گەر بابەتەکە تەنها مەخلوقی فعلی عەبد بێت ؟! گەر قورئانەکە کە ئەیخوێنێ بە کەلامی خۆی نەزانێ بۆ ئەڵێ کەلامی من مەخلوقە ؟! بۆ لە ڕەددی لەفزییەکان شیعری امرئ القیس ئەهێنن ئەڵێن گەر ئەم شیعرە بخوێنی ئەوا شیعرەکە هەر هی ئەوە نابێتە شیعری تۆ ؟ تێبگە .

وە ئەوەی ئەمە زیاتر روون ئەکاتەوە کە لەفزییەکان کاتێک قورئان ئەخوێنن وەک کەلامی خۆیان حیسابی بۆ ئەکەن ئەم ریوایەتەی اسحاق بن راهویە

### حرب الكرماني ئەڵێ:

بیستم پرسیار لە اسحاق بن راهویە کرا دەربارەی پیاوێک کە ئەڵێ: قورئان مەخلوق نیە، بەڵام قیرائەتی من بۆ قورئان مەخلوقە، چونکە من قورئانەکە ئەڵێمەوە و ئەگێڕمەوە، وە ووتەی ئێمەش مەخلوقە ؟

اسحاق ووتی: ئەمە بیدعەیە، ئیقرار ناکرێت لەسەر ئەمە تاکو ئەگەڕێتەوە و واز لەم ووتەیەی ئەهێنێت.

**(السنة لحرب : ٤٠٦)**

سەیرکە کابرای لەفزی ئەڵێ: قورئان مەخلوق نیە بەڵام قیرائەتی من بۆ قورئان مەخلوقە

ئینجا مەبەستەکەی روون ئەکاتەوە کە مەبەستی چیە لە مەخلوق بوونی قیرائە

ئەڵێ: چونکە من قورئانەکە ئەڵێمەوە کەلامی منیش مەخلوقە

سەیرکە باسی کەلامی خۆی ئەکات نەک فعلی خۆی، ئەڵێ کەلامی من مەخلوقە، کە من قورئان ئەخوێنمەوە قورئانەکە بە کەلامی من خوێنراوە، واتا بۆتە کەلامی من، بە کەلامی خۆم کەلامی اللە ئەخوێنمەوە، کەلامی اللە بە نسبەت اللە مەخلوق نیە، بەڵام کە من خوێندم کەلامی منە و مەخلوقە

گەر بووترێ: ئەی بۆ اسحاق ووتی ئەمە بیدعەیە نەیووت کوفرە ؟ ئەڵێین: مەبەستی اسحاق بیدعەی کوفرییە، چونکە ابو داود-یش لە اسحاقی ریوایەت کردووە کە

پرسیاری لێئەکەن دەربارەی لەفزییەکان، ئەڵێ بیدعەچین، بۆیە مەبەستی لە بیدعە کوفرە.

---------------------------

ماویەتی

# بەشێک

وادیارە عمومیە چەپەڵەکە کەناڵەکەی سڕیوەتەوە لای من نایدات، بەداخەوە نەمتوانی هەموو پۆستەکانی کۆپی بکەم لەلای خۆم بۆ ڕەتدانەوەی، بەڵام هەندێکیانم کۆپی کردووە، ئەوانی تریشم بیرماوە بەڵام حەزم ئەکرد لە کاتی ڕەتدانەوە ووتەکانی وەک خۆی نەقل بکەم ئینجا ڕەددی بدەمەوە.

# بەشێک

گەردنی هەموو ئەو کەسانەم ئازاد کرد کە قسەیان لەسەر کردووم لە بابەتی (لەفز بە قورئان) ئەوانەی داوای لێبوردنیان کردووە و ئەوانەی داوای لێبوردنیشیان نەکردووە هەردووک لا گەردەنیان ئازاد بێت، هەندێکیان لەوانەی کە مەنهەجیان ڕوون نەبوو تا ئێستاش ڕوون نیە و تەوبەیەکی ڕێک و جوانیان نیشان نەدا زۆر قورس بوو لەلام گەردنیان ئازاد بکەم ئێستاش کە گەردنم ئازاد کردوون لەبەر ئەوە نیە کە بە ڕێز و خاوەن قەدرن لەلام بەڵکو بۆ ئەوە گەردنم ئازاد کردوون تاکو الله لێم خۆشبێت، بڵێ مادام تۆ لەوان خۆشبوویت لە پێناوی من ئەوا منیش لێت خۆشبووم، ناکرێ لەم شەوانە هەمیشە بڵێین (اللهم إنك عفو تحب العفو فاعف عني) کەچی خۆشمان لە کەس خۆش نەبین، وە لەلام گرنگ نیە تا چەند لێخۆشبوونی من جێگای بایەخە بۆتان، بەڵکو ئەوەی لای من گرنگە ئەوەیە کە الله بەهۆی ئەم لێخۆشبوونەم لە ئێوە لە منیش خۆشبێت، وە لێخۆشبوون مانای ئەوە نیە کەسەکە بە ئەهلی سوننە بزانیت و خاڵی بێت لە بیدعە، ئەم لێخۆشبوونە مافی خەڵکە، بە سوننی دانان و بیدعی دانانی خەڵکی ئەمەیان دینە مافی خەڵک نیە بیبەخشێت و بیسەنێتەوە.

## بەشێک

**أبو بكر المروذي** ئەڵێ:

بیستم باوکی عبدالله -ئیمام أحمد- ئەیووت: هەر کەسێک نەڵێ قورئان کەلامی الله یە مەخلوق نیە، ئەوا جێگای جەهمیەکان ئەگرێتەوە.

**(الإبانة الكبرى لابن بطة : ٢٢٠٠)**

لە بابەتی قورئان بەهەر کەسێک ووترا بێت جەهمی ئەوا ئەم کەسە قورئانی بە مەخلوق زانیوە یان گومانی لە غەیر مەخلوقی قورئان هەبووە بۆیە پێی ووتراوە جەهمی، جا یان بە ڕاشکاوی وای ووتوە وەک مەخلوقیەکان، وە یان بە فێڵ و پەناو پێچ وای ووتوە وەک واقفە و لەفزییەکان، هیچ کەسێک نەبووە قورئان بە غەیر مەخلوق بزانێت یان گومانی لە غەیر مەخلوقی قورئان نەبێت کەچی تەکفیر کرا بێت دەربارەی قورئان، تەنانەت واقفەش کە تەکفیر کراون لەبەر دوو شت بووە، یان قورئان بە مەخلوق ئەزانن بەڵام ئەترسن دەری بڕن، یان گومانیان هەیە لەوەی کەلامی الله غەیر مەخلوقە بۆیە توقف ئەکەن، کە ئیمام احمد و باقی سەلەف بەم دوو هۆکارە واقفەیان تەکفیر کردووە، هیچ فرقەیەکیش نەبووە بڵێن قورئان غەیر مەخلوقە بەڵام بەهۆی ئیلزامێکە تەکفیر کرابن کە ڕائەکەن لێی، وە ئەگەر بۆیان

روون بکرێتەوە لێی ڕابکەن و حاشای لێ بکەن، هەموویان بە دەمی خۆیان بە ڕوونی دان بەوە ئەنێن قورئان مەخلوقە، جا هەیانە بە ڕاشکاوی وەک جەهمی و موعتەزیلە، هەیانە بە پەناو پێچ وەک لەفزی و کوللابی و ئەشعەری، بۆیە کە بە لەفزییەکان ووتراوە جەهمی حەتمەن قورئان بە مەخلوق ئەزانن لە حاڵێک لە حاڵەکاندا نەک حاشای لێ بکەن و بە زۆر مولزەم بکرێن بە شتێک کە بەری بن لێی.

# اللفظية (٤١)



**أبو العباس الكنكشي** (٤٤٩ هـ) ئەڵێ:

ئیمان هەبوون بەوەی کە کەلامی الله مەخلوق نیە، بەڵکو وەحی و دابەزێنراوی الله یە، وە قیرائەتی قورئان قورئانە، وە تیلاوە و لەفز بە قورئان بریتیە لەوەی کە ئەیبیستین لە کەلامی الله تعالى نەوەک جوڵەی بەندەکان بە قورئان.

پرسیار کرا لە سفیان الثوري -رحمة الله عليه- دەربارەی لەفز بە قورئان و ڕێگاکانی قورئان لەلایەن قورئانخوێنەوە ؟

سفیان ووتی: ئەندامەکانم هەموویان قورئانیان پێدا تێئەپەڕێ، وە ئەندامەکانم مەخلوقن، وە قورئانیش مەخلوق نیە، وە لەفز بە قورئان مەخلوق نیە.

ابو العباس ئەڵێ: تەفسیری ووتەکەی سفیان ئەمەیە: زمان و دوو لێوەکان و ددانەکان و بەشی سەرەوەی ناوەوەی دەم و قوڕگ بریتین لە ڕێگاکانی قورئان و قورئان پێیدا تێئەپەڕێ، وە هەموو کەلامێکی پێدا تێئەپەڕێ، جا کاتێک قورئان بەم ڕێگایانە تێپەڕی ئەوا کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە کاتێک دەرچوو لە دەم و گوێگر بیستی لەم کاتەدا بیستنی لەفزەکە و خودی لەفز بە قورئان کەلامی رب العالمين-ە.

هەروەها ئەڵێ: زمان مەخلوقە، وە ئەوەی بە زمان ئەخوێنرێ غەیر مەخلوقە، چاو مەخلوقە، وە ئەوەی بە چاوەکان سەیر ئەکرێ غەیر مەخلوقە، گوێ مەخلوقە، وە ئەوەی بە گوێیەکان ئەبیسترێ غەیر مەخلوقە، دوو دەستەکە مەخلوقن، وە ئەوەی بە دوو دەستەکە ئەنوسرێ غەیر مەخلوقە.

هەروەها ئەڵێ: قورئان لە سینە دایە و جیایە لە سینە، تێکەڵ نیە بە سینە و حلولی نەکردووە تێیدا، چونکە سینە مەخلوقە و قورئان غەیر مەخلوقە، وە هەر شتێک لە سیفەتەکانی الله تعالی بێت ئەوا غەیر مەخلوقە، وە هەر شتێک لە سیفەتی بەندەکان بێت ئەوا مەخلوقە.

هەروەها ئەڵێ: قورئان لە هەموو ڕوویەکەوە هەر چۆنێک تەسەروفی پێ بکرێ لەسەر زمانی عەرەبی و عەجەمی و هەر کاتێک بخوێنرێ و هەر چۆنێک تەفسیر بکرێ لە هەموو حاڵێکدا کەلامی الله عز وجل-ە و مەخلوق نیە.

هەروەها ئەڵێ: قورئان ناگۆڕێت بە هیچ شتێک لە شتەکان، قورئان پەیوەستە بە زمانی قورئانخوێنەوە و دراوەتە پاڵ قورئانخوێن، وە قورئانخوێن جیایە لە قورئان.

هەروەها ئەڵێ: بە هەمان شێوە قورئان پەیوەستە بە دەنگی قورئانخوێن، وە قورئانخوێن بەخۆیی و دەنگەکەی جیانە لە قورئان، وە عیلم و قودرەتی الله تعالی پەیوەستە بە هەموو شتێکەوە بە بەڵگەی فەرمایشتی الله تعالی: ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَىۡءٍ عَلِيمٌ﴾ [البقرة: ٢٩]، ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىۡءٍ قَدِيرُۢ﴾ [المائدة: ١٢٠]، وە هەموو شتێکیش جیایە لە عیلم و قودرەتی الله.

هەروەها ئەڵێ: ووتەکەمان دەربارەی ئیسبات کردنی قورئان لە سینەدا بەو جۆرەیە کە باسمان کرد چونکە قورئان لە سینە دایە، وە سینەش جیایە لە قورئان بە بەڵگەی فەرمایشتی الله تعالى: ﴿بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٌ مَّجِيدٌ (٢١) فِي لَوۡحٍ مَّحۡفُوظِۭ (٢٢)﴾ [البروج]، سینەش وەک لەوح وایە و هەردووکیان مەخلوقن، جا هەروەک چۆن الله تعالى ئیسباتی کردووە کە قورئان لە لەوحی مەحفوز دایە، بە هەمان شێوە لە سینەدا مەحفوزە و پەیوەستە بە سینەوە، وە سینە جیایە لە قورئان، ئایا نابینی خۆر و مانگ کە مەخلوقن کاتێک دەرئەکەون بەسەر زەوی یان بەسەر ئاو یان بەسەر دار یان بەسەر خەڵک یان بەسەر شتی تر ئەوا خۆر و مانگ تێکەڵ نابن بە هیچ یەکێک لەمانە، جا خۆر و مانگ مەخلوقن ئەمە سیفەتەکەیانە، ئەی چۆن کەلامی خالق تێکەڵ ئەبێت بە شتێکی مەخلوق ؟!

**(دەستنوسی عقيدة أهل السنة والجماعة) بتصرف**

**وە بڕوانە (الرسالة الواضحة لابن الحنبلي : ٦٦٣-٧٠٣)**

لە پۆستەکانی پێشوو باسی ئەوەم کرد کە کاتێک لەفزییەکان ئەیان ووت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە یان قیرائەمان بۆ قورئان یان تیلاوەمان بە قورئان، لەم ووتانە مەبەستیان ئەوەبوو خودی قورئانەکە مەخلوقە نەک فعلی عەبد، هەر بۆیەش الكنكشي لە ڕەددی لەفزییەکاندا ئەڵێ: قیرائەی قورئان قورئانە، واتا ئەو قورئانەی کە عەبد ئەیخوێنێ هەر قورئانە، مەبەستی ئەوە نیە فعلی عەبدەکە قورئانە، گەر قیرائە مەبەست پێی فعلی عەبد بێت ئەوا ناڵێ قیرائەی قورئان قورئانە،

بۆیە لە رەددی لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان تێئەگەین کە لەفزییە مەخلوقیەکان مەبەستیان چی بووە لە ووتەکانیان، گەر کابرای لەفزی بڵێ قیرائەم بۆ قورئان مەخلوقە، لەم ووتەیەدا مەبەستی ئەوە بێت فعلی عەبد مەخلوقە، ئەی چۆن لەفزییەکی غەیر مەخلوقی لەولاوە دێت رەددی ئەداتەوە ئەڵێ: قیرائەی قورئان قورئانە ؟! ئایا ووتەکەی واتا: فعلی عەبد قورئانە ؟! پەنا بە اللّٰه کەس ئەم قسەیە ناکات ئیللا زندیق نەبێت.

پاشان الكنكشي ئەڵێ: تیلاوە و لەفز بە قورئان بریتیە لەوەی کە ئەیبیستین لە کەلامی اللّٰه نەک جوڵەی بەندەکان، ئەم ووتەیە دەقێکی ڕوون و ڕاشکاوە کە لەفزییەکان مەبەستیان لە لەفز و تیلاوە چی بووە، مەبەستیان فعلی عەبد نەبووە بەڵکو مەبەستیان قورئانەکە بووە، ئەوەتا ئەڵێ خودی قورئانەکەی کە ئەیبیستین تیلاوە و لەفزە نەک جوڵە و فعلی بەندەکان تیلاوە و لەفز بێت

ئینجا کە ووتەکەی سفیان نەقل ئەکات کە هەمان ووتەی لەفزییە غەیر مەخلوقیەکانە، ئەمە هەڵەیە کە توشی هاتووە بەڵکو سفیان هەر قسەی نەکردووە لەم بابەتە چ جای بڵێ لەفز بە قورئان مەخلوق نیە ! الكنكشي وەکو زۆرینەی منتسبین بۆ ئەهلی سوننە کەوتۆتە هەڵەوە لە بابەتی لەفزدا کاتێک لەفز بە قورئان بە غەیر مەخلوق وەسف ئەکات، بەڵام ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە ئەوەیە کە ئیقرار ئەکات لەسەر ئەوەی لێوەکان و زمان و ددان و ناو دەم و قورگ هەموو ئەمانە مەخلوقن و قورئانیان پێدا تێئەپەڕێ، وە قورئان کە پێیاندا تێئەپەڕێ غەیر مەخلوقە، کەواتە دیسان بۆمان روون بوویەوە کە لەفزییە غەیر مەخلوقیەکان

ئەڵێن: لەفزمان بە قورئان غەیر مەخلوقە مەبەستیان ئەوەیە قورئان کە ئەخوێنرێ و عەبد دەری ئەبڕێ غەیر مەخلوقە، نەک مەبەستیان ئەوە بێ خودی فعلی عەبدەکە غەیر مەخلوقە، ئەوەتا الكنكشي کە لەفزیەکی غەیر مەخلوقیە دان بەوە ئەنێت کە لێو و دەم و زمان و ددان و قورگ مەخلوقن و قورئانیان پێدا تێئەپەڕێ، وە قورئانەکە غەیر مەخلوقە، ووتەی لەفزیە غەیر مەخلوقیەکانیش لە ڕەددی لەفزیەکان بەکارهاتووە گەر لە ووتەی ئەوان تێئەگەیشتی ئەوا ئەزانی ڕەددی چ فرقەیەکیان داوەتەوە و فرقەکە چ عەقیدەیەکیان هەبووە، گەر لەفزیەکان عەقیدەیان بریتی بێت لەوەی فعل و جوڵەی عەبد مەخلوقە، ئەی چۆن الكنكشي لە ڕەددی ئەواندا هەمان شت ئەڵێتەوە ؟! ئایا ئەویش لەفزی بووە لە کاتێکدا خۆی ڕەددی لەفزیەکان ئەداتەوە ؟!

پاشان ئەڵێ: لەکاتی بیستنی لەفزەکە خودی لەفز بە قورئان کەلامی رب العالمین-ە باسی بیستنی لەفز ئەکات، ئایا چ شتێک ئەبیسترێ ؟ کەلام ئەبیسترێ یان جوڵەی ناو دەمی قورئانخوێن ؟ بێگومان کەلام ئەبیسترێ نەک جوڵەی ناو دەمی قورئانخوێن، کەواتە دیسان روون بوویەوە مەبەست لە لەفز خودی قورئانەکەیە نەک فعلی عەبدەکە

پاشان ئەڵێ لەفز بە قورئان کەلامی رب العالمین-ە، ئایا مەعقولە بڵێ: فعلی عەبدەکە کەلامی رب العالمین-ە ؟ ئەوانەی تا ئێستا واحاڵی بوونە لەفزییەکان مەبەستیان لە لەفز بە قورئان فعلی عەبد بوو نەک قورئان، هۆش بێننەوە بەرخۆتان، سەیری ڕەددی زانایان بکەن بۆ لەفزییەکان، ئاخر بە پێی فەهمی ئێوە بۆ ئەم بابەتە ڕەددی ئەم زانایانە هەمووی ئەبێتە کوفر، یان ئەبێ بڵێن ئەم زانایانە کەسیان نەیانزانیوە مەزهەبی لەفزییەکان چیە لەخۆیانەوە قسەیان کردووە و ڕەددیان داونەتەوە، ئەمە لە کاتێکدا هەر الكنكشي خۆی ووتی جوڵەی بەندەکان لەفز و تیلاوە نیە بەڵکو ئەو کەلامەی ئەبیسترێ لەفز و تیلاوەیە، واتا لەفز و تیلاوەی جیاکردەوە لە فعلی عەبد، بۆیە کەس ناتوانێ بڵێ الكنكشي فعلی عەبدی بە غەیر مەخلوق داناوە، وە ووتەی هەموو ئەوانەش کە لەفزی غەیر مەخلوقی بوونە کە پێشتر نەقلم کردووە ووتەکەیان وەک ووتەی الكنكشي بووە، لە ابو حاتم الرازي و ابن منده و احمد بن صالح المصري و ابو الشيخ و قوام السنة الاصبهاني و جگە لەمانەش، ئایا هەموو ئەمانە لە مەزهەبی لەفزییەکان تێنەگەیشتوون لەخۆیانەوە ڕەددیان داونەتەوە بەبێ ئاگایانە ؟!

ئینجا قسەیەک ئەکات کە هەمان ریوایەتەکەی ئیمام احمدە، ئەویش باسکردنی مەخلوقی زمان و دەست و چاو و گوێیە، هەموو ئەمانە کە قورئانیان پێ ئەخوێنرێ و ئەنوسرێ و ئەبینرێ و ئەبیسترێ مەخلوقن، وە قورئانەکە غەیر مەخلوقە.

پاشان سینە جیا ئەکاتەوە لە قورئان، ئەڵێ قورئان لە سینە دایە، سینە مەخلوقە و قورئان غەیر مەخلوقە، تەنانەت جەماعەتی دوو جەزائیریەکەش الله لەناویان ببات

ئینکاری لەوە ناکەن سینە مەخلوقە لە کاتێکدا ئەمە دژبەیەک بوونە، چونکە سەلەف جیاوازییان نەکردووە لە نێوان قورئان بە حیفز کراوی و بیستراوی و خوێنراوی و نوسراوی، چۆن قورئان لە سینەدا حیفز کراوە سینە مەخلوقە و قورئان غەیر مەخلوقە، ئاواش قورئان لە کاغەزدا نوسراوە کاغەز مەخلوقە و قورئان غەیر مەخلوقە، ئەڵێن بڵێی سینە مەخلوقە ئاساییە بەڵام بڵێی کاغەزەکە مەخلوقە کوفرە! ئەمەش جیاوازی کردنە لە نێوان دوو شتی هاوشێوە کە سەلەف ئەم جیاوازییەکان نەکردووە..

پاشان ئەڵێ: قورئانخوێن بە خۆیی و دەنگەکەی جیانە لە قورئان، واتا قورئانخوێن و دەنگەکەی مەخلوقن بەڵام قورئانەکە کە عەبد ئەیخوێنێ مەخلوق نیە، هەروەک چۆن ووتی سینە جیایە لە قورئان، سینە مەخلوقە و قورئان غەیر مەخلوقە، هەروەها ئەڵێ ئەوەی لە سیفەتی الله یە هەمووی غەیر مەخلوقە، وە ئەوەی لە سیفەتی بەندە دایە هەمووی مەخلوقە، واتا دەنگی و جوڵەی و نوسینی حیفزی و بیستنی هەموو ئەمانە سیفەتی بەندەن مەخلوقن، بیستراو و بینراو و حیفزکراو و خوێنراو کەلامی الله یە مەخلوق نیە.

لە کۆتایی ئەڵێ: قورئان لە سینە دایە هەروەک چۆن لە لەوحی مەحفوز دایە، سینە وەک لەوحە هەردووکیان مەخلوقن

ئەم ووتەیەی کۆتایی لە هەمووی بەهێزترە، لەوحی مەحفوز الله تعالى خۆی دروستی کردووە لەلای خۆیەتی، بە فرمانی خۆی قەلەم نوسینی کردووە لە لەوحدا و کەلامی

اللّٰه ی لە لەوحدا نوسیوە، جا گەر ئەم لەوحە مەخلوق بێت کە ئەمە سیفەتیەتی، ئەی چ جای ئەم قەلەم و کاغەزی کە ئێمەی مرۆڤ بە دەستی خۆمان دروستی ئەکەین ؟!

أبو العباس الكنكشي وەک لە تەرجەمەکەی هاتووە لە تاريخ بغداد لەسەر مەزهەبی سفيان الثوري بووە، ئەم نوسراوانەی هێنام لە دەستنوسی (مخطوط) کتێبەکەی هەیە بە ناونیشانی (عقيدة أهل السنة والجماعة) کە سێ ساڵ لەمەوبەر لە وولاتی توركيا چاپكراوە بەڵام نازانم بە زمانی توركيە يان عەرەبی، دەستنوسی ئەم کتێبەم لە ٦٠ لاپەرە دەستکەوت لەکاتی خوێندنەوەی دەستنوسەکە بۆم دەرکەوت کە سێ بەشی زیاتری بابەتەکانی ئەم دەستنوسە هەمان بابەتەکانی کتێبی (الرسالة الواضحة)ی ابن الحنبلي (٥٣٦ هـ) ! نەک تەنها سەرە بابەتەکانیان وەک یەک بن بەڵکو پیت بە پیتی دەستنوسەکە و کتێبەکە وەکو یەکن، کتێبەکەی ابن الحنبلي کە چاپکراوە ١٣٧٨ لاپەرە، ئەتوانم بڵێم هەزار لاپەرەی زیاتری ووتەی محققە، لە سەرەتای کتێبەکە تاکو لاپەرە ٤١٩ هەمووی ووتەی محققە، لە لاپەرە ٤١٩ دەقی کتێبەکە دەست پێ ئەکات تاکو لاپەرە ١١٠٦ ئیتر لەوێ بەدواوە فهارسی علمیە بۆ کتێبەکە، لە لاپەرە ٤١٩ تاکو ١١٠٦ کە دەقی کتێبەکەیە کە ئەکاتە نزیکەی ٧٠٠ لاپەرە ئەتوانم بڵێم لەم ٧٠٠ لاپەڕەیە ئەگەر ٢٠٠ لاپەرەی دەقی کتێبەکە بێت باقیەکەی هەمووی ووتەی محققە کە بەشێکی زۆر لە حاشیەکانی چەند لاپەرەیەک داگیر ئەکات ! وە لە لاپەرە ٦٠٦ ی کتێبەکە تاکو کۆتایی کتێب هەموو ووتەکانی ناو

کتێبەکە هەمان ئەو ووتانەن کە لە دەستنوسی کتێبەکەی الکنکشي هاتووە پیت بە پیت، بەڵام سەرەتای کتێبەکەی ابن الحنبلي لە لاپەرە ٤١٩ تا ٦٠٦ ووتەی ابن الحنبلي خۆیەتی لە دەستنوسەکەی الکنکشي بوونی نیە، هەروەک بە ڕوونیش دیارە کە لە سەرەتای کتێبەکە ابن الحنبلي چەند ریوایەتێک ئەکات لە باوکی، جا نازانم چۆنە لە لاپەرە ٦٠٦ ی کتێبەکە تاکو کۆتایی ووتەکانی ناو کتێبەکە هەمان ووتەکانی الکنکشي-ە ! ئایا ابن الحنبلي دەقاو دەق ئەم ووتانەی الکنکشي نەقل کردووە ؟ چونکە الکنکشي پێش ابن الحنبلي ژیاوە، یان ئەو دەستنوسەی کە دراوەتە پاڵ الکنکشي هی ئەو نیە بەشێکە لە دەستنوسی کتێبەکەی ابن الحنبلي بە هەڵە دراوەتە پاڵ الکنکشي ؟ چونکە لە دەستنوسەکە تەنها نوسراوە ئەمە کتێبی أبو العباس الکنکشي-ە بەبێ ئەوەی ناسخ بە سەنەدەوە کتێبەکە ریوایەت بکات لە الکنکشي، وە ناسخ لە ساڵی ٥٩٣ هـ دەستنوسەکەی نوسیوەتە، بەڵام ئەم کتێبەی الکنکشي لە تورکیا چاپکراوە وەک باسم کرد و دراوەتە پاڵ الکنکشي هەر چەندە کتێبەکەم نەدیوە بە چاپکراوی بەڵام دیارە محقق ئیسباتی کردووە کە ئەمە کتێبی الکنکشي-ە، وە ئەوەی کە ئەگەری ئەوەم لا بەهێز ئەکات ئەمە کتێبی الکنکشي بێت ئەوەیە کە الکنکشي لە بابەتی لەفز ووتەی سفیان الثوري نەقل ئەکات لە کاتێکدا لە سەردەمی سفیان ئەم بابەتە لە ئارادا نەبووە و قسەی تێدا نەکردووە، دیارترین کەس کە زۆرترین قسەی هەیە لەم بابەتە ئیمام احمدە، هەرچەندە چەند ریوایەتێکی ئیمام احمدی نەقل کردووە بەڵام نەقل کردنی ووتەی سفیان لە بابەتێکی ئاوادا کە لە سەردەمی سفیان بوونی نەبووە ئەوەم لەلا بەهێز ئەکات کە ئەمە کتێبی الکنکشي بێت کە لەسەر مەزهەبی سفیان

بووە، بەڵام ناتوانم یەکلای بکەمەوە کە کتێبەکە هی کێیە تاکو کتێبە چاپکراوەکە و بەڵگەکانی محقق بۆ چەسپاندنی نسبەتی کتێبەکە بۆ خاوەنەکەی ئەبینم.

---------------------------

ماویەتی

# اللفظية (٤٢)



***ئیمام أحمد*** ئەڵێ:

پاشان کەسی جەهمی بانگەشەی شتێکی تری کرد، ووتی: الله ئەفەرمووێ: ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾، جا پێی وابوو قورئان لەوە دەرناچێت کە لە ئاسمانەکان بێت یان لە زەوی بێت یان لە نێوانی ئاسمان و زەوی بێت، جا گومان و تێکەڵ کردنی بۆ خەڵک دروستکرد.

ئێمەش پێمان ووتن: ئایا الله عز وجل خەلق و مەخلوقی نەخستۆتە سەر ئەو شتانەی کە لە ئاسمانەکان و زەوی و نێوانی ئاسمان و زەوین ؟

ووتیان: بەڵێ

ووتمان: ئایا لە سەرووی ئاسمانەکان شتی مەخلوق هەیە ؟

ووتیان: بەڵێ

ووتمان: الله ئەوانەی سەروو ئاسمانەکانی لە شتە مەخلوقەکان دانەناوە لە ئایەتەکەدا، وە ئەهلی عیلم زانیویانە کە لە سەرووی حەوت ئاسمانەکە کورسی و

عەرش و لەوحی مەحفوز و پەردەکان و شتی زۆر هەیە کە الله ناوی نەبردووە لە ئایەتەکەدا و لەگەڵ شتە مەخلوقەکان داینەناوە، بەڵکو هەواڵ پێدان لە لایەن الله عز وجل تەنها کەوتۆتە سەر ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانی ئاسمان و زەوی دایە.

**(الرد على الزنادقة والجهمية : ٢٥٦-٢٥٧)**

بڕوانە جەهمیەکان ووتیان الله فەرموویەتی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیان مەخلوقن، قورئانیش لە یەکێک لەم شوێنانەیە کەواتە قورئانیش مەخلوقە

ئیمام احمد سەرەتا پرسیاریان لێ ئەکات ئایا لە سەرووی حەوت ئاسمانەکە شتی مەخلوق بوونی هەیە ؟ ئەوانیش ئەڵێن بەڵێ .

ئینجا ئیمام احمد بۆ هەڵوەشاندنەوەی ووتەکەیان ئەڵێ: لە سەرووی حەوت ئاسمانەکە کورسی و عەرش و لەوحی مەحفوز و پەردە نورینەکانی الله هەیە کە دایبڕیوە لە مەخلوقاتەکانی و زۆر شتی تر هەن کە الله ناوی نەبردوون لە ئایەتەکە، ئێمە سەرەتا ڕێککەوتین کە لە سەرووی حەوت ئاسمانەکە شتانی مەخلوق هەن، هەروەک جەهمیەکان ووتیان هەیە و ئیمام احمد ئیقراری لەسەر کرد، ئێ ئەوەتا ئەو شتە مەخلوقانەی سەرووی حەوت ئاسمانەکە لە ئایەتەکەدا نەهاتوون، ئایاتەکە تەنها باسی ئاسمانەکان و زەوی و نێوانیان ئەکات، جا گەر مەخلوقاتی سەرووی حەوت ئاسمانەکە بەدەر بن لە ئایەتەکە، ئەوا قورئان کە کەلامی الله یە و مەخلوق نیە لە پێشترە بەدەر بێت لە ئایەتەکە، ئەوەی مەبەستیشە لە پۆستەکە و جێگای

بەڵگە هێنانەوەیە باسکردنی لەوحی مەحفوزە لەپاڵ شتە مەخلوقەکانی تردا، هەروەک پێشتریش ئیمام احمد ئیقراری کرد لەسەر ووتەی جەهمیەکان کە شتانێکی مەخلوق هەن لە سەرووی حەوت ئاسمانەکە، ئینجا لە چوارچێوەیاندا باسی لەوحی مەحفوزی کرد.

هەمیشەش وتوومە کە تۆ دانت بەوە دانا لەوحی مەحفوز مەخلوقە ئیتر هەمووی ئەبڕێتەوە، لەوحێک لەلای الله بێت و خۆی دروستی بکات و خۆی فرمان بە قەلەم بکات کە عیلم و ووتەی الله-ی تێدا بنوسێ، لەوحێک ئەمە حاڵی بێت و مەخلوق بێت، ئەی چ جای ئەو کاغەز و قەلەمەی کە لەبەر دەستی ئێمە دایە قورئانی تێدا ئەنوسین ؟ بێگومان هەموو کاغەز و قەلەم و حیبرەکان مەخلوقن، بەڵام نوسراوەکە کە کەلامی الله یە غەیر مەخلوقە.

-----------------------

ماویەتی

# اللفظية (٤٣)



**البربهاري ئەڵێ:**

وە هەموو شتێک لەوانەی کە الله لەناوچوونی لەسەر نوسیوە لەناو ئەچێت، تەنها بەهەشت و دۆزەخ و کورسی و عەرش و لەوح و قەلەم و صور نەبێت هیچ یەکێک لەمانە هەرگیز لەناو ناچێت، پاشان الله دروستکراوەکان زیندوو ئەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەت لەسەر ئەو شتەی کە لەسەری مردوون، جا حیسابیان لەگەڵ ئەکات بەهەر چۆنێک کە بیەوێت، کۆمەڵێک لە بەهەشتدا دەبن و کۆمەڵێکیش لە دۆزەخ، وە بە باقی دروستکراوەکان ئەفەرمووێ ئەوانەی کە بۆ مانەوە دروست نەکراون: ببن بە خۆڵ.

**(شرح السنة : ٥٠)**

البربهاري باسی ئەو مەخلوقاتانە ئەکات کە لەناو ئەچن و ئەوانەش کە لەناو ناچن، هەموو مەخلوقێک لەناو ئەچێت تەنها چەند دانەیەک نەبێت استثناء کراوە کە البربهاري باسی هەندێکیانی تر، لێرەدا البربهاري کورسی و عەرش و قەلەم و لەوحی مەحفوز و صور دەرئەهێنێت لە باقی مەخلوقەکانی تر بەوەی کە لەناو ناچن، واتا

ئەمانەش هەر مەخلوقن بەڵام الله بۆ هەمیشەیی دروستی کردوون و لەناو چوونی لەسەر نەنوسیون، استثنائەکەش متصل-ە منقطع نیە، المستثنى و المستثنى منه هەردووکیان مەخلوقن، المستثنى بەوە جیا کراوەتەوە لە المستثنى منه کە لەناو ناچێت، وەکو ئەوە وایە بڵێی: هەموو مرۆڤێک لە دایک ئەبێت تەنها ئادەم نەبێت، لێرەدا ئادەمیش هەر مرۆڤە هەمان جنسە بەڵام ئەوەی جیای کردۆتەوە ئەوەیە لە دایک نەبووە، کە البربهاري ئەڵێ: هەموو مەخلوقاتەکان لەناو ئەچن تەنها بەهەشت و دۆزەخ و عەرش و کورسی و لەوحی مەحفوز و قەلەم نەبێت، واتا ئەوانەش هەر مەخلوقن بەڵام لەناو نەچوونیان جیای کردوونەتەوە لە باقی مەخلوقات.

-------------------------

ماویەتی

# اللفظية (٤٤)



ابن بطة ئەڵێ:

وە یەکێک لەو شتانەی کە کەسی جەهمی نەزانەکانی پێ فریودا ئەوە بوو ووتی: قورئان لە لەوحی مەحفوز دایە، وە لەوح سنووردارە، وە هەموو شتێکی سنووردار مەخلوقە.

ئەمە لە کاتێکدایە کە کەسی جەهمی نکۆڵی لە لەوح ئەکات و ئینکاری لێ ئەکات، وە کتێب و وەحی الله ڕەت ئەکاتەوە دەربارەی لەوح، بەڵام دان بە لەوح ئەنێت لەو شوێنەی کە هیوای هەیە ببێتە بەڵگە بۆ کوفرەکەی.

جا کەسی جەهمی ووتی: فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٌ مَّجِيدٌ (٢١) فِي لَوۡحٍ مَّحۡفُوظِۭ (٢٢)﴾ [البروج]، ووتی: لەوح و ئەوەی تێیدایە مەخلوقە، وە دروست نیە مەخلوقێک شتی غەیر مەخلوقی تێدا بێت.

جا زۆر ناشرین تەئویلیان کرد و کافر بوون بە قورئان لە زۆر ڕوودا، چونکە قورئان لە عیلمی الله یە، وە عیلم و کەلام و گشت سیفەتەکانی الله هەموو ئەمانە پێش لەوحی مەحفوز و قەلەم بوونە، ابن عباس رحمه الله ئاواى فەرمووە: یەکەم شت کە الله

دروستی کرد قەلەم بوو، بە قەلەمی فەرموو: بنوسە، قەلەمیش نوسی لە لەوحی مەحفوزدا.

جا دروست بوونی لەوح و قەلەم بە ووتەی الله بووە کە پێیانی فەرمووە: (ببن)، جا ووتەی الله پێش دروستکراوەکانیەتی.

وە ئەوەی لە لەوحدایە کەلامی الله یە، ئەوەی لە لەوحدا هەیە لە قورئان بە شێوەی نوسراوە، وە کەلامی الله عز وجل مەخلوق نیە.

بە هەمان شێوە فەرمایشتی الله عز وجل: ﴿فِى صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ (١٣) مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍ (١٤)﴾ [عبس]، پەڕاوەکان ڕێزلێنراو و بەرزکراو و پاک ڕاگیراون لەبەر ئەوەی کەلامی الله-ی تێدا دانراوە.

پاشان **ابن بطة** ئەڵێ:

جا کاتێک زانرا الله خالقە مەخلوق نیە، بە هەمان شێوە هەر شتێک لە الله دابێت مەخلوق نیە، الله فەرموویەتی: ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ [البقرة ٢٥٥]، ابن عباس کورسی بە عیلمی الله تەفسیر کردووە.

الله هەواڵیدا کە عیلمی خۆی ئاسمانەکان و زەوی لەخۆ گرتووە، ئایا عیلم ئەبێتە مەخلوق ؟ کاتێک ئەبێتە مەخلوق کە نەبوو بێت پاشان بوو بێت، وە پەروەردگارمان لە ئەزەلەوە عالیم و قسەکەر بووە.

**بڕوانە (الإبانة الكبرى : ٢٤٩٤)**

دوو جەزائیریەکە الله لەناویان ببات گەر شایەنی هیدایەت نین شتێکیان داهێنا لەم بابەتە کە هیچ کەس پێشی ئەوان باسی نەکردبوو، هاتن ووتیان: بڵێی دەنگی قورئانخوێن مەخلوقە ئەوا قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق، بڵێی حیبر و قەلەم و کاغەز مەخلوقە ئەوا قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق، بڵێی فعلی عەبد مەخلوقە لەکاتی نوسین و خوێندنی قورئان ئەوا قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق، هەموو ئەم حوکمانەیان داهێنا بەهۆی جاهیلی خۆیانەوە لە ژێر ناوی پتەوی عەقیدە و شوێنکەوتنی سەلەف و بە جەهمی دانانی بەرامبەر لە کاتێکدا هیچ سەلەفێکیان نیە لەم ووتانە و شوێنکەوتووانیان داوای بەڵگەیان لێ ناکەن کە ئایا کام زانای سەلەف وتوویەتی ئەوەی بڵێ فلان شت مەخلوقە قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق، ئەم بە جەهمی دانانە چاوی کوێر کردوون وائەزانن هەر کاتێک توانیان بە بەرامبەرەکەیان بڵێن جەهمی ئەوا لەوپەڕی پتەوی عەقیدەدان و هەڵگری ئاڵای سوننەتن، لە کاتێکدا ئەمە شتێکە هەموو کەس ئەتوانێ بیکات منیش ئەتوانم بنوسم فلان کەسی مخالفم جەهمیە، بەڵام لە قیامەت ئەبێ بەرگەی ئەم حوکمە بگرین کە داومانە، شێخی عومومیەکان کاتێک بینی ابن عباس ئەڵێ الله لەوحی مەحفوزی خەلق کرد، ئەمە وای لێنەکرد کە پەشیمان بێتەوە لە عەقیدەکەی، سەیرکەن ئەهلی بیدەع چۆنن لەکاتی بینینی حەق لەبری گەڕانەوە هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگایەک ئەدەن بۆ پەڕینەوە لەم حەقەو بەردەوام بوون لەسەر بیدعەکەیان، هات ووتی ئەم ووتەی ابن عباس کە ئەڵێ الله لەوحی خەلق کرد ئەمە وەکو صیغەی ڕابردوو باس ئەکرێ ئەڵێین الله لەوحی خەلق کرد، بەڵام ناڵێین لەوح مەخلوقە!!! واتا تەنها بۆت هەیە بە صیغەی ڕابردوو باسی بکەیت نەک بۆ ئێستا بڵێی لەوح مەخلوقە، بەم ووتە پڕوپوچ و گاڵتەجاڕییە

بەردەوامیدا بە بیدعەکەی، لەملاوەش دەروێشێکی بێ ئەدەبی جنێوفرۆشی دەم شڕی هات هەمان قسە گاڵتەجاڕییەکەی شێخەکەی دووبارە کردەوە ووتی ئەڵێین الله سەرەتا لەوحی دروستکرد بەڵام بە ڕەهایی نابێ بووترێ لەوح مەخلوقە ئەمە کوفرە! هەروەک چۆن الله سەرەتا لە عماء دابووە ئێستا لەسەر عەرشە، ناکرێ ئێستا بڵێین الله لە عماء دایە، لەوحیش بە هەمان شێوە ئەڵێین سەرەتا الله لەوحی دروستکرد بەڵام ناڵێین ئێستاش لەوح مەخلوقە!!! گاڵتەجاڕتر لە شێخەکەی دەرچوو، هەروەک ووتراوە گەر بیدعە لەلایەن داهێنەرەکەی بستێک بێت ئەوا لەلای شوێنکەوتووانی ئەبێتە مەترێک، ئەم گەمژەیە کە هەمیشە جەهمی جەهمی لەسەر دەمی بوو هات کوێرانە دوای شێخەکەی کەوت و هەڵسا شوێنی الله-ی قیاس کردە سەر مەخلوقێک کە لەوحە، دووجار ئابڕووی خۆی برد، یەکەمیان خالق قیاس ناکرێتە سەر مەخلوق، دووەمیان شوێن گۆڕان جیایە لەوەی شتەکە وەسفی مەخلوق بوونی بگۆڕێت، زۆر شت هەن شوێنیان ئەگۆڕێ بەڵام مەحاڵە شتێک هەبێت سەرەتا مەخلوق بێت دواتر وەسفی مەخلوقی نەمێنێ بەڵکو تا هەتایە هەر مەخلوقە ئەم وەسفە لە دەست نادات، ئینجا کاتی خۆی بۆ گاڵتە پێکردنی ووتم ئەمە وەکو ئەوە وایە بڵێی: مادام سەیارە شوێنی ئەگۆڕێ کەواتە ئەکرێ وەسف کردنی بە مەخلوق ئەویش بگۆڕێ، کەچی هێندە بێ حەیا بوو دەستە پیسەکەی بە من سڕیەوە هات ئەم خاڵەی لە دژی خۆم بەکارئەهێنا ئەیووت ئەمە بە قیاس کردنی سەیارە ئەیەوێ لەوح بکاتە مەخلوق، لەکاتێکدا بۆ گاڵتەکردن بەخۆی باسی سەیارەم کرد پۆستەکەش ماوە، ئینجا دەستی کرد بە بانگەشە پوچەکانی کە لەسەر ئەساسی جەهل بنیاتی نابوو، ئەمە لە جەهمیەکان کافرترە، جەهمیەکان جورئەتیان نەکردووە بڵێن لەوح

مەخلوقە، مولزەمم کردووە بە کوفرێکی زۆر گەورە ئەبێت بڵێ موصحەف مەخلوقە، ئینجا بەم هاش و هوشە کۆمەڵێک نەزان کەوتنە داویەوە، من خۆم بێ هیوا بوومە لەو بەڵام هیوام وایە کە هەندێکیان لە جەهلە بێنە دەرەوە و بەهۆش خۆیان بێنەوە دوای پۆستە.

ئێستاش ئەچمە سەر قسەکردن لەسەر ووتەکەی ابن بطة

بە سەحیحی لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هاتووە کە ئەفەرمووێ یەکەم شت کە الله دروستی کرد قەلەم بوو، بە سەحیحی لە ابن عباس هاتووە کە باسی خەلق کردنی لەوح ئەکات لەلایەن الله.

ئەزانن هیچ کاتێک جەهمیەکان نەهاتوون ئەم دوو ریوایەتە بکەن بە شوبهە بۆ کوفرەکەیان کە خەلقی قورئان بوو، لە کاتێکدا بەپێی زەعمی ئەم عمومیە پیس و چەپەڵانە بێت ئەم دوو ریوایەتە شوبهەی زۆر بەهێزیان تێدایە بۆ جەهمیەکان، ئەهاتن ئەیان ووت ئەوەتا لە فەرمووده و ئاثار هاتووە لەوح و قەلەم مەخلوقە، لە بەرامبەریشدا نابینین سەلەف باسی ئەوە بکەن بڵێن جەهمیەکان هاتن دەستیان گرت بەم دوو ریوایەتە ووتیان لەوح و قەلەم مەخلوقە، ئێمەش لە رەددی ئەواندا ووتمان ئەم مەخلوقیە بۆ سەرەتا بوو بەڵام دوای نوسینی کەلامی الله کوفرە بووترێ لەوح و قەلەم مەخلوقە، هیچ شتێکی ئاوا نابینین لە ووتەکانی سەلەف، لە کاتێکدا گەر سەیری دوو کتێبەکەی الدارمي بکەین کە لە رەددی جەهمیەکان نوسیویەتی ئەبینین جەهمیەکان دەست ئەگرن بە ریوایەتی درۆ و زەعیف و تەئویلی زۆر باطل و

بێ مانا بۆ سەرخستنی کوفرەکانیان، بەڵام نابینین دەست بگرن بە دوو ریوایەتی سەحیح بڵێن لەوح و قەلەم مەخلوقە سەلەفیش لە رەددی ئەوان بڵێن کوفرە لە ئێستادا بووترێ لەوح و قەلەم مەخلوقە، ئەو مەخلوقیەی کە هاتووە لە دوو ریوایەتەکە بۆ سەرەتا بووە.

هەروەها ئەبینین ابن بطة ووتەی جەهمیەکان نەقل ئەکات کە ئەڵێن لەوح مەخلوقە، کەچی ابن بطة هیچ رەخنەیەک لەم ووتەیە ناگرێت و رەددی ناداتەوە، بەڵکو لە زاهیری ووتەکەی دیارە کە ئیقرار لەسەر ئەم بەشەی ووتەکەیان ئەکات کە لەوح مەخلوقە، بەڵام رەددی ئەوەیان ئەداتەوە کە ئەڵێن نابێ مەخلوقێک شتی غەیر مەخلوقی تێدا بێت، لە رەددەکەیدا ناڵێ لەوح پێی ناووترێ مەخلوق دوای ئەوەی کەلامی الله-ی تێدا نوسرا، سەرەتا ابن بطة تەئکید لەوە ئەکاتەوە کە لەوح و قەلەم هەردووکیان مەخلوقن و بە ووتەی الله خەلق کراون کە بە هەردووکیان فەرمووە ببن (کونا) جا ووتەی الله پێش لەوح و قەلەم بوونی هەبووە، کەواتە ووتەی الله مەخلوق نیە، گەر وەسف کردنی لەوح و قەلەم بە مەخلوق کوفر بێت ئەوا ابن بطة بەم ووتەیەی شوبهەی جەهمیەکان بەهێزتر ئەکات و زیاتر بەرەو هەڵدێریان ئەبات، چونکە بەپێی عەقیدەی عومیە چەپەڵەکان بێت ابن بطة لێرەدا ئەبوایە باسی ئەوە بکات کە کوفرە ئێستا بووترێ لەوح مەخلوقە بەڵام باسی شتێکی لەم جۆرە ناکات کە ئێرە شوێنی بوو باسی بکات بە پێی عەقیدەی عومیەکان، تەنانەت دووبارە تەئکید لە مەخلوقی لەوح و قەلەم ئەکاتەوە، ئینجا دێت رەددی شوبهەکەیان ئەداتەوە کە ئەڵێن

لەوح کەلامی الله ی تێدایە، لەوح مەخلوقە چۆن ئەبێ شتێکی مەخلوق شتێکی غەیر مەخلوقی تێدا بێت، واتا کەلامی الله-ش مەخلوقە، بەوە ڕەددیان ئەداتەوە کە کەلامی الله لە لەوحدایە بە شێوەی نوسین نەک خودی کەلامەکە حلولی کردبێت لە لەوحدا، واتا خودی کەلامەکە لە زاتی الله دەرنەچووە چوو بێتە ناو لەوح و حلولی کردبێت تێیدا و کەلامەکە لەلای الله نەما بێت، چونکە وجودی کەلام جیایە لە وجودی شتەکانی تر، بۆ نموونە تۆ لە شوێنێکی ناتوانی لە یەک کاتدا لە دوو شوێن بیت بەڵام ووتەکانت لە یەک کاتدا ئەکرێ لە ملیۆنەها شوێن بن بەبێ ئەوەی تۆ ووتەکەت لە دەست بدەیت و لەلات نەمێنێت، بەڵام گەر مۆبایلەکەت لە شوێنێک ببەیتە شوێنێکی تر ئەوا لە شوێنی یەکەم نامێنێت، ئەمەیە جیاوازی وجودی کەلام لەگەڵ وجودی شتەکانی تر کە هۆکاری سەرەکی گومڕابوونی کەسەکان لە بابەتی لەفز نەزانینی ئەم خاڵەیە کە ان شاء الله بە چەند پۆستێک ڕوونی ئەکەمەوە بابەتەکە ووردە و تێگەیشتنی ئەوێ، جا ابن بطة ئەڵێ: ئەوەی لە لەوحدایە کەلامی الله یە بە نوسراوی، کەلامی الله-ش بە نوسراوی و خوێنراوی و بیستراوی و حیفز کراوی هەر غەیر مەخلوقە، پاشان ابن بطة بە ووتەکانی خۆیان ئەم شوبهەیان پوچەڵ ئەکاتەوە لەبەر ئەوەی لە دەرەوەی بابەتەکەمان بوو نەم هێنا، بەڵام بە کورتی ئەڵێ: ئێوە ئەڵێن نابێ

شتی مەخلوق شتی غەیر مەخلوقی تێدا بێت، ئەی ئێوە لە عەقیدەتان ناڵێن الله لە هەموو شوێنێکە! شوێنیش مەخلوقە و الله مەخلوق نیە، ئەی چۆن الله کە مەخلوق نیە لە شوێنی مەخلوقە لەملاوەش ئەڵێن نابێ شتی مەخلوق شتی غەیر مەخلوقی تێدا بێت! ئەمە دژبەیەک بوونە لە بەڵگەکانتان

ئینجا ووتەکەی کۆتایی ابن بطة دەربارەی عیلمی الله ووتە پوچەکەی شێخی عومومیەکان ئەخاتە زبڵدانەوە کە شوێنی ئەسلی خۆیەتی و هەر لەوێوە هاتووە، شێخی عومومیەکان ئەڵێ لەوح سەرەتا مەخلوق بووە بەڵام دوای نوسینی کەلامی الله تێیدا کوفرە بووترێ لەوح مەخلوقە، ابن بطة-ش ئەڵێ: ئایا عیلمی الله مەخلوقە ؟! بەڵکو شتێک مەخلوقە کە سەرەتا نەبوو بێت پاشان بوو بێت، واتا پێناسەی مەخلوقمان بۆ ئەکات کە مەخلوق چیە، هەر شتێک لە ئەزەلەوە نەبوو بێت مەخلوقە، مادام لە کاتێکدا نەبووە دواتر بووە ئەوا ئەم شتە مەخلوقە، کەواتە ئەوەی ئەم وەسفە بیگرێتەوە مەخلوقە، لەوحیش هەمان وەسفی هەیە، وە بەڕاستی ئەمە شتێکی زۆر بەدیهیە کە قسەکردن لەسەری و روونکردنەوەی شتێکی ئازار بەخشە وەک ئەوە وایە روونی بکەیتەوە ئاگر گەرمە سارد نیە، بەڵام کە جەهل زاڵ بوو نەفسیش زاڵ بوو بۆ سەرخستنی جەهالەتەکە ئەوا ئەم نموونە قێزەونانە ئەبینین.

-------------------------

ماویەتی

# اللفظية (٤٥)



## کۆتا پۆستی زنجیرەکە

هیوادارم ئەم پۆستە بخوێنەوە بە تەواوی و بە تێگەیشتنەوە، وەکو هەندێک کەس ناڵێم گەر نەتخوێندەوە تیلیگرامت بسوتێنە بەڵام گەر تێیبگەیت بإذن الله هەموو کێشەکانت چارەسەر ئەبێت لە بابەتی لەفز و هیچ شوبهەیەک نامێنێت لە مێشکتدا.

کە ئەڵێین حیبر و کاغەز مەخلوقە بەڵام قورئانەکە کە نوسراوە غەیر مەخلوقە، فعلی عەبد لە نوسین و خوێندن و حیفز کردن و دەنگی عەبد و جوڵەی زمان و لێوی هەموو ئەمانە مەخلوقن، بەڵام ئەوەی عەبد ئەیخوێنێ و حیفزی ئەکات و ئەینوسێ غەیر مەخلوقە، ئەوانەی کە لە بابەتە تێنەگەیشتوون ئەڵێن ئەمە قسەیەکی بێ مانایە و دژبەیەکە، ئەمە مانای چیە حیبرەکە مەخلوقە بەڵام نوسراوەکە مەخلوق نیە! بۆ نوسراوەکە چ شتێکە جگە لە حیبر ؟! کە ووتتان حیبر مەخلوقە کەواتە بڵێن قورئانە نوسراوەکەش مەخلوقە قورئانەکە هەر بە حیبرەکە نوسراوە، ئەم قسانە

ئەکەن بەهۆی تێنەگەیشتنی لە حەقیقەتی کەلام، لە هەمان کاتدا خۆیان دژبەیەکن لەم قسەیاندا چونکە ئەڵێن کە ووتت حیبر مەخلوقە قورئانەکەش ئەبێتە مەخلوق، کە ووتت دەنگی عەبد مەخلوقە لەکاتی قورئانخوێندن ئەوا قورئانەکەش کە لە عەبدی ئەبیستین ئەبێتە مەخلوق، هەر خۆشیان ئەڵێن توقف ئەکەین لە حیبر و فعلی عەبد و دەنگی عەبد، نە ئەڵێین مەخلوقن نە ئەڵێین غەیر مەخلوقن! باشە گەر حوکمی حیبر و دەنگ و فعلی عەبد پەیوەست بێت بە قورئان، بە مەخلوقی ئەمانە قورئان ببێتە مەخلوق، ئەی بۆ کاتێک ئێوە کە توقف لەوانە ئەکەن ئەوا توقف تان نەکردووە لە قورئان؟ ئەی ناڵێن حوکمدان لەسەر ئەمانە قورئانەکەش ئەگرێتەوە ؟ کەواتە بە قسەی خۆتان ئێوە بوون بە واقفە توقف تان کرد لە قورئان، گەر بڵێن نەخێر توقف مان کردووە لە حیبر و فعل و دەنگی عەبد نەک قورئانەکە، ئەوا ئێمەش ئەڵێین وتوومانە حیبر و فعل و دەنگی عەبد مەخلوقە نەک قورئانەکە، گەر بڵێن ئاخر ئەمانە جیاناکرێنەوە لە قورئانەکە، ئەڵێین ئەی چۆن ئێوە جیاتان کردنەوە لە قورئانەکە ووتتان ئەوەیان توقف ئەکەین ئەوی تریشیان غەیر مەخلوقە، بۆ ئێوە دوو حوکمی جیاواز بدەن لەسەر حیبر و قورئان ئاساییە، بەڵام ئێمە گەر دوو حوکمی جیاواز بدەین لەسەریان کوفرە؟! هەموو ئەم حوکمە دژبەیەکانە نیشانەی تێنەگەیشتنە لە ئەسلی بابەتەکە کە لەم پۆستەدا ڕوونی ئەکەینەوە

وەک ووتراوە بە نموونە هێنانەوە ووتە ڕوون ئەبێتەوە، منیش چەند نموونەیەک ئەهێنمەوە تاکو تێبگەن مەبەستمان چیە کە ئەڵێین قورئانەکە غەیر مەخلوقە کە عەبد ئەیخوێنێ بەڵام دەنگی عەبدەکە مەخلوقە، حیبرەکە مەخلوقە بەڵام ئەو قورئانەی کە بە حیبرەکە نوسراوە غەیر مەخلوقە.

بۆ نموونە: کتێبێکم لەلایە ووتەی زۆر جوانی تێدا نوسراوە، کە کتێبەکە ئەخوێنمەوە ئەڵێم: بەڕاستی ووتەکانی ناو کتێبەکە زۆر جوانن، لە کاتێکدا کتێبەکە بە حیبرێکی ناشرین نوسراوە لەسەر کاغەزێکی پیس و ناشرین و بە دەستوخەتێکی ناشرین، ئەمە چۆن بوو ؟ چۆن حیبرەکە و دەستوخەتەکە زۆر ناشرینە بەڵام ووتەکە زۆر جوانە ؟ ئایا ئەمە دوو وەسفە دژبەیەک نین ؟ بێگومان نەخێر هەموو کەسێکی عاقڵ تێئەگات کە ووتەکە ووتراوە ووتەیەکی جوان بووە جا ئەم ووتە جوانە بە دەستوخەتێکی ناشرین بنوسرێ هەر ووتەیەکی جوانە، بە دەنگێکی ناخۆش دەرببڕدرێت هەر ووتەیەکی جوانە، جوانی ووتەکە پەیوەندی نیە بە ناشرینی حیبرەکە و ناشرینی حیبرەکە پەیوەندی نیە بە جوانی ووتەکە، کە ئەڵێین قورئانیش کە نوسراوە لە موسحەفدا غەیر مەخلوقە بەڵام حیبرەکە مەخلوقە کە پێی نوسراوە هەمان شتە، قورئان کەلامی الله یە غەیر مەخلوقە ئەم کەلامە الله قسەی پێکردووە کەلامی الله-ش غەیر مەخلوقە بەهەر شتێکی مەخلوق بنوسرێ کەلامەکە هەر غەیر مەخلوقە نابێتە مەخلوق، هەروەک چۆن ووتەیەکی جوان بە خەتێک و حیبرێکی ناشرین بنوسرێ هەر ووتەیەکی جوانە، واتا کەلامەکە غەیر مەخلوقە ئەوەی پێی ئەنوسرێ

ئەداتێکە بۆ دەرخستنی ووتەکە، ئەم ئەداتە مەخلوقە، مەخلوقی ئەداتەکە هیچ پەیوەندی بە کەلامەکەوە نیە، حیبرەکە و شێوەکەی کە ئەینەخشێنی لەسەر کاغەز مەخلوقن بەڵام کەلامەکە کە نوسراوە کەلامی الله یە غەیر مەخلوقە، نەک حیبرەکە ببێتە غەیر مەخلوق یان شێوەکەی کە نەخشێنراوە لەسەر کاغەزەکە ببێتە غەیر مەخلوق، گەر تێگەیشتنی ئەمە لەلات ئاڵۆزە بگەڕێوە بۆ سەر نموونەکە ئاسانتر تێی ئەگەیت.

نموونەیەکی تر: کتێبێکت لایە ووتە و چیرۆکی پێکەنیناوی تێدایە، کە ئەیخوێنیتەوە پێئەکەنیت ئەڵێی بەڕاستی زۆر پێکەنیناویە، لەکاتێکدا نە کاغەزەکە نە حیبرەکە نە دەستوخەتەکە هیچ پێکەنیناوی نین، بەڵکو خودی ووتەکە کە ووتراوە پێکەنیناویە نەک ڕەنگی حیبرەکە یان شێوەی حیبرەکە کە نەخشێنراوە لەسەر کاغەزەکە پێکەنیناوی بێت، کەلامەکە لە ئەسلی خۆیدا وەسفێکی هەیە، حیبرەکەش ئەداتێکە بۆ نوسینی کەلامەکە وەسفێکی تری هەیە، کەلامیش خۆی وجودێکی مەلموسی نیە لە واقعدا دەستی لێ بدەیت بڵێی ئەمە کەلامە، بەڵکو کەلام تاکو نەنوسرێ لەلایەن نوسەر یان تاکو نەخوێنرێ

لەلایەن خوێنەر وجودی نابێت لە واقعدا، بە خیلافی شتەکانی تر، بۆ نموونە ئاو وجودی هەیە بەبێ ئەوەی بنوسرێ و بخوێنرێ، بەڵام کەلام تاکو نەنوسرێ یان نەخوێنرێ وجودی هەست پێ ناکرێ، تێنەگەیشتن لە حەقیقەتی کەلام وایکردووە زۆرێک لەم بابەتە توشی گومڕایی بن، عەقیدەیەکی سەقەت بڵاو بکەنەوە بەناوی سەلەف و خەڵکی بکەن بە جەهمی بە ناحەق.

هەموو شتێک لە واقعدا چوار جۆر بوونی هەیە، بوونێکی زاتی کە خودی شتەکەیە، بوونێکی خەیاڵی لە خەیاڵی خۆتدا شتەکە وێنە دەکەیت و دەزانی چیە و چۆنە، بوونێکی وێنەیی کاتێک وێنەی شتەکە ئەکێشی یان ناوی شتەکە ئەنوسی، بوونێکی دەنگی کاتێک شتەکە بە دەم دەرئەبڕی

بۆ نموونە گەر ئاو وەربگرین و باسی هەر چوار جۆری بوونی بکەین

بوونی زاتی ئاو ئەوەیە کە خۆت ئاوەکە ئەبینیت و دەستی لێ ئەدەیت و مەوجودە لەبەر دەستت، ئەمە حەقیقەتی وجودی ئاوە

بوونی خەیاڵی ئاو ئەوەیە کە لە خەیاڵی خۆت وێنەی ئاو ئەکەیت و ئەزانی چیە و چۆنە

بوونی وێنەیی ئاو ئەوەیە کە لەسەر کاغەزێک وێنەی ئاو بکێشیت یان بنوسیت ئاو

بوونی دەنگی ئاو ئەوەیە بە دەم بڵێی ئاو، واتا ووشەی (ئاو) دەربڕیت

هەموومان ئەوە ئەزانین کە ئەو ئاوەی لە رووبار و کانیەکان هەیە جیایە لەو ئاوەی کە لە خەیاڵماندایە، وە جیایە لەو ئاوەی کە لەسەر کاغەز ئەینوسین، وە جیایە لەو ئاوەی کە بە دەم دەری ئەبڕین، کە ئاو ئەخۆیتە تینوویت ئەشکێ و دەمت تەڕ ئەبێ، بەڵام کە بیر لە ئاو ئەکەیتەوە ئەمە ڕوو نادات، کە لەسەر کاغەز ئەنوسی ئاو کاغەزەکە تەڕ نابێت، کە بە دەم ئەڵێی ئاو ناو دەمت تەڕ نابێ، ئەمەش بۆیە باس ئەکەم تاکو کەس خۆی گەمژە نەکات بڵێ ئەم قسانە قسەی ئەهلی کەلامە و نازانم

چی و دەست گرتن بە مەنهەجی سەلەف بفرۆشێتەوە پێمان، ئەوەی باسم کرد هەموو مرۆڤێکی عاقڵ ئەیزانێت و بڕوای پێیەتی و زانایانیش باسیان کردووە کەس ئینکاری لێ ناکات ئیللا گەمژە نەبێت.

**الدارمي** ئەڵێ:

کاغەز و نوسینی ناو وەک خودی ناوەکە نیە، گەر کاغەزەکە بسوتێ نوسینەکە ئەسوتێ ناوی الله هەر ئەمێنێتەوە و لەسەر زمانی نوسەرەکەش هەر ئەمێنێتەوە، هەروەک چۆن پێش نوسینی ناوەکە هەبووە، ئاگرەکە نە هیچ شتێکی لە ناوەکە کەم کردۆتەوە نە هیچ شتێکی لە خاوەنی ناوەکە کەم کردۆتەوە، بە هەمان شێوە گەر ناوی مەخلوقەکان بێت ئەوا ئاگر هیچ شتێک لە ناوی مەخلوقەکان و هیچ شتێک لە لاشەیان کەم ناکاتەوە، بە هەمان شێوە گەر بنوسرێ (الله) لەسەر کاغەزێک و کاغەزەکە بسوتێ ئەوا الله بە کەماڵی خۆی لەسەر عەرشە، بە هەمان شێوە گەر شێوەی پیاوێک بکێشرێ لەسەر کاغەزێک پاشان کاغەزەکە فڕێ بدرێتە ناو ئاگر ئەوا کاغەزەکە ئەسوتێ و شێوەی پیاوەکە هیچ زیانێکی پێ ناگات، بە هەمان شێوە قورئان گەر هەموو موسحەفەکان بسوتێن یەک پیت کەم ناکات لە خودی قورئان، بە هەمان شێوە گەر هەموو قورئانخوێنەکان بسوتێن یان بکوژرێن یان بمرن ئەوا قورئان بە تەواوی و کەماڵی ئەمێنێتەوە هەروەک چۆن پێشتر هەبووە یەک پیتی لێ کەم ناکات، چونکە قورئان لە الله-وە دەرچووە و بۆ ئەویش ئەگەڕێتەوە لەکاتی لەناو چوونی مەخلوقات بە تەواوی و کەماڵی ئەمێنێتەوە بەبێ کەم و کورتی.

**(النقض : ٥٠)**

ئەوەی الدارمي باسیکرد هەمان ئەو چوار جۆرەی وجودە کە باسم کرد لە سەرەوە وجودی زاتی و خەیاڵی و وێنەیی و دەنگی، سەیرکەن الدارمي ئەڵێ: کاغەز و نوسینی ناو جیایە لە ناوەکە، واتا نوسینی ناوەکە خودی ناوەکە نیە، وە خودی کەسەکەش نیە، گەر موسحەفەکان هەمووی بسوتێن قورئان هەروەک خۆی ئەمێنێتەوە هیچی لێ کەم ناکات، گەر قاریئەکان کە حافزی قورئانن هەموویان بمرن قورئان هەروەک خۆی ئەمێنێتەوە هیچی لێ کەم ناکات

### ابن بطة ئەڵێ:

وە ئەوەی لە لەوحدایە کەلامی الله یە، ئەوەی لە لەوحدا هەیە لە قورئان بە شێوەی نوسراوە، وە کەلامی الله عز وجل مەخلوق نیە.

**بڕوانە (الإبانة الكبرى : ٢٤٩٤)**

ابن بطة باسی هەمان بابەت ئەکات لێرەدا کە جەهمیەکان ئەڵێن چۆن ئەبێت شتێکی مەخلوق شتێکی غەیر مەخلوق لەخۆ بگرێت، واتا چۆن ئەبێ لەوحی مەحفوز کە مەخلوقە کەلامی الله لەخۆ بگرێت کە غەیر مەخلوقە؟ ئەویش لە وەڵامدا پێیان ئەڵێ: ئەوەی لە لەوحدایە کەلامی الله یە بە شێوەی نوسراو، واتا خودی کەلامەکە لە الله

دەرنەچووە حلولی کردبێت لە لەوحدا، بەڵکو کەلامەکە بە نوسراوی هەیە لە لەوحدا هەیە کەلامی الله-ش غەیر مەخلوقە.

ئێستا ئەڵێن تێگەیشتین لە مەبەستت بەڵام کێشەیەک دێتە پێشەوە، گەر حیبرەکە و نەخشاندنی لەسەر موسحەف مەخلوق بێت، موسحەفیش هەر حیبر و نەخشی حیبرەکەی لەسەرە، کەواتە بۆچی ئەڵێین ئەوەی لە لە موسحەفدایە غەیر مەخلوقە ؟ بۆ ناڵێین ئەوەی لە موسحەفدایە مەخلوقە تەنها حیبر و نەخشەکەیەتی ؟

لێرەدا جیاوازی وجودی کەلام لەگەڵ وجودی باقی شتەکانی تر دەرئەکەوێ و بە تێگەیشتنی ئەم باسە ئەم گومانە نامێنێ.

ووتمان هەموو شتێک جوار چۆر وجودی هەیە، بۆ نموونە گەر کەسێک وەربگرین بەناوی (محمد) وجودی زاتی محمد ئەوەیە کە کەسێکە بوونی هەیە ئەیبینین و قسەی لەگەڵ ئەکەین، وجودی وێنەیی محمد ئەوەیە کە لەسەر کاغەز ئەنوسین محمد، وجودی خەیاڵی محمد ئەوەیە کە باسی ئەکرێ لە خەیاڵی خۆمان ئەزانین محمد کێیە و چیە و چۆنە یان لە دڵماندا ناوی محمد حیفز ئەکەین، وجودی دەنگی محمد ئەوەیە کە بە دەم ئەڵێین محمد، تەنها لە وجودی زاتی محمد خودی محمد هەیە لە سێ وجودەکەی تر خودی محمد نایەتە ناو کاغەزەکە نایەتە ناو دڵ و خەیاڵمان نایەتە ناو دەممان، ناوی هەیە لەسەر کاغەز نەک خودی خۆی لەسەر کاغەزەکە بێت، ناوی هەیە لە دڵ و خەیاڵمان نەک خۆی بێتە ناو دڵمان، ناوی هەیە لەسەر دەممان نەک خۆی بێتە ناو دەممان، وجودی هەموو شتێک بەم جۆرەیە بۆیە

کاتێک ناوی محمد حیفز ئەکەیت ناڵێی محمدم حیفز کرد ئەڵێی ناوی محمدم حیفز کرد، کە ناوی ئەنوسی ئەڵێی ناوی محمدم نوسی ناڵێی خودی محمدم نوسی، کە ناوی محمد ئەهێنی ئەڵێی ناوی محمدم هێنا ناڵێی محمدم هێنایە سەر دەمم، گەر لە کتێبێک باسی محمد کرا بێت ناڵێی لەناو ئەم کتێبەدا محمد بوونی هەیە بەڵکو ئەڵێی ناو و بەسەرهاتی محمد بوونی هەیە، وجودی زاتی محمد جیایە لەگەڵ وجودی وێنەیی و دەنگی و خەیاڵی، بەڵام کەلام وانیە خودی کەلامەکە ئەنوسرێ و حیفز ئەکرێ و دەرئەبڕدرێ، گەر کەلامی محمد لەناو کتێبێک نوسرا بێت ئەڵێی کەلامی محمد هەیە لەناو کتێبەکە، گەر کەلامی محمد ببیستی ئەڵێی کەلامی محمدم بیست، گەر کەلامی محمد حیفز بکەیت ئەڵێی کەلامی محمدم حیفز کرد، واتا خودی کەلامەکە ئەنوسرێ و حیفز ئەکرێ و ئەبیسترێ و ئەخوێنرێ، وەک ئەوە نیە کە محمد تەنها ناوی ئەنوسرا و ئەبیسترا و حیفز ئەکرا.

**الدارمي** ئەڵێ:

زانایان زانیویانە کە قورئان کەلامە، کەلامیش خۆی لەخۆیدا نایەتە بوون تاکو زمانەکان پێی هەڵئەستن و ئەخوێنرێ لەسەر زمانەکان، خودی خۆی ناتوانێ بێت و بجوڵێت و دابەزێت بەبێ ئەوەی کەسێک دایبەزێنێت و بیجوڵێنێت، ئیللا مەگەر بهێنرێت و دابەزێنرێت.

**(النقض : ١٩٠-١٩١)**

ئەمەیە جیاوازی وجودی کەلام لەگەڵ وجودی شتەکانی تر، شتەکانی تر وجودی زاتیان هەیە لە هەمان کاتدا ئەنوسرێن و ئەخوێنرێن و حیفز ئەکرێن بەڵام لە هیچ کام لەم سێ جۆرەی کۆتایی جۆری زاتی شتەکە بوونی نیە بەڵکو تەنها ناوی شتەکە بوونی هەیە بە شێوەی نوسین و رەنگ و دەنگ، بەڵام هەرچی کەلامە هەر خودی کەلامەکە ئەنوسرێ و ئەخوێنرێ و ئەبیسترێ و حیفز ئەکرێ چونکە کەلام هیچ وجودێکی زاتی نیە تاکو کەسێک ئەیخوێنێ یان ئەینوسێ دێتە وجود، بۆیە کاتێک باسی محمد ئەکرێ لە کتێبێکدا ئەووترێ: باس و بەسەرهات و ناوی محمد هەیە لەم کتێبە، بەڵام کە کەلامی محمد هەبێت لە کتێبێکدا ڕێک ئەووترێ کەلامی محمد هەیە لەم کتێبە، واتا خودی کەلامەکە نوسراوە، جۆرەکانی وجودی کەلامیش بەم جۆرەیە: وجودی زاتی کەلام و وجودی دەنگی کەلام هەمان شتن کە قسە ئەکەی خودی کەلامەکە دێتە دەرەوە لە دەمت بە شێوەی دەنگ ئەم دوو جۆرە بەیەکەوەن، وجودی وێنەیی کەلام ئەوەیە کە کەلامە ئەنوسیت، وجودی خەیاڵی کەلامیش ئەوەیە کە کەلامەکە حیفز ئەکەیت

بۆ نموونە گەر پێغەمبەر موسی علیه السلام وەربگرین لە قورئاندا

خودی پێغەمبەر موسی بوونی نیە لە قورئاندا، بەڵکو ناو و بەسەرهاتی موسی هەیە لە قورئاندا، ئەی کەلامی موسی هەیە لە قورئاندا ؟ بەڵێ کەلامی موسی بوونی هەیە لە قورئاندا، ئەمەیە جیاوازی وجودی شتەکان لەگەڵ وجودی کەلام، وجودی

شتەکان وجودی زاتی نیە لەکاتی بیستن و خوێندن و نوسین و حیفز کردن، بەڵام کەلام خودی کەلامەکە ئەنوسرێ و حیفز ئەکرێ و ئەخوێنرێ و ئەبیسترێ.

ئەسلیش لە هەموو کتێبێک و نوسراوێک کەلامەکەی ناویەتی نەک حیبرەکە کە پێی نوسراوە، بۆ نموونە هەر کتێبێکت پێ بێت لەهەر بابەتێک بێت، پێت بڵێم ئەم کتێبە چی تیایە ؟ ئەڵێی کەلامی تیایە ناڵێی حیبری تیایە، ئەڵێی چیرۆکی تیایە ئەڵێی ووتەی جوانی تیایە ئەڵێی نوکتەی تیایە، باس باسی کەلامەکەیە نەک حیبرەکە، جا کەلامەکە هەر وەسفێکی هەبێت ئەو وەسفە ئەیگرێتەوە حیساب بۆ حیبرەکە ناکرێ چیە و چۆنە، موسحەفیش بە هەمان شێوە ئەڵێی کەلامی الله ی تیایە ناڵێی حیبری تیایە کەلامی الله-ش غەیر مەخلوقە، ئەگەرچی حیبرەکەش مەخلوقە بەڵام ئەو کەلامەی کە نوسراوە و جێگیر کراوە لە موسحەفدا کەلامی الله یە کە غەیر مەخلوقە، بە هەمان شێوە کە کەلامێک ئەبیستی بە دەنگەوە ئەیبیستی بەڵام ئەڵێی کەلامی فلانم بیست ناڵێی دەنگی فلانم بیست، یان کەسێک کە قسە ئەکات قسەکەی حیفز ئەکەی ئەڵێی قسەکانیم حیفز کرد ناڵێی دەنگی کەسەکەم حیفز کرد، کە کەلامی کەسێک ئەخوێنیتەوە ئەڵێی کەلامی فلانم خوێندەوە ناڵێی حیبرەکەم خوێندەوە، ئەسلەکە کەلامەکەیە نەک ئەداتەکانی گەیاندنی کەلامەکە کە دەنگ و دڵ و نوسینە، کەلامەکەش چ وەسفێکی هەبێت هەر ئەو وەسفەی ئەمێنێ ئەداتی گەیاندنەکە وەسفەکەی ناگۆڕێ، هەر بۆیە سەلەف ئەڵێن قورئان کەلامی الله یە لە هەموو ڕووێکەوە غەیر مەخلوقە بە نوسراوی بە خوێنراوی و بە بیستراوی بە حیفز کراوی، ئەوەی ئەیخوێنی کەلامی الله یە مەخلوق نیە، ئەوەی ئەیبیستی کەلامی الله یە مەخلوق نیە، ئەوەی ئەینوسی کەلامی الله یە مەخلوق نیە، ئەوەی حیفزی ئەکەیت

کەلامی الله یە مەخلوق نیە، هەر بۆیە ئیمام احمد ووتی: چاو مەخلوقە ئەوەی چاو سەیری ئەکات غەیر مەخلوقە، بەو مانایەی چاو سەیری کەلامەکە ئەکات کە قورئانە نەک حیبرەکە، گوێ مەخلوقە ئەوەی گوێ ئەیبیستێ غەیر مەخلوقە، گوێ قورئانەکە ئەبیستێ حیساب بۆ دەنگی قاریئەکە ناکرێ کە ئەداتێکە بۆ گەیاندنی کەلامەکە، ئەسلەکە کەلامە نەک ئەداتەکە کە کەلامەکە ئەگەیەنێت، دەست مەخلوقە ئەوەی دەست ئەینوسێ غەیر مەخلوقە، دەستەکە کەلام ئەنوسێ ئەویش کەلامی الله یە غەیر مەخلوقە باسی حیبر و نەخشی حیبرەکە نیە باس باسی کەلامەکەیە، جا ئەوەی مەبەستە لێرەدا دوو خاڵ ڕوون بێتەوە تاکو پارێزراو بین لە عەقیدەی حلولی و عەقیدەی جەهمی، کە ئەڵێین موسحەف کەلامی الله ی تیایە غەیر مەخلوقە مانای ئەوە نیە کە الله قسەی کردووە بە قورئان بە دەنگ و بە پیت خودی دەنگ و پیتەکانی الله گۆڕاون بۆ حیبر و حلولیان کردووە لە موسحەفدا کە ئەمە عەقیدەی حلولیەکانە، بەڵکو حیبرەکە مەخلوقە و نەخشی حیبرەکەش لەسەر کاغەز هەر مەخلوقە بەڵام کەلامێکی پێ نوسراوە کە کەلامی الله یە غەیر مەخلوقە، وە کە ئەڵێین حیبرەکە و نەخشی حیبرەکە لەناو موسحەف مەخلوقن مانای ئەوە نیە قورئان تەنها حیبر و نەخشی مەخلوقی تێدایە یان بڵێین ئەو کەلامەی لە موسحەفدا نوسراوە مەخلوقە کە ئەمە عەقیدەی جەهمیەکانە، بەڵکو کەلامەکە کە نوسراوە کەلامێکی غەیر مەخلوقە کەلامی الله یە بە حیبرێکی مەخلوق نوسراوە هەروەک چۆن هەموو کەلامێکی تر هی هەر کەسێک بێت وەسفێکی هەیە کەلامەکە جیایە لە وەسفی حیبرەکە وەک لە نموونەکان باسمان کرد.

